# کورد لە ئەرشیفی
# رووسیا و سۆڤیەتدا

## کۆمەڵە دیکۆمێنتێکی نهێنین لەسەر کێشەی کورد لە ساڵەکانی نێوان ١٩١٤-١٩٢٤ کە دوای رووخانی سۆڤیەت رووناکی دەرەوەیان بینیووە

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

د. ئەفراسیاو هەورامی

پێداچوونەوە زمانەوانی

مستەفا غەفور

ناوی کتێب: کورد لە ئەرشیفی رووسیا و سۆڤییەتدا

- وەرگێڕان و ئامادەکردن: دکتۆر ئەفراسیاو هەورامی
- پێداچوونەوەو زمانەوانی: مستەفا غەفور
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- پیتچنین: محمد مامند
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٨١٥
- تیراژ: ١٥٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٦٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب —٩٠— (١٩٣)

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

www.mukiryani.com

asokareem@ maktoob.com

Tel: 2260311

## دەسپێك

ئەم کۆمەڵە بەڵگە و دیکۆمێنتانەی ئارشیفەکانی سۆڤیەتی پێشوو سەبارەت بە کێشەی کورد کە بۆ جاری یەکەمە رۆناکایی دەرەوە دەبینن، بۆ خوێنەران و بەتایبەتی بۆ لێکۆڵەران گەلێك بە کەڵك وپڕ بایەخن. لام وایە زۆر تارمایی و بۆچوونی نادروستی زۆر کەس و هێزی سیاسی و کەسایەتی و مێژوونووسی کورد بەم بەڵگانە روون دەبێتەوە و بەرپەرچی کوردناسەکانی سۆڤیەتیش دەدەنەوە. جگەلەوەش زۆر رووداو و زانیاری نوێ و شاراوە سەبارەت بەکێشە و مێژووی کورد دەردەخەن. دیارە زۆر نووسەر و مێژووناسی کورد گەلێك شتیان لەسەر سیاسەتی کوردی سۆڤیەت نووسیوە، کە لەگەڵ ناوەڕۆکی بەڵگەکان یەك دەگرێتەوە، نووسینەکانیان گەرچی بێ بەڵگەبوون،بەڵام لە ئەنجامی پراکتیکی سیاسەتی رۆژانەی سۆڤیەت، بە تایبەتی پەیوەندی سۆڤیەت لەگەڵ رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، بێدەنگی و هەڵوێستی نێگەتیڤانەی دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتی بەرانبەر بە کێشەی رەوای کورد کە هانی داون لە روانگەیەکی رەخنەگرانە و توند، بەرپەرچی ئەو ئایدیانەی سۆڤیەت، پارتە کۆمۆنیستەکانی ئێران، عێراق، سوریا، تورکیا، هەندێ هێزی چەپی ئەو وڵاتانە و تەنانەت کوردستانیش بدەنەوە،کە سۆڤیەت یاریدەر و پشتوانی کورد بووە یا لەبەر هەلومەرجی دژوار پێی نەکراوە یارمەتی بدات. تا روخانی سۆڤیەت بگرە پاش روخانیشی تائێستا هەندێکیان رەخنە و توانج گرتنیان لە سۆڤیەت بە کوفر دەزانی و نادۆستانە یان ناشۆڕشگێڕانە لەگەڵ رەخنەگرانی کورد و ناکورد مامەڵەیان دەکرد.سەرەڕای روخانی سۆڤیەت هێشتا هەر لەسەر هەڵوێستی خۆیان سورن. ئەگەر کەسایەتی و سەرکردەکانی کورد خالید بەگی جەبرانلی و شێخ مەحموود لەبەر ئەوەی دەوڵەتی ساوای سۆڤیەتیان نەناسی بوو ئەزمونێکیان لەو بارەوە نەبوو تەنیا بە دروشم و بەڵێنەکانی باوەڕیان کردبوو،هەڵەیەکیان کردبێ،خۆ هاوکاری بەلشەفیکەکان نەبوون لە دامرکاندن و سەرکوتکردنی شۆڕشەکانی شێخ سەعید و ئاکرێ (ئارارات) و کۆماری مهاباد و فرۆشتنی بە نەوتی ئێران،کە ئەمانە شتێك نەبوون مرۆڤی سیاسی کورد هەستیان پێ نەکات.

پێشڕەو یا ڕووناکبیر یا هێزە سیاسییەکانی هەر نەتەوەیەك بە پێوانەی بەرژەوەنـدی گەلەکـەی خۆیان سیاسەتی دەوڵەتان و باری نێونەتەوەیی دەپێون،کەچی ئێمـەی کـورد هـەتا ئێـستا بـە پێوانە یا تەرازووی فارس و تـورك و عـەرەب سـەودای کـڕین و فرۆشـتن ومامەڵـەی سیاسـی دەکەین.

سۆڤیەت بەلایەوە گرینگ بوو تورکیای کەمالی بە گژ ئیمپریالیزمی ئینگلیـزدا بـچێت بۆیـە هەموو شتێکی بۆ بە هێزکردنی ئەو ڕژێمە دەکرد و خەڵکی هاندەدا پشتیوانی لێ بکـەن. بـە شێخ مەحموودیان گوتبوو ڕزگار بوون لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزم گەلێك زەحمەترە لە مانەوە لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی وەك وتورکیا و عێراقدا. ئـەو ئیمپریالیزمـەی کـە ئیمپراتۆرییـەتی سەدەکانی ناوەراستی عوسمانی تێکشکاند و پارچە پارچەی کرد و زۆر گەل ونەتـەوەی لـە ژێـر چەپۆکی دەرهێنا. سۆڤیەت ڕژێمی کەمالیەکانی پێ پێشکەوتوو بوو کـە دانـی بـە هـەبوونی کورد و نیشتمان و زمانەکەی دانەدەنا و دژی هەرچەشنەقەوارەیەکی سیاسی کورد بوو.گەرچی دەوڵەتێکی ئەوروپایی وەك ئنیگلیز دەیویست وڵاتان و گەلانی تر بخاتە ژێر دەستی خۆی بـەڵام دژی ناسنامەی نەتەوەیەك یان دژی زمانەکـەی نـەبوو.کەواتـە چـۆن دوو شـتی ئـاوا بـەراورد دەکرێن؟. بەپێچەوانەوە هەر ئەوان نەبوون کەمالی ڕەگەزپەرستیان بەپێـشکەوتوو،ئینگلیزیان بە کۆنەپەرست و دوێنی بەعسیەکانی شام و بەغدای پێرێیان بەقەڵای خـۆ ڕاگـری و پێـشەنگ دادەناو سەددامیان بە کاسترۆی دووەم لە قەڵەم دەدا.

لەناو بەڵگەکاندا کۆنسوڵ و باڵوێز و کار بە دەستانی تری سۆڤیەتی لە تورکیا و ئێران بەرانبەر بە کێشەی کورد بیروڕای جیاواز و تەنانـەت دژ بـە یـەکیان هـەبووە، گـەلێك لەوانـە لەگـەڵ پشتیوانی کردنی گەلی کورد بوون وتا بلێـی بۆچـوون و لێکدانـەوەکانیان لـەمبارەوە زانـستی ومرۆڤانەبووە، لەگەڵ ئەو پرەنسیپە و بانگەوازانـەی دەوڵەتەکـەیان بـوون کـە لەگـەڵ مـافی چارەنووسی گەلان و پشتوانی گەلانی ژێر دەست یەکی دەگرتەوە. بەڵام مەخابن گوێگریـان لـە مۆسکۆ نەبووە، ڕێز لە بۆچوونەکانی ئـەوان و سـەرکردەکانی کـورد و گەلەکـەیان نـەگیراوە. بەشەکەی تریان کە سیاسەتێکی نێگەتیڤانەیان لە ئاست کێشەی کورد هەبووە و دیارە لەگـەڵ سیاسەتی گشتی سۆڤیەتی یەکیان گرتۆتەوە یان مۆسکۆ گوێرایەڵی ئەوانە بووە، یاخود بە پێی دەستوور و ڕێنوێنیەکانی دەوڵەتەکەیان جوڵاونەتەوە. (لە هەموو بەڵگەکاندا خۆیان دەنـوێن و

چەند پات دەبنەوە). مەبەستی منیش لێرە هەر بۆ ئەوەیە کە ئەو بەڵگانە هەموویان بڵاوبینەوە و خوێنەر وانەزانێت هەڵویستی سۆڤیەت تەنیا لە دوو یا سێ بەڵگەی بێ مانادایە.نەخێر هەڵوێستی نێگەتیڤانەی سۆڤیەت لە قۆناغێکی چارەنووس سازدا بۆ گەلی کورد پاش شەڕی جیهانی یەکەم کەس ناتوانێ پاساوی بۆ بێنێتەوە،وەك لە دیکومێنتەکاندا دەردەکەوێت فەرمانبەرانی سۆڤیەتی هەموویان دان بەوە دادەنێن کە چالاکی سۆڤیەتییەکان لەناو کورددا لە چاو ئینگلیزەکان گەلێك زۆرتر بووە،نەك هەر هیچ پلانیان بۆ دروست کردنی کیانێکی کوردی یا گەیشتن بە مافەڕەواکانی نەبووە بەڵکو دژی ئینگلیز و نەهێشتنی دەوری ئینگلیز لەناوچەکە بەکاریان هێناون، پێوەندی و بەڵێنەکانیشیان هەر بۆ ئەو مەبەستە بووە.

هەندێك لە فەرمانبەرانی سۆڤیەتی لە وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە بۆچی سۆڤیەت خۆی لە کێشەی کورد ناگەیەنێ؟، دەڵێن لەبەر ئەو پێوەندیانەی کە لەگەڵ تورکیا و ئێران هەمانەو نامانەوێ ئەو دەوڵەتانە گومانمان لێبکەن وزیان بەپەیوەندییەکانمان بگەیەنێ. کەوابوو نابێ دەست لە کاروباری ئەو دوو دەوڵەتە دۆست و هاوسێیە وەردەین یا بواری هێزێکی دەرەکی و نەیاری سۆڤیەت بدەین بە زیانی ئێمە و ئەوان لە ناوچەکەدا پلان بگێڕن. تورکیای کەمالی پێشکەوتووخواز کە سیاسەتێکی نیشتمانی گرتۆتە پێش و بۆ سەربەخۆیی و پاراستنی وڵاتەکەی دژی ئیمپریالیزم لە خەباتدایە لە لایەن سۆڤیەتەوە پێشوازی و پشتگیری لێ دەکرێت. بەڵام ئەم سیاسەتە پێشکەوتنخواز و نیشتمانی و سەربەخۆیەی کەمالیەکان بۆ کورد رەگەزپەرستانە و جینۆسایدی بەدواوە بوو.

باڵوێز و کۆنسۆڵ و فەرمانبەرانی سۆڤیەت لە تورکیا و ئێران بەتایبەتی لە کوردستان باشترین کۆکەرەوەی دەنگوباس بۆ رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان بوون، بەتایبەتی لەچاوپێکەوتنیان لەگەڵ کەسایەتی و سەرکردەکانی کورد کە ساکارانە سۆڤیەتیەکانیان لە بەرنامە و پلانی خۆیان ئاگادار کردۆتەوە.

کاتێك کە زۆربەی فەرمانبەرانی سۆڤیەتی هەموو راپەڕینەکانی کورد بە گوشار دادەنێن بۆسەر تورکیای شۆڕشگێڕ و ئێرانێك کە دەیهەوێ بگاتە سەربەخۆیی خۆی و بزووتنەوەکانی کورد بە دەستکردی ئیمپریالیزم و دژی سۆڤیەت دەزانن، دەبێ چ نیازێکی پاك و خێرخوازانە لەو دەوڵەتە چاوەڕوان بکرێت.

سۆڤیەت وەك زلهێزێك كە هاوسێ و هاوسنووری كوردستان بووە و زۆرجار كورد هانای بۆ بردووە، نە تەنیا یارمەتی دۆزی رەوای كوردی نەداوە، بەڵكو دژی وەستاوەو بە گێرەشێوێنی لەقەڵەم داوە، بەواتایەكی تر كۆسپێكی گەورە بووە لەسەر رێگای زلهێزەكانی تریش (هەر ئەوە كە دەوڵەتەكانی تریشیان وەك عێراق و سوریا دروست كرد)كە ویستویانە دەوڵەتێك بۆ كورد دروست بكەن. یارمەتی و پشتگیری سۆڤیەت لە رژێمە داگیركەرەكانی ئێران و توركیا هێندە زۆر و كاریگەر بووە پلان و یارمەتی نەیارەكانی سۆڤیەتی بۆ كورد، پوچەڵ كردۆتەوە. زەحمەت بوو دەوڵەتێكی لەرزۆكی وەك توركیا بەبێ یارمەتی روسیای سۆڤیەتی بتوانێ بەربەرەكانی كورد و گەلانی تر بكا یا بەرانبەر دابەشكردنی پاشماوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی واتە توركیای ئەمرۆ لە لایەن رۆژئاواییەكانەوە خۆی ڕابگرێ.

كوردستانێكی سەربەخۆ لە روانگەی بەلشەویكەكانەوە دروشمێكە ئیمپریالیزم خستویەتە سەرزاری كوردان و كوردستانێكی سەربەخۆ دەبێتە پردێك بۆ پەڕینەوەی ئیمپریالیزم بۆ قەفقاز و ئاسیای ناوەڕاستی سۆڤیەت و هاتنی گاردی سپی بۆ ئەو ناوچانەی كە دەیانەوێ بە یارمەتی هێزی تر لە ناوچەی تر دەسەلاتی سۆڤیەتی بروخێنن.

كۆمیتەی ئەرزەرۆمی كوردی بە سەرۆكایەتی (خالید بەگی جەبرانلی) كە لایەنگر و هیوا و ئۆمێدی سۆڤیەت بووە، ویستوویەتی كوردستانێكی سەربەخۆ لە ژێر ڕكێفی یەكیەتی سۆڤیەت دابمەزرێنێت، سۆڤیەت نە تەنیا ناهێڵێت وەك كوردێك پشتی دەوڵەتەكەی شێخ مەحموود بگرێت، بەڵكو هانیشیانداوە دژی راوەستێت كە گوایە سەر بە ئیمپریالیزمی ئینگلیزە.

لە بەڵگەكاندا هەورەك باسكرا هەندێ فەرمانبەری تێگەیشتوو و مرۆڤ دۆست و دووربینی سۆڤیەت بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتەكەیان و گەلی كورد و بۆ بەرەبەرەكانێ دژی ئینگلیز، پێشنیار دەكەن: بۆ ئەوەی سۆڤیەت دەور و كاریگەری لە كوردستان هەبێت دەبێ لە كوردستانی بن دەستی خۆیانەوە (كوردستانی قەفقاز) دەست پێ بكەین و لەوێوە بۆ پارچەكانی تری كوردستان بچین و بەرانبەر بە كوردستانی ئینلگیز (مەبەست كوردستانی باشوور یان مەملەكەتی شێخ مەحموودە) بوەستین, دەبێ كوردستانێكی ترلەو ناوچانەی لە ئێمەوە نزیكن (كوردستانی باكوور) دروست بكەین، یان بەڵێنی دروست كردنی بە كوردەكان بدەین و بۆ بەرەو پیش بردنی سیاسەتی خۆمان لە بەشەكانی تری كوردستان، لە كوردەكانی سۆڤیەت كەڵك وەربگرین،

بەواتایەکی تر کیان دروست کردن بۆ کوردی سۆڤیەت دەبێتە نموونە و سیمبۆل بۆ هەموو کوردەکانی تر. ئەمە ڕێگایەکی زۆر ژیرانەتر بووە لەو بیانوەی کە خۆتێگەیاندن لە دۆزی کورد زیان بە پەیوەندییەکانی سۆڤیەت لەگەڵ ئێران و تورکیا دەگەیەنێت، یان ئێمە وەك ئینگلیز توانای ماددی و کەرەستە و یارمەتیمان بۆ کورد نییە.

خوێنەرانی بەڕێز واتێنەگەن کە من پاش چاوپێکەوتنم بەم بەڵگانە و بەڵگەکانی تر بۆ وێنە لەسەر شۆرشی شێخ سەعید و کۆماری مەهاباد، پاکانە بۆ سایەسەتی ڕۆژئاواییەکان دەکەم، نا چونکە ئەوان هەموو کاتێك توانیویانە هەروەك چۆن دەستیان لە کاروباری دەوڵەتانی تر داوە دەوڵەتی نوێیان بۆ گەلی تر دروست کرد بۆ کوردیش دروست بکەن، ئەگەر دانیان بە مەلیکایەتی شێخ مەحموددا نا، پاشان شێخ مەحموود لێیان هەڵگەڕایەوە یان بەرەو هەڵدێریان برد، خۆ زۆر کەسایەتی تر هەبوون لە جێی شێخ مەحموود دایبنێن، یان کۆمارێکی ساوای وەك مەهاباد بۆ دەبێ بەبیانووی ئەوەی دەستکردی سۆڤیەتیەکان بووە بە پشتگیری کردن لە ڕژێمی تاوانباری پاشایەتی ئێران کورد بێ ماف و بێ کیان بکەن، چارەنووسی گەلی کوردیان بەو بڕوبیانوانە کردە قوربانی و کەسیش ناتوانێت پاکانەیان بۆ بکات.

لە لایەکی تریشەوە دەبێ خوێنەری بەڕێز بزانێت کە مەبەستی منیش دژایەتی کردن یان تاوانبارکردنی سۆڤیەت و دەوڵەتەکەیان یان پارتە چەپ و سۆڤیەت خوازەکان نییە، وابزانم ئەوەی هەندێك ئەزموونی سیاسی هەبێت پێی خۆش بوو سۆڤیەت دۆست یا یارمەتیدەری دروست کردنی کیانێك بۆ کورد بوایە. ئێستاش ئەو زهێزەی جاران کە کورد هیوایەکی زۆری پێبوو نەماوە. گرنگ ئەوەیە کە روسیای نوێ چاوێك بە سیاسەتی خۆیدا بخشێنێت لەمەڕ کورد (یا درێژەدەری سیاسەتی سۆڤیەت نەبێت) و ئەگەر نەتوانێت یارمەتیدەری چارەسەری کێشەی کورد بێت بێلایەن یا بێ زیان بێت. بە دەرکەوتنی ئەم بەڵگانە و بەڵگەی تر دەتوانرێت گلەیی و گازندە بەرامبەر بە سیاسەتمەدارانی پێشووی سۆڤیەت کە ئەمڕۆش دەستێکی باڵایان لە سیاسەتی دەوڵەتەکەیاندا هەیە، بکرێت، بەڵکو هەڵوێستێکی دۆستانە و مرۆڤانە لە ئاستی کێشەی کورد بگرنەبەر، ئێمەی کورد پێویستمان بە یارمەتی و دۆستایەتی هەموو لایەنێك هەیە.

سوپاسی ئەو بەڕێزانە دەکەم لە پێداچوونەوەی ئەم بەرهەمەدا هەڵەکانم بۆ چاك دەکەنەوە و وەرگێڕاوەکان پوختە و ڕەوان دەکەن تا بۆ خوێنەرانی بەڕێزیش ئاسان و جێی پەسەند بێت،

داوای لێبوردن لە کەموکوڕی کارەکەم دەکەم، منی کورد کە لە خوێندنی زمانی کوردی بێبەش بووم و لە هەندەران و لەو وڵاتەی تیای دەژیم، پسپۆر یان لێی زانێکی لێ نەبووە کە ئەو ئەرکە پیرۆزە بگرێتە ئەستۆ. بۆیە پاش (٥) ساڵ تێپەڕبوون بەسەر ئەم بەرهەمە بریارمدا بینێرمەوە وڵات و خۆم بە بەختەوەر دەزانم لە کوردستانێکی ئازاد چاپ بکرێت و بکەوێتە بەردەستی هەمووان.

خاڵێکی تر کە بە پێویستی ئەزانم ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە کە گەلێك لەو بەڵگانە کە زۆر کۆن و بگرە هەندێکیشیان زۆر بە زەحمەت دەخوێنرانەوە و تەمەنی هەندێکیان لە سەد ساڵ تا هەفتا ساڵە.

گەلێك بەڵگەی وا هەبوون کە بواریان نەدا تەماشایان بکەم یان کۆپییان بکەم و گەلێکیش لەوانە کورتە و ناوەڕۆکەکەم نووسیون.

بۆ من گەلێك ئاسانتر بوو ناوەرۆکی بەڵگەکانم لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆم و گەلێك سەرچاوەی تر وەك پەرتووك یان چەند پەرتوکێك نووسیبایە. بەڵام من زیاتر مەبەستم دەرخستنی بابەتەکان بوو بۆ لێکۆڵینەران و مێژوونوسان بەتایبەتی مامۆستایان و قوتابیانی زانکۆکانی کوردستان. لە بڕی پێشەکی چاوخشانێکی بە پەلەم بەسەر بەڵگەکاندا کرد لەگەڵ هەندێ بۆچوونی خۆم کە هیوادارم ڕێنیۆنێك یان زانیارییەك بن لەسەر ناوەڕۆکی بەڵگەکان.

د. ئەفراسیاو هەورامی

# بەشی یەکەم

## پێشەکی

لە ناو ئەو بەڵگە و دیکومێنتانەدا، بەشی تێزەکان و راپۆرتی کامیل بەدرخان بە ئیمزای شاخۆڤسکی جێگایەکی تایبەتی و گرنگیان هەیە. لە بەشی تیزەکاندا لە ژێر ناوی کێشەی کورد لە نێوان ١٩١٧-١٩٢٣ و دەوری رووسیا لە کێشەی کورد، کە لە لایەن بەشی رۆژهەڵاتی وەزارەتی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت ئامادەکراوە. گرنگی کێشەی کورد و جێگای کوردستان لە رووی ئابووری و بازرگانی و لەشکری و جوگرافیایی و هەروەها رەوابوونی کێشەکەی و خەباتی بێوچانی گەلی کورد لە پێناوی ئازادی و نیشتمانەکەی، بە کورتی ئاماژەیان پێکراوە. بۆیە ئەم تێزانە وا بەکورتی گەڵاڵەکراون تا دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت لە بایەخی کێشەکە تێبگەن و هەنگاو هەڵبگرن بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بەرژەوەندییەکانی رووسیای سۆڤیەتی لە کوردستان و بە گشتی لەناوچەکەدا بپارێزن. گەڵاڵەی تێزەکان وێڕای رەخنە لە سیاسەتی رابردووی خۆیان بەرامبەر بە کێشەی کورد، کاربەدەستانی رووسیای سۆڤیەتی ئاگادار دەکاتەوە کە خۆلادان یا چاودێری کردن و بێلایەن بوون لە کێشەی کورد زیانی هەمەلایەنە بە رووسیای سۆڤیەتی دەگەیەنێت.

ئەگەر بە وردی لەسەر ئەم تێزانە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە بکرێت، دەبێ پەرتوکێکی گەورەی لەسەر بنووسرێت و ئەو راستیە و ئەو مافەش بە کورد دەدا، کە ئەگەر ئێمە خۆمان لە قەرەی کێشەی کورد نەدەین ئەو دەم کوردان ناچارن پەنابەرنە بەر ئینگلیزەکان، چونکە هەرچی بێ لە روانگەی کوردەکانەوە لە تورك باشترن و مێژووی تورك شاهیدی چەوسانەوە و سوکایەتی کردنە بە گەلانی ژێر دەستی خۆیان و هیچ قازانجیان بۆ کورد نەبووە. بۆیە کوردەکان نایانەوێ چیتر لە چوارچێوەی تورکیادا بمێننەوە. پرۆسەی جیابوونەوەی کورد شتێکی حەتمیە و کێشەکەشیان

ئەمڕۆ کێشەیەکی نێونەتەوەییە و نابێ ئامۆژگاریان بکەین لە چوارچێوەی تورکیادا بمێننەوە ئەگینا لێمان دووردەکەونەوە.

تێزەکان بە قوڵی، بەکورتی و هەمەلایەنە گرنگی کێشەی کورد و جێگای کوردستانیان گەلاڵەکردووە، لە لایەك دەڵێن ئەگەر ئێمە پاسیڤ نەبین کوردەکان پەنا بۆ ئینگلیز دەبەن و ئەو دەم بە هاوکاری و پشتوانی ئەوان بن بە دەوڵەت خاوەنەکەی ئینگلیزەکان دەبن کە ئەمە بۆ ئێمە زیان بەخشە و کوردستان دەبێتە پوازێك و لە قەفقازی ئێمە دەدرێت. ئینگلیزەکان ئەمڕۆ پەرە بە جولانەوەی جوێخوازانەی کوردەکان دەدەن، بەپێچەوانەی سۆڤیەت کە پیشنیار دەکات لەگەڵ تورك و فارس بمێننەوەو ئاشت وەبن.

لە هەموو حاڵەتێکدا تێزەکان ئەو راستیە دەسەلمێنن: لەبەر ئەوەی کوردستان هاوسێی ئێمەیە و زەمینە لەبارە بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، باشترە لە باتی تورکیا دەوڵەتی کوردی دۆست و هاوسێی ئێمە (رووسیا) بێت. ئەوسا کوردستان تورکیا لە رووسیا جیادەکاتەوە، ئەو دەوڵەتەی کە بە درێژایی مێژوو دوژمنی رووسیا بووە و هەوڵی لاوازبوونی داوە و دەست لە کاروباری ناوخۆیی ئێمە وەردەدا و ئێستاش حەز لە چارەمان ناکا.

بەڵام مەخابن ئەم تێزانە لەناو کاربەدەستانی سۆڤیەتدا گوێگریان نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەم گەلاڵەیە جولاونەتەوە، واتە هەوڵ دراوە کێشەی کورد نەبێتە کێشەیەکی نێونەتەوەیی و لەم رووەوە یارمەتی داگیرکەرانی کوردستانیان داوە تا کوردستان نەبێتە وڵاتێکی سەربەخۆ کە بەپێی زۆربەی بەڵگەکان گوایە کوردستانی سەربەخۆ مەترسیەکە و هەڕەشە لە سۆڤیەت دەکات.

یەکێك لە بەڵگە و دیکۆمێنتە هەرە بە نرخ و بابەتیەکان، راپۆرتی کامیل بەدرخانە بۆ کاربەدەستانی رووسیای قەیسەری کە لە ساڵی ١٩١٧ نووسراوە و دیارە گەیەنراوەتە کاربەدەستانی نوێ واتە بەلشەویکەکان. ئەم راپۆرتەکە ئیمزای شازادە شاخۆڤسکی پێوەیە دەتوانین بڵێین لە لایەن ئەویشەوە پەسەندکراوە یان بەواتایەکی تر دوورنییە راپۆرتێکی هاوبەش بوویێت تا جارێکی تر مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و رووسیا و داواکاریی کوردەکان وە بیر دەسەڵاتدارانی ئەم وڵاتە بخەنەوە.

ئەوەی لەم راپۆرتەدا زۆرگرنگ و زانستیانەیە چۆنیەتی ئاڵۆزبوونی پەیوندییەکانی نێوان کورد و ئەرمەن، کورد و رووسیایە. لەمبارەوە نووسەر هەر لە سەرەتاوە بەرێز رووداوەکان دەگێرێتەوە. فاکتی زیندوو لەوانە چەند فەرمانده‌یەکی لەشکری رووسیان کە شاهیدی ئەم تراژیدیایەن لەگەڵ بەرپرسی کاروباری کوردەکان لە دەوڵەتی رووسیا واتە شاخۆڤسکی کە بۆ خۆشی لەمبارەیەوە راپۆرتی نووسیوە، لەگەڵ ئەم راپۆرتەی کامیل بەگ یەك دەگرێتەوە کە ئەویش لە نزیکەوە شاهیدی رووداوەکانە و لەناو جەرگەیاندابووە.

ئەم راپۆرتە بەرپرچی ئەو لایەنانە بەتایبەتی نووسەرانی ئەرمەنی و کوردولۆژییەکانی سۆڤیەت دەداتەوە کە بەناهەق و نازانستیانە بە ویستی خۆیان باسی شەڕی کورد و ئەرمەنییان کردووە و کوردیان بە تاوانبار داناوە.

ئەم بەڵگە مێژووییە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو نووسەر و راستکردنەوەی ئەو نووسینانەیە کە نامەوێ لێرە بە وردی لێیان بدوێم. نووسەر پێشینەیەکی مێژوویمان لەمبارەوە بۆ باس دەکات تادەگاتە بەستنی پەیمانی دۆستایەتی نێوان کورد و ئەرمەن، ئینجا لادانی لایەنی ئەرمەنی لەم پەیمانە و بەستنی پەیمانی نهێنی لەگەڵ تورك و بەشداری راستەوخۆیان لەشەڕی دژی کورد و بەکۆمەڵ کوشتنی کوردەکان. نووسەر رێکەوت و شوێنی روداوەکان دەخاتە روو، باسی دەست پێشخەری و کوشتار و بە کۆمەڵ کوشتنی ژن و منالی کورد و راوەدوونانیان دەکات تادەگاتە جنگی جیهانی یەکەم. لە تاوانی ئەرمەنیەکانی ناو سوپای رووسیا و ئەو چەکدارە ئەرمەنییانە دەدوێ کە دەوڵەتی رووسیا چەك و تەقەمەنی پێداون تا دژی دەسەڵاتداری عوسمانی راپەڕن و هاوکاری سوپای رووسیا بکەن، کەچی ئەو چەکانە دژی کورد کەڵکیان وەرگیرا نەك دژی سوپای تورك، لە کوردستانەوە دەستیان پێکردووە کە بەداخەوە ژمارەیەکی زۆر لە فەرماندە و سەربازەکانی رووسیش چ لە رووی نەزانییەوە یا بە هۆی خراپ تێگەیاندنیان لە لایەن ئەرمەنییەکانەوە، بەشداری گەلێك لەم ئۆپەراسیۆنە سەرکوتکەرانە بوونە، تا وای لێهاتووە زۆر ناوچە بە کورد چۆڵ بکەن و گوند و ماڵ و سامانیان ئاگری تێبەربدەن.

من لێرەدا باسی ئەوە ناکەم کە ئەوساو پێش ئەو رووداوانەش لە چەند شوێنی کوردستان راپەڕینی کوردان دژی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە پەرەسەندن دابووە و رووسیاش بە هۆی ئەو پەیوەندی بە کوردەکانەوە بەتایبەتی بە کامیل بەدرخانەوە لە چەند شوێن و ناوچەدا راپەڕینی کوردان رێك دەخەن کە سەرکەوتنێکی زۆری بۆ سوپای رووس مسۆگەرکرد و زیانێکی گەورەیان لە لەشکری تورك دا و

گەلێك ناوچەیان بۆ لەشکری رووس ئازاد کرد. باسی ئەوەش ناکەم کە چۆن سوارە حەمیدییەکانی کوردی ناو سوپای تورك دێنە ریزی سوپای رووسیاوە، چونکە لە بەلگەکاندا زۆرجار باسیان لێوە دەکرێت، لەگەڵ تراژیدیەی چاوەڕییان دەبێت واتە کوشتنیان لە لایەن چەکدارە ئەرمەنییەکانەوە...

مەبەست لە هۆنینەوەی ئەم باسانە وەبیرهێنانەوەی خوێنەرە کە کردەوەی دەستە چەکدارەکانی ئەرمەن دەبێتە هۆی ئەوەی راپەڕینەکانی کورد توشی شکست بن و ببنە کوسپێکی گەورە لە بەردەم جێبەجێ کردنی پیلانی هاوبەشی کورد و رووس، سەرئەنجام هەڵگەڕانەوەی کورد لە رووسیا، کە لە هەندێ ناوچەوە دەچنە ریزی تورك و دەست بەشەڕ دژی لەشکری رووس دەکەن، کە هەم شکست بە سوپای رووس دێنن و هەم پێش بە پێشڕەوی لەشکری رووس دەگرن. هەندێ بەلگەش بە دەستەوەن کە سوپای رووس لەگەڵ دەستەچەکدارەکانی ئەرمەن، کورد راوەدەنێن،بەگوێرەی گێرانەوەی رووداوەکان دەڵێی بۆ پاکسازی کوردەکان چوون، نەك شەڕ لەگەڵ سوپای عوسمانی. نووسەر زۆر ژیرانە و دیپلۆماسیانە و لە هەمانکاتیشدا نەترسانە راستیەکان دەخاتە بەردەستی کاربەدەستانی رووس و گەلێك فەرماندەی لەشکری رووس لەم کوردکوژییەدا تاوانبار دەکات. نووسەر پەنادانی ئەرمەنییەکان لە لایەن کوردەکانەوە (ئەوانەی کە لە دەست سەرکوتکەرانی تورك خۆیان رزگاردەکەن و دێنە کوردستان) دەکاتە بەلگە و وێنە لە هەمانکاتیشدا دەڵێت تاقە کوردێك لە لایەن ئەرمەنییەکانەوە پەنانەدراوە.

نووسەر زۆر بە ژیری و دووربینانە داوا لە کاربەدەستانی رووسیا دەکات بۆ نەهێشتنی ئەم دوبەرەکییە کە خزمەتی هیچ لایەنێك ناکات بکەونە نێوبژی کردن و دەڵێ ئەم دوژمنایەتیەی کورد و ئەرمەن سروشتی نییە و دەستکردە. بەڵام مەخابن هیچ هەنگاوێك لەم بارەوە هەڵناگیرێت، تاوای لێدێت کوردەکان داوادەکەن ئەو لەشکرەی دەنێردرێتە کوردستان با ئەرمەنیان لەگەڵ نەبن و چیتر گوێرایەڵی ئەرمەنە شۆڤینیەکان مەبن، چونکە کورد دژایەتی رووسیا ناکا.

لە سەرەتای شەڕدا بە هۆی ئەو راپەڕینانەی کوردستانی باکوورکە هێزێکی زۆری سوپای تورکیای بەخۆوە خەریك کردبوو گەلێك ناوچەی کوردستانیان لە لەشکری تورکیا پاککردەوە و رێگەیان بۆ پێشڕەوی سوپای رووسیا خۆشکرد، پاشانیش بە چوونی ژمارەیەکی زۆر لە دەستەکانی حەمیدی کورد بۆ ناو سوپای رووسیا، کورد خزمەتێکی بێ وێنەی پێکردن، بەپێی پیلانێك کە نووسەر باسی دەکات بڕیاربووە سوپای رووسیا بە کوردستانی باکووردا بگاتە کوردستانی باشوور و لەوێ لەگەڵ هێزەکانی

ئینگلیز و فەرەنسا یەك بگرنەوە، بەڵام سوپای رووسیا لە (بەتلیس) بەو لاوە ناتوانێت پێشڕەوی بکات و هۆکانیشی دیارەچی بوون.

کامیل بەگ دەڵێت هاوینی (١٩١٥) عەبدولرەزاقی برازام کە لە رووسیا پەنابەربوو هەوڵیدا راپەڕینێك رێکبخات و دەستی بگاتە بۆتان بەڵام سەرینەگرت،دەڵێ هۆکەشی ئەوە بوو: هێزەکانی عەبدولرەزاق پرچەك نەبوون وکۆمیتەی ئەرمەنییەکانیش گیروگرفتی بۆ دروست کردوون. کامیل بەگ دەڵێت: کورد بە بەرگری لە خۆی و نیشتمانەکەی وەڵامی ئەو دەستدرێژیانەی رووس و ئەرمەنیان دەداوەتەوەو زیانێکی زۆریش بە سوپای رووس دەگەیەنن و لەبەرەی چەپی (بەتلیس)یش پاشەکشەی پێدەکەن، ئینجا دەست بە تۆڵەسەندنەوە لە ئەرمەنییەکان دەکەن. زۆر بە راشکاوی لە راپۆرتەکەیدا دەڵێت ئاشکرایە کورد لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا ناتوانێت بەرامبەر بە رووسەکان باش بێت، بەڵام دەڵێ: سەرەڕای ئەم هەموو کارەساتە ئەگەر سیاسەتێکی ژیرانە هەبێت و کورد و ئەرمەن ئاشتببنەوە و هاوکاری یەکتر بکەن گەرەنتی ئۆتۆنۆمیشیان هەبێت من خۆم و بنەماڵەکەم لە کوردستان لەمبارەوە یارمەتیەکی زۆریان دەدەین.

لەسەر هەلویستی دەسەڵاتدارانی باڵای رووسیای قەیسەری لەسەر کێشەی کورد واتە لەسەر ئەو راپۆرتە نهێنیەی شاخۆفسکی کە بۆ کاروباری کوردان واتا هەڵوێستی رەسمی دەوڵەتی رووسیا بەو هیوایە نووسراوە کە (شازادە نیکۆلای نیکۆلایچ) پەسەندی بکات و ببێتە بناغەیەکی پتەو و بەڵگەیەکی رەسمی کە دەوڵەتی رووسیای تزاری بۆ چارەسەری کێشەی کورد هەنگاو هەڵگرێت. بەڵام مەخابن هەڵوێستی رووسیا هەروەك خۆی دەمێنێتەوە ئەویش لە کەلك وەرگرتن لە هێز و توانای کورد بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی بەبێ ئەوەی بەڵێن یا پرۆژەیەکی بۆ چارەسەی کێشەی کورد هەبێت. (شازادە نیکۆلای نیکۆلایچ) پاش خوێندنەوەی نامەکە لە هەندێ شوێندا هێڵی بە ژێرداکێشاوە واتە دەبێ ئەو شتانە جێبەجێ بکرێن و دوابڕیار دەداتە دەست سەرۆکی دەوڵەت. دیارە سەرۆکی دەوڵەتیش پێشنیار و بۆچوونەکانی حاکم و دەسەڵاتدارانی رووسیا لە قەفقاس لەبەرچاو دەگرێ کە نیگەتیڤانە بووە چ رابردوو چ ئێستا.

راپۆرتەکە، خواستە سیاسییەکانی کامیل بەگ یان کورد، واتە گەڕانەوەی تاج و تەخت و دەسەڵات بۆ بنەماڵەی بەدرخان یا دروست کردنی کوردستانێکی سەربەخۆ پەسەند ناکات و هیچ بەڵێنێکیش

نادات،بگرە دوای شەڕەکە لە کۆبوونەوەی هاوپەیمانان نایەڵێت کێشەی کورد باس بکرێ و بڕیاری لەسەربدرێ.

(نیکۆلای نیکۆلایچ) کە بڕیاری دەوڵەتەکەی لە دەستدایە، ئامادەیە تەنیا سەروەت و سامانی بنەماڵەی کامیل بەدرخان کە لە لایەن تورکەکانەوە دەستی بەسەرداگیراوە یان بە تالان براوە، بگەڕێنێتەوە، بەڵام نە بەڵێنی دەسەلاتی پێ دەدەن و نە چارەنووسی کوردیش پاش شەڕ دیاری دەکەن. ئەویش بەو مەرجەی کوردەکان بەگشتی و بەتایبەتی کامیل بەدرخان و بنەماڵەکەی یارمەتی رووسیا بدەن واتە بێ مەرج و بەبێ بەڵێن وەك رابردوو هەر خزمەت بکەن، گوایە تائەو دەمە کورد هیچ خزمەت و هاوکاری رووسیای نەکردووە و نیازی پاك نەبووە. خۆ خزمەت کردن و هاوکاری کورد و رووسیا لە تەواوی راپۆرت و بەڵگەکاندا هاتووە، پێویست ناکا لێرە دوپاتیان بکەمەوە یان ئاماژەیان پێبکەم. سەیریش ئەوەیە دەڵێ، هەروەك چۆن لە ١٩١٥ بڕیارمان لەسەر عەبدولرەزاق دابوو کامیل بەگیش هەر بەو چەشنە دەبێت. واتە بەڵێنیان بە عەبدولرەزاق دابوو کە زەوی و زارەکەی بۆ بگەڕێننەوە، ئەو عەبدولرەزاقەی ئەو هەموو خزمەتەی کردبوو، بەو نیازە هاتبۆ رووسیا و راپەڕینی رێکخستبوو تا کوردستان بە یارمەتی و پشتیوانی رووسیا رزگار بێ و سەربەخۆیی خۆی دەستەبەر بکا. هەروەها دەڵێ بۆ ئارام کردنەوەی کامیل بەدرخان بە زارەکی ئاماژەیەکی نادیار وبەڵێنێکی ناروونی پێبدەن، واتە ئەوەی لە خاڵی چواردا هاتووە کە ئەگەر خزمەتمان بکات، خزمەتەکەی لەبەرچاو دەگیرێت و پارێزگارییان لێدەکرێت تالە ئاشتی و پێشکەوتندا بژین، سوپاسی دەوڵەت بە کامیل بەگ بگەیەنن لەبەر ئەو چالاکیانەی کە هەیبووە. واتە کامیل بەگ وەك میری بۆتان، وەك نوێنەری کورد، وەك سەرکردەیەکی کورد خزمەتی زۆری رووسیای کردووە، هەروەك لە راپۆرتەکاندا هاتووە خەلکی لە کوردستان راپەڕاند، بە بانگەوازی ئەو حەمیدییەکان هاتنە ریزی سوپای رووسیا، کورد بە پیر هێزەکانی رووسیاوە چوو بەشداری شەڕیان کرد دژی سوپای تورك و هتد... بەڵام بۆ دەبێ پاش ئەو هەموو ساڵە و ئەو هەموو خزمەتە لە شوباتی١٩١٧ بگوترێت ئەگەر کوردەکان یارمەتیمان بدەن خزمەتەکەیان لە بەر چاودەگیرێت؟!.

د. ئەفراسیاو هەورامی

## کێشەی کورد لە نێوان ساڵانی ١٩١٧-١٩٢٢ دا

## بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت

## تێزەکان لەسەر ڕۆڵی سۆڤییەت لە مەڕ کێشەی کورد

١- کوردەکان پێکەوە بەکۆمەڵ لەم ویلایەتانەی تورکیا جێگیربوونە: ئەرزەڕۆم ( ناوچەکانی قارس، ئۆڵت و ئیگدەر، بەتلیس، وان، موسڵ، دیاربەکر، باکووری ڕۆژهەڵاتی ئالپۆ، خارپوت و بەشێك لە سیواس. لە فارس (ئێران) لە بەشێکی ئازربایجان لە سەلماسەوە بۆ گۆلی ورمێ و لەوێوە بە درێژایی تەواوی سنووری ئێران و عێراق شۆڕدەبێتەوە. بەپێی سەرژمێری مایڤسکی تادەستپێکردنی شەڕ لە ویلایەتی وان تورك ٩٪ بوون، دانیشتوانی تورك لە بەتلیس ٥٪ و لە ویلاتەکانی تر ڕێژەی تورك زۆکەمە، سەرەڕای ئەوەی کە لە کاتی شەڕ کوردێکی زۆر لەو شوێنانە کەم بوونەوە و باریان کرد. ویلاتە کوردیەکان روت و قوت و لەخۆوە هەڵنەکەوتن تا لە گەمارۆی تورکەکان دابن، بەڵکو ئەوانیش لە باری جوگرافیاییەوە وەك پۆلۆنیەکان لە ئەڵمانیا هەڵکەوتوون، خاکێکی دیاریکراویان هەیە کە ناوچە کوردییەکانی فارس و میزوپۆتامیا دەگرێتەخۆ.

٢- دوژمنایەتی سەدان ساڵەی قوڵی کۆچەر وجوتیارانی گەلی کورد لەگەڵ دام و دەزگای بێ کەڵك وبێ توانای تورك،بۆتە هۆی ئەوەی جیابوونەوەیان لە تورکیا (حەتمیە)و گەڕانەوەی بۆنییە.

٣- پرۆسەی جیابوونەوەیان هێند دوور ڕۆیشتووە کە لە ڕاستیدا چیتر کێشەی کوردی لە سنووری کێشەیەکی ناوخۆی تورکیا بردۆتە دەرێ.

٤- پرۆسەی جیابوونەوەی کوردەکان کە لە پێشتر رووسەکان گوێیان نەدەدایە و دایان پۆشی بوو، ئەمڕۆ لە لایەن ئینگلیزەوە پەرەی پێدەدرێت.

٥- پێوەندی زۆرباشی رووسیا و تورکیا، پاڵ بەکوردەکانەوە نانێ لەگەڵ ژێر چەپۆك بـوون و زۆرداری تورکەکاندا بگونجێن. بێگومان حیمایەی ئینگلیـز بـۆ کوردەکـان لـە چەوسـانەوەی کاربەدەسـتانی تورکیا زۆر بەسوودترە. بە پێچەوانەوە ئامۆژگاریمان بۆ کوردەکان تەنیا ئەوانمان لێ دووردەخاتەوە.

٦- یارمەتی یا پـشتوانی کردنـی کوردەکـان لـە لایـەن دەوڵـەتێکی بێگانـەوە، بـەم پێوەندییـە و هەڵوێستە پاسیڤیانەی ئێمە کوردەکان بۆ باوەشی ئینگلیزەکـان پـاڵ پێوەدەنێـت. ئەگـەر رووسـیا پشتیوانی لە کوردەکان نەکات دەچنە لای ئینگلیزەکان، لەبـەر ئـەوەی دەسـەڵاتی ئـەوانیان لـەهی تورکیا پێ باشترە.

٧- بە کوردستان و میزۆپۆتامیا و ئێراندا رێگای بازرگانی دەچـێتەوە هینـد کـە رێگـای چـوونی لەشکر بۆ ناو کوردستان و فارس ئاسانتر و لە لایەکی ترلـە ئـەوروپاو ئاسـیای ناوەڕاسـتەوە بـواری گەیشتنە ناوچە موسڵمان نشینەکانی رووسیا فەراهەم دەکات.بۆیە جێگیربـوون و پتـەوبوونی دەوری رووسیا لەم ناوچانە هەڕەشەیەکی جدییە بـۆ سـەر ئنیگلیزەکـان ومانـەوەی ئینگلیزەکـانیش لـەوێ مەترسی و هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ سەر رووسیا.

٨- رووسیا ناتوانێ لە سەقامگیربوونی ئینگلیزەکـان لـە کوردسـتان بێبـەش و تەماشاچـی بێـت. هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان پوازێکە لە قەفقاز دەدرێ و فارس لە پاشـکۆی تورکیـا جیادەکاتـەوە، بەم چەشنە دەبێتە پرد یان گۆڕەپانێکی باش بۆ هەموو چەشنە (ئۆپەراسیۆن)و چالاکیەکی ئینگلیز.

٩- ئەگەر رووسیا نەتوانێت چـالاکانە بجوڵێتـەوە لانـی کـەم پێویـستە پێوەنـدی دۆسـتانە لەگـەڵ کوردەکان ببەستێت و بەپێی توانا یارمەتی هەندێ لەسەرکردەکانی کورد بدات تالـە داهـاتوودا لـە خزمەتی ئێمەدابن، بەم چەشنە دراوسێی ئێمە ئەمجار تورکیا نابێ بەڵکو کوردستان دەبێت.(1)

(1) АВПР. ф ф 094 оп. 6 ПаП. 113 g.55 9р. 171-172

## له فەرانسیەوە وەرگێڕداروەتە سەر زمانی رووسی

**بۆ: ئەفسەر شاردی لی**

زۆر زەحمەتە لە چەند رستەدا بارووdۆخی کوردستان لە تورکیا و پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن پێش و پاش شەڕ لەلایەك و لە لایەکی ترەوە بەگشتی ئەو رووداوانە و پەیوەندیان بە یەکەوە... بنووسرێت. زۆر رووداو و فاکت هەن کە نابێ لە پێش چاونەگیرێن، چونکە کارێکی زۆریان کردۆتە سەر بارووdۆخی سیاسی و هەندێك ئامانجی ستراتیژی. بۆیە راپۆرتەکەمان دریژترە لەوەی پێشبینیمان کردبوو.

گەرچی بۆچوونەکانی ئێمە لەوانەیە هەندێ جار پێش داوەرانە، لایەنگرانە و مەبەستدار بێت، بەڵام دەتوانین بەڵێن بدەین ئەوانە راستن و بێ لایەنن وەك کارە هاوبەشەکانمان بێ لایەن و بێ مەبەست بوون....

بنەماڵەی بەدرخانیەکان لە سەدەی (١٣)وە بگرە تاهاتنی تورکەکان بۆ ناوچەکە دەسەڵاتداری کوردستان بوون، یەکێك لەو میرانە بەناوی (نەسرەدین) پارەی تایبەتی خۆی هەبووە و عانەی هەڵکەنراوی زێرو زیوی خۆی هەبووەو و تا هاتنی سوڵتان عەبدولمەجید بەردەوام بووە. میری بۆتان لەسەردەمەدا خوالێخشبووی باوکم بەدرخانی عەزیزی بووە. دەکرێ بڵێین لە تەواوی کوردستانی تورکیا و تەنانەت لەناو کوردەکانی ورمێ و سەلماسیشدا دەسەڵاتی هەبووە. لە ساڵی ١٨٥٠ سوڵتان عەبدولمەجید لە گەڵ بە دەستەوەگرتنی دەسەڵات لەشکری ئاناتۆلی بە سەرۆکایەتی وەزیر عوسمان پاشا و (١٥) هەزار سوپای ئەستەنبول بە سەرۆکایەتی عومەر پاشا( کە پاشان فەرماندەی سەرەکی و گشتی هێزەکانی تورك بوو لە شەڕی کەریم دژی رووسیا) ناردە کوردستان.

لە ئەنجامی شەڕ کە ساڵێك زیاتر درێژەی کێشا میری بۆتان بە دیل دەگیرێت و دەنێردرێتە (ئەستەنبۆل) لەوێ دەنێردرێتە دورگەی کریت. سوڵتان عەبدولمەجید بە شانازی ئەم سەرکەوتنە، میدالیای بەناوی کوردستان دروست کردبوو.

بۆ تەواوی بنەماڵەی بەدرخان، ڕۆشتن بۆ کوردستان یاساخکرا. لە سەردەمی شەڕی تورکیا و رووسیا لە (١٨٧٧) براکانی من عوسمان پاشا و حوسێن پاشا رادەکەنە کوردستان و لەوێ راپەرینیان دژی تورك بەرپاکرد، تەنیا لە سایەی ناوبژی کردنی براکەم (فەخری پاشا) کە عبدولمەجید دەینیرێت بۆ کوژاندنەوەی ئەم راپەڕینە، ئاشتیانە کۆتایی پێ دێت.

لە کاتی شۆڕشی تورکیا هەزاران ئەرمەنی و کورد کە زۆربەیان روناکبیری ئەرمەنی بوون لە کۆنفرانسێکا لە کەنیسەی خالیدی شۆغلی کۆدەبنەوە (دەکرێ بڵێم تەواوی ئەندامانی بنەماڵەی ئێمەش لەوێدا بەشداردەبن). هەردوولا سوێند دەخۆن کە پێکەوە ئاشتیانە و لە دراوسێیەتی یەکتردا بژین و گوێ نەدەنە پێشنیار و فروفێڵەکانی دەسەڵاتدارانی تورك و پێکەوە بۆ وەدەست هێنانی مافی پێشلکراویان خەبات بکەن.

سەرەڕای ئەم هەموو بەڵێنە باشانە، کۆمیتەکانی ئەرمەنی فریوی بەڵێنە درۆینەکانی تورکە گەنجەکان دەخۆن و خیانەتمان پێدەکەن و دەست لەنێو دەستی تورکەکان دەنێن و لە راپەڕینەکەی بەتلیسدا ئەرمەنیەکان پەنا بۆ والی بەتلیس دەبەن، تا بۆ دژایەتی کردنی کوردەکان چەکییان بداتێ. (٧٠٠) چەك وەردەگرن لەگەڵ تورکان پێکەوە هێرشیان هێنایە سەرمان. بەم چەشنە تاکەوتنی عەبدولمەجید و راگەیاندنی تورکیای دەستووری (یاسای بنەڕەتی)، هاتوچۆی ئەندامانی بنەماڵەی ئێمە بۆ کوردستان قەدەغەبوو.

من و دووبرام و یەکێك لە برازاکانم توانیمان خۆمان بگەیەنینە کوردستان تا بتوانین لەوێ کاربکەین بۆ گەڕاندنەوەی مافی خۆمان.

دوای گەشتێکی دوورودرێژ بە بۆتاندا ئێمە بە چاوی خۆمان ئەو تەنگ پێهەڵچنین و زۆرداریەمان بینی کە لە لایەن تورکەکان و کاربەدەستەکانیانەوە لە دانیشتوانی کورد دەکرێت و کوردەکان لە دڵەوە چاوی دیتنی ئەو زۆردارانەیان نەبوو.

کوردەکانی سەنجاق و ماردین بۆ ئەوەی نارەزایی خۆیان دەربڕن ئامادەنەبوون مالیات و باج بدەن و ژمارەیەکی زۆر لە موچە خۆر و فەرمانبەری تورکیان لە زۆر ناوچە دەرکرد.

لەم ماوەیەدا حوسێن پاشای برام کۆچی دوایی کرد و بزووتنەوەی کوردیش بۆ ماوەیەك راوەستا. کۆنسوڵی ئەڵمانیا لە موسڵ بۆ کوژاندنەوەی ئەم راپەڕینانە زۆر چالاکانە هاوکاری

تورکەکانی دەکرد، پاشان بۆ پڕۆپاگەندە لەبەرژەوەندی تورکان گەشتێك بە کوردستاندا دەکات منیش دەستوورم بەکوردەکانی خۆماندا هێرش بکەنەسەری، سەرئەنجام ناوبراو رووتدەکەن وئەویش بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە.

١٨-٣١ مارتی ١٩١٤ ڕاپەڕینی بەتلیس سەریهەڵدا کە لە لایەن ئێمەوە رێکخرابوو، بۆ یەکەمجار کوردەکان سەرکەوتن و بەشێکی بەتلیسیان گرت، بەڵام تورکەکان هێزی زۆریان لە مووش و وانەوە هێنا، کوردەکان نەیانتوانی بەرامبەر بەرەشاش و تۆپی ئەوان راوەستن، راپەڕینەکە سەرکوتکرا و چەند سەرکردەی کوردیش لە بەتلیس لەسێدارە دران. برازای من سلێمان بەگ لە کاتی گرتنی گوندی شاك (ثاك) لە ٣٥ کیلۆمەتری جەزیرەی ئەبی عومەر دەکوژرێت، منیش لە سگێرت گیرام و نێردرام بۆ بەیروت و بە کەشتی(میساژیر مارتین) ناردرام بۆ ئەستەمبوڵ، ئمیزایان لێ وەرگرتم تا بەبێ مۆڵەتی دەوڵەتی رووسیا تەحویلی دەوڵەتی تورکم نەدەن ئەستەمبوڵیش بە هەوڵی سەفارەتەکانی رووسیا و فەڕەنسا منیان نارده (ئۆدیسا) لەوێشەوە لە سەرەتای مانگی تەموز هاتمە تیفلیس.

بەنیازبووم لە تیفلیس بە یارمەتی رووسیا راپەڕینێکی نوێ لە کوردستان بخەمە گەڕ،بەڵام لەبەر رێککەوتنی تەلعەت بەگ و ئیمپراتۆر نیکۆلای دووەم، لەسەرەتای ئامادەکردنی پلانی راپەڕینێکی گەورە بەهاوکاری من و برازاکەم عەبدولڕەزاق بەگ و شێخ بەرزان لەناوخاکی ئێراندا گیرام. چونکە ئیمپراتۆر تەلعەت پاشا دڵنیا دەکات دەرفەتی چالاکی دژی تورکیامان پێنادات، منیش ناچار لە سەرەتای شەڕی رووسیا و تورکیاوە دەستمکردەوە بە کاری خۆم. دەوڵەتی تورکیا ئەوەی لە توانای دابووبێت وەکاری خستوە تا نەهێڵێ دانیشتوانی (٧) حەوت ملیۆنی کوردستان پێشکەوێت، لەبەر ئەوە چینی ڕووناکبیر زۆر کەمە.

سەرەڕای ئەوەش لەناو جەنڕاڵ و سەفیر و ئەفسەرانی گەورەی تورکیا، لەناو فەرماندار و پارێزەر و ئەندازیارەکان کوردمان هەیە. لە شارەگەورەکانی تورکیا کۆمەڵێکی زۆر کورد هەن کە لە دەرەوە خوێندنیان تەواو کردووەو کەم تا زۆر خەڵك فێری زانیاری و زانست دەکەن.

لەناوکۆمیتەکان دەتوانم ئاماژە بە کۆمیتەی پاریس بە سەرۆکایەتی ژەنراڵ شەریف پاشا بکەم و هەروەها کۆمیتەی تایبەتی لە (جنێف) هەیە کە بە زمانی کوردی رۆژنامەی کوردستان چاپ دەکات. ئەو ئەفسەرە کوردانەی سوپای تورکیا کە بە دیلی گیراون و هێنراونەتە تیفلیس پێیان

وتم لە شارە گەورەکانی کوردستان تەنانەت لە ئەستەمبولیش کۆمیتەی نهێنی کوردەکان هەیە کە ئەفسەرەکان سەرکردایەتییان دەکەن.

من دەتوانم بەپارێزیەوە لەسەر پەیوەندییەکانی ئەرمەن و کورد،پەیوەندی کوردەکان لەگەڵ رووسیا لە کاتی شەڕدا بدوێم، لەبەر ئەوە ناتوانم بەوردی بڵێم لەناوخۆی ولات و تێکڕای بەردی قەفقاز چی روودەدات. ئێمە لەناو شانۆی روداوەکانی شەڕدا بووین و ئەو دەنگوباسانەی (بارەگای سەرکردایەتی شەر) وەری گرتوون دوور بووین.

پێش هەموو شتێك پێویستە کە کوردەکان بکەینە دوو بەش یان دوو دەستە: کوردی ویلایەتەکانی وان و ئەرزەرۆم و سەنجاقی موش، کوردی ویلایەتەکانی بەتلیس و موسڵ و دیاربکر. کوردەکانی ویلایەتی خارپۆت -قزڵباشەکان- دەستەیەکی تایبەتی پێکدێنن.دیارە ئەم دابەش کردنە بەپێی بناغە یان تایبەتمەندییەکی پتەو نییە. بۆ ئاسانترکردن، کوردەکانی باکوور بەدەستەی یەکەم و وکوردەکانی باشوور بە دەستەی دووەم دادەنێن. پێش ئەوەی بێینە سەر باسی رووداوەکان دەبێ هۆکانی ئەو پەیوەندییەی ئێستای کورد و ئەرمەن بزانین کە بۆتە فاکتەرێکی گەورە لە کوردستان. ئەو بۆچوونەی گوایا کوردەکان دوژمنایەتی ئەرمەنیان بەمیرات بۆ بەجێ ماوە، راست نییە. دژایەتی کردنی ئەرمەن دوای کۆنگرەی بەرلین دەست پێ دەکات، کە لەوێدا ئەرمەنیەکان هەوڵ ئەدەن ئۆتۆنۆمی بۆخۆیان دابمەزرێنن، تا ئەو دەمە ئەرمەنەکان وەك گەلانی تر لەگەڵ کوردەکان پێکەوە بە ئاشتی ژیاون، لە دەست کوردان نەزۆر و نەکەم زیانیان پێ نەگەیشتووە، ئەوان هەمیشە لە خرمەتی کێشەی ناوخۆی بەگە کوردەکان دابوون. دانیشتوانی مەسیحی کە بە هۆی کاری کشتوکاڵی بە بەگە کوردەکانەوە بەسترابوونەوە وەك خاڵێکی لاواز زیانی پێ دەگەیاندن،بۆ نموونە هێرشی مەسیحییەکانی سەر بە بەگی کورد کە دژی بەرژەوەندی بەگەکانی تری کوردستان بوون،بۆ ئەوان زیانبەخش بوو لە هەمانکاتیشدا لە کوشتاری کوردان بێ بەزەیی بوون و کەمەترخەمیان نەکرد. ئەم بەسەرهاتە خەماویانە تراژیدیای تێکڕای ئەو دانیشتوانە بوو کە لە لایەك پارێزگاری لێ دەکراو لەلایەکی تر هێرشی دەکرایەسەر.

دوای گۆنگرەی بەرلین سولتان عەبدولحەمید مەترسی بەسەرهاتی ناوچەکانی ئەنادۆڵی کردە بیانوو، دەستی دایە گرتن و راوەدوونانی ئەرمەنییەکان، کە کۆمیتەی ئەرمەنی (داشناك

سوتون) زۆرتر هانی دابوون. بۆ بەرەنگاری، پێ داگری و داواکاریی ئەرمەنییەکان (واتە، ئۆتۆنۆمی، وەرگێڕ) کەڵکی لەکوردەکان وەرگرت کەلایان وابوو ئەرمەنییەکان دیانەوێ کوردستان داگیربکەن و کوردەکان دەربکەن. تورکەکان تاکە رووداوێکیان لە دەست نەداوە کوردەکانی لە دژی ئەرمەن پێ هان نەدەن، لە هەموو شتێك کەڵکیان وەرگرتووە. هەر کەس بە پێوەندیی پەرەسەندنی کێشەی ئەرمەن و کوردەوە چووبێت، دەبێ دان بەوەدا بنێ دوژمنایەتی ئەرمەن و کورد لە مێژنییە پەیدابووە،ناسرووشتیانەو دەستکردە، کە لە لایەن و بە پشتیوانی کۆمیتەکانی ئەرمەنی و لە سەرەوەی هەموویان (داشناك سوتونەکان) دروستکراوە. ئەرمەنییەکان خۆیان کۆمیتەکان تاوانبار دەکەن و دەڵێن تەواوی ئەم کوێرەوەری و بەدبەختیە ئەم کۆمیتانە بە سەریاندا هێناوین، راستیەکەشی هەر ئەوەیە. دەکرێ بڵێم زۆربەی ئەو کوردانەی باکور کە لە ژێر دەسەڵاتی تورکدان، لە ژێر کارلێکی بیرۆکراتیەتی تورك ورەیان بەرداوەو وەك چەك یان داردەست بەکاریان دەهێنن، زۆربەیان چوونە ریزی سوپای حەمیدی و تورکەکان بۆ لەناوبردنی ئەرمەنەکان کەڵکیان لێ وەرگرتوون. کەچیسەرەڕای ئەمەش کورد تورکیان هەرخۆش ناوێ. سەرەتای دەست پێ کردنی شەڕ، کورد هیچ جمووجۆڵێکی دژی (ئەرمەنییان) نەبوو چ بگابە ژن و منداڵیان و راپەڕینی دژی ئەرمەنی. تەنیا دوای هێرشی پاسەوانە خۆداخوازەکانی ئەرمەن بوو کە هەرچی ژن و پیاو و زەوی و زاری کوردەکان بوو دڕندانە لەناویان برد،کوردەکانیش ناچار دژی ئەرمەن ڕاپەڕین. دوای دروستبوونی پاسەوانانی خۆداخواز، دەوڵەتی تورك بڕیاری لەناوبردنی ئەرمەنەکانی داو جێبەجێشی کرد، بەتایبەتی پاش راپەڕینەکەی (وان) لێدانی ئەرمەنیەکان دەستی پێکرد.

لە سەرەتای شەڕ کوردەکان هەڵوێستیان بەرانبەر بە رووسیا زۆرباش بوو. لە شەڕەکانی پێشوودا رووسەکان بە باشی لەگەڵ کوردەکان دەجولانەوە و هەر بۆیە کوردەکانیش لایان وابوو رووسەکان وەك رابردوو مامەڵیان لەگەڵ دەکەن. سەرەتای شەڕ ژمارەیەکی زۆر لەسوارەکانی حەمیدییە بەسەرۆکایەتی رەسوڵ بەگ، حەمید بەگ وئەیوب پاشا هاتنە ریزی ئێمە. بە داخەوە ئەم ئەفسەرانە و تەواوی ئەوانەی هاتبوونە ریزی ئێمە، کەوتنە بەر کرداری ناپەسەندانە، ناموسییان برا،ماڵ و سامانیان تالان کرا، ئەمەش بەڵگەیەکی بچووك بوو بۆ نەهاتنی ئەوانی تر. حەسەن بەگ، بەگی گەورەی عەشیرەتی بە هێزی خەرتووش کە لە سەرەتای شەڕ خۆی تەسلیمی رووسەکان دەکا، بێ ئەدەبانە لەگەڵی دەجولێنەوە و سوکایەتی پێ دەکەن.ناوبراو

رادەکات و دوایی بوو بە دوژمنێکی سەرسەختی رووسەکان.ئەرمەنەکان لەشکری رووسیا هان دەدەن و بە فیتی ئەوان زولْم و زۆر و دەستدرێژی زۆر دەکرێتە سەر کوردەکان. دەسەلاتدارانی تیفلیس ئەوەدەمە لە ژێر کارتێکردنی ئەرمەنییەکان بڕیار دەدەن کە نابێ هیچ پەیوەندییەك لەگەڵ کوردەکان هەبێت و پێویستە هەموویان لەناو ببرێن، ئاشکرایە سەرکردەکانی لەشکریش هەر لە ژێر ئەم کارتێکردنانە بوون. لە لایەکی ترەوە، ئەرمەنییەکان لەناو لەشکری رووسیا لەهەر شوێنێك بووبن زۆرتر، هەم لەناو ئەفسەرکاندا و هەم لە ئاستی چینەکانی خوارەوە تۆی دژایەتی کوردیان چاندووە. سیستەمێکی پیلان گێڕیان دروستکردبوو تا سەربازەکانی لەشکری رووس دژی کوردەکان هان بدەن و بە ئامانجی خۆشیان گەیشتن. کوردەکان هیچ بەزەییەکییان لە سوپای رووس نەدی و دەبوایە نائومێدانە و بێ باکانە تامردن شەڕیان لەگەڵ بکەن.

دەکرێ بڵێین بارودۆخی کوردەکان لەناوچەکانی شەڕ بەم چەشنەبوو: کوردەکان لە ترسی ئەوەی کە دەیانزانی دەیانکوژن و سەروسامانیان بەتالان دەچێت و ئەرمەنییەکان یان سەربازەکان بەدەسکیسی ئەرمەنییەکان ژنەکانیان ئەتك دەکەن و دەستدرێژیان دەکەنەسەر، نەیاتوانیوە یان نەیانویستووە خۆبەدەستەوە بدەن، ئەگەر بەرانبەر بە هێزی رووسیا پاشەکشەش بکەن دانیشتوانی موسڵمان لە لایەن ئەرمەنەکانەوە بە کۆمەڵ لەناودەچن.

سەرەڕای ئەوە تا ئێستاش ئەرمەنییەکی زۆر هەن کوردەکان پەنا و حەشاریان داون. لە کاتێکدا تاکە کوردێك شك نابرێت کە لە لایەن ئەرمەنیەکانەوە رزگارکرابێت. دەبێ کە ئەو فاکتە بە درۆنەخراو و باوەڕپێکراوانەش بگوترێت لەمەڕ ئەو ناوچانەی تورکیا کە کوردییان لێ نییە. ئەرمەنەکان لەناوچوون لە کاتێکا لەناوچە کوردنشینەکان تەنانەت لە باکوورشیدا ئەرمەنییەکی زۆر لە لایەن کوردەکانەوە رزگارکراون و لەناوچەکانی باشوور تەنانەت براکەم حوسێن بەگ لە خزیخی نێوان جەزیرە و میدیت، مەسیحیەکانی پاراست و دژی تورکیا راوەستا. تەواوی ئەو هێزی تورك کە نێردرابوونەسەری بە مەبەستی خۆیان نەگەیشتن.

تەنیا بە هاتنی شازادەی گەورە نیکۆلا نیکۆلایویچ بۆ قەفقاز سیاسەتی کوردی رووسیا گۆڕاوە. ئەویش بەداخەوە لە سەرەتادا ئەم گۆڕانە تەنیا لەسەر کاغەز بوو چونکە رق و قین بەرانبەر بە کورد زۆر بەناو لەشکری رووسیادا رۆچووە و کاری تێکردووون. دواتر کە کارەکە دەستی پێکرد

و بەرەوپێش دەچوو دەکرا ببێتە جێگای هیواو ئومێد، کۆدەتا بەرپا بـوو (مەبەسـت شۆڕشـی ئۆکتۆبەری ١٩١٧)ەیە.

کوردەکانی باشوور جیاوازیەکی زۆریان (لەمبارە) لەگەڵ هاولاتیـانی بـاکووری خۆیـان هەیـە، ئەوانە زۆر کەم کەوتونەتە ژێرکارتێکردنی تورکەکان و بۆیە سەربەخۆتر و جـەنگاوەرترن بـیری نەتەوایەتی و خەباتی خۆیان بۆ سەربەخۆیی پاراستوە. داخی تورکانیان زۆر لە دڵدایە.

دەکرێ کوردەکانی باشووری کوردستان بکەین بە سێ بەش: کوردەکانی رۆژئـاوا یـا دەسـتەی رۆژئاوا واتە کوردەکانی موسڵ، سلێمانی، کەرکوك و رەوانـدوز و هـەرکی کـە زۆربـەیان دژی رووس و لایەنگری شێخ عەبدولقادر (سیناتۆری تورکیا) کـوڕی شـێخ عوبەیـدولای شـەمزینی بەناوبانگن. بەڵام لە کانوونی دووەمی ئەمساڵ کوردێکی ئەفـسەری خـەڵکی سـلێمانی خـۆی دەگەیەنێتە رووسەکان بۆ ئەوەی وەك نوێنەری سلێمانی بۆ وتووێژکردن چاوی بە من بکـەوێت. بەڵام منی نەبینی، ناوبراو ئێستا لەناو ئەفسەرە دیلەکانی تورکیایە.

**دەستەی ناوەڕاست (ناوەندی):** کوردی بۆتان کە شوێنی پاشایەتی و دەسەڵاتداری بنەماڵەکەی ئێمە عەزیزی (بەدرخان) بووە. بنەماڵەی عەزیزی هەمیشە چاویان لە رووسیابووە بەو هیوایەی ئەم ئیمپراتۆریە دژی تورك پـشتیوانیان بکـات. بـاوکی خوالێخۆشـبووم بـەدرخان عـەزیزی و یەزدانشێری برازای بەوتەی شازادە شاخۆفسکی: بە نووسین پێـشنیاریان کـردووە دژی تورکیـا ئامادەی هەر یارمەتی و خزمەتێکن بۆ دەوڵەتی رووسیا.

تەواوی بۆتان دەیەوێ لە ژێـر چـەپۆکی تـورك رزگـاری بێـت، بنەماڵەکـەی ئێمـەش دەیـەوێ بگەڕێتەوە سەر شوێنی باوباپیرانی.تا ئێستاش جێگای وا لە بۆتان هەیە کـە تورکـەکان پـاش هێرشەکەی ئۆمەر پاشاش دەستیان پێی رانەگەیشتووە.

**دەسـتەی رۆژئـاوا:** کوردەکـانی دیاربـەکر (کـە زۆر شـەڕکەرن)، مالاتیـا، ئۆرفـە و دواتـر دەستەیەکی جیاواز هەن کە کوردەکانی دەرسیمن.

ئەمانەم هەموو باس کرد ئینجا دێمە سەر رووداوەکان، دوای راگەیاندنی شەڕ لە لایەن تورکیا، ژەنەڕال میشەلۆڤسکی بانگی کردم تا بە دەستووری ڤارەنتسۆڤ داشکۆڤ حاکمی قەفقاز بمنێرێتە بارەگای ئاباتسیف تا کوردەکان بۆ لای رووسیا راکێشم و دژی تورکیا هانیان بدەم راپەڕن. کە

گەیشتمە (قەرەکلیس) دەستم بە کاری خۆم کرد و سەرکەوتنیشم بەرچاو بوو، بەڵام ئەرمەنییەکان کە ئاواتیان لەناوبردنی کوردەکان و گرتنی ناوچەکان بوو،بۆ ئەوەی زەمینەی ئەرمینیای داهاتوو ئامادەبکەن، هێرشیان کردەسەر دانیشتوانی بێ تاوان و تالآنیان کردن، دەست درێژیان کردە سەریان و تەنانەت منداڵیشیان دەکوشت. ئەم تالآن و کوشت و بڕە هەم لە لایەن ئەرمەنەکان، هەم لە لایەن سەربازانی سوپای رووسیا کە بە پڕۆپاگەندەی ئەرمەنییەکان هاندرابوون تا ئێستا بەردەوامە.

ئەو کوردانەی خۆیان بە دەستەوەداوە لە هەموو ماف و دادپەروەرییەك بێبەش کراون و لەناوچوون. لەباتی ئەو پشتیوانیەی لە رووسیا چاوەڕوانیان دەکرد، تووشی گەورەترین کوێرەوەری و بێ بەزەیی و زۆرداری بوون. لە گرتنی ناوچەکاندا یارمەتییەکی هەمە لایەنەی مەسیحییەکانیان دا، کەچیکوردە هەژارەکان ئەوە سی ساڵە ناوێرن خەلەوخەرمانی خۆیان کۆبکەنەوە، بە تەواوی وەلانراون و دەکرێ بڵێم رووت و برسی و لە سەرماوسۆڵەدا دەمرن.

سەرەڕای ئەو نیازەباشانەی دەوڵەتی رووسیا و نیازباشیخۆم لەبارووددۆخێکی ئاوا ناتوانم ئەرکەکان بە جێبگەیەنم و ناچار بووم واز لە کارەکەم بهێنم و بگەڕێمەوە بۆ تیفلیس. (لە سەرەتای شوباتی ١٩١٥) بە هاتنی شازادەی مەزن نیکۆلای نیکۆلایویچ بۆ قەفقاز سیاسەتی کوردی لە تیفلیس گۆڕا. شازادەی مەزن بە ژیری و تێگەیشتوویی خۆی زانی ئیش و کارەکەی ئێمە چەند گرنگە،واتە ئەگەر هاتبا و هەستی کوردەکانمان بەرەو لای خۆمان راکێشابا و لە تورکمان دابڕیبان.... بۆ رووسیا زۆر گرنگ بوو. ناوبراو بڕیاریدا جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە گرنگە بە ئەستۆی من و شاخۆڤسکی و بسپێرێت، ئەم دەستوورانەی خوارەوەی نیشانەی ئەوەیە کە بە باشی لەم کێشەیە تێگەیشتووە، ئەم بڕیارە تا ئێشتاش لە جێی خۆی ماوە: رووسیا هیچ نەتەوەیەك بە باڵا دەست نازانێت، تێکڕای ئەو گەلانەی لەگەڵ رووسیا نیازپاکن مافی یەکسانیان هەیە لە دادپەروەری و پاراستنی خۆیان. خوێنێکی زۆری کورد و ئەرمەن بەبێ ئەوەی هیچ قازانجێکی بەدواوە بێت رژاوە، دەبێ کۆتایی بەو کێشانە بهێنرێت. دەبێ ئەم دوو گەلە وەك رابردوو لە داهاتووشدا پێکەوە بە ئاشتی بژین. بۆیە بە کۆتاییهاتنی شەڕ ئەو دوو گەلە دەبێ پێکەوە بژین دەبێ هەر لەئێستاوە دەستدرێژی کردنە سەر یەکتر کۆتایی پێ بێت، ئەگەر کەسێك ئیجازە بە خۆیدات و دژی لایەنەکەی تر بجولێتەوە چ کورد بێت چ ئەرمەن بە

توندی سزا دەدرێت. تـەنیارێگای ئاشـتی نێـوان ئـەو دوو گەلەئەوەیـە دەرفـەتیان پێبـدرێ بگەڕێنەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆیان. هەروەها ناوبراو بەلێنی ئەوەشی بە کوردەکانـدا کـە لـە داهاتوودا ئۆتۆنۆمیان هەبێت بەلاّم هیچ بەلێنێکی کۆنکریتی نـەبوو، گوایـە ئـەوە پێویـستی بەرێککەوتن لەگەلّ دەولەتانی هاوپەیمان هەیە.

بەلاّم بەلێنیدا لە کوردەکان لە دەست درێژی تورك بپـارێزێ و لـە بەسـتنی پـەیمانی ئاشـتیدا بەرگری لە بەرژوەندی کوردەکان بکات، وەلێ ئەرمەنییەکان هیچ هەنگاوێکیان بـۆ چارەسـەری کێشەکە هەلنەگرت و گوێیان نەدایە ئەو بانگەوازە. ئەرمەنییە شۆڤینیەکان بۆ تۆلەسـەندنەوە داوای لەناوبردنی کوردەکانیان دەکرد، یەکـسەرکەوتنە درووسـتکردنی گـیرو گرفـت لەبـەردەم جێبەجێ کردنی ئەو بەلێنانە.

ئەوانە توانیان دژی ئێمە و بەتایبەتی دژی شازادە شاخۆڤسکی ( شەڕێکی ئاشتیانە) واتـە نـە شەڕ و نە ئاشتی رابگەیەنن. ئەوەی لە دەستمان هات بۆ پاراستنی ئەرمەنییەکان بەتایبـەتی و بە گشتی مەسیحیەکانی دانیشتووی کوردستان کردمان وکەم تەرخەمیان نەکردووە.

ئەوان باش دەیانزانی بە ئیشارەیەکی بچووکی من ئەو ئەرمەنیانـەی لـە بۆتـان و ناوچـەکانی دەوروبەری شاردراونەتەوە بە کۆمەلّ لەناودەبرێن. خۆ ئەگـەر کۆدەتـا نەبوایـە سـەرەڕای ئـەو هەموو پروپاگەندەی هاوینی سالّی پێشوویان کارەکانمان سەرکەوتوانە جێبەجێ دەکـرد. ئەگـەر ئاژاوەنانەوەی ئەوان نەبوایە ئێمـە لـە هـاوینی (١٩١٦) دەسـت کـەوتی زۆر باشمـان دەبـوو؛ کردەوەکانی ئەوانە کۆسپی زۆریان خستەسەر رێگامان. سێ جار شاخۆڤسکی هەولّی پێك هاتن و وتووێژی لەگەلّ ئەرمەنییەکان دا منیش لە (وان) بەشداری ئەو هەولاّنەم کرد و پیشانمدا کـە من هیچ مەبەستێکی دژی ئەرمەنیم نییە و تەنیا دەمەوێ هاوکاری بەرەو پێش چوونی چالاکی لەشکری بکەم، کەچی بێسوود بوو، ئەوانە بە کـەڕولاڵی مانـەوە و گوێیـان نـەگرت. هـاوینی (١٩١٥) برازاکەم عەبدولڕەزاق کە پەنابەر بوو لە رووسیا هەولّی دابوو دەستی بگاتە بۆتان بۆ ئەوەی دژی تورکەکان راپەڕینێك رێکبخات. هەولّدانەکەی سـەر ناگرێـت لـە لایەکـەوە لەبـەر ئەوەی کە بە باشی چەکدار و ئامادەنەکرابوو و لە لایەکی تر کۆمیتەی ئەرمەنییـەکان لـە (وان) لەسەر رووباری بۆتان دەوەستن ولەپەڕینەوەدا پێشی پێدەگرن،کە ئەرمەنییەکانیش دەیانەوێ پردی

رووباری بۆتان دروست بکەن عەبدولڕەزاق ناهێڵێت، چونکە کاتی خۆی عەبدولرەزاق ویستی بە پارەی خۆی دروستی بکا، نەیانهێشت.

لە تشرینی دووەمی (١٩١٥) شازادە شاخۆڤسکی چاوی بە نوێنەرانی بۆتان دەکەوێت کە بەدوای مندا دەگەڕێن بۆ ئەوەی لە ڕێگای منەوە پەیوەندی بە رووسیاوە بکەن. شاخۆڤسکی کە لەو کاتەدا لە لایەن شازادەی مەزنەوە کاروباری کوردستانی پێ رادەسپێرێت، راپۆرتێك دەنووسێت کە پێویستە چی بکرێت و چ هەنگاوێك لە کوردستان هەڵبگیرێت.

شازادەی مەزن دەستوور دەدا لەگەڵ من دەست بەکاربێت. لەم کاتەدا (بەتلیس) لە لایەن لەشکری رووسیاوە داگیر دەکرێ، لە ڕێگای بەتلیسەوە پەیوەندی بە کوردستانی باشوورەوە ئاسان دەبێ و ئێمەش دەستبەجێ رۆشتین بۆ ئەوێ.

بەداخەوە لەشکری رووسیا نەیتوانی لە (بەتلیس) دەربچێت. بۆیە ئێمەش نەمانتوانی پەیوەندی بە کوردستانی باشوورەوە بکەین. بەڵام ئێمە لە دەشتی (موش) و ناوچەکانی موتکی و خوتیا دەست بەکاربووین.

کاروباری ئێمە تابلێی سەخت و دژوار بوو ئەویش لەبەر دوژمنکاری ئەرمەنییەکان بەرانبەر بە ئێمە و کردەوەی ئەو ئەرمەنە چەکدارانەی کە دەست درێژیان دەکردە سەر دانیشتوان.

بەشێکی زۆر لەو کوردانەی دانیشتووی ئەو ناوچەیە کە نەیانتوانیبوو یا فریای ئەوە نەکەوتبوون لەگەڵ تورکەکان هەڵبێن، لە لایەن چەکدارە ئەرمەنییەکانەوە کوژران.

کەچی دانیشتوانی کوردو موسڵمانی (بەتلیس) نەك هەر بەشداری ئەو کوشتارەیان نەکرد کە جەندرمەکانی تورکیا دەرهەق بەئەرمەنییەکان ئەنجامیان دا،بەڵکو هەرچی لەدەستیان هاتبوو کردبوویان تا ئەرمەنییەکان داڵدە بدەن و بیان پارێزن

دانیشتوانی ئەو ناوچانە زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێکردم و پروپاگەندەکانی منیان سەبارەت بەداهاتووی کوردستان بە هەستەوە وەرگرت. کوردەکان پێیان ڕاگەیاندم ئەگەر بنەماڵە و سەروسامانیان بە تەواوی بپارێزرێت (گەرەنتی بکرێن)، لە لایەن ئەرمەنییەکانەوە دەست درێژیان نەکرێتەسەر، وەك ناوچەی (موش) وشوێنەکانی تر بێ بەزەییانە کۆکوژ نەکرێن ئەوا ئامادەن لەگەڵمان بن،بەڵام ئێمە نەمانتوانی ئەم گەرەنتیە بدەین. شازادە شاخۆڤسکی هەر چۆنێك بێت

توانی هەندێ هەنگاوی باش هەڵگرێت، ژمارەیەك كوردی (بەتلیس) بۆ تاقیكردنەوە بڕیـار دەدەن خۆیان بە دەستەوە بدەن، دەچنە گوندەكان و چەكەكانی خۆیان تەسلیم دەكەن و لە هەمانكاتدا لە زۆربەی ناوچەكان پاراستنیان گەرەنتی دەكرێت.

ئەوانە ئەوەندە بەڵێن وگەرەنتی خۆیان رەچاو دەكرد،كـە لـە ١/١٤ دارودەسـتەی حـاجی موسـا دەیانەوێت هێرش بكەنە سەر (چۆ گۆر خۆرشین) ئەوان ناهێڵن. ئـەم كردەیـە لـە كـاتی هێرشـی توركەكان بۆ (بەتلیس) كە مەترسی لەوە دەكرا (بەتلیس) لە دەست بـدەین، دووپـات كرایـەوە. بەڵام ئەنجامەكەی دیسانەوە خەماوی بوو. كوردەكان پێش ئەوەی فریای خـۆ قـایم كـردن بكـەون ئەرمەنییەكان هێرش دەكەنە سەریان و تالاًینان دەكەن، ئەوانیش هیچ شوێنێك شك نابەن پـەنای بۆ بەرن. ئەرمەنییەكانیش كە بێ سزا دەمێننەوە، بەبێ هیچ تەگـەرە و كۆسـپێك دەجولێنـەوە. بۆیە هەر بە دەرچوونی ئێمە،كە ناچار بووین (بەتلیس) بە جێبهـێڵین، بەشـێكی زۆری كوردەكـان دووبارە ناچار دەبن بۆ پاراستنی گیانی خۆیان پەنا ببەنە بەرچیاكان. لەبـەر ئـەوە لـە (بـەتلیس) هیچ كارێكمان بۆ نەكرا و نەمانتوانی لەوێوە پەیوەندی بە باشوورەوە بكەین.

دەنگوباسی گرنگ و باشمـان لـە بۆتانـەوە بـە دەسـت گەیـشت. بـە (شـاتاخ-وان)دا گەڕاینـەوە (تیفلیس) تا راپۆرت پێشكەش بكـەین و خۆمـان ئامادەبكـەین و ئینجـا بـڕۆین بـۆ (وان)، تـا لەوێشەوە بە (شاتاخ)دا بڕۆینە بۆتان. ئەمجارەیان باش چەكدار كرابـووین، ئێمـە سـەدان قـەزاق و ژمارەیەك كورد و ئاشوری بۆتانمان لەگـەڵ بـوو. لـە ١ی تـەموزی (١٩١٦) گەیـشتینە (وان) و لەوێوە شاخۆڤسكی رۆیشت بۆ (بەتلیس). ناوبراو لـەوێ دەبـینێ زۆربـەی كوردەكـانی ناوچـەی (چوفری) و (پۆرشین) هەڵاتوون بۆناو شاخەكان تا لە دەست درێژی ئەرمەنییەكان خۆیان بپـارێزن، لەولاشەوە كوردە چەكدار و باشەكانی موتكی هاتنە (بەتلیس) و هاتنە كەشیان بـە تایبـەت بـۆ لای من بوو، بێ ئۆقرە چاوەڕێی هاتنی منیان دەكرد. لەبەر ئـەوەی هەرچەشـنە چـالاكییەك لـە بەتلیس بێ كەڵك بوو تەنیا بە فیرۆدانـی كـات و پـارەبوو، لـە (وان) كـارێكی باشـتر چـاوەڕێی دەكردین، شاخۆڤسكی لەوێ هیچ پەیوەندی و وتووژێكی لەگەڵ كەس نەكرد و گەڕایەوە بـۆ (وان) و لە ناوەڕاستی مانگی تەموز رۆیشتین بۆ (شاتاخ) كە لە لایەن هێزەكانی ئێمـەوە داگیركرابـوو، لەوێوە پەیوەندیمان بە باشـووری عەشـیرەتی زۆر بـە هێـزی خارتوشـی بـاكووری بۆتانـەوە كـرد، هەموویان كەوتنە ژێر دەستی من و بەڵێنیاندا ئامادەن لەگەڵم بـێن و هێزێكـی زۆر رێـك بخـەن.

بڕیار بوو لە٢٧-٢٨ تەمووز سەرۆك عەشیرەتەكان بۆ ڕاویێژ بێنە شاتاخ بۆ لای من، لە راستیدا ئەوان لە كاتی دیاریكراودا هاتن بەڵام ئێمە ئیتر لەوێ نەمابووین.

توركەكان بەتلیسیان گرت و هەڕەشە و مەترسیان خستەسەر وان، لەشكری رووسیای نێوان شاتاخ و وان بانگ كرابۆوە وان و ئێمەش لە ١٤ی تەمووز داواكراین بگەڕێنەوە.

جێی سەرسوڕمان نییە كە بڵێین توركەكان لە سایەی ئەرمەنییەكان بەتلیسیان گرتەوە. هەر كە پیاوەكانی خۆمان لە بەتلیس ئاگاداریان كردین، كوردەكان دوای كەوتنی ئەم شارە هاتنە لام. كوردەكانی خەزات و شێروان بە هاتنی من بۆ بەتلیس لەسەرەتای مانگی تەمووز نوێنەرانی خۆیان ناردبووە بەتلیس تا وتوویێژم لەگەڵ بكەن. ئەو نوێنەرانە كە پیاوماقووڵ و هەرە ناودار بوون، چەكدارەكانی( ئاندارنیك و ئاما ئاسك)دەیانگرن و دەیانكوژن. كوردەكانی (خەزان و شێروان) كە تا ئەو كاتە هیچ چالاكییەكیان دژی بەتلیس ئەنجام نەدابوو، بەبیستنی ئەم رووداوە دەچنە لای فەرماندەی هێزەكانی تورك و دەڵێن ئامادەن لەبەرەی چەپی هێزەكانی رووس كە ئەرمەنییەكانن، شەڕ وەئەستۆ بگرن،تا تۆڵەی خۆیان لە ئەرمەنییەكان بكەنەوە. بەم چەشنە پاشەكشێ بە هێزی رووسیا لە بەرەی چەپ دەكەن. تۆڵەیەكی بێ بەزەییانە لە ئەرمەنییەكان دەكەنەوە زیانێكی یەكجار زۆریان پێدەگەیەنن. ئەمانە چارەنووسی بەتلیسیان دیاریكرد. دوای ئەمە شێروانیەكان دەگەڕێنەوە ماڵ و دووبارە دەست بە جووڵانەوەی دژ بە توركیا دەكەن و هێرش دەكەنە سەر ترانسپۆرت و دەستەیەكی سەربازی. هەرچەندە كارەكەی ئێمە بەردەوام نەبوو بەڵام بێ بەرهەمیش نەبوو، من گەیشتمە ئەو باوەڕە كە تەواوی بۆتان تەنانەت خارتوشیش لەگەڵ من دەبێ. كوردەكان ڕێگاكەیان بەستبوو، ئەوەی بەلامەوە گرینگ بوو ئەوە بوو ئامادەبوون رووسەكان وەربگرن بە مەرجێك ئەرمەنییان لەگەڵ نەبێ. من بزاوتیكی بەهێزی پرۆپاگەندەم لەم بەشەی كوردستان وەگەڕ خستبوو. كوردەكان كۆسپ و كێشەی زۆریان بۆ هاتووچۆ و پەیوەندی توركەكان دروست كردبوو و هێرشیان دەكردە سەر پێگە و كەرتەكانی سوپای تورك.

پێوەندی و هاتووچۆی نێوان بەتلیس و بۆتان بەهۆی كوردەكانە هێندە سەخت بوو توركەكان ناچار بوون بەشێك لە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بگوازنەوە و هەنگاوی سەركوتكارانەش دژی كوردەكانی بۆتان هەڵگرن و ژمارەیەكی زۆریش لە سەركردە كوردەكان لەسێدارە بدەن.

کوردەکانی ناو سوپای حەمیدییە هەڵدێن و چەکیش لەگەڵ خۆیان دەبەن. هاوینی (١٩١٦) کوردەکانی بەتلیس و موش (بیلیس-مۆتسکی) جگە لە کوردەکانی حاجی موغان بەگ هیچ بەشداریەکیان لە شەڕی دژی هێزی ئێمە (واتە ڕووس) لەتەك سوپای تورکدا نەکردبوو و ئەمەش لە سایەی سەری منەوە بوو لەم ناوچەیەدا.

کوردە هەڵاتووەکانی ئەو ناوچانەی ژێر دەستی ڕووسەکان، دەیانویست پەیوەندیم پێوەبکەن تا بۆخۆبەدەستەوە دانیان بە سوپای ڕووس لە ڕێگای منەوە بکەونە وتووێژ، کەچی نامەکەیان لە لایەن تورکەکانەوە دەگیرێت و سەرکردەکانیان دوردەخرێنەوە، وابزانم بۆ قوتبە.

تورکەکان کە چیتر باوەڕ بە کوردە هەڵاتووەکان ناکەن،بنەماڵەکانیان دوردەخەنەوە بۆ سازنینگ و دیاربەکر. ئێمە بەڵێنمان بە فەرماندەی هێزەکانی ڕووسیا دابوو کە بە درێژایی ڕێگا لە (وان)و شاتاخەوە تا جەزیری لای دیجلە، دانیشتوانی ئەو ناوچانە لە چوونماندا دەمانپارێزن و بە ڕووخۆشیەوە پێشوازی و هاوکاریمان دەکەن، بە مەرجێك هێزەکانی ڕووسیا چەکداری ئەرمەنییان لەگەڵ نەبێ و لانی کەم بە باشی لەگەڵ دانیشتوان بجولێنەوە. بۆ ئەو مەبەستەش من و شاخۆڤسکی چەند دەستە چەکداری کوردمان نارد بۆ پێشەوە کە پشتیوانی لەشکری ڕووسیا بوون تاپرستێژ(سومعە)ی لەشکری ڕووسیا بەرز بکەنەوە و دانیشتوانی ئەو ناوچانە ئامادەبکەن بۆ ڕاپەڕین. بەڵام شۆڕشی ئوکتۆبەر هەمووی تێکدا.

کە گەرامەوە بۆ (وان) نەم دەویست کات لە دەست بدەم، چوومە باکووری گۆلی وان تا کوردەکانی ئەوێ ئاشت بکەمەوە، توانیم بە مەبەستەکەم بگەم و بەڵێنی هاوکاری و پشتیوانی تێکڕای کوردەکانی باکووری وان واتە عەشیرەتەکانی زیلان و دەری، وەربگرم. دەستی ڕووسەکان بەو شوێنانە ڕانەگەیشتووە واتە بەکێوەکانی سیپان و عادیل جەواز و دۆڵی ئاباگین. ڕێگای وان - بایەزید کە تا ئێستا مەترسی لێدەکرا دەست بە جێ ئەو مەترسیە لابرا، ناوچەکانی دەوربەریشی تا ئێستا مەترسی هاتووچۆیان تێدایە.

کوردەکان خەریکی کشتوکاڵن، دەیانەوێ قوتابخانە و سەرپەنا بۆ منالانی بێ دایك و باوك دروست بکەن، کرێکاریان داناوە بۆ ڕاکێشانی هێڵی شەمەندەفەری نێوان وان و بایەزید و نێوان کورمونج و قەرەکین. ژیان و بارووذۆخی ئەم ناوچانە ئاسایی و هێمنە.

که کوده‌تا کرا هه‌موو شتێکی تێکدا، ئه‌رمه‌نییه‌کان که دژی ئێمه راوه‌ستاون ده‌ڵێن: کورده‌کان له‌سه‌ر ئه‌و خاکه ده‌ژین و کارده‌که‌ن که ده‌ستکه‌وتی ئێمه‌یه. بۆ سزادانی کورده‌کان به‌و بیانوه‌ی په‌لاماری سوپای رووسیان داوه هێرش ده‌که‌نه‌سه‌ر خورشید به‌گی به‌دری قه‌ڵا و سوری. دوو گروپ ئه‌رمه‌نی له‌م هێرشه به‌شداریان کردووه. ٢٠ی مانگی ئایار نزیکه‌ی پێنج سه‌د کورد که هه‌موویان پیر و ژن و منداڵ بوون له‌به‌ر ده‌رگای قه‌ڵا ده‌کوژن.ده‌ریش که‌وت ئه‌وانه هیچ تاوانیکیان نه‌بووه.

به‌رامبه‌ر به دانیشتوانی نیوه مردووی برسی و بێ تاوانی سوری ئه‌و په‌ڕی بێ به‌زه‌یی و نامرۆڤایه‌تیان نواندووه. دوای گرتنی شاخۆڤسکی ئه‌ره‌مه‌نییه‌کان کردبوویانه ده‌نگۆ که هه‌ردووکمان له سێداره دراوین.

له‌گه‌ڵ کورده‌کانی ده‌رسیم وتووێژ هه‌بوو، به‌ڵام ئێمه ئاگاردار نه‌بووین. کورده‌کانی ده‌رسیم که چاوی بینینی تورکانیان نییه ده‌یانویست پێکه‌وه له‌گه‌ڵیان ده‌ست به کاربن، وتووێژه‌کانیان سه‌رکه‌وتوو بوو که‌چی نازانم بۆ ئه‌م رێککه‌وتنه به‌ره‌و پێش نه‌چوو. هۆکانی هه‌ر ده‌بێ ئه‌وه بێ، واته سیاسه‌تی ده‌ستدرێژکاری ئه‌رمه‌نییه‌کان.

ئێمه ناتوانین بڵێین کورد له‌و ناوچانه‌ی گیراون، ماون، چونکه له سه‌رده‌می کوده‌تاوه پێوه‌ندیمان به کورده‌کانه‌وه نه‌ماوه، له‌و کاته‌وه‌ش تا ئێستا رووداوگه‌لی زۆر گرنگ رووی داوه، زه‌حمه‌ته بارووذۆخه‌که وه‌کو خۆی مابێته‌وه. کورده‌کان له ناوچه‌ی ئه‌رزه‌ڕۆم، دۆڵی موش، مه‌لا زگیرد و ته‌واوی باکووری گۆلی وان و سه‌نجاقی بایه‌زید ده‌ژین، به گشتی ده‌کرێت بڵێین به‌شێکی دانیشتووی کوردی ئه‌و ناوچانه ئاواره‌کراون، ئه‌وانه‌ش که ماون له کوله‌مه‌رگی و هه‌ژاریدا ده‌ژین و گوشارێکی زۆریان له‌سه‌ره به تایبه‌تی له لایه‌ن ئه‌رمه‌نییه‌کانه‌وه. ته‌نیا بارووذۆخی کورده‌کانی زیلان ده‌ری له ناوچه‌کانی ئازه‌ربایجان له چاو کورده‌کانی تر هه‌ندێك باشتره،ئه‌ویش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هێزی له‌شکری نه‌یتوانیوه بگاته لایان.

کورده‌کانی تری ناوچه داگیرکراوه‌کان له بارووذۆخێکی پڕ له مه‌ترسی و هه‌ژاری دان و له لایه‌ن ده‌وڵه‌ته‌وه هیچ پشتیوانییه‌ك ناکرێن و یارمه‌تی نادرێن. ئاشکرایه کورد له بارووذۆخێکی ئاوادا ناتوانێ به‌رامبه‌ر به رووسه‌کان باش بێت، هێزه‌کانی رووسیا به‌وه تاوانبارده‌که‌ن که بواری

ئەرمەنییەکانیان داوە دەست درێژی بکەنە سەریان، لە هەمانکاتدا دەڵێن رووسەکان لە لایەن ئەرمەنییەکانەوە فریودراون و بە هەڵەدا چوون.

بەڵام سەرەڕای ئەوە من دەتوانم بیسەلمێنم ئەگەر سیاسەتێکی ژیرانە بەرامبەر بە کوردەکان بەڕێوەبچێت و هەنگاوی ئەو تۆ هەڵبگیرێت کە باوەڕبکەن، بەتایبەتی ئەگەر پەیمانی ئاشتبوونەوەی ئەرمەن و کورد ببەسترێت و بە پاکی جێبەجێ بکرێت و ریزی لێ بگیرێت، ئەگەر ئەرمەنییەکان واتە کۆمیتەکانیان لە دڵەوە واز لە کوشتاری کوردەکان بێنن و کوردەکانیش یاریدەر و پارێزەر و دادپەروەریان هەبێت ئەوسا دەکرێ رابکێشرێن و بەڵێنی رزگاکردنیان لە ژێر چەپۆکی تورکەکان پێ بدرێت و ئۆتۆنۆمیشیان بۆگەرەنتی بکرێت. دەکرێ دەسکەوتی مەزنتریش هەبێت، منیش لە سایەی پرستیژی(سومعەی) بنەماڵەکەمان و خۆم لە کوردستان لەم بارەوە یارمەتیەکی زۆر پێشکەش دەکەین.

**ئیمزا**

**کامیل بەدرخان و کنیاز شاخۆڤسکی**

**٢٩ی سیپتەمبەری ١٩١٧ تیفلیس**

## سەرژمێری دانیشتوانی ناوچەکانی رۆژهەڵات:

دیاربەکر، بەرێوەبەرایەتی تەلعەزیز، وان، بەتلیس، ئەرزەرۆم و سیواس.

### سەرژمێری رەسمی

| نەتەوە | ژمارەی دانیشتوان | رێژەی لەسەدا% |
| --- | --- | --- |
| موسڵمانان- کورد | ٣,٠٤٠,٨٩١ | %٧٩ |
| ئەرمەن | ٦٣٦,٣٠٦ | %١٥,٥ |
| خەڵکی دی | ١٦٢,٣٥٨ | %٤,٥ |

### سەرژمێری بە پێی «کتێبی زەرد»

| نەتەوە | ژمارەی دانیشتوان | رێژەی لەسەدا% |
| --- | --- | --- |
| موسڵمانان- کورد | ٣,٦٦٩,٣٨٦ | %٧٣,٥ |
| ئەرمەن | ٦٦٦,٤٣٥ | %١٨,٥ |
| خەڵکی دی | ٢٧٢,٥٨١ | %٧,٥ |

## ئینسکلۆپیدیای ئینگلیز، چاپی یەکەم ساڵی ١٩١٥"بەرگی ١١ لاپەڕەی ٥٥٤"

لە باشترین سەرژمێری کردندا ئەرمەنییەکان لە (١٥٩) قەزای تورکیا لە (٩)قەزادا،(٧) قەزای (وان) و (٢) قەزای (موش) زۆربەی دانیشتوان پێك دێنن. دانیشتوانی ویلایەتەکانی تورکیا لە ئـەرزەڕۆم و وان و بـەتلیس و خـارپوت، بەڕیوەبەرایـەتی تەلعـەزیز، دیاربـەکر بـە گـشتی ٢,٦٤٢,٠٠٠ کەسن.

| نەتەوە | ژمارەی دانیشتوان | ڕێژەی لەسەدا٪ |
|---|---|---|
| موسڵمانان- کورد | ٣,٨٨٧ ١٠٣ | ٪٦٩ |
| ئەرمەن | ٦٣٣,٣٥٠ | ٪٢٤ |
| مەسیحیی دی | ١٧٩,٨٧٥ | ٪٧ |

سەرژمێریەکانی سەرەوە بەڕوونی ئاشکرای دەکەن کـە زۆربـەی دانیـشتوانی ئـەم ناوچـانە لـە کوردەکان پێك هاتووە، ئەرمەنییەکان کەمایەتین.

ئەو شوێنانەی کە لەم راپۆرتەدا خەت و نیشان کراون بە دەستی خودی نیکۆلای نیکۆلایۆیج فەرماندەی بەرز و گشتی هێزەکانی رووسیا بە مەیدانی کردوویەتی.

## راپۆرتی نهێنی شازادە شاخۆڤسکی باریس
## نووسراو بۆ یاریدەری حاکمی قەفقاز لە کاروباری لەشکری:

**خاوەن شکۆ ئیمپڕاتۆر**

**٩ی شوباتی ١٩١٧ ژمارە (١٩)**

لە راپۆرتەکەی من بۆ ستادی لەشکر لە (٣)ی کانوونی دووەمی ئیمسالّدا ژمارە (١٤) داوا لە خاوەن شکۆ بە رێز ئیمپڕاتۆر دەکرێت کە داخوازییەکەی کامیل بەدرخان سەبارەت بەو بارودۆخەی کە ئێستا تیایەتی، پاش شەڕیشی دیاری بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا داوا لە خاوەن شکۆ بەرێز ئیمپڕاتۆر دەکرێت ئەوەی کە پەیوەندی بە مافی بنەماڵەکەیان لە بۆتان هەیە و کەمال بەگ داوای دەکا جێی پرسیارە و جارێ بڕیاری لەسەر نادرێت، دەست نیشان بکرێت و دەستوور بفەرموون کە چ بڕیارێك لەسەری دەدرێت تا بە رەسمی بە کەمال بەگ بگوترێت و وەڵامی ئەم نامەیەی کەمال بەگ کە لە ١٣ی شوباتی ئیمسالّدا سەبارەت بە وەزعی خۆی ئێستا و دوای شەڕ بۆ منی نووسیوە، روون بکرێتەوە.

دوێنێ کە بۆ روون کردنەوەی کاروباری کەمال بەگ چووبوومە لای فەرماندەی لەشکر، پێی راگەیاندم، ستادی لەشکر دەتوانێ تەنیا لەسەر داخوازی یەکەمی کامیل بەگ کە پەیوەندی بە کارەکەی ئەوەوە هەیە بڕیار بدات، وەلێ بۆ بەفەرمی کردنی ئەو بڕیارە، فەرماندەی لەشکر پێیوایە ستادی لەشکر ناتوانێت بەڵێنی دوای شەڕیشی پێبدات، پێشنیاری کرد لەسەر ئەم داخوازییە داوا لە خاوەن شکۆی بەرێزتان بکرێت وەك سەرۆکی دەوڵەت بڕیار بدەن.

وەك تێبینی و ڕوونکردنەوە لە چەند خاڵدا ڕاپۆرتەکە ئاراستەی خاوەن شکۆ ئیمپڕاتۆڕ دەکەم:

مافی بەدرخان لە بۆتان دوولایەنەیە: سیاسی و سامانی (زەوی و زار). بۆتان تا نیوەی سەدەی پێشوو واتە تاتێشکانی بەدرخان پاشا ئیمارەتێکی نیوە سەربەخۆ بوو. بەدرخانییەکان هەوڵی

گەڕانەوە یا وەرگرتنەوەی دەسەڵاتی لەدەست چووی خۆیان دەدەن. لە هەمانکاتـدا مولـك و زەوی و زار و سامانێکی یەکجار زۆری بەدرخانیەکان دەستی بەسەر داگیراوە و دراوەتە خەزێنـەی دەوڵـەت. کامیل بەدرخان بۆ گەڕاندنەوەی ئەم سەروەت و سامانەی بنەماڵەکەیان هەوڵێکی زۆر دەدا.

بەڵام پێ داگرتن لە سەر خواستە سیاسەکانی تا ئەو جێگایەی من تێی گەیشتم ئەوەیـە: هیـوادارە بۆتان بکەوێتە ژێر حیمایەی رووسیا، دەسەڵات و باروودۆخی جاران بۆ کوڕەکانی بەدرخان پاشا و بـۆ کامیل بەگیش لەوێ مسۆگەر بکرێت. ئەگەر بێتو ئەوان و بەگشتی کوردەکان بـە ویـستی خۆیـان هاوکاری بکەن و یارمەتی رووسیا بدەن، دەوڵەتی ئیمپڕاتۆری رووسیا بەهەڵوێستێکی خێرخوازانـەوە دەتوانێت لە وتووێژەکانی ئاشتی داهاتوودا پارێزەری مافیان بێت.

لـە کۆبوونـەوەی ١٨ی تـشرینی یەکـەمی (١٩١٥) کـە گـوێ بـۆ روون کردنـەوە و بڕیـار لەسـەر داخوازییەکانی عەبدولڕەزاق گیرا. خاوەن شکۆ فەرماندەی گشتی هێزەکـان فـەرموویان: بـەڵێن بـە عەبدولڕەزاق بەگ دەدەین ئەگەر بە راستی کوردەکانی بۆتان بـۆ لای ئێمـە (روسـیا) رابکێـشێت و خزمەتمان بکەن ناوبراو دەنێرینەوە بۆتان و تەواوی ئەو زەوی و زارەی دەستی بەسـەر داگـیراوە بـۆی وەردەگرینەوە. پێشنیاردەکەم لەتەك خواستە سیاسییەکان بەڵێنێکی وەهاش بە کامیل بەگ بدرێت، چونکە داوا سیاسیەکانی پێش وەخت ناکرێ یا لە کاتی خۆیدا نییە و نابێت.

سەبارەت بە داخوازییە سیاسییەکان بۆ ئارام کردنەوەی کامیل بـەگ تـەنیا بـەزارەکی ئاماژەیـەکی ناڕوون و نادیار کەلە خاڵی چوارەمدا هاتووە بکەن. بەڵام سەبارەت بـە دابـین کردنـی بـاری مـاددی ژیانی کامیل بەگ بەپێی ئەو بڕیـارەی خـاوەن شـکۆ ئیمپڕاتـۆر لـەمبارەوە داویـەتی دەکرێـت یـا دەتوانرێت نامەیەك لە لایەن مەکتەبی دەوڵەتی خاوەن شـکۆوە بـەناوی جێگـری لەشـکری حـاکمی قەفقاز یا بە نـاوی سـتادی لەشـکر ئاگـاداری بکەنـەوە کـە ئـەو مووچـەیەی بـۆی بڕاوەتـەوە تـا چارەسەرکردنی کێشەکانی تری و مانەوەی لە رووسیا ئەگەر نەگەرایەوە، تاکۆتایی شەڕ مـسۆگەرەو پێ دەدرێت. بۆ ئەوەی داخوازییەکانی تری ئامادە و رێك بخـرێ و دەسـتووریان لەسـەر بـدرێت، بـۆ پەسەند کردنی پێویستە ئاڕاستەیخاوەن شکۆ فەرماندەی گشتی هێزەکـانی رووسـیا بکرێـت. ئـەو مووچەیەی کەمال بەگ ئەمڕۆ وەری دەگرێت لە خەزێنەی لەشکرە، لەوانەیە لە لایەن خـاوەن شـکۆ ئیمپراتۆروەوە زیادبکوێت و بکرێتە (٧٥٠) روبڵ، چونکە فەرمانـدەی هێزەکـان، دوێنـی رایگەیانـد ئەو مووچەیەی کەمال بەگ وەری دەگرێت بە راستی لەم باروودۆخە گرانیـەدا پارەیـەکی زۆر نییـە. دەبێ لە راپۆرتەکەدا ئـەوەش دەسـت نیـشان بکرێـت کـە تـا چارەسـەر کردنـی کێـشەکانی تـر و

دیاریکردنی چارەنووسی، ئەم مووچەیەی بۆ دیاری بکرێت. کەواتە لەم بارووددۆخەدا باسکردنی کێشەکانی تری کەمال بەگ دوا دەخرێت و بڕیاریان لەسەر نادرێت لەبەر ئەوەی پێمان وایە باسکردنی ئەو کێشانە لە کاتی خۆیدانییە و لە کاتی پێویستدا دەتوانرێت لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت و بڕیار بدرێت، باس کردنشیان ماوەتەوە سەر بارووددۆخ، تائەو کاتە دەکرێ ژیانی کامیل بەگ دابین بکرێت و لەم بارەوە ئاسودەبێت. بۆ چارەسەرکردنی کاروباری کامیل بەگ بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی لە بەرژوەندی ئێمە و وەرگرتنەوەی مافی خۆی لەگەڵ ئێمە کار دەکات، ئەم خاڵانەی خوارەوە بە باش دەزانم:

١- نامەیەك لە لایەن ستادی لەشکرەوە بۆ کەمال بەگ بنێردرێت لەگەڵ ئەو کارانەی کەپێی سپێردراون وەك ئەو نامەیەی کاتی خۆی ستادی لەشکر بۆ عەبدولڕەزاقی نووسیبوو.

٢- راپۆرتێك سەبارەت بە دیاریکردنی مووچەی بژێوی کامیل بەگ تا چارەسەرکردنی کێشەی داهاتووی، بۆ پەسەندکردنی خاوەن شکۆ ئامادە بکرێت.

٣- نامەیەکیش لە لایەن دەوڵەتی خاوەن شکۆوە یاخود لە لایەن ستادی لەشکرەوە سەبارەت بە دیاریکردنی مووچە بۆ کامیل بەگ بنووسرێت تا بڕیاری چارەنووسی لە داهاتوودا بدرێت.

٤- بەڵێنی یارمەتیدان ووەرگرتنەوەی دوای شەڕیش بە کەمال بەگ بدرێت سەبارەت بەو زەویانەی تورکەکان دەستیان بەسەرداگرتووە. بەزارەکیش لە لایەن دەوڵەتی خاوەن شکۆ ئیمپڕاتۆرەوە پێیڕابگەیەنن ئەگەر کوردەکانی بۆتان کە خاون شکۆ هیوای هاوکاری رووسیای پێیانە، یارمەتیمان بدەن، بێگومان خاوەن شکۆ دوای نەمانی شەڕ ئەم خزمەتەیان لەبەر چاودەگرێت و پارێزگارییان لێ دەکات تا لە ژیانێکی هێمنانەدا بژین و بواری پێشکەوتنیان هەبێت. لە لایەن دەوڵەتی خاوەن شکۆوە سوپاسی خاوەن شکۆ ئیمپڕاتۆری رووسیا بە کامیل بەگ بگەیەنن لەمەڕ و ئەو خزمەتانەی تا ئێستا کردوویەتی، سوپاسنامەکە لە لایەن و بە ناوی خاوەن شکۆوە بێت زۆر لەوە باشترە کە تا ئێستا من وەك هاوکارییەك پێمگەیاندوە[2].

**مۆرو ئیمزا**

**نیکۆلای / ١٠ فیبرایەری ١٩١٧**

---

(2) АВПР ф ф. 094 Оп. 6 ПоП. 113 g. 55 ф 230-246

**تێبینی (لە هەورامی):**

نیکۆلا نیکۆلایویج (بچووک) (١٨٥٦-١٩٢٦) شازادە یا قەیسەری گەورەی رووسیا کوڕی نیکۆلا نیکۆلایویج (گەورە) و وەلی عەهدی رووسیا بووە. لە شەڕی رووسیا-تورکیا نوێنەری ئیمپڕاتۆری رووسیا بووە بۆ کاروباری تایبەتی، لە (١٩١٥) لەسەر پێداگرتنی راسپۆتین (کەسێك بووە کە ئیمپڕاتۆری رووسیا و ئەندامانی دەوڵەتەکەی بە قسەیان کردووە و رێز و دەوری لەسەر سیاسەتی رووسیادا هەبووە و لە ساڵی (١٩١٦) لە لایەن ئەنارشیستەکانی رووسیا کوژرا) و مەلیکەی رووسیا واتە ئەلیکستاندەر فیئورۆڤنا(3) کە لە دەوری ناوبراو و توانایەکەی دەترسان و هەستیان کرد بوو دەیەوێ دەسەڵات بگرێتە دەست، لە فەرماندەی بەرزی هەموو هێزەکانی رووسیا لا دەبرێت و دەیکەن بە حاکمی قەفقاز و فەرماندەی هەموو هێزەکانی رووسیا لە بەرەی قەفقاز.

لە مانگی ئازاری ١٩١٧ بە لاچوونی ئیمپڕاتۆر نیکۆلای دووەم، نیکۆلای نیکۆلایۆیج دووبارە سەرکردایەتی باڵای هەموو هێزەکانی رووسیای پێ دەدرێتەوە. بەڵام بە هاتنی سەر کاری حکومەتی کاتی لە رووسیا ناچارکرا دەست لە کار بکێشێتەوە، پاشان دەچێتە کریم و لە ١٩١٩ لە کریم بە پاپۆڕێکی ئینگلیزی دەچێتە ئیتالیا و لەوێشەوە بۆ فەرەنسا و لەوێش کۆچی دوایی دەکا. مرۆڤێکی چالاك و توانای رێکخستن و ئامادەکردنی لەشکری زۆر بە هێزبوو، رێز و دەورێکی زۆری لە ناو ئەفسەرانی سوپای رووسیای قەیسەری دا هەبووە. فەرماندەی هەموو هێزەکانی سوپای قەیسەری لە دەرەوەی وڵات بوو کە بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵات لە رووسیا و لابردنی رژێمی بەلشەویکەکان هەوڵی دەدا.پاش ئەوەی شازادە ڤارەنتسوڤ داشکوڤ حاکمی قەفقاز ماوەیەکی زۆر نەخۆش دەکەوێت، کاروباری قەفقاز و بەرەی شەڕ و سیاسەتیان بەرامبەر بە کورد و ئەرمەن..... دەکەوێتە دەست ژنە گەنجە ئەرمەنییەکەی، ئەویش بە ئامۆژگاری و

(3) ئەلکساندرا فیئورۆڤنا: ناودڕاستیەکەی ئالیساگیس درام شتاسکییە (١٨٧٢-١٩١٨) مەلیکەی رووسیابووە و لە ١٨٩٤بووەتە ژنی نیکۆلای دووەم ئیمپڕاتۆری رووسیا لە ١٩١٨ بەدەستووری بەلشەویکەکان لەگەڵ بنەماڵەکەی لە یکاتیرنیبۆرك گولەبارانکران. کچی ئیمپڕاتۆری ئەڵمانیا (گیرنسۆگ گسین درام شتاتسکی) بووە. دەورێکی زۆری لە سیاسەتی قەیسەری رووسیا واتە مێردەکەی نیکۆلای دووەمدا هەبووە و رووسیای بەرەو لای ئەڵمانیا و نزیك بوونەوەیان راکێشاوە. لە کاتی شەڕی جیهانی یەکەم هەوڵی زۆریدا کە رووسیا لەگەڵ ئەڵمانیا پەیمانی ئاشتی ببەستێت (هەورامی).

ڕێنوێنی داشناکەکان و دەوڵەتە ئەرمەنییەکان بەڕێوە دەچێ. نیکۆلای نیکۆلایویج دەبێتە حاکمی قەفقاز، پاش ئەوەی کامیل بەدرخان شاخوڤسکی ئاگادار دەکاتەوە کە حاکمی پێشووی قەفقازو ژنەکەی زیانێکی قەرەبونەکراویان گەیاندۆتە رووسیاو بە ناهەق سیاسەتی کورد کوژیان گرتۆتە بەر، بووەتە هۆی ئەوەی نە تەنیا کوردەکان لە رووسیا دورخەنەوە، بەڵکو لە هەندێ شوێن بەرگریی لە پێشڕەوی هێزەکانی رووس و بگرە هاوکاری سوپای تورکیاش دەکەن. پاش ئەوەی هەواڵی کوشتن و زیندانی کردنی حەمیدییەکانی کورد کە چووبوونە ریزی سوپای رووسیا لە کوردستان بڵاودەبێتەوە، حاکمی نوێ ناچاردەبێ دەستوور بدات واز لە کوشتاری کورد بهێنرێت، هەوڵی ئاشت بوونەوەی کورد و ئەرمەن و کورد و رووس بدرێت، تائەو بێ باوەڕیەی کوردان بەرامبەر رووسیا بگەڕێتەوە بارودۆخی ئاسایی خۆی، بەڵام دەستوورەکەی لە لایەن کاربەدەست و فەرماندەکانی سوپای رووس و چەکدارە ئەرمەنییەکان جێبەجێ ناکرێت، ئینجا کوردەکانیش مەرج بۆ کاربەدەستانی رووسیا دادەنێن کە هەر هێزێك بنێردرێتە کوردستان ئامادەن هاوکاری و پێشوازی لێ بکەن بەمەرجێك ئەرمەنییان لەگەڵ نەبێت، رووسەکان ناچار دەبن داخوازییەکانیان جێبەجێ بکەن، چونکە لەبەر هەڵوێستی نیگەتیڤانەی کوردەکان پێشبینی تێشکانی سوپای رووس دەکرا.

# بەشی دووەم

## پێشەکی

کەسایەتی ناوداری کورد (کامیل بەدرخان) کە میر یا شازادەشیان پێوتووە، لە بنەماڵەی بەردخانە، هەر لە سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمەوە تا ١٩٢٣ لە سۆڤیەت (رووسیا) بووە، بەو هیوایەی رووسیا وکاربەدەستانی رووسیا بۆ پشتگیری لە کێشەی کورد راکێشێت، خۆی و بنەماڵەکەی خزمەتێکی زۆری دەوڵەتی رووسیایان کردووە، لە بەڵگەنامەکاندا دیارە هەوڵێکی زۆری داوە بە پشتیوانی رووسیا پاشان سۆڤیەت کوردستانێکی سەربەخۆ رابگەیەنرێت.

ودلێ داوایەکانی یەك لە دوای یەك بەبیانوی جۆراوجۆر و بە درۆو بەڵێنی بێ کردەوە پشت گوێ دەخرێن و تەنانەت خیانەتیشی لێدەکەن و وای لێدێ سۆڤیەت بەجێ بهێڵێت. وەزەراتی پاراستنی سۆڤیەت و وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت چیچیرین دەستوور دەدەن بەو مەرجەی نەگەڕێتەوە سۆڤیەت پێش بە ڕۆیشتنەکەی نەگیرێت و دەستووریش دەدەن ڤیزەی گەرانەوەی بۆ سۆڤیەتی پێ نەدرێ . کامیل بەگ کە لە دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت نائومێد دەبێت و بۆی دەردەکەوێ شتێك بۆ کورد ناکەن، خۆی داوا دەکات سۆڤیەت بەجێ بهێڵێت و تا خۆی لە تیاچوون و یا تەسلیم کردنەوەی بە تورکەکان بپارێزێت، پاساوی دەسکورتی و خراپی ژیان بۆ ڕۆیشتنەکەی دەهێنێتەوە، لە بەڵگەکانیشدا هاتووە، لەوتو وێژ لەگەڵ کاربەدەستانی سۆڤیەت کامیل بەگ ژیان و کەسایەتی خۆی و گەڕاندنەوەی بۆ تورکیا و گەڕاندنەوەی موڵك و ماڵی بنەماڵەکەی بەلاوە گرنگ نەبووە. لەبیرمان نەچێ ئەم دەستووورە واتە رۆشتنی کامیل لە مانگی یەکی ١٩٢٣ بووە واتە پاش ئەوەی شێخ مەحموود نامە و نوێنەرانی خۆی پەیتایەیتا بۆ لای نوێنەرانی سۆڤیەت و سەرکردەکانیان دەنێرێت.کەواتە چۆن کاربەدەستانی سۆڤیەت ئامادە دەبن یارمەتی شێخ مەحموود بدەن، کامیل بەگ پاش ئەو هەموو ساڵ و ئەو

هەموو خزمەتەی کە کردوویەتی دەردەکرێت و نارازی و بە دەستی بەتاڵ سۆڤیەت جێ دەهێڵێت، دەبێ چ وەفایەك یان نیاز پاکیەکی تریان بەرامبەر بە کەسایەتیەکی تری کوردی وەك شێخ مەحموود یا خود کێشەی کورد هەبێت جگە لە یاریکردن و بەرەو هەڵدێربردن و کەڵك وەرگرتن. ئەم سیاسەتەی بەلشەویکەکان کە سنووری هەموو داب و نەریت و ئەخلاقێکی ئینسانی و مرۆڤایەتی بەزاندووە، لەگەڵ سیاسەتی هیچ رژێمێکی تردا بەراورد ناکرێت. ئەگەر بەوردی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر بەڵگەکان بکرێت دەبێ چەند پەرتوکێك بنووسرێت، من نامەوێ لێرەدا باسیان بکەم.

کامیل بەدرخان لە راکێشان و دەعوەت کردنی شێخ عبدولسەلامی بارزانی، سمایل ئاغای شوکاك (سمکۆ) و ... بۆ رووسیا و هاوکاری کردنیان لەگەڵ رووسیا دەوری سەرەکی هەبووە.

کامیل بەگ پاش دەرچوونی لە سۆڤیەت یا بەواتایەکی تر پاش هەڵاتنی، بۆ شێخ مەحموودی ئاگادار نەکردوەتەوە کە واز لە بەلشەویکەکان بێنێت، تۆ بڵێی پەیام و نامەیەکی لەم بارەوە بۆ شێخ نەنوسیبێت، تۆ بڵێی شێخ ئاگای لە دەرچوونی کامیل بەگ نەبووبێت؟

کەمالیەکان بێ شك بە دەرکردنی کامیل بەگ دیارییەکی گەورەیان لە بەلشەویکەکان وەرگرت، گومانیش لەوەدانییە کە خواستی ئەوان هەر دەرکردن، کوشتن و یان تەسلیم کردنەوەی کامیل بەگ بووە، بەلشەویکەکانیش بۆ نیشاندانی دۆستایەتی و وەفاداری خۆیان بەرامبەر بە کەمالیەکان بەم کردەوە نا ئەخلاقییە هەڵسان. کامیل بەگ هەوڵی زۆری دەدا قەناعەت بە دەسەڵاتدارانی رووس و سۆڤیەت بکات کە سمکۆ نە پیاوی ئینگلیزە و نەپیاوی تورکیا . سمکۆ مەرج و داخوازی هەیە و ئامادەیە هاوکاری سۆڤیەت بکات . سمکۆ ناحەز و دوژمنی زۆرە، کردەوەی ناڕاستی کاربەدەستان، فەرماندەکانی لەشکری سۆڤیەت، ئەرمەنییەکان و دوژمنان، زۆر جار سمکۆ یان ناچار کردووە بچێتە ناو تورکیا پەیوەندی بە تورك یا بە ئینگلیزەوە بکات بەڵام بێسوود بووە .

# بڕیاری وەزارەتی دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت لەسەر کێشەی کورد

هەندێك لە ڕێبەران و ڕێکخراوی کورد لەخەباتی ڕزگاریخوازیدا گەلێك جار هەوڵیان داوە بە مەبەستی یارمەتی وەرگرتن و درێژەپێدانی خەبات، پەیوەندی بە نوێنەرانی یەکیەتی سۆڤیەتەوە بکەن.

یەکەم هەنگاو دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٢ کە کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی «خۆیبوون» بڕیاریدا بە یارمەتی و پشتیوانی سۆڤییەت سەربەخۆیی کوردستان وەدەسبێنێ. بۆ ئەو مەبەستە سەرۆکی کۆمیتە «خالید بەگی جویرانلی» و (یوسف زیا) بەناوی کۆمیتەی کوردی (ئەستامبۆل) لە ئەنقەرە سەردانی باڵیۆزخانەی ئێمەدەکەن.

لە وەڵامی داواکاری نوێنەری ئێمە بۆ هەڵوێست وەرگرتن، لیژنەی کۆمیسیاریای گەلی وەزارەتی دەرەوە لە ڕێکەوتی ١٩٢٣/٣/٨ بڕیاریدا:

«نە پشتیوانی کوردە جوداخوازەکان بکرێ دژی تورك و نەپشتیوانی ئیمپریالیزمی تورك دژی کوردەکان، بەڵکو هاوسۆزی تێکۆشانی کوردەکان بن بۆ دژایەتی بەریتانیا » سەرەڕای سەرنەکەوتنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئێمە، کۆمیتەی کوردەکان درێژەی بە سیاسەتی لایەنگری کردنی سۆڤیەت دا.بە نوێنەری خۆیدا کەمال فەوزی بەگ بە(شفرە-رەمز) نامەی بۆ کۆنسۆلی ئێمە لە تەوریز هاوریێ دوبسون ناردووە.کەمال فەوزی بەگ داوا دەکات سەرەڕای بۆچوونی دەوڵەتی سۆڤیەت بەرامبەر کێشەی کورد، پێویستە سۆڤییەت لەگەڵ سمایل ئاغای شوکاك کە لە باکووری ئێران سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد دەکات پەیوەندی بگرێت و ڕێگا بە کۆمیتەی کوردی بدرێت تا ڕێبەرایەتی کارەکانی سمکۆ بکا، بەو چشنەی کە کۆمیتەی کورد خوازیارە.

سەرەڕای ئەوەی ئێمە ئامادە نەبووین چیتر لەگەڵ کوردەکان پەیوەندی و وتوویژمان هەبێت، کەچی کۆمیتەی کوردی پێی ڕاگەیاندین کۆمیتەکەیان و گەلی کورد لەلایەنگری کردنی سۆڤیەت هەر بەردەوام دەبن.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٣ کۆنسۆلی ئێمە لە تەوریز نامەیەکی لە لایەن شێخ مەحموودەوە پێ دەگات تیایدا داوای یارمەتی و پشتیوانی و حیمایەی ئێمە دەکات.

## دوا ڕووداوەکانی کوردستانی تورکیا:

بەهۆی لەناوبردنی ڕێکخراوە کوردییەکان و دوورخستنەوەی ڕێبەرانی کورد، سەرکردە سیاسیەکانی کورد دەرفەتیان نەما پەیوەندیمان پێوە بکەن. جگە لەوەش هەندێ شت بوو بە هۆی ئەوەی کوردەکان ساردببنەوە و لێمان بتەکنەوە.

ئێمە نە تەنیا پشتیوانی خەباتەکەیانمان نەکرد، بەڵکو لە چاپەمەنیەکانیشماندا بزووتنەوەکەیان ڕەنگی نەداوەتەوە. لە ساڵی ١٩٢٦ کوردە ڕاپەڕیوەکان زۆرجار بە ناردنی نامە و نوێنەرانی خۆیان هەوڵیاندا پەیوەندیمان پێوە بکەن، بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٢٨ بەنهێنی نامەیەکیان بۆ کۆنسوڵی ئێمە لە ماکۆ ناردووە ئەمە ناوەرۆکەکەیەتی:

لە لایەن (دەوڵەتی) ئەراراتەوە نامەیەك بە ژمارەی ٢٤ و بە ئیمزای من بۆ ئێوە نێردراوە بەڵام وەڵامێك وەرنەگیراوە.سەرباری ئەوەش تەتەرەکەمان هەر لەو ڕۆژەوە گیراوە و تائێستاش لەبەندیخانەی(ماکۆ)دایە. تاوتوێکردنی بارودۆخی سیاسی ئەو ڕاستیەی بۆ ئێمە سەلماند : بەبێ هاوکاری و یارمەتی ڕووسیای سۆڤیەتی گەلی کورد ناتوانێت ڕزگاری نەتەوەیی خۆی دەستەبەر بکات....

لەبەر ئەوەی هەوڵی کوردەکان بۆ گفتۆگۆ لەگەڵ ئێمە لە دەرەوەی سۆڤیەت بە ئەنجام نەگەیشت و سەرکەوتوو نەبوو، ئەوان بە نهێنی لە سنوورەکانەوە هاتنە ناو خاکی یەکیەتی سۆڤیەت تا لێرە وتووێژمان لەگەڵ بکەن.

ئاودیوبوونی سوپای سۆڤیەتی لە ساڵی ١٩٤١ بۆ ئێران دەرفەتێکی بۆ کوردەکان ڕەخساند تا پەیوەندی لەگەڵ کاربەدەستانی کۆنسوڵخانە و کەرتەکانی سوپای سوور بگرن.

* لە ڕاگەیاندنی بەڕێوەبەری کاروباری ڕوژهەڵاتی ناوەڕاست وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت هاوڕێ سیچۆڤ وەرگیراوە.

### سکرتاریەتی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکیەتی سۆڤیەت (بەلشەوێك)

ژمارە (1) ٣٠٠٨ / ١٩٤٦/١٢/٢٣

ئەم بەڵگەیە کە هەڵوێست و سیاسەتی ڕووسیای سۆڤیەتی واتە لە هاتنە سەر دەسەڵاتی بەلشەویکەکان لە ساڵی ١٩١٧-١٩٤١ بەرامبەر بەکێشەی کورد کە پاش تاوتوێ کردن و

(1) Pyxn DHN P. 17 on. 128 g. 208 jp. 2339-2336

لێکۆڵینەوەی بەرپرسانی دەوڵەتی و حیزبـی سۆڤیەت سـەرئەنجام بـەناوی وەزارەتـی دەرەوەی سۆڤیەت بڕیاری لەسەر دەدرێت.

کاربەدەستانی سۆڤیەتی دان بەوە دادەنێن کە ئامادەنەبوون هاوکاری و پـشتیوانی بزووتنـەوەی کورد بکەن و گشت پەیوەندی و هانابردنی ڕێکخـراو و کەسـایەتیەکانی کـورد بـۆ نوێنـەرانی سۆڤیەت بێ کەڵك بووە و وەڵام نەدراونەوە.

بڕیاری وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت لە ١٩٢٣/٣/٨ واتە پاش نامـەکانی شـێخ مـەحموود، بـە ئاشکرا بزووتنەوەی کورد بە جیاخواز دادەنێ، تاقە شتێك کـە سـۆڤیەت لـە کـوردی دەوێـت بەگژاچوونی ئیمپریالیزمی ئینگلیزە، ئەو دەمـیش نـە تـەنیا ئامادەنـابن پـشتیوانی بکـەن و هاوسۆز و هاودەردی بن بەڵکوگەلێك بەڵگەنامەی تر هەن ئاراسـتەی دەسـت و پێوەنـدەکانیان کراون، سیمای راسـتەقینەی بەلـشەویکەکان دەردەخـا.ئەوانـەی ئیـدعای پـشتیوانی گـەلانی چەوساوە و ژێر دەستیان دەکرد، ئەویش بۆ گەلی کورد کە خزمـەتی پـێ کـردوون خـوێنی بـۆ رشتوون و دراوسێیانە و لە زۆربەی گەلان موستەحەق تر بووە.

سەیر ئەوەیە کەسایەتی و ڕێکخراوە سیاسیەکانی کورد هەموو جارێك و لە هەموو شـوێنێك و لە هەموو شۆڕشەکاندا دەست بەرووریانەوە دەنرێت، کەچی لەبری کاردانەوە دژی هەستی روون و ناشایستەی بەلشویکەکان، لەلایەنگری کردنی سۆڤیەت هـەر بـەردەوام دەبـن، سـەرکردەکانی شۆڕشی ئەراراتیش پەیوەنـدییان پێـوە دەکـەن لەکاتێکـدا نامەبەرەکەشـیان بـێ سەروشـوێن دەکرێت. مەگەر ئەزموونی کامیل بـەدرخان و کۆمیتـەکانی کـوردی ئـەرزەرۆم (خالیدبـەگی جوبرانلی) و کۆمیتەی ئەستامبوڵ (یوسف زیابەگ) و سمکـۆ و سـەید تـەها و عەبـدولرەزاق و شێخ مەحموودیان...... لەبەرچاو نەبوو؟!!.

سۆڤیەت لە باتی یارمـەتی شۆڕشـی ئـاگری (ئـەرارات) یـا بـێ لایـەن بـوون، لەگـەڵ هێـزە سەرکوتکەرەکانی تورك و (کە بە چەکی سۆڤیەتی و پسپۆڕانی لەشکری سۆڤیەت و ڕێگادانیان بۆناو خاکی سۆڤیەت)، هێزەکانی ئێران سێ قۆڵی ئـەو شۆڕشـەیان نـوقمی خـوێن کـرد، کـە ئەمەش بابەتێکە لێکۆڵینەوەی تایبەتی دەوێت، من لێرەخـۆی لێـدەبوێرم. سیاسـەتی رەسمـی رژێمی بەلشەویکی لە ئاست کێشەی کورد کە لە دەستوورێکدا لـە لایـەن وەزارەتـی دەرەوەی سۆڤیەتەوە لە ٢٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٣ نێردراوە بۆ نوێنەرەکانیان واتە باڵوێز و کۆنسوڵخانە و

دام و دەزگا سیخۆرییەکان لە ولاتە داگیرکەرەکانی کوردستان، بەڕوونی و بەکورتی فۆرمۆلە کراوە کە ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

ئێمە واتە (سۆڤیەت) کێشەی کورد بە کێشەیەکی نێونەتەوەیی نازانین بەڵکو بە کێشەیەکی ناوخۆیی ئەو ولاتانە دادەنێین کە کوردییان تێدایە، ئۆتۆنۆمی یا دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆکوردستان رەتدەکەینەوە، لە ژێر رکێف یا پشتیوانی هەر لایەنێك بێت دژی دەوەستین...... واتە بەلشەویکەکان دژی هەموو هەوڵێکی نێو نەتەوەیی بوون بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد، بەکردەوەش سەلماندیان، کەواتە هیچ جیاوازیەکییان نییە لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان، ئەوان دژی ئۆتۆنۆمین هەتتا لە چوارچێوەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیش، چونکە ئەو ئۆتۆنۆمییە لە داهاتوودا دەبێتە سەربەخۆیی کوردستان و کوردستان دەبێتە پێگەیەکی ئیمپریالیزم دژی سۆڤیەت و دەبێتە هۆرەیەك لە قەفقاز دەدرێت و ئیمپریالیزم لەکوردستانەوە دەستی دەگاتە ئاسیای ناوەڕاست و نەوتی باکوور....

لە هەمانکاتدا وەزارەتی دەرەوە داوا لە فەرمانبەرانی خۆیان دەکات: دژی چەك کردنی خێڵ و هۆزەکانی کوردبن لە لایەن فارس و تورکەوە، لەبەر ئەوەی شەرکەرن و میرخاسن، لە کاتی پێویست بە کەڵکمان دێن و دەتوانین دژی تورك و فارس بەکاریان بهێنین.داوا دەکات بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد دژی ئینگلیز بەکاربهێنرێ و پروپاگەندە بکرێت کە ئەوانە هیچیان بۆ ناکەن.

تەنانەت دژی مافی ئۆتۆنۆمی کوردن ئەگەر لەلایەن تورکیشەوە بدرێت، چونکە ئەوسا کوردەکانی ئێرانیش یا دەچنە پاڵی یاخۆیان داوای ئۆتۆنۆمی دەکەن، ئەمەش لەبەرهاو سنوورییان لەگەڵ ناوچە کوردیەکانی خۆیە و ماکۆ و سەلماس، بۆئەوان مەترسی هەیە و لەبەرژەوەندییان نییە. ئەمەم بۆیە دووپات.کردەوە چونکە چەند ساڵێك بەلشەویکەکان بەڵێنیان بە نوێنەران و کەسایەتی کورد دەدا گوایە دەبنە ناوبژیکەری تورك و کورد بۆ وەرگرتنی ئۆتۆنۆمی. تا کورد لە ئینگلیزەکان دابرێن ولە ژێر کاریگەرییان دا نەبن. ئەو بەڵێنانە لەگەڵ ئەم دەستوورە نەك هەر دژێك و پێچەوانەی یەکترن، بەڵکو سنووری تاوانشییان بەزاندووە. سەرکردایەتی رژێمی بەلشەویکی لە لایەکی ترەوە فەرمانبەرەکانیان ئاگادار دەکردەوە: کوردەکان بەخۆ نزیك کردنەوەیان لە ئێمە، دەیانەوێ نێوان ئێمە و فارس (ئێران) و تورك تێك بدەن.

... سۆڤیەت ئامادە نییە نەپارە نەچەك بدات بە كوردە جوداخوازەكان، چ بۆ شۆڕش یا كارێكی هاندەر تەنانەت ئەگەر ئەوكارە بە قازانجی ئێمەش بێت. هەروەها دەڵێ: بەو چەقەڵانەی ئیمپریالیزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (واتە كورد) بڵێن و تێیان بگەیەنن تا ئێش و كاری زۆرمان بۆ نەكەن ئاوڕیان لێ نادەینەوە، چونكە زۆر نیگەرانی ئەو پەیوەندییە نزیكەین كە لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئینگلیز هەیانە.

بۆیە ئاماژەم بەو خاڵەی سەرەوە كرد تا لەبیرمان نەچێ، بەڵێنیان بە نوێنەرانی كورد دەدا، نامە و شاندیان دەنارده لایان كە ئەگەر لە ئیمپرالیزم دابڕێن ئێمە یارمەتیتان دەدەین ولانی كەم دەتوانین ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی توركیا بۆ كورد گەرەنتی بكەین. كە كوردیان دابڕی نە یارمەتییان داو نە ئۆتۆنۆمیش گەرەنتی كرا. كەچی لە دەستوورەكەدا هاتووە ئەوان بەخۆ نزیك كردنەوەیان لە ئێمە دەیانەوێ نێوانی ئێمە و فارس و تورك تێك بدەن.

بەڵگەیەكی تر كە زۆر بە نرخ و مێژووییە ڕاپۆرتی شازادە باریس شاخۆڤسكییە كە لە ڕووسیا بە ناودارترین كوردناس دادەنرێت، لەبەر ئەوەی ساڵانێك لە كوردستان بووە و بە كوردستاندا گەڕاوە و لە لایەن دەوڵەتەكەیەوە بۆ پەیوەندی گرتن و ڕاكێشانی كوردەكان، تەرخان كراوە. جگە لە زانیاری گشتی و مێژوویی لەسەر كوردستان و بزووتنەوەكانی، زانیاریشی لە سەر باروودۆخی كوردستان هەبووە. لە سەردەمی جەنگی جیهانی یەكەم و دەوری زلهێزەكانی تر لەسەر كوردستان وداگیركەرانی، گەلێك زانیاری بەكەڵكی بۆ داموودەزگاكانی دەوڵەتی ڕووسیا بەتایبەت داموودەزگا سەربازییەكان كۆكردۆتەوە، لە ڕاكێشانی كورد بۆ لای ڕووسیا ڕۆڵێكی باڵای گێڕاوە، لەگەڵ ژمارەیەك كەسایەتی و سەرۆك هۆز و خێڵی كورد پەیوەندی نزیكی هەبووە.

كوردناسەكانی سۆڤیەت زۆر سوودیان لەڕاپۆرتەكانی ناوبراو وەرگرتووە. بەڵام بەداخەوە هەرچی گرنگ و پێویست بووە ئاماژەیان پێ نەكردووە. باسی تاوانی كاربەدەستەكانیان نەكردووە بەتایبەت كاربەدەستانی قەفقاز و باڵوێز و كۆنسۆڵخانەكانیان لە توركیای عوسمانی و ئێران وپڕۆپاگەندەچییانی سوپاكەیان لەم وڵاتانە.

شاخۆڤسكی بە وردی و بە بەڵگەوە بەرپەرچی ئەو ڕاپۆرتانە دەداتەوە كەدەڵێن كورد دوژمنی ڕووسیان، داوا دەكات نابێ باوەر بەوكەسانە و ڕاپۆرتەكانیان بكرێت، چونكە خۆی بە كوردستاندا گەڕاوە و چاوی بە زۆر كەس كەوتووە، بۆ وێنە دەنووسێت... ئەی جەنگی جیهانی

یەکەم پیشانی نەداین؟ هەر کە شەڕ دژی تورکیا دەستی پێکرد ڕەسوڵ بەگ شەمسەدینۆف برای حەمید بەگ و کوڕانی ئەیوب پاشا لە ناوچەی قەرەکلیس بە خۆیان و فەوجەکانی حەمیدیەوە لەگەڵ گەلێك کەسایەتی تریش کە لە بەڵگەنامەکاندا ناویان هاتووە هاتنە ڕیزی سوپای ڕووسیا. ئەوانی تریش چاوەڕێی نزیکبوونەوەی سوپای رووسیایان دەکرد..... باسی تاوانی ئەرمەنەکانی ناو سوپای رووسیا دەکات کەبە ناحەق چ کوشتارێکیان لەکورد کردووە تەنانەت فەرماندە و سەربازەکانی سوپای رووسیاشیان دژی کوردەکان هان داوە، بۆیە ئەوانەی (مەبەستی کوردەکانە) تەسلیمی ئێمە بوون دەیانگرن و دەیانکوژن. باسی حاکمی قەفقاز دەکات کە کچوڵەیەکی ئەرمەنی دەکەنە ژنی و پاشان حاکم نەخۆش دەکەوێت و کاروباری قەفقاز و کێشەی کورد دەکەوێتە دەست شاژن و ئەوەی کە بەسەر کوردەکانی هێناوە مرۆڤ بە خوێندنەوەی گریانی دێت. ئەو کوردانەی دێنە ریزی سوپای رووسیا، لەناو دەبرێن و دەست درێژی دەکەنە سەر ناموسیان و سەرکردەکانیشیان دووردەخەنەوە بۆ سیبریا کە تائێستاش بێ سەروشوێنن. ئەم بەڵگە مێژوویی و گرنگە لەگەڵ چەند بەڵگەنامەیەکی تر هەموو یان بەرپەرچی ئەو ئیدعا و نووسینانەی ئەرمەنییە شۆڤینیستەکان دەدەنەوە کە لە سەدان پەرتووك و وتاردا بلاوکراونەتەوە. کوردناسەکانی سۆڤیەتیش کە هێندێکیان ئەرمەنی و ژمارەیەکی زۆریشیان رووس و کورد بوون، بۆ ئەوەی تاوانی دەوڵەت و سوپاکەیان ئاشکرا نەکرێت و لە قاو نەدرێت، بەپێچەوانەوە باسی پەیوەندییەکانی کورد و ئەرمەن دەگێڕنەوە. بەداخەوە هەندێ نووسەری کوردیش بە پشت بەستن بەم سەرچاوانە کوێرانە پاکانەیان بۆ کردوون.

شاخۆڤسکی دەڵێ پاش کارەسات و تراژیدی بە کۆمەڵ کوژی کوردان بەدەست ئەرمەنییەکان کوردەکان وازیان لە لایەنگری کردنی رووسیا هێناو چیتر تەسلیمی ئێمە نەدەبوون و کەوتنە پشتگیری تورکیا . بەراشکاوی وتەی سەرکردەکانی فەوجە حەمیدییەکان دەگێڕێتەوە کە هاتوونەتە ریزی سوپای رووسیا و بە دەستی ئەرمەنەکان لەناوبراون، چەند نەفەر لەوانە خۆیان دەرباز دەکەن و دەتوانن بگەنەوە کوردستان و لەوێ بەکاربەدەستانی رووسیان وتووە ئێمە نەمانزانی ئەرمەنەکان رووسیا بەڕێوە دەبەن. نووسەر باسی کوشتنی ئەوانەش دەکات کە تەسلیم بوون، دەڵێ: ئەو کوردانەی تەسلیمی سوپای ئێمە دەبوون ئەرمەنییەکان بە دیلی ڕایان نەدەگرتن هەر لەوێ دەیانکوشتن. بۆیە ئێستا کەسیان تەسلیمی سوپای رووسیا نابن، تا دوا تنۆکی خوێن بەرگری لە کەرامەت و ناموس و خاکی خۆیان دەکەن، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی

پێشڕەوی سۆپای رووس لە کوردستان زۆر زەحمەت بێت. کەچی دەڵێ سەرەڕای ئەو هەموو تاوانەش کوردەکان نەکەوتنە دژایەتی رووسیا. دەیانزانی ئەمە سیاسەتی رووسیا نییە، سەرئەنجام داوا دەکەن هەر هێزێك کە دەنێردرێت بۆ کوردستان نابێ ئەرمەنیان لەناودا بێت، ئەم کردەوانەی دەستە چەکدارەکانی ئەرمەن و سوپای رووسیا هەر لە سەرەتای شەڕەوە لە ئارا دابووە، من نامەوێ لێرە بە درێژی بچمە ناو ئەو باسەوە.

نووسەر دەڵێ سەرەڕای ئەو تاوانانەی دەرحەق بە کورد کرا، ئێمە بە یارمەتی کامیل بەگ لە بەهاری ١٩١٧ راپەڕینی کوردەکانی بۆتانمان وەگەڕخست کە زیانێکی یەکجار گەورەمان بە سوپای تورك گەیاند، کوردەکانی دەرسیمیش زۆر یارمەتیان داین.

نووسەر دان بەو راستیەش دادەنێت و دەڵێ: کوردەکان لەبیریانە چۆن ژەنەراڵ ئاندرەیڤسکی لە تێکشکاندنی سمکۆدا بەشداری کردووە و دەشزانن بالوێزی ئێمە لە سەر ئەوەی تورکیا داخوازی ئێرانی لەمەڕ بەدەستەوەدانی سمکۆ جێبەجێ نەکردووە، بە توندی ڕەخنەی لەتورکیا گرتووە. دەریدەخا دڵڕەقی رووسەکان بەرامبەر بەرێبەرانی کورد چۆن بووە، ئەویش سمکۆ کە هەر بە قسەی خۆیان لە شەڕدا گەلێك یارمەتی رووسیای داوە و تەنانەت جاریکیان هێزێکی گەورەی رووسیای لە گەمارۆی هێزەکانی تورك رزگار کرد. بەڵگەی تر کە نووسەر تاوانی هێز و رێکخراوەکانی ئەرمەن بەرامبەر بە کورد دەردەخات ئەوەیە کە دەڵێ: پاش ئەوەی تورکە گەنجەکان لە ساڵی ١٩٠٨ هاتنە سەر دەسەڵات، بۆ کورد و ئەرمەن شتێکی باشیان نەکرد هەردووکیان لە کۆبوونەوەیەك بڕیار و سوێند دەخۆن کە پێکەوە بۆ گەیشتن بە مافی خۆیان خەبات بکەن، بەڵام ئەم یەکیەتیە زۆری نەخایاند و ئەویش تاوانی داشناك سوتونەکان بوو کە پلانی ئەرمەنستانی گەورەیان هێنایەکایەوە کە کوردستانی دەگرتەوە و چۆن لەگەڵ پارتی ئیتحاد و تەرەقی بەبێ ئاگاداری کوردەکان پەیمانیان بەست و دوژمنایەتی هاوبەشیان دژی کورد دەست پێکرد ئەم راستیەش لە چەند بەڵگەی تردا ئاماژەی پێکراوە.

هاوکاری ئەرمەنەکان لەگەڵ تورك بوو بە هۆی ئەوەی تورکەکان لە ساڵی ١٩١٤ راپەڕینی کوردەکانی بەتلیس سەرکوت بکەن. نووسەر لە درێژەی راپۆرتەکەیدا پەردە لەسەر تاوانێکی تری فەرماندەکانی لەشکری خۆیان لادەبا ئەویش ئەوەیە: عەبدولڕەزاق و سەید تەها کە لە لایەن سمکۆوە لە دەست هێزەکانی تورك ئازاد دەکرێن و دێنە کوردستانی رۆژهەڵات و پێکەوە

پلانی راپەڕین دادەنێن و لە سەرەتای شەڕیشەوە پێکەوە هاوکاری هێزەکانی رووسیا دەکەن، بە تاوانی پەیوەندیان بە تورکیاوە دەگیرێن و رەوانەی تیفلیس دەکرێن. لەوێ لەگەڵ سمکۆ زیندانی دەکرێن. پاشان دەزانن کە خەڵکی ناوچەکە بە تایبەتی کوردەکان لەم کردەوەی فەرمانبەرانی رووسیا نارازین و داوای بەردانیان دەکەن و بگرە هەرەشە لە هێزەکانی رووسیا دەکەن، مەترسی ئەوەشیان لێدەکرێ کە بۆ دەربازکردنیان دوورنییە یارمەتی لە تورکان وەربگرن. ناچار سمکۆ ئازاد دەکەن، لایەکی تر بە هیوا دەبن کە سمکۆ دژی تورك شەڕیان بۆ بکات. هەروەها دەڵی پاش ئەوەی هێزەکانیان لە ئێران دەکشێنەوە و چەك و کەرەستەی زۆر لە پاش خۆیان بەجێ دەهێڵن کەدەکەوێتە دەست ئەرمەنی و ئاشوریەکان، بەم چەکە ئەوانیش دەکەونە شەر دژی سمکۆ و دەیانەوێ دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرن. سمکۆش بەرەنگاریان دەبێت، پاشماوەی هێزەکانی رووسیای قەیسەریش کە دواتر ناویان بە گاردی سپی دەرکرد، دژی رژێمی بەلشەویکی بە هاوکاری قەزاقە رووسەکان لە سوپای ئێراندا خز مەت دەکەن، ئێرانیش ئەو هێزانەی بە سەرۆکایەتی ژەنەراڵ فیلی پۆڤ دەنێرێتە شەڕی سمکۆ. مامەڵەی رووسەکانیش لەگەڵ عەبدولرەزاق و سەید تەها لە بەڵگەنامەکاندا زۆر نامرۆڤانەیە، سەرنجی خوێنەر بۆ بەسەرهاتیان دەهێڵمەوە بۆ بەڵگەکان. سەید تەها کە زۆر کەین و بەینی لەگەڵ رووسەکاندا هەبوو، لەگەڵ سمکۆ دەست بە داوێنی شێخ مەحموود دەبن لەگەڵ رووسەکان تێکی نەدا. بە گوێرەی بەڵگەنامەکان، ئەرمەنەکان بوختان بە عەبدولرەزاق دەکەن و دەنێردرێ بۆ رووسیا و لەوێ زیندانی دەکەن. پاش کودەتاکەی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ ئازاد دەبێ و دەگەرێتەوە بۆ باوەشی دوژمن واتە تورکیا، ئەوانیش دەینێرن بۆ موسڵ و بۆ ئەوەی لەکۆڵییان بێتەوە لەوێ تورکەکان ژەهر خواردی دەکەن. تاوانی کوژرانی ئەو کەڵە پیاوە کە تورکەکان کون بەکون بە دوایدا دەگەڕان، دەکەوێتە سەرشانی رووسەکان. لەو کاتەدا کە سەید تەها و عەبدولرەزاق بە تەمای هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی بەربڵاو دەبن لە هەمو پارچەکانی کوردستان، رووسەکان دەیانگرن و هەر یەکەیان لە شارێکی رووسیا زیندانی دەکەن، سمکۆی بێ کەس ئەمجارەش بە تەنیا دەمێنێتەوە و لە هەمو لایەکەوە و بە تورك و فارس و رووس گەمارۆ دەدرێت.... شۆڕشی مەزنی کوردستان هەرەس دێنێ. لە راپۆرتەکاندا باسی بەشداری و هاوکاری کوردەکان دەکرێ لە شەڕی کریم شان بەشانی سوپای رووسیا دژی لەشکری تورك، تەنانەت هەندێ لە فەرماندە کوردەکان نیشان و مەدالیایان پێ دەدرێت. پاش شەڕی کریمیش چەند راپەڕینێك بە

ڕێنوێنی ڕووسیا بۆ لاوازکردنی تورکیا لە کوردستان ڕێك دەخرێت. ئەمە چەند وێنەی خزمەتی کوردە بە ڕووسیا کە هەزاران ڕۆڵەی قارەمانی کورد لە پێناوی ڕووسیا و سەرکەوتنی بەسەر دوژمن و نەیارانیدا گیانی خۆی بەخت کردووە، ئیتر باسی کاولکردنی کوردستان و ڕاگواستن و کوشتنی کورد بە بیانوی لایەنگری کردنی ڕووسیا لە لایەن دەسەڵاتدارانی تورکەوە، ناکرێت. کامیل بەگ هەرچی خزمەت و هاوکاری کوردەکانە لەگەڵ خزمەتی خۆی و بنەماڵەکەی بۆ نوێنەرانی سۆڤییەت دەهۆنێتەوە، کەچی بێ کەڵك دەبێت و لە ئەنجامدا شاخۆڤسکی لەراپۆرتەکەیدا کە ئاراستەی دەکات دەڵێ: (پاش کودەتای بەلشەویکەکان لە ڕووسیا) فۆرمی سیستەمی بەڕێوەبردنی ڕووسیا لەلای کامیل بەگ گرنگ نییە، بۆی گرنگ نییە کێ لە ڕووسیا لە سەر دەسەڵاتە، چونکە ئەو خزمەتی سیستەم یان دەوڵەت ناکات بەڵکو هی ڕووسیا و بەرژوەندی نیشتیمانەکەی دەکات. مەبەست لە نووسینی یان بەبیرهێنانەوەی هەندێ بابەتی گرنگ لەم بەشەی بەڵگەکان بۆ چەند مەبەستێك بوو. کە سەرەکی ترینیان ئەوەیە: لەم بارووددۆخەدا بەو هەموو بەڵگە زیندوو و نهێنیانەوە، پەنابردن بۆ بەلشەویکەکان نە تەنیا هەڵەبووە بەڵکو تاوان وخۆ هەڵدێران بووە....ئەو کەسایەتیانەی کورد کە پەیوەندییان بە ڕووسیا و بەلشەویکەکانەوە هەبووە دیل یا بارمتەی شۆڕشی کورد بوون لەلای ڕووسیا. ئەو هەموو زیانەی بەلشەویك و ڕووسەکان بە بزووتنەوەی کورد و کەسایەتیەکانی گەیاندووە وەك سمکۆ و سەید تەها و عەبدولڕەزاق یا چارەنووسی خەماوی کامیل بەدرخان و خالید بەگی جەبرانلی و ... بۆ شێخمەحمود شاراوە نەبوون، ئەدی لەسەر چ بنچینە و بنەمایەك پەنا بۆ بەلشەویکەکان دەباو داوا دەکا دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن، نەك هەر نەدەبوو ئەو کارە بکا بەڵکو دەبوو هەتا بۆی دەکرێ لێیان دوورکەوێتەوە، هەڵویستی نێگەتیڤی شێخ مەحموود تراژیدیای هەموو سەدەی بیستەمی گەلی کوردی بە دواوە بوو کە هێشتا پێیەوە دەناڵێنێ. شێخ چ هەڵویستێکی باشی، زیندوو، زارەکی، دیبلۆماسی، سیاسی، ماددی یا سەربازی لەوانە بینیوو.

لەو قۆناغە چارەنووس سازەی گەلی کورددا کە بەشێك لە نیشتیمانەکەی لە لایەن نەیاران و دوژمنانی بەلشەویکەکانەوە ئازاد کرابوو، گەورەترین داگیرکەر و دوژمنی کوردیان دارزاندو پەل پەلیان کرد بوو، خاوەنی بڕیاڕی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان و جەنگ و ئاشتی جیهانی بوون، دبلۆماسیەت و ئابووری جیهانیان لەدەسدا بوو، و بەشێکی کوردستانیان لە دەست

درێژی تورك پاراستبوو، پەنابردن بۆ بەلشەویکەکان، خۆکوشتن بوو. وەنەبێ شتەکان بە پێی پێوانەی ئەمڕۆ مەزندە بکەین، بەڵکو هەر ئەو دەمەش هەر دیاربوو. سمکۆ، سەید تەها، مستەفا پاشا یا مولکی، شەریف پاشا، سەید عەبدولقادر نەهری و ... دەست بە داوێنی شێخ بوون بەڵام ئامۆژگاری و ڕێنوینەکانی ئەوانی لەهی ئوزدەمیر و مستەفا کەمال پێ بەنرختر نەبوو. گریمان بەلشەویکەکان بۆ هاندان و ئاژاوەنانەوە یارمەتی چەك و دراوی شێخیان دابا، ئایا ئینگلیز و هاوپەیمانەکانی دەیان هشێت دەسەڵاتێکی دەستەمۆی بەلشەویکەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دابمەزرێت؟ ئایا کورد دەیتوانی بەربەرەکانی ئینگلیز بکات؟ جگە لەوە شێخ و هاوبیرەکانی لە خۆیان نەپرسیبوو ئەگەر بەراستی بەلشەویکەکان ئەوەندە خێرخوازن بۆچی کیانێك لە تورکیا بۆ کورد داواناکەن؟ یا کەمال و ئەزدەمیر بۆچی هیچ شتێك بە کوردەکانی ژێر دەستی خۆیان ڕەوانابینن؟ ئەمانە و دەیان پرسیاری تر... لە ڕاپۆرتێکی تردا ئارالۆڤ سەفیری سۆڤیەت لە ئەنقەرە لە ساڵی ١٩٢٢ دەنوسێت:

کاتێك بۆ لێکۆڵینەوە چووبوومە کوردستان بۆ دۆزینەوەی نەوت لە ئەرزەڕۆم و وان /چوومە لای خالید بەگ شێروانشا و سەلیم بەگ لە مادراس و حوسێن پاشا لە پانوس و مێوانیان بووم، دەیانگوت ئەگەر لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا یا لە ساڵی١٩٢١ لە کاتی شەڕی یونان و تورکیا لەو کاتەی کە یۆنانییەکان تەواوی ڕۆژئاوای ئەنادۆلیان گرتبوو تا ئەنکەرە پێشڕەویان کردبوو کوردەکان یەکگرتوو بان دەیانتوانی دەوڵەتی خۆیان دابمەزرێنن. بەڵام ئیمڕۆ بە یارمەتی دەرەوە ئەم شتە سەرناگرێت. ئەم وتە بە نرخانەی ئەو بەرێزانە پێویستی بە لێکۆڵینەوە نییە و ڕاستیەکە و ناشاردرێتەوە. بەڵام کێ کوردی هاندا پشتی کەمالی پێشکەوتوخواز! بگرێت دژی ئیمپریالیزم، لە بەلشەویکەکان بەولاوە کە ڕێنوێنیەکانیان بۆ کورد ئەودەم وەك ئایەتی قورئان بوو لە سەردەمی هێرشی عەرەبان بۆ کوردستان و وڵاتانی تر. ئارالۆڤ خۆی یەکێك بووە لە دانەرانی سیاسەتی کوردی سۆڤیەت، گەشت و هەواڵ و زانیارییەکانی لەسەر کورد و چاوپێکەوتنی کوردەکان و فەرمانبەرانی سۆڤیەت، هەمووی لە خزمەت تورکە ڕەگەزپەرستەکاندا بووە، تا توانیویەتی کێشەی کوردی لە خشتە بردووە، بالوێز و کۆنسوڵەکانی ژێر دەستی وەك داموودەزگاکانی سیخوڕی کەمالی بووە. سەفیری سۆڤیەت دان بەوە دادەنێت، دەوڵەتەکەی لە پەیمانی لۆزان یارمەتی تورکیای داوە. دەڵێ دوژمنایەتی تورك بەرامبەر بە

سۆڤیەت لەهی عوسمانیەکان دژی رووسیای قەیسەری کەمتر نییە، سەرەرای ئەوە بە پێچەوانەی رووسیای قەیسەری ئێمە یارمەتیەکی زۆری تورکیامان داوە...

ئارالۆڤ پێشبینی کردووە: ئەگەر ئینگلیز دەوڵەتی کوردی دروست نەکا لە دژی ئێمە، تورکمان بەگژدا دەکات. پێشبینیەکەی راست دەرچوو. سەفیری سۆڤیەت دانیش بەوە دادەنێت کە هەڵسوکەوتی بێ ئەدەبانە، دوژمنانە، بێ مانا، بێ بنەمای فەرماندەکانی سوپای رووسیا کوردەکانی لە ئێمە زیز و تورەکردووە، دووبارە متمانە کردنیان بە ئێمە کارێکی ئاسان نییە. دیارە وتەی کورتی سەفیر زۆر شت دەگرێتەخۆ. گەرچی لە بەڵگەکانی تر ئاماژە بەو تاوانانەکراوە، بۆ وێنە هاندان و چەکدارکردنی ئەرمەنییەکان چ لە ریزی سوپای رووسیا و چ لە دەرەوە، قەتلوعامی کوردەکانی باکوور و کوردستانی رۆژهەڵات لە ورمێ و ساباڵاخ و شنۆ و سنە و کرماشان و سەردەشت و....کە ئەو تاوانانەیان تەنیا لەگەڵ تاوانی لەشکری داگیرکەرانی کوردستان وەك کەمال ئەتاتورك و رەزا شا بەراورد دەکرێت. قەزاقەکانی رووس وێنەی هەرە بێ رەحم و سەرکوتکەری رێکخراوی چەکداری و نیزامی سەدەی نۆزدە و بیست بوون کە تەنیا بە کوشتن و گرتن و دوورخستنەوە و پاکتاوکردن سەر کەوتنیان بە دەست دەهێنا، لە سێدارەدان لە پێش چاوی خەڵك هەتا ئێستاش زاربەزار و پشت بە پشت لە لایەن دانیشتوانی کوردستانی رۆژهەڵاتەوە باس دەکرێت، سەدان کەسایەتی ناوداری کوردیان هەر لە خۆی و ماکۆ و ورمێ و شنۆ و ساباڵاخ و سەقز و سنە و کرماشان و قەسری شیرین و خانەقین و لەسێدارەدا ... تۆمارکراوە.

هەندێ لە کاربەدەستان و فەرمانبەرانی رووسیا (سۆڤیەت) ئەو راستیانە ناشارنەوە و بەراشکاوی کێشەی رەوای کورد ئاراستەی سەرانی سۆڤیەت دەکەن، بەڵام قەت ئەم بۆچوون و پێشنیارانەی ئەوان کەلێنێکی سیاسەتی سۆڤیەتی سەبارەت بە کورد پڕ نەکردەوە و گوێیان نەداوەتێ یا نەبووە بەدەستوورێك وەك تێبینی رەچاو بکرێن. بۆ وێنە دەڵێن ئەگەر ئێمە ئامادە نەبین حیمایەی کوردستان لە لایەن رووسیاوە کە کوردەکان داوای دەکەن پەسەند بکەین، دەستبەجێ کوردەکان دەچنە باوەشی ئینگلیز کە مافی خۆیانە. یا دەڵێن کوردەکان دەسەڵاتی ئینگلیزیان لە هی تورك پێ باشترە. لە دواییدا دەڵێت گومان لەوەدانییە کە کوردستان دەبێ لە تورکیا جیابکرێتەوە، کێشەی کورد لە دەست تورکیا دەرچووە و خۆ ئەگەر ناچاریش بن دان

بە ئۆتۆنۆمی کورد دابنێن ناتوانن جێ بەجێ بکەن، چونکە ئەوان هیچ هەقێك نادەن بە گەلانی ژێر دەستی خۆیان، جگە لەوەش دەسەلاتدار و کاربەدەستانی تورك نیشانیان داوە کە بێ عیززەتن و توانای بەڕێوەبردنیان نییە. راپۆرت چی دەولەتەکەی خۆی ئاگادار دەکاتەوە کە کێشەی کورد لە کێشەی بوغازەکانی (تەنگە)ی دەریای رەش بۆ ئێمە کەمتر نییە و ئێمە نابێ بەرامبەر بە کێشەی کورد چاودێر و بێ لایەن بین. ئەگەر نەتوانین یارمەتیشیان بدەین نابێ لە خۆشمانیان دوور بخەینەوە. دراوسێتی ئێمە ئەوەدەم کوردستان دەبێت نەك تورکیا. بەلشەویکەکان نە تەنیا یارمەتیەکەیان ناتەواو و بێ لایەن نەبوو بەلکو هەم کێشەی کوردیان بەهۆی کامیل بەدرخان و خالید بەگی جوبرانلی و شێخ مەحموودەوە بەرەو هەلدێر برد هەم هێز و وزەی کوردی بەهۆی ئەوانەوە خستەژێر دەستی تورکیای داگیر کەر و پێشیان بە راپەڕین گرت، تەنانەت یارمەتی داگیرکەرانی کوردستانیشیاندا کە بە چەك و دراوی بەلشەویکەکان بزووتنەوەی کورد و پالپشتی سۆڤیەت نوقمی خوێن بکەن.

یەکێك لەو بەلگە بەنرخانە، وتوێژی نوێنەری بەتلیسە لە پەرلمانی تورکیا کە چەند جارێك بە نهێنی پەیوەندی بە کاربەدەستانی سۆڤیەتەوە دەکات واتە یوسف زیا بەگی کورد، لەدواییدا بیۆگرافیەکەی بە جیا پێشکەش دەکەین. زیا بەگ کە هەست بە هەموو پۆخلەواتی بەلشەویکەکان دەکات و دەزانێ پێویستە بەراشکاوی و نەترسان لەگەلیان بجولێتەوە هەندێ پرسیار و داخوازی دەخاتە بەردەمیان کە بە دلیان نابێت و چاوەڕێی هەلوێستێکی وا نەترسانەی لێ ناکەن، کە دەلێت کوردستان سیستەمێکی بەلشەویکی پەسەند ناکات. ئەم وتەیە بۆ ئەوان وەکو سوکایەتی کردن و لادان وەرگیراوە ئەویش لەوەدەمەی کە سیاسەتی بەلشەویکەکان ناردنە دەرەوەی شۆڕشی بەلشەویکی جیهان و پیادە و کۆپی کردنی سیاسەتی کیانی بەلشەویکی بۆ هەمووان، بووە. دیارە یوسف زیا بەگ لەبەر بارووودۆخی تایبەتی کۆمەلگای کوردەواری و جیهان و ناوچەکە ئەم شتەی کردووە کە کوردستان ئامادەی وەرگرتنی ئەو شتە نییە کە ئێوە دەتانەوێ بەسەریدا بیسەپێنن. لە لایەکی تر دەلێ: کوردستان ناتوانێت بچێتە چوارچێوەی رووسیای فیدرالیەوە، کوردستان دەبێ سەربەخۆبێت. وەنەبێ ئەم خالەشیان بە دل بوبێ، چونکە ئەو پەڕی هەولی بەلشەویکەکان بە روالەت و زارەکی، ئۆتۆنۆمی کورد بووە لە چوارچێوەی تورکیادا، کە هیچ هەنگاوێکیان بۆ هەلنەگرت. واتە یوسف زیا بەگ داوای سەربەخۆیی بۆ کوردستان دەکات، ئەو کوردستانەی بە پێی بۆچوونی بەلشەویکەکان نابێ بە

هیچ شێوەیەك لە ژێر حیمایەی هیچ وڵاتێکدا دروست ببێت، چونکە مەترسی بۆ ئەوان هەیە و دەبێتە پێگەی ئیمپریالیزم و پێچەوانەی رێبازی بەلشەویکە.

یوسف زیا بەگ ئینجا دەڵێ: ئایا دەوڵەتی سۆڤیەت دەتوانێ بەو مەرجانە یارمەتی کوردستان بدا؟ داوای وەڵام دەکات. دیسان چەند پرسیارێکی تر دەکا: ئەگەر تورك و فارس هێرشیان کردەسەر کوردستان ئایا رووسیا پارێزگاری لێدەکات؟ سۆڤیەت بەرامبەر بەو یارمەتییەی کە دەیدا بە کوردستان چی لە کورد دەوێت؟. یوسف زیا کە مرۆڤێکی زانا و تێگەیشتوو و نەترس بووە، دەیەوێ وەڵامی ئەم پرسیارانە وەرگرێت و کێشەی پەیوەندی کورد و سۆڤیەت روون یا یەکلا بکاتەوە. یوسف زیا بەگ لە چاوپێکەوتنەکانی تر زۆر شتی تر بۆ کاربەدەستانی رووسیا روون دەکاتەوە، لە خیانەت و تاوان و هەڵەکانی رووسیاوە بەرامبەر بە کورد بگرە تا بەشداری راستەوخۆ لە هەرەس پێ هێنانی بزوتنەوەکانیان.

**د. ئەفراسیاو هەورامی**

## بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

## وەزارەتی دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت: هاوڕێ پاستۆخۆڤ

**٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣**

ئەرستۆکرات و کەسایەتی سیاسی کورد و کەمال بەگ بەدرخان کە لە تیفلیس دەژی. لە نامەکەیدا داوای کردووە کە ئیجازەی بدرێتێ بچێت بۆ سوریا (دیمەشق)، هۆی رۆیشتنەکەی دەڵێ لەبەر دەست کورتی و خراپی ژیانە لە بارەی مادییەوە. لە لایەن بەشی دەرەوەی دەزگای پاراستنەوە (کا. گ. بی) رێی لێناگیرێت، بەڵام بەو مەرجەی رێگای گەڕانەوەی پێ نەدرێت. تکایە بیروڕای خۆتان لەم بارەوە رابگەیەنن[1].

(1) ф.О 132 onm 6.6 nan. 133 gono 288 jp. 23

## سەبارەت بە رۆیشتنی کامیل زیا بەگی بەدرخان

**هاوڕێی بەڕێز....**

**کانوونی دووەمی ١٩٢٤**

لە وەڵامی داواکاریەکەی ئێوە لە رۆژی ٢٥ی کانونی دووەمی١٩٢٣/ ژمارە ٤٧١٢٦ بە نهێنی پێتانی رادەگەیەنین کە لە لایەن کۆمیساری کاروباری دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت (وەزارەتی دەرەوە) هیچ بەرگرییەك لە رۆیشتنی کەمال بەگی بەدرخان کەسایەتی ناوداری کورد بۆ دەرەوە ناکرێت(1).

سڵاوێکی کۆمۆنیستانە

**چیچرین**

**وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت**

---

(1) ф.о 132 onma. 7 nan. 196 geno 362 jp. 370

## بۆ: هاوڕێیانی دەستەی کۆمسیاری کاروباری دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت (وەزارەتی دەرەوە)

لە سەر راپۆرتی هاوڕێ ئارالۆڤ، هاورێ شاخۆڤسکی پێشنیار دەکا کەڵك لە کەمال بەدرخان کە یەکێکە لە رێبەرانی بەناوبانگی کورد وەربگریت، نـاوبراو خـەڵکی بۆتانـە. ئێمـەش بـۆ ئـەو مەبەستە چووینە تفلیس کە بیبینین. ناوبراو لە بنەماڵەی بەدرخانەکانە، دەور و دەسەڵاتیان لە کوردستان زۆرە بەتایبەتی لە باشوور و ناوەندی کوردستان. لە سایەی کـەمال بـەدرخان لـەناو سوپای رووسیادا کوردەکانی بۆتان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا دژی تورکیا یارمەتییان داین، ناوبراو لە سوپای رووسیادا دەورێکی زۆری گێڕا بۆ سەرکەوتنی لەشکرەکەمان لە کوردسـتان. بە پێی راپۆرتی هاورێ لڤوفیچ لە ٢١ی شوباتی ١٩٢٣ هاورێ پانکراتۆڤ سـەرۆکی کۆمیتـەی تایبەتی پاراستن چاوی بە کەمال بەدرخان کەوتووە. هاوڕێیان بیرەوەری باشـیان لەگـەڵ کـەمال بەگ هەیە. کەمال بەگ بۆ کاروباری راگەیاندن ئامادەیە. بۆ رێکخستنی راپـەڕینی کوردەکـان دژی ئینگلیز، کەمال بەگ دەڵێ پێویستە سمکۆ و رێبەرانی تری کورد بانگ بکرێنە تیفلـیس، بۆ خۆی لە باری مادییەوە لە وەزعێکی زۆر خراپدا دەژیت، هاورێ لڤوفیچ بە پێویستی دەزانێ یارمەتی بدرێت. سەبارەت بە راگەیاندنی سـەرەوەی بەشـی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتی وەزارەتـی دەرەوەی سۆڤیەت لەگـەڵ راپـۆرتی ١٩٢٣/١٢/٢٠ داوای دەسـتوور و پێـشنیاری هاوڕێیـانی وەزارەتی دەرەوە دەکات(1).

**پاستۆخوف س. ك**

**سەرۆکی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت**

**٢ی مارتی ١٩٢٣**

---

(1) ф.о 132 onm 66 nan. 13 geno 288 JP. 109

## راپۆرتی هاوڕێ پاستۆخۆف

لە سەرەتای ئەم ساڵ کە کێشەی کورد پێویستی بەهەڵویستی ئێمە کرد وەزارەتـی دەرەوەی یەکیـەتی سۆڤیەت بە نوێنەرایەتی ئێمە لە (ئەنقەرە) و (تاران) بەم چەشنەی خوارەوەی دەستووری پێداین:

١- ئێمە کێشەی کورد بە کێشەیەکی نێونەتەوەی نازانین لەبەر ئەوە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لـە ژێـر پشتیوانی هەر کەس بێت، رەتیدەکەینەوە.

٢- بە هۆی ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵ سەرکردەکانی کورد هەمانە دەبـێ پێیـان بڵـێین: ئۆتۆنـۆمی بـۆ کوردستان دروشمێکە ئینگلیزەکان پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن، وەك کارتێکی براوە وایـە لـە دەسـتیاندا لـە کێشەی نێوان خۆیان و تورکیا بە کـاری دێـنن. ئیمپریـالیزمی ئینگلیـز بـە دروشمـی ئۆتۆنـۆمی بـۆ کوردستان لە ژێر حیمایەی خۆیدا، پاشماوەی کۆیلایەتی لە فـۆرمێکی گـرینگتردا بـۆ کـورد بـەدیاری دێنێ.

٣- کوردەکان دەبێ هەوڵ بدەن بە وتووێژی راستەوخۆ لەگەڵ دەوڵەتانی تورکیـا و فـارس، بەپەیوەنـدی لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئەو وڵاتانە بارو دۆخی خۆیان بەرەو باشی بگۆڕن.

بە بۆچوونی هاوڕێیانی وەزارەتی دەرەوە کە هاوڕێ شۆمیانستکی ئاراستەی کردووە، هەڵوێستی ئێمـە بەرامبەر بە کێشەی کورد بەم چەشنەی خوارەوەیە:

١- دەکرێ ئۆتۆنۆمی کوردستان لە ژێرحیمایەی ئینگلیز یا تورکیا بێـت وەلێ هـەرگیز نـابێ لـە ژێـر حیمایەی فارسدا بێت، چونکە دەبێتە هۆی (مەترسـیەکی سیاسـی و لەشـکری دژی بەرژەوندییـەکانی یەکیەتی سۆڤیەت)، بۆیە هەر پلانێك بۆ ئۆتۆنۆمیەکی ئەوتۆ دابرێـژرێت، دەبـێ بـە جیـدی تـاوتوێی بکەین.

٢- پێویستە ئێمە لە دابەشکردنی کوردستان بۆ باشووری (ئینگلیز) و باکووری (تورکیا)، ئاگادار بین:

ا- ئینگلیز هەوڵ دەدا باشووری کوردستان بخاتە سەر عێراق.

ب- تورکیا بیەوێ ئۆتۆنۆمی بداتە بـاکووری کوردسـتان بـۆ بەرژەوەندییـەکانی ئێمـە یـەکجار زیـان بەخشە.

ج- بۆ ئەوەی باشووری کوردستان بخەنە سەر عێراق ئینلگیزەکان دەبێ لەگەڵ سەرۆکایەتی دەوڵەتی فارس پێکبێن و پێکەوە دژی کوردەکانی ئێران ڕاپەڕن (کوردەکانی ماکۆ و ورمێ و سەلماس و هتد...)

ئێمە لە دژی ئۆتۆنۆمیین بۆ کوردستان، بە یارمەتی یا پشتیوانی هەر لایەك بێت. هەروا دژی چەك کردنی عەشیرەتەکانی کوردین، لەلایەن هەر کەسێکەوە بێت . زۆر بە قازانجە تایبەتمەندی جەنگاوەری عەشیرەتەکانی کورد بپارێزین و لەناویدا پڕۆپاگەندە بکەین کە بۆ ناسیۆنالیزمی کورد، سەربەخۆی عەشیرەتەکان، پێویستی ژیان و مانەوەیە.دەبێ پێیان بڵێین لایەنگری تورکیا یا ئینگلیز نەکەن چونکە مەبەستی ئیمپریالیزمییان هەیە، تێیان بگەیەنین کە ئینگلیز و تورك و فارسەکان دەیانەوێ بیانکەنە قوربانی ئامانجە سیاسی و سەربازییەکانی خۆیان. دەبێ بڵێین بەرژوەندییان لەوە دایە لەگەڵ دەوڵەتەکانی خۆیان بەجیا پێکبێن، تا بیانو بۆ هێرشی سەرکوتکەرانەی ئەو دەوڵەتانە نەڕەخسێنن . دەکرێ بڵێین لەگەڵ دەوڵەتی فارس لەسەر ئەم خاڵانە پێکبێن:

١- عەشیرەتەکان بە ڕەسمی دان بە دەوڵەتی فارس دابنێن.

٢- عەشیرەتەکان ئامادەبن لە ماوەیەکی دیاریکراودا هەندێ مالیات بدەن بە دەوڵەت.

٣- عەشیرەتەکان ئامادەبن بە گوێرەی پێویست سوار بە دەوڵەت بدەن و خزمەتی سەربازی بکەن.

هاورێ سۆمیاتسکی دەڵێ (ئاشکرایە یارمەتی و هاوکاری ئێمە بۆ کوردەکان لە چوارچێوەی تەنگی پڕۆپاگەندە بەولاوە ناکرێ ناوەڕۆکی سەربازی هەبێت )، وەك یارمەتیدان بۆ چاپکردنی چاپەمەنی و بەیاننامە و.... . پێشنیارەکانی هاورێ شۆمیاتسکی لەگەڵ دەستووری هاورێیانی وەزارەتی دەرەوەمان سەبارەت بە ئۆتۆنۆمیەك بۆ کوردستان و چارەسەری کێشەی کورد بە پێك هاتنی کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتانی تورکیا و فارس، یەکدەگرێتەوە، بەڵام لەم خاڵانەدا پێکناکۆکن:

١- دژی ئۆتۆنۆمی کوردستانی تورکیا دەوەستین.

٢- دژی چەك کردنی عەشایەرەکانی کوردین. ئەو شتە نوێیەی لە پێشنیارەکانی هاورێ شۆمیاتسکیدا هەیە ئەوەیە کە دژی لکاندنی باشووری کوردستان بین بە دەوڵەتی عێراقەوە.

بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت پێیوایە:

ا- دەبێ پاشماوەی دەرەبەگایەتی تا قۆناغی سەرمایەداری لە وڵاتانی رۆژهەڵات بنبڕ بکرێت.

ب- چونکە بەرژەوەندیمان لە هێمنایەتی ناوچەکەدا هەیە، نابێ نە دژی ئۆتۆنۆمی کوردستانی تورکیا و نە دژی چەك کردنی عەشیرەتەکانی کوردبین. ژیرانەیە، دوای دانی ئۆتۆنۆمی بە کوردستانی تورکیا بە هیچ شێوەیەك دەرفەتی ئەوە نەدەین لەگەڵ باکووری کوردستانی فارس یەك بگرێتەوە. دوور نییە ئۆتۆنۆمی کوردستانی فارس تێك بچێت یا بەو شێوەیەی لێ بێ کە هاوڕێ شۆمیاتسکی پێشنیاری دەکات. بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە گلەیی ئینگلیزەکانەوە هەیە واتە لکاندنی باشووری کوردستان بە عیراقەوە ((ئێمە هیچ بەرژوەندیەکمان نییە دژی راوەستن، چونکە ناکرێ هەموو کوردستان لە ژێر پارێزگاری ئێمەدا بێت، جگە لەوەی بەشێکی دەچێتە سەرعێراق باشترە بەشەکانی تری کوردستان پارچەپارچە بن. ئەم شتە لە بەرژەوەندی ئێمەیە و دەبێتە هۆی:

١- گێرە و کێشەیەکی جیدی نێوان تورکیا و عیراق و ئینگلیز، تورکیا سەرگەرم دەکات و ئیشتیای دەکاتەوە.

٢- عیراق (ئینگلیز) لاواز و هێزەکانیان بڵاوتر و بەرەی بەرامبەر وەستانیان زیاتر دەبێت. رەنگە ئەمەش لە بەرژەوەندی ئێمە بێت. لەسەر ئەم پرسیارانەی لێرە باسکراوە بەشی رۆژهەڵاتی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت داوا لە هاوڕێیانی دەستەی وەزارەتی دەرەوە دەکات لەم بارەوە فەرمانی خۆیان بدەن[1].

**یاستۆخۆڤ**

**سەرۆکی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت**

**٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣**

---

(1) ф.о 132 onma nan. 133 geno 288 JP 24-26

## هاوڕێی بەڕێز گۆرگی

پراکتیکی دوای سەری ساڵی نوێ ناچارمان دەکات یا وامان لێ دەکات بزانین فۆرمۆلی سیاسەتی ئێمە بۆ چارەسەری کێشەی کورد تاکوێ ڕاست دەرچووەو بۆ ڕاست کردنەوەی ئەم فۆرمۆڵە دەبێ چ بکەین؟

**یەکەم:** مەبەستی ناسیۆنالیستی کوردەکان بۆ دروست کردنی دەوڵەتێك لەم ساڵانەی دوایی لە خزمەت سیاسەت و بەرژەوەندی ئینگلیز و تورکیادا بووە. ئاشکرایە کوردەکان بەبێ یارمەتی مادی و سەربازی ناتوانن سەربەخۆ بمێنێنەوە ودەوڵەت دابمەزرێنن. بەم پێیە بۆ یەکیەتی سۆڤیەت ئەم پرسیارانە دێنەکایەوە: لەرووی سیاسیەوە تا چ رادەیەك لە بەرژەوەندی سۆڤیەت دایە بە پشتیوانی ئینگلیز یا تورك یا فارس لەم قۆناغەدا لە رۆژهەلات دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دابمەزرێت. لە راستیدا رەنگە بە پشتیوانی دوو دەوڵەتی یەکەم ئەم پرسە جێبەجێ بکرێت، وەلێ دەوڵەتی فارس جگە لە سەرکوت کردنی سوپایی و چەك کردن هیچ سیاسەتێکی بۆ چارەسەکردنی کێشەی نەتەوایەتی نییە و بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ ئامانجە نەتەوەییەکانی کوردان جێبەجێ بکات. بەم چەشنە ئەگەر چەتری پاراستنی تورك یا ئینگلیز بەسەر کوردستانەوە بێت بێ شك مەترسی سیاسی و لەشکری راستەوخۆی دەبێ بۆسەر بەرژەوەندییەکانی یەکیەتی سۆڤیەت، کەواتە دەبێ بە هەموو شێوەیەك دژی داشکانی کورد بین بە لای تورك یا ئینگلیزدا. من کارم بەسەر ئەوەوە نییە خەڵکی کام دەوڵەتن یا سنووری جوگرافیایان کوێیە چونکە هیچ دەورێکیان نییە.

**دووەم:** لەم دواییانەدا هەوڵ دەدرێت کێشەی کورد لە باشوور و باکووری کوردستان جیاجیا چارەسەربکرێ، تورکەکان دەیانەوێ چارەسەری کێشەی کورد لە باکووری کوردستان بگرنە دەست و سمکۆ بکەنە سەرۆکی ئەم بزووتنەوەیە و شاری (وان) بکەنە ناوەندی کوردستان، واتە دەیانەوێ ئۆتۆنۆمی بەرفراوان بدەنە کوردان.

بێ گومان ئەگەر بێتو ئەم کێشەیە سەرکەوتوانە چارەسەربکرێت و دەوڵەتی فارس بەردەوام بێت گووشار بخاتە سەر کوردەکان، کوردی ماکۆ و ورمێ و سەلماس دەچنە ژێر دەسەڵاتی تورکیا. لە سەرەوە من ئاماژەم بەوە کرد کە لە بەرژەوەندی ئێمە نییە کوردستان لە ژێر پارێزگاری تورکیا بێت و بەشێکی کوردستانی فارسیش بلکێت بە تورکیاوە. ئینلگیزەکان لە باشووری کوردستان دەیانەوێ بە پێی ئەو هەل و مەرجە سیاسیەی لە گۆڕاندایە چارەسەری کێشەی کورد بکەن.کە چەند مانگ لەمەوبەر دەیانەویست کێشەی کورد لەگەڵ ناوەندی کوردستان واتە سلەیمانی چارەسەر بکەن، ئیمرۆ بە پێچەوانەوە لەگەڵ ناوەندی عیراق واتە بەغدا چارەسەری دەکەن. تەنانەت لەگەڵ دەوڵەتی فارس سەبارەت بە چالاکی هاوبەش دژی کورد رێککەوتوون (بۆ وێنە لە ناوچەی سنە). بەم چەشنە ئینگلیز دەیەوەێ کوردەکان والیێ بکات لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ پێك بێن. ئەم دبلۆماسیەی هەڵیبژاردووە بۆ ئێمەش شتی باشی تێدایە: بیانووی ئەوەمان بە دەستەوە دەدا پروپاگەندە بکەین بڵێین: ئینگلیزەکان دەیانەوێ بە هەر شێوەیەك بێ چارەسەری کێشەی سەربەخۆیی کورد هەڵپەسێرن و بیخەنە ژێر دەستی دەوڵەتی خۆفرۆشی عەرەبی مەلیك فەیسەڵ. نابێ ئەو مەترسییە گەورەیەش پشگوێ بخەین کە ئینگلیزەکان بە یارمەتی فرۆکەی جەنگی و چەك دەرفەت بە دەوڵەتی فارس دەدەن عەشیرەتە کوردەکان سەرکوت و چەك بکەن تا ژمارەیەکیان بەرەو لای ئینگلیزەکان برۆن، ئێمە پێویستە بەو ئەنجامە بگەین: نەهێڵین کوردەکان بکەونە ژێر دەستی مەلیك فەیسەڵ و نەشهێڵین ئینگلیز و فارس لەسەر چەك کردنی کوردەکانی فارس رێککەون.

**سێهەم:** گومانی تێدا نییە یەکگرتنەوەی کوردەکان چ بە گشتی و چ بەش بەش بە پشتیوانی هەر لایەنێك بێت بۆ یەکیەتی سۆڤیەت زیانبەخشە، سەرەڕای ئەوەش دەبێ هەڵوێستی خۆمان لەسەر کێشەی کورد لەم کاتەدا دیاری بکەین، بەرەتکردنەوەی باڵی پارێزگاری هەر وڵاتێکی بێگانە بەسەر کوردەستاندا، دەبێ بزانین چەك کردنی کوردەکان بە قازانجمان نییە. عەشایەرە چەکدارەکانی کورد و خەسڵەتی جەنگاوەرییان لە چارەسەکردنی کێشەکانی رۆژهەڵات دەتوانن دەورێکی گرنگ ببینن. لەناوچوونی ئەم هێزە ریئاڵە لەم کاتەدا لە بەرژەوەندی ئێمەدا نابێت. ئەم هێزە لە کاتی پێویستدا وەك کێشەی نەتەوەیەکی چەوساوە دژی چەوسێنەران کەڵکی لێ وەردەگیرێ، بۆیە پێویستە ئێمە دژی چەك کردنی کوردەکان بین و هێزی جەنگاوەرییان بپارێزین و لەناویاندا پڕۆپاگەندەی مانەوەی سەربەخۆیی عەشایەرەکان بکەین کە بۆ ناسیۆنالیزمی

کوردی فاکتەری ژیانە، بلێین لایەنگری کردن لە تورکیا و ئینگلیز کە مەبەستی ئیمپریالستییان بەرامبەر ئێمە هەیە بێ کەڵکە. لاتان روونەو باش دەزانن لە بەرچی دەبێ سەرزارەکی یا بە پڕۆپاگەندە نەك مادی هاوکاری کوردان بکرێت. دەبێ هەوڵبدەین بۆ هێشتنەوەی وزەی جەنگاوەری عەشایەرە کوردەکان و رەتکردنەوەی پارێزگاری ولاتانی بێگانەی ئیمپریالیست و بە کوردەکان بلێین لەگەڵ دەوڵەتانی خۆیان هەر چۆنێك بێ پێك بێن. وەزارەتی دەرەوەمان لە کاتی خۆی شێوەیەکی ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانەی کوردییان تیادەژین بەدەستەوە نەداوە. بەڵام لە هەندێ بارودۆخی سیاسی تایبەتدا، کاتێك دەسەڵاتداری فارس هیچ رێگایەکی تر جگە لە شەڕ و شمشێر ناگرێتە بەر تا کوردەکان بکاتە گوێ لەمست و بیانخاتە ژێر دەستی خۆی، کاتێك وشەی ئۆتۆنۆمی و بابەتی ئەوتۆ لای فارسەکان جگە لە جوداخوازی هیچ مانایەکی تری نییە، کاتێك دەسەڵات لە دەست چینی فیودالْ دایە و بورژوازی فارسیش دەوری تێدا هەیە، زۆر زەحمەتە خەباتی کوردان بۆ مافی ئۆتۆنۆمی کوردستان لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیمڕۆی فارسدا بگاتە هیچکوێ. بۆیە من وای بۆ دەچم پروپاگەندە بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان لە ژێر دەسەڵاتێکی کۆنەپەرست و میلیتاری بێ بەزەیی فارس، وەك ئەوە وایە لە کاتی باران بەدوای هەتاودا بگەرێی. ئاشکرایە تاقە رێگا لەم سەردەمەدا ئەوەیە کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی پێك بێن و ئەویش لەسەر ئەم خاڵانە:

١- عەشیرەتەکان بە (فەرمی) دان بە دەوڵەتی فارس دا بنێن.

٢- عەشیرەتەکان ئامادەبن لە ماوەیەکی دیاریکراودا هەندێ ماڵیاتبدەن بە دەوڵەت.

٣- عەشیرەتەکان ئامادەبن بە گوێرەی پێویست سەربازی سوارە بدەن بە دەوڵەت و خزمەت بکەن.

ئاشکرایە ئەم رێککەوتنە ناتوانێ کێشەی کورد چارەسەر بکات. بەڵام دەبێ ئێمە هەموو چەشنە پلانێکی کۆنکریتی چارەسەری کێشەی کورد کە زیان بە سیاسەتی ئێمە لە رۆژهەڵات دەگەیەنێت، وەدوابخەین، بە کورتی:

ئێمە نابێ دەرفەتی ئەوەبدین کوردەکان بەرەو ئینگلیز یا تورکیا بڕۆن، نابێ رێگە بدەین کوردەکان سەرکوت یا چەك بکەن ئیتر لە لایەن هەر کەسێکەوە بێت تورك، فارس یا ئینگلیز.

دەبێ هەموو هەوڵی خۆمان بۆ بەهێزکردنی عەشایەرەکانی کورد وەگەڕبخەین و پەیوەندی نێوانیان زیاتر بەهێز بکەین، تا لە کاتی پێویستدا بتوانن پێکەوە بەرەنگاری بکەن، تا تورك و ئینگلیز و فارس نەتوانن بۆ مەبەستی سیاسی یان سەربازی خۆیان کەڵکیان لێ وەربگرن. دەبێ پێیان رابگەیەنین دەوڵەتانی ناوبراو هەوڵ دەدەن کورد بۆمەبەستی سیاسی و لەشکری خۆیان بە کاربێنن. و تێیان بگەیەنین و پروپاگەندە بکەین کە تەنیا رووسیای سۆڤیەتی توانیویەتی ئاشتیانە کێشەی ئاڵۆزی نەتەوایەتی لەناو وڵاتەکەی خۆی چارەسەربکا، هیچ بەرژەوەندییەکی لە چەوساندنەوەو سەرکوتکردندا نییە. دەبێ کوردان بۆ بەرژوەندی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتەکانیان بەجیا لەسەر هەندێ شت پێك بێن تا بەم چەشنە پێش بە هێرشی سەرکوت کەرانەی ئەو دەوڵەتانە بگرن. ئاشکرایە یارمەتی و هاوکاری ئێمە بۆ کورد ناکرێ ناوەڕۆکی لەشکری هەبێت، تەنیا دەتوانێ لە چوارچێوەی تەنگی پروپاگەندە دابێ وەك یارمەتیدان بۆ چاپ وبلاوکردنەوە و....... .*

لەگەڵ سلاوی کۆمۆنیستانەدا

**شۆمیاتسکی**

## بۆ: کۆنسوڵی سۆڤیەت هاوڕێ پاتۆخۆڤ

**ژمارە ٤٠٧ نهێنی**

ئێستا کە نوێنەرانی شێخ مەحموود لە (ئەنقەرە) لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا خەریکی وتووێژن، تورك ئەم وتووێژە وەدوادەخەن. بیانۆشیان ئەوەیە گوایە نازانن کۆنفراسی لۆزان چۆن کۆتایی پێ دێ، لە لایەکی ترەوە چاوەڕێی دەست بەکاری مەجلیسی نوێن تا بڕیار بدا. شێخ مەحموود خەریکە لە ئینگلیز دوور دەکەوێتەوەو هەوڵ دەدا نەهێڵێ دەس لە کاروباری کوردستان وەربدەن. هەر لەسەر ئەم هەڵوێستەی شێخ دوو بەرەکی کەوتۆتە ناو دەوڵەتی کوردی و بنەماڵەکەی. شێخ مەحموود دژی پشتیوانی ئینگلیزە بۆیە لەگەڵ تورکان کەوتۆتە وتووێژ. بەشێکی تری کورد بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادر و سەید تەها دەیانەوێ کوردستان بکەوێتە ژێر رکێفی ئینگلیز. شێخ مەحموود ئێستا کە بەرەو لای تورکیا دەڕوا کەمتر لاگیری رووسیای سۆڤیەتی دەکا. ئینگلیزەکان لەهەموو شتێك ئاگادارن، دەزانن شێخ مەحموود داوای یارمەتی لە ئێمە کردووە. ئەوان دەیانویست کۆنگرەیەك بۆ کوردەکان بە سەرۆکایەتی سەید تەها رێك بخەن بەلام سەری نەگرت. دوای ئەمە بوو ئینگلیزەکان داوای وتووێژیان لە شێخ مەحموود کرد. بەلام شێخ ئامادە نەبوو بچێتە بەغدا. بۆیە ئینگلیزەکانیش بە دوژمنی خۆیان دانا و دژی جولانەوەکەی وەستان، سلێمانیان بۆمباران کرد. شێخ بۆ بەرگری کردن لە وێرانی، شاری سلێمانی بەجێهێشت و لەگەڵ سمکۆ پەنای بردە بەر چیاکان. دوورنییە چووبنە رەواندز تا لەوێ لەگەڵ تورکەکان بکەوێتە وتووێژ. ئەوە بوو دواتر دەستەیەکی نوێنەرایەتی خۆی ناردە ئەنقەرە. پێگەی ئینگلیزەکان لە سلێمانی و کەرکوك لاواز بووە.

دوای ئەوە ئینگلیزەکان ناوچە کوردەکان بەجێ دەهێڵێن، بۆ ئەوەی خۆیان بۆ هێرشێك بۆ سەر شێخ مەحموود ئامادەبکەن. تورکەکان بەرواڵەت دۆستی کوردانن، تورکیا خۆی خەریکی ئامادەکردنی هێزە بۆ لەناوبردنی ئایدیای سەربەخۆیی کوردستان.

تێکڕای ئەم شتانە ماوەتەوە سەر پێکهاتنی ئینگلیز و تورکیا. رۆژنامەکانی عەرەبی باسی هەلاتنی کوردەکان دەکەن بۆدیرالزوری ژێردەسەلاتی فەرەنسیەکان لە سوریا. لایەنگری شێخ بۆ

تورکیا بەو مانایە نییە کۆمەڵانی کورد لایەنگری ئەم شتەن. لایەنگری تورکیا لەناو کوردەکانی موسڵ لەبەر هەندێ هۆی مێژووییە:

تا سەردەمی خەلیفەی عوسمانی، کەرکوك و سلێمانی سوپای خەلیفەی عوسمانی لێ بووە و لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکە تارادەیەك لەناویەکدا قاڵبوونەتەوە، لە شوێنەکانی تر ئەم دیاردەیە بەدی ناکرێ .... .

ئێوە دەبێ ئاگاداری پەیوەندی کورد و وتووێژەکانیان بن لەگەڵ تورکیا، لە لایەکی ترەوە نابێ ئەو پەیوەندییە گوایە باشەی کوردەکان لەگەڵ رووسیادا لەبەرچاو نەگرن، دەبێ لە خیانەتی ئینگلیزەکان بەرامبەر بە کورد کەڵك وەربگرن تاهەست و سۆزییان بەرامبەر رووسیا قوڵتر بێت. بەڵام پروپاگەندە کردن لەسەر لایەنگری کردن لە رووسیا لەناو کوردەکان جارێ نابێت بکرێت، چونکە کاتی خۆی نەهاتووە. دووریش نییە مستەفا کەمال پاشا ئەو بۆچوونە بە پێویست بزانێ و جۆرە ئۆتۆنۆمیەك بدا بە کوردان. هەرچەند نیازی ئەم شتە بەداخەوە جارێ زۆر لاوازە. لەبەر پەیوەندییەکانی ئێمە لەگەڵ تورکیا و دەوڵەتی فارس، ناوەند (مۆسکۆ) رای وایە نابێ هەوڵی (جیاخوازی) کوردەکان پەرە پێ بدەین، بەڵکو پێوستە هیواداریان بکەین بە ئۆتۆنۆمی رازی بن، ئەویش بەمەرجێك سەربەخۆیی تورکیا بپارێزرێت. جارێکی تر دووپاتی دەکەینەوە تکایە هیچ هەنگاوێك هەڵمەگرن دژی ئەم دەستوورەی ناوەندبێت* .

بەسلاوێکی کۆمۆنیستانە.

**روزینبێرگ. م**

**سکرتێری بەشی رۆژهەڵاتی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت.**

---

* هەمان سەرچاوە ل ٣٩-٤١

## له وەزارەتی دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت

### بۆ: هاوڕێ قەرەخان

لەمەڕ کێشەی کوردو بەپێی وتووێژی دیبلۆماتەکانمان لەگەڵ سەرکردە و کەسایەتیەکانی کورد، سەرنجتان بۆ ئەم شتانەی خوارەوە رائەکێشین:

١٩ی مارتی ئەمساڵ 1923 دەستەیەکی نوێنەری نوێی دەوڵەتی باشووری کوردستان هاتنە تەورێز کە دەیانەوێ بە خاکی ئێمەدا لە قارس-ئاگور، بۆ وتووێژ لەسەر چارەنووسی کوردستان لەگەڵ دەوڵەتی تورك وتووێژ بکەن. ئەم دەستە نوێنەرایەتیە لەم کەسانەی خوارەوە پێك هاتووە:

١- ئەفسەری پێشووی تورکیا کاپیتانی سوپای شێخ مەحموود (فەتاح).

٢- سەرۆکی فێرگە (قوتابخە)ی سلێمانی راپیس بەگ.

٣- ئەحمەد تەقی، ئەمانە لەگەڵ کاپیتانی دەزگای پاراستنی سوپای تورکیان بە سەرۆکایەتی ئوزدەمیر پاشا کە کابرایەکە بەناوی فەوزی بەگ[1].

١٩٢٣/٧/٢٦

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٤٢

**بۆ: کۆنسۆڵی یەکیەتی سۆڤیەت لە بایەزید هاوڕێ مالسۆڤ**

**بۆ: کۆنسولی یەکیەتی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم هاوڕێ پاڤلۆڤسکی**

**بۆ: کۆنسۆڵی یەکیەتی سۆڤیەت لە فارس هاوڕێ تۆمانۆڤ**

**بۆ: کۆنسۆڵی یەکیەتی سۆڤیەت لە میرسین هاوری پلاتوڤ**

راپۆرتە دوور و درێژ و سەرنج راکێشەکانی ئێوە لە ٢٢ی شوباتی ئەمساڵ ژمارە ٥٩/نهێنی مان پێگەیشت. بە گشتی ئەو لێکۆڵینەوەی ئێوەمان لا پەسەند بوو سەبارەت بە بارووذۆخی کوردستانی تورکیا و فارس و ئامادەیی کوردەکان بۆ راپەڕین دژی تورکیا. پێویستە ئێوە سەرنجی تایبەتی بدەنە روونکردنەوەی ئەم پرسیارانەی خوارەوە سەبارەت بە تاقی کردنەوەیان کە هەرکام سوودی خۆی هەیە:

١- پڕۆپاگەندەو چالاکی سوپای تورکیا لە کوردستانی فارس بە تایبەتی لە ئازەربایجان روون بکەنەوە.

٢- چالاکی هاوبەشی تورکیا و فارس لەسەر کێشەی کورد، لەوانە چالاکی هاوبەشی فارس و کوردەکان، ئەو پەیوەندییانە تاکوێ راستن؟، ئایا تورك پلانێکی ئاواشیان لەگەڵ ئازەربایجانیەکاندا هەیە؟.

٣- پەیوەندی کوردەکان، هەم سەرکردە و هەم کۆمەڵانی خەڵك لەگەڵ ئینگلیز، ئەم دەنگۆیانە تاچ رادەیەك بە هێزن؟، هەڵوێستیان بەرامبەر رووسیا چۆنە؟

٤- وادیارە لە کوردستانی تورکیا رێکخراوێکی کوردی هەیە هەموو کوردەکانی تورکیای یەکخستوە و رێبەرایەتیان دەکات. زۆر گرنگە بزانن ئەم شتە راستە یان نا، ئەوسا دەبێ بزانرێت کێ سەرکردایەتی دەکات و لە کوێدا، هەوڵ بدرێت لەم بارەوە پەیوەندی ئەم رێکخراوە لەگەڵ شێخ مەحموود و ئینلگیزەکان و رووسیا روون بکرێتەوە و لایەنگری کامەیان بەهێز و لە دڵەوەیە. ئەگەر دەوری ئەم رێکخراوە بزانرێت لە پەیوەندی گرتن بە دەوڵەتی کوردییەوە لە باشووری کوردستان، کارێکی باشە.

٥- ئاگاداری تەواوی جموجۆڵ و هەنگاوە گەورەکانی تورکیا بن هەم لە کوردستانی تورکیا و هەم لە کوردستانی فارس، چونکە نزیکبوونەوەی بەهار هاتووچۆ و پەیوەندی زیاتر دەکات. زۆرباشە ئەگەر بکرێت لە بانە و دیلمان و سابلاخ و ئەو دەڤەرە دەنگوباسی بە نرخ کۆبکرێتەوە. بەم چەشنە بارودۆخەکە بە راستی روون بکەنەوە.

بە دەستووری هاوڕێ ئارالۆڤ پێتان رادەگەیەنین: مۆسکۆ رێگەی داوە نامەکەی ئێمە وەك رەشنووسێك بێت بۆ کێشەی کورد نەك دەستوور (ژمارە ٢٥٢٢).

ئێستا هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر بە کێشەی کورد ئەوەندە روونە کە دەتوانین بڕیار بدەین یا سەرکرادیەتی بارودۆخەکە بکەین.هەڵویستی ئێمە سەبارەت بە یەکگرتنی کوردستانی تورکیا و فارس دەبێتەهۆی ئەوەی تورکیا و فارس دژمان بوەستن. ئەو شتە گرینگەی دەبێ ئێمە خۆمانی لێبپارێزین ئەوەیە: لەوانەیە هەندێ لە سەرکردەکانی کورد بە هۆی ئاژاوەگێڕی ئینگلیزەکان لە دۆستایەتی رووسیا و تورك کەڵك وەربگرن ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی رووسیا نەتوانێ دەس لە کاروباری کوردستان وەربدات . بەڵام لە لایەکی ترەوە نابێ چاو لەوە بقووچێنین کە بزوتنەوەی کورد زۆر پەرەی سەندووە بە هۆی ئەو دەنگوباسانەی کە ئینگلیزەکان بڵاویان کردۆتەوە کە سوپای یەکیەتی سۆڤیەت کوردەکانی سەرکوت کردووە ئەمەش لەوانەیە بۆ ئێمە خراپ بێت. گرنگە ئەم پرسیارە روون بکرێتەوە، بۆچی کوردەکان ئێمەیان واخۆشویستووە؟. بەشێکی دەتوانین بڵێین لەبەر ئەوەیە پشتیوانی ئینگلیزەکان بۆ کوردەکانی باکوور بە گوێرەی پێویست نییە .بۆ ئەوەی لەوەڵامی ئەم پرسیارە نزیك ببنەوە دەبێ دەنگوباسی ئەوەتان هەبێت لە کوردستانی ئینگلیز چی روودەدات. ئێمە ئاوامان نەکردووە و نازانین کە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان بە چ شێوەیەکە، ئایا ئیدارەیەکی عەرەبی دادەنێن؟، ئایا هەوڵ دەدەن کوردستان بخەنە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عیراق؟ ئایا ئینگلیزەکان پێش بە تاڵانکردن وراووڕووتی کوردەکان دەگرن؟.

ئەگەر ئینگلیزەکان هەوڵبدەن ئۆتۆنۆمیەکی بەرفراوان بدەن بە کورد زەحمەتە باوەڕ بکەین کە کورد چاویان بە ئینگلیز هەڵنایا، ئەمە تەنیا هەڵوێستێکی رواڵتییە! . کەوایە دەبێ بڵێین کوردەکان یاری بە ئێمە دەکەن و دەیانەوێ ئێمە لە تێکهەڵچوونی داهاتوودا لەگەڵ تورکیا و فارس هەڵپەسێرن. ئێمە لەناو پێشبینییەکاندا وون دەبین و نازانین کێ لەسەر بزووتنەوەی کورد کاریگەرە و رای گرتووە. لەبەر ئەم هۆیانە جارێ نابی لەمەڕ پشتیوانی رووسیا بۆ کوردستان قسە بکرێت و هتد.....

شتەکان بەروالّەت زۆر خۆش و جوانن، بەلاّم هێشتا لە ژێر پەروەردەی شك و گومان دان. مەبەستی سەرەکی دەولّەتی سۆڤیەت سەقامیگرکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکانی ولاّتە، ئێمە ناتوانین بۆ هاندانیان نەپارە و نەچەك بدەین، ئەگەر ئەم هاندانە بە قازانجی ئێمەش بێت، نازانین!. ئەم ئەنجامە نێگەتیڤە بە هیچ شێوەیەك گرینگی کاری ئێوە لەسەر لێکۆڵینەوەی کێشەی کورد کەم ناکاتەوە. بایەخی ئەم کێشەیە بە تەواوی (لە پرسی سمکۆ بەدواوە) لەبەر چاوە بۆیە هەمیشە پێویستی بە دەنگوباسی کێشەی کورد بە وردی و دەرخستنی داینەمۆی ئەم بزووتنەوەیە، هەیە. تەنیا دوای ئەوەی ئێوە ئەم ئەرکە بەجێ دەگەیەنن ناوەند دەتوانێ روونتر ئەو هەلّوێستە بگرێتەبەر کە پێوستە. بۆیە پێویستە بەردەوام پەیوەندی لەگەلّ کوردەکان هەبێت و لە هەمان کاتدا خۆیان رێگا نەدەن ئاژاوەگێرەکانی ئینگلیز و تورکیا لێیان نزیك ببنەوە. ئەم ئەرکە جێبەجێ کردنی زۆر ئاسان نییە، ئەم چەقەلانەی ئیمپریالیزم لە رۆژهەلاّت ( مەبەستی کوردەکانە) تێ بگەیەنن کە تا ئیش و کاری زۆرمان بۆ نەکەن نیگەرانی پەیوەندی نزیکی ئەوان و ئینگلیزین. لە هەمان کاتدا رووسیای شۆرشگێر هیچ کاتێك پرەنیسپی بەرزی چارەنووسی گەلانی نەگۆریوە و ئاشکرایە ناتوانێت دژی مافی چارەی خۆنووسین بێت بەلاّم بە مەرجێك لە بەرژوەندی ئنیگلزەکان نەبێت چونکە ئینگلیزەکان دەس لە کاروباری مافی چارەی خۆ نووسینی گەلانی موسلّمانی رۆژهەلاّت وەردەدەن و درندانە دەیان چەوسێننەوە و....

لەبەر ئەوە ئەم دەنگوباس و کەسایەتییە کراوانە بۆ داهاتوو یارمەتیان نادات، چونکە نیازی خۆیان دەرنابرن وناشکرێ بەرژەوەندییە مادییەکانیان نەزانرێت*.

**رۆزینبیرگ**

**سکرتێری بەشی رۆژهەلاّتی ناوەراستی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت**

---

* هەمان سەرچاوە ل ٤٣-٤٥.

## بۆ: هاوڕێ مالتسۆڤ کۆنسوڵی رووسیای فیدراتیڤ

تورکەکان داوای داخستنی کۆنسوڵخانەکانمان دەکەن. ئەم کردەوە زیانێکی گەورە بە ئێمە دەگەیەنێت و ڤیزا نادەن بە هاوڕێیانمان و داوای لابردنی مالتسۆڤ دەکەن و دەیانەوێ کۆنسوڵخانەی ئێمەش لە بایەزید دابخرێت.

....... ئێمە بایەخێکی زۆر بە بیروبۆچوونەکانی ئێوە دەدەین، لە راپۆرتەکانتاندا سەبارەت بە کێشەی کورد، بۆچوونی ئێمەش لەگەڵ ئێوە یەکە. بۆیە دەتوانم بڵێم: تەنیا لە بەر کاڵ و کرچی دۆستایەتی رووسیا و تورکیا کێشەی کورد پتر بایەخی پەیدا کردووە.تا لە مۆسکۆ لێکۆڵینەوە نەکرێت و بڕیار نەدرێت، ئێمە چیتر ناتوانین دەستووری سیاسیتان پێ بدەین. وەك ئامۆژگاری کەسایەتی خۆم دەبێ بڵێم ئێستا دووپاتی دەکەمەوە چیتر نابێ لەسەر کێشەی کورد ئێمە وەفاداری تورکان بین. دەبێ تێیانبگەیەنین کە ئەگەر ئەوان لە لایەن ئنیگلیزەوە گومڕا نەکرابان لە مێژبوو یارمەتیمان دەدان، پێیان بڵێین شەیتانە ئنیگلیزەکان دووژمنی ئیسلام و رووسیای سۆڤیەتین بۆیە ئێمە پشتیوانی تورکیامان کرد، چونکە تورکیا دژی ئینگلیز خەباتی کردووە.

....... کاغەز و بەڵگەکانی کۆنسوڵخانە بەشێوەیەك هەڵگرن بتوانن لە هەموو کاتێکدا لەناویان بەرن[1].

رۆزنبیرگ

---

(1) سەرچاوەی پێشوو ل ٥٨.

## راپۆرت

## بۆ: هاوڕێیانی دەستەی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت

هاوڕێ ئارالۆڤ بروسکەی ناردووە ئەندامی پەرلەمانی تورکیا نوێنەری بەتلیس واتە یوسف زیـا بەگ کە کوردە و یەکێکە لە سەرکردەکانی گروپی دووهەم ئامادەیە گروپی نوێنـەرانی خۆیـان لەپـەرلمانی تورکیـا بکاتـە گرووپـی رووس و کـورد. ئامادەیـە گـەرەنتی دەنـگ و بـاس و داواکارییەکان لە پەرلمانی تورکیا بۆ ئێمە بکات، هاوڕێ ئـارالۆڤ دەڵێـت پێویـستە پەیوەنـدی لەگەڵ ئۆپۆسزیۆن و کوردەکان بەهێز بکرێت[1].

**پاستۆخۆف**

**جێگیری بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وەزارەتی دەرەوە.**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٥٩

## بۆ: هاوڕێیانی وەزارەتی دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت

هەڵوێستی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت لەسەر کێشەی کورد لە گەڵاڵەی تێزەکان کە لە ٤ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣ دراوەتە هاوڕێیانی وەزارەتی دەرەوە بەم چەشنەی خوارەوەیە:

کێشەی ئۆتۆنۆمی کوردستان لە ژێر حیمایەی تورکیا بە زووترین کات بخرێتە بەردەستی دەوڵەتی تورکیا و بەگوێرەی ئەم گەڵاڵەیە بۆ پوچەڵ کردنەوەی دەوری ئینلگیز لەناو کوردەکان کاربکرێت. هاوڕێ ئارالۆڤ لە تێزەکانی چواری شوبات خۆی لەگەڵ بۆچوونەکانی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوە هاودەنگە و دەستنیشانی ئەوە دەکات کە پێویستە بەزووترین کات لەناو کوردەکان دەسبەکار بین، لە پێشدا لەناو سەرکردەکان. جگە لەوە بە پێی پێشنیاری ئەو دەبێ لە تیفلیس رێکخراوێکی تایبەتی بۆ ئەم کارە پێک بێت تا تێکرای کاروباری کوردستان وەئەستۆ بگرێت . هەروەها دەستەیەکی تایبەت بە مەبەستی لێکۆڵینەوە و روونکردنەوەی ئەم کێشەیە بنێردرێتە تیفلیس و لەوێش ئەگەر پێویست بوو هاوڕێیان روزنبیرگ و شاخۆڤسکی بنێردرێنە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا.

ئەم پێشنیارانە لە لایەن وەزیری کاروباری دەرەوەی رووسیای سۆڤیەتی لە رۆژی ١٩٢٣/٣/٨ بە یەکجاری رەتکرانەوە، دەستەی هاوڕێیانی وەزارەتی دەرەوە بڕیاریاندا:

«نە یارمەتی کوردە جیاخوازەکان دژی تورکیا و نە یارمەتی ئیمپریالیزمی تورک بدرێت . هاوسۆزی خەباتی کوردەکان بن دژی ئنیگلیز و ئامۆژگارییان بکەن دژی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا تێبکۆشن». بە گەیشتنی ئەم بڕیارە دەستووری پێویست بە هاوڕێ ئارالۆڤ و کۆنسوڵەکانمان لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی تورکیادا بدەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە نامەی دواییدا هاوڕێ روزنبیرگ (بە دەستووری هاوڕێ ئارالۆڤ) دەستنیشانی ئەوەی کردووە کە بەپێی دەستوور وتووێژێکی ئەوتۆ رێگای نزیك بوونەوەمان لە رێبەرانی کورد دەگرێت کە تورك و ئینگلیز بە

باشی دەزانن. لەم بارەوە هاوڕێ ئارالۆڤ (دژە گەلاڵە) یا تێزی نوێ لەسەر ئەم کێشەیە ئاراستە دەکات کەلە (٩) خاڵ پێکهاتووە. بەم پێیە:

ئەگەر رووسیا نەتوانێ چالاکانە لەم بارەوە بجولێتەوە، لانی کەم دەبێ پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ کوردەکاندا ببەستێت و بەپێی توانا یارمەتی هەندێ لە رێبەرانی کورد بدات تا بۆ داهاتوو هەست وسۆزیان بەرامبەر بە رووسیا راگرێت، چونکە لە داهاتوودا کوردستان دەبێتە دراوسێی ئێمە نەك تورکیا. بۆ ئەم مەبەستە ئێمە داوای دەستوورگەلی پێویست لە هاوڕێیانی دەستەی وەزارەتی دەرەوە دەکەین[1].

**پاستۆخۆڤ**

**سەرۆکی بەشی رۆژهەلاتی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت[2]**

**نیسانی١٩٢٣**

---

١- هەمان سەرچاوە ل ٦٤

٢- هەمان سەرچاوە ل٦٤

## له نامەی سکرتاریەتی نوێنەرایەتیمان له ئەنقەرە

### ٢٤ی مارتی ١٩٢٣

..... له مەڕ ئەو شتانەی له سەرەوە ئاگادارمان کردن سەرنجتان بۆ ئەوە رادەکێشین کە پێویستە کۆنسوڵخانەمان له ساوجبلاغ هەبێت، چونکە له بارووداۆخی کوردستانی ئنیگلیز ئاگادارمان دەکاتەوە، بۆ ئێمە زۆر گرینگە پەیوەندییەکانی کورد و ئینگلیزمان لا روون بێت.بە پێی بروسکەی ئێوە لەسەر کێشەی کورد نامەیەکی کورتمان له لایەن کۆنسوڵەکانەوە ئامادەکردووە[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٦٦

# له نوێنەرایەتی رووسیای سۆڤیەتی له تاران

## ٢٥ی مارتی ١٩٢٣ ژماره ٦٠٩

### دوایین رۆژەكانی مەلیكایەتی شێخ مەحموود

هەواڵی ناكاریگەری ئینگلیزەكان لەسەر شێخ مەحموود پێشتریش هەر هەبوو، بەڵام لەبەر نەبوونی زەمینەی تەواو نەدەكرا هەست بكەین كه شێخ مەحموود وا زوو دوایی به مەلیكایەتی خۆی دێنێت. سەركەوتنەكانی تورك، نارەزایی بەشێكی زۆر له مووچه خۆران له شێخ مەحموود و ئینگلیز، بێ ئاكامی هەوڵەكانی ئینگلیز بۆ بەكارهێنانی شێخ مەحموود وەك هێزێكی گەوره و ریئال دژی تورك، سەرئەنجام سەرنەكەوتنی شێخ مەحموود له راكێشانی عەشایەره كوردەكان بۆ لای خۆی، هەموو ئەمانه پێكەوه بوونه هۆی كۆتایی هاتنی خێرای ئەم پرسه. له سەرەتای مانگی شوبات تورك كه له بارودۆخی شێخ مەحموود ئاگادار بوون، (فەتاح ئەفەندی) ژن برای شێخ مەحموودیان نارده لای شێخ كه لای توركەكان وەك لێكۆلەر ئیشی دەكرد. هێنده بەسەر رۆیشتنەكەی (فەتاح ئەفەندی)دا تێ ناپەڕێ، شێخ مەحموود سمكۆ دەنێرێته لای توركەكان و ئەوانیش به گەرمی پێشوازی لێدەكەن، دیاره دەكەوێته ژێر كارتێكردن یا بەڵێنیان پێ دەدات. دوای گەڕانەوەی سمكۆ لایەنگرانی توركیا بەهێز دەبن. ئینگلیزەكانیش توانیان ئەوانەی دەوروبەری شێخ مەحموود بۆ لای خۆیان راكێشن یا بیانكڕن وەك شێخ قادر- برای شێخ مەحموود -شێخ قادری كوڕی شێخ مەحەمەد -ساڵح شێخ عەبدوڵڵا كەریم- مستەفا پاشا-سولێمان كه ئینگلیزەكانی له پەیوەندی شێخ مەحموود و توركان ئاگادار دەكردەوه. ئینگلیزەكانیش به توندی داوایان له شێخ مەحموود كرد یا دژی توركەكان شەڕ رابگەیەنێت یا بۆ وەرگرتنی دەستوور بێته بەغدا. دیاره ئینگلیزەكان لەبەر بێ باوەڕییان به شێخ مەحموود نوێنەرانی سەربازی خۆیان له كەركوكەوه نارده سلێمانی كه مەبەستی سەرەكییان ئەوه بوو كار بكەنه سەر ناودار و دەسەڵاتدارانی دەوروبەری شێخ مەحموود. له٢١و٢٢ی شوبات له سلێمانی به بەشداری نوێنەرانی لەشكری ئینگلیز و شێخ مەحموود و چەند گەوره بەرپرسی بارەگای مەلیكایەتی كۆدەبنەوه [1].

**له جێگایەكی تر به وردی لەسەر ئەم كۆبوونەوەیه نووسراوه 0132-v-362 JP. 187-198**

---

(1) هەمان سەرچاوه ل ٦٧-٧٠

## راپۆرتی کۆنسۆلی سۆڤیەت لە قارس

١٩٢٣/٣/٢٣

١٥ی مارت من لەگەڵ ڕێبەری کوردەکان کامیل بەگ کوڕی بەدرخان لە (قارس) کۆبوومــەوە. بە ناونیشانی شەقامی گودویچ ژمارە (١٣) ڕۆیشتمە ماڵیان، نــاوبراو لــەوێ نــەبوو ژنەکــەیم بینی کە خەڵکی ئەڵمانیایە و هەندێك ڕووسی دەزانێت. وامزانی ژنەکەی لە تەواوی ڕووداوەکان ئاگادارە، بەڵام هەوڵی دەدا من واهەست نەکەم. دوای دە دەقیقە کامیل بەگ هاتەوە لە گەڵی ئاشنابوم و نامەی هاوڕێ شاخۆڤسکیم پێدا، زۆر پێ خۆشحاڵ بوو وتی: لە مانگی ئابی ســاڵی ڕابردووڕا تا ئێستا ئەمە یەکەم نامەیــە بــە دەســتم دەگــات. لــە وتــەکانی واتێگەیــشتم کــە ئۆتۆنۆمی کوردستان تەنیا بە حمایەی ڕووسیای سۆڤیەت دێتە دی و ئەگەر سۆڤیەت ئامادەبێت ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەوا پرۆگرامی ئەم ئۆتۆنۆمیەمان دەداتێ کــە بــە یارمــەتی ڕێبەرانی تری کورد ڕێك دەخرێت و جێبەجێ کردنەکەی وەئەستۆی خۆی دەگرێت. لــەم بــارەوە من پێموایە کامیل بەگ ئامادەیە ئۆتۆنــۆمی کوردســتان لــە ژێرحیمایــەی تورکیــا وەئەســتۆ بگرێت. دوایی وتی من هاوڕێی شاخۆڤسکیم وەك برا خۆش دەوێت، لە هاوڕێیــان پــانکرانۆڤ و ئنیزریتس ناڕازییە چــونکە درۆیــان لەگــەڵ کــردووە. نــاوبراوان نوێنــەری دەزگــای پاراســتنی دەرەوەن[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٧٣

## راپۆرتی هاوڕێ ئارالۆڤ لە قارسەوە

### ٢٣ی مارتی ١٩٢٣

ساڵی ١٩٢٣ کە بۆ لێکۆڵینەوە چووبوومە کوردستان بۆ دۆزینەوەی نەوت لە ئەرزەڕۆم و وان، چوومە لای خالید بەگ و شێروان شا و سەلیم بەگ لە مادراس و حوسێن پاشا لە پاونوس میوانیان بووم دەیانگوت ئەگەر کوردەکان یەکگرتووبان لە کاتی تێکشکانی تورکەکان لە شەڕی جیهانی یەکەم و لە ساڵی ١٩٢١ لە کاتی شەڕی یۆنان و تورکیا کە یۆنانیەکان تەواوی ڕۆژئاوای ئەنادۆلیان گرتبوو و تا ئەنقەرە پێشڕەوییان کرد. کوردەکان دەیانتوانی دەوڵەتی خۆیان پێك بهێنن. بەڵام ئەمڕۆ بەبێ یارمەتی دەرەوە ئەم شتە سەرناگرێت چونکە دووبەرەکی و دوژمنایەتی لەناو کوردەکان زۆرە. راپەڕینی ئەمجارەی کوردەکان ئەگەر بێتو هێزی دەرەکی یارمەتی و ڕێنمایی نەکات تێك دەشکێت. ئێستاکە تورکەکان یۆنانیەکانیان شکاندووە دەتوانن رووبکەنە کوردستان. گەرچی رژێمی ئیمرۆی تورکیا لە بارودۆخێکی نالەباردایە و قەیرانی ئابووری و لەشکری و ... لەشی داگرتووە ئەگەر کوردەکان راپەڕن و سەربەخۆیی خۆیان بەدەست بێنن نیوەی ئەنادۆڵ لە دەست تورك دەرئەچێت و دوابەدوای ئەوە پارچە پارچەبوونی تورکیا هەر بەردەوام دەبێت، بەڵام تورکەکان هەموو هەوڵی خۆیان دەدەن کە کوردستان سەربەخۆ نەبێت. ئێمە هەواڵمان پێ گەیشتووە کە بۆ بەهار بڕیارە سەد هەزار سەربازی تورکیا بنێردرێنە دیاربەکر و بایەزید و ..... بۆ سەرکوتکردنی کوردەکان.

**شەڕی تورکیا لەگەڵ کورد و ئینگلیز لەسەر موسڵ:**

...ئێمە (روسیای سۆڤیەت) لە لۆزان یارمەتی و ڕێنوێنی تورکەکانمان کرد بەڵام تورکەکان لە بەرنامەی هاوبەش (روسیا-تورکیا)، ئێمەیان لە ئاستی نێو نەتەوەیی داوەت کردەوە.

..... تورکیای نوێ لە تورکیای پێشوو (ئیمپراتۆریەتی عوسمانی) بەرامبەر ئێمە بێ باوەڕتر و نادۆستانەترە. تەنیا یەك جیاوازی هەیە: ئیمپراتۆری عوسمانی دوژمنایەتی رووسیای تێزاری بە میرات بۆ بەجێمابوو، بەڵام تورکیای نوێ زۆر جار وەفای رووسیای فیدراتیقی سۆڤیەتی پێ نیشان دراوە و یارمەتی بە تورکیا داوە، وەك دیارە سیاسەتی پێشوو هێشتا لای تورکیا کۆن

نەبووە. تورکیا لەگەڵ ئینگلیزەکان پێکهاتوە، کوردستانی سەرکوت کردووە و دەستی بەسەر داگرتووە و بەبیانووی مەترسی، لەشکرێکی زۆری تێدا کۆکردۆتەوە کە ئەمەش مەترسییەکە بۆ قەفقاز. ئاشکرایە ئینگلیزەکان بێ چەند وچوون پشتیوانی لێ دەکەن. ئەگەر نەشتوانن دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دروست بکەن، تورکان بەگژ ئێمەدا دەکەن.

**لەسەر ڕووداوەکانی فارس:**

......دەوڵەتی ناوەندی فارس لاوازە، جگە لەوە سەربەخۆیی خانەکان، ڕاپەڕینی عەشایەرەکان و .... دەرفەت دەدا بە کوردەکان لەگەڵ کوردی تورکیا یەك بگرن. سمکۆش کە پەیوەندی خۆی بە یەکجاری لەگەڵ تورکەکان بڕیوە ئەم بۆچوونە زیاتر بەهێز دەکات. لە کۆتاییدا پێویستە لێکۆڵینەوەی جدی لەسەر ئەوە بکرێت کە هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر بە ڕووداوە پەرەگرتووەکانی کوردستان دەبێ چۆن بێت؟ بە تەواوی ئاشکرایە کە ئێمە ناتوانین تەماشاکەربین، دەستەوەستان و بێ بەش بمێنینەوە. ئەگەر تەنیا دەنگوباسی ڕووداوەکان کۆبکەینەوە و چاودێریان بین مانای ئەوەیە ئاستەنگێکی نوێ لە داهاتوویەکی نزیکدا بۆ خۆمان دروست دەکەین. ئینگلیزەکان لە هەموو لایەکەوە گوشاریان خستۆتە سەر ئێمە و دەیانەوێ دەستیان بگاتە نەوتی باکوور. تورکەکانیش چیتر ئیجازەمان پێنادەن کۆنسوڵخانەکانمان لە دیاربەکر و بایەزید و وان کە سێ ناوەندی گەورەی کوردانە، کاربکەن. هەمو ئەمانە بەرەو کێشەی کورد پاڵمان پێوەدەنێن.....

ئاشکرایە چالاکی لەناو کوردەکان کارێکی وا ئاسان نییە، چونکە هەڵسوکەوتی بێ ئەدەبانە و دوژمنایەتی بێ مانای ڕێبەرانی لەشکری ڕووسیای تێزاری کوردەکانی توندو تووڕە کردووە، گەڕاندنەوەی باوەڕیان بە ڕووسیای سۆڤیەت زۆر زەحمەت دەبێت. هێشتا ژمارەیەکیان تێناگەن و نازانن کە تیزار لەناوچووە و سیستەمی ئەمڕۆی ڕووسیا چییە. وەلێ پێویستە لە ڕێگای ڕێبەرانی عەشایەرەکانیانەوە ئەم شتەیان تێبگەیەندرێت. دەبێ لەناویاندا پروپاگەندە دژی ئینگلیزەکان بکرێ و زەمینە بۆ گەڕاندنەوەی ئەو متمانە لە دەست چووەی کوردەکان خۆش بکرێت. بۆ کارکردن و چالاکی لەناو کوردەکان دەبێ:

- لەو کوردانە یان ئەو کەسانەی کە ڕۆیشتوونەتە کوردستان یان ئەوانەی لە بەشی ڕوژهەڵاتناسی، کێشەی کورد بەلایانەوە سەرنج ڕاکێشە، کادیر ئامادەبکرێت.

- بۆ پێشبینی چالاکی و کاروبار لەناو کوردەکاندا ئیمکانات بخرێتە بەردەستی کۆنسۆڵەکانمان.

- دەبێ پێشوەخت ئەو سەرکردە و ڕێبەرە عەشایەرانەی کورد بناسرێن کە لایەنگیری ئێمەن و پەیوەندییان پێوەبکرێت.

- کێشەی کورد دەبێ ڕاستەوخۆ لە مۆسکۆوە لە ڕێگای تیفلیسەوە کە پەیوەندی نزیکی بە نوێنەرایەتی ئێمەوە هەبێت لە ئەنقەرە، بەڕێوەبچێت. واباشترە نوێنەرانی کۆمارەکانی قەفقازمان لەم بارەوە ئاگادار نەبن و ئۆرگانەکانی تر نەزانن.

- گەڵاڵەی ئۆتۆنۆمی کوردستان ئامادە و کاری لەسەر بکرێت و ئەو ئۆتۆنۆمییە دەبێ لە ژێر حیمایەی ئێمە یان تورکیا بێت.بەڕێوەبەرێتی و پێکهاتەی دەزگای کارکردن لەناو کوردەکان دەبێ لە دەست نوێنەرایەتی سوپاو وەزارەتی کاروباری دەرەوەی رووسیای سۆڤیەتی و ناوەندەکەی لە تیفلیس بێت(1).

ئارالۆڤ

**کۆنسۆڵی رووسیای سۆڤیەتی لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا**

(1) هەمان سەرچاوە ل ٨٥-٨٦

## بارودۆخی کوردستان

کامیل بەگ کە لە تفلیسە پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحموود هەیە....هیچ دەنگوباسێکمان دەربارەی ڕێبەرایەتی کۆمیتەی کوردی لە ئەرزەڕۆم نییە.... سمکۆ لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم بەشداری دەکات و لەلایەن رووسەکانەوە تاوانبار دەکرێت کە ئینگلیز لایەنگریەتی.گوایە سمکۆ ئەم تاوانە رەتدەکاتەوە و ماڵئاوایی لە کۆمیتەی کوردی دەکات....

لە لایەکی ترەوە کۆمیەتی کوردی دژی دابەشکردنی کوردستانە و ویلایەتی موسڵ بە بەشێکی جیانەکراوی کوردستان دادەنێت و دژی دەست بەسەرداگرتنی بەشێکی کوردستانە لە لایەن ئینگلیزەکانەوە و دەڵێ، ئینگلیزەکان کە لە بەشێکی کوردستان دەسەڵاتیان هەیە لەوێوە تۆی دووبەرەکی و ئاژاوە دژی بەشەکانی تری کوردستان دەنێنەوە و زیان بە سەربەخۆیی کوردستان دەگەیەنن.

ماوەیەك لەمەوبەر کەسایەتیەکی بەناوبانگی کورد رۆیشتووە بۆ ئەستەمبوڵ. تا لەگەڵ شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ عەبدوڵلای شەمزینان کە لەوێ دەژی وتووێژ بکات. شێخ عەبدولقادر لەناو کوردەکانی موسڵ لایەنگر و دەورێکی یەکجار زۆری هەیە. ناوبراو دەیەوێ پێشنیار بەشێخ عەبدواقادر بکا بۆ پڕۆپاگەندە و بەرژوەندی کۆمیتەی کوردی بچێتە موسڵ. گومان لەوەدانییە شێخ بڕوات بۆ ئەوێ چاوی بەتێکڕای شێخەکانی کوردستان دەکەوێت و وتووێژیان لەگەڵ دەکات لەوانە: ئیسلام حەیدەر زادە و عەلی ئەمین بەگ کوری بەدرخان پاشا و .... سەرەڕای هەموو ئەو ئاژاوانەی کە ئەرمەنییەکان نایانەوە لەم شەڕەی دواییدا رووسەکان بیرەوەری و پاشماوەی باشیان لای کوردەکان بەجێ هێشت. ئەگەر تائێستا جێی شك و گومان بوو کە کوردەکان بەرەو نەریتی سیاسی رووسیا بێن یان لایەنگری رووسیا بن، کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم بە هۆی هاوڕێ پاڤلۆڤسکیەوە پێشنیاری حیمایەی رووسیای بۆ کوردستان دەکرد بۆ ئێمە جێی گومان بوو، بەڵام ئێستا لێرە بە روونی و جدی داوامان لێدەکەنەوە کە رووسیا باڵی پاراستن بەسەر کوردستاندا بکێشێت، دەبێ ئەم پێشنیارە بەجدی وەربگیردرێ و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت، دەبێ تێ بگەین کە رەتکردنەوەی حیمایەی رووسیا بەسەر کوردستاندا دەسبەجێ کوردەکان دەخاتە باوەشی ئینگلیز لەگەڵ ئەو پاشماوە و ئەنجامە

خراپانەی بۆمان بەجێ دەهێڵێت. چونکە هەر چۆنێك بێت لە هەموو بارودۆخێکدا کوردەکان دەسەڵاتی ئینگلیزیان لە دەسەلاتی تورکان پێ باشترە....

هاورێ پاڤلۆڤسکی لە رێگای (خالید بەگ)ەوە ئاگاداری کردین کە سمکۆ ئەندامی سەرکردایەتی کۆمیتەی کوردییە و لە کۆبوونەوەکانی کۆمیتە بەشداری کردووە، بەڵام سمکۆ لە دەست پێکردنی کاروباری خۆی پاڵی بە ئینگلیزەکانەوەدا و ئاشکرایە کە یارمەتی و دەستووریشی لێ وەرگرتوون. لەبەر ئەوەی لە کۆمیتەی کوردی دوور کەوتۆتەوە و کۆمیتەی کوردیش نەیدەویست رێبازی سیاسی ئینگلیزی بگرێتەبەر. جیابوونەوەی کۆمیتەی کوردی لە سمکۆ لەسەر ئەم کێشانە (مەبدەئی) بوو. کە کۆمیتەدەستی لە پشتیوانی کردنی سمکۆ هەڵگرت، لە تێکهەڵچوون لەگەڵ دەوڵەتی فارس کوردەکانی تورکیا پشتیوانی سمکۆیان نەکرد. ئەمەش وێناچێ لەبەر ئەوەبێ کۆمیتە کردەوەکانی سمکۆی بە دڵ نەبووە، جارێ هیچ ئاگادارییەکمان نییە. بێگومان دەبێ پەیوەندی هەبێ، هیوادارم بەم زووانە بتوانین ئەم شتە روون بکەینەوە. گەرچی کۆمیتەی کوردی دژی سیاسەتی ئینگلیزی و دەولەتی کوردییە لە سلێمانی بەلام پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحموود هەر هەیە، لەوانەیە دۆستانەشبێ، ئاشکرایە ئەگەر ئەمە راست بێت، سەرکردەکانی ئێرەی کورد لەو باوەڕەدان کە شێخ مەحموود کەم ناسراوە و ئیرادەی لاوازەو بە ئاسانی ناچاردەکرێت واز لەلاگیری سیاسەتی ئینگلیزەکان بێنێت و بێتە ریزی کۆمیتەوە. لە پەرەسەندنی رووداوەکان چاوەڕێ دەکرێت کوردستانی سەربەخۆی ئیمرۆ پێگەیەکی باش و جێی متمانە بێت بۆ ئامادەکردنی بزووتنەوەی کوردی و پاشان دەبێتە قەلایەك بۆ بەردەوامی هێرشی بزووتنەوەی کوردی لە کوردستانی تورکیا و دوور نییە لە کوردستانی فارسیش. هەندێك لە سەرۆك و ناودارانی کورد: شێخ عەبدولقادر کوری شێخ عوبێدوللای شەمزینی کە سەرۆکی شورای دەوڵەتی بووە و لەناو کوردەکانی موسڵدا لایەنگری زۆری هەیە ئێستا لە ئەستامبۆڵە.

- حەیدەر زادە (شێخولئیسلام) لە ئەستەمبولە.
- ئەمین عەلی بەگ کوری بەدرخان ئەویش لە ئەستەمبولە.
- عەلی بەگ نەوەی بەدرخان پاشایە لە موسڵ و بۆتان دەوری زۆرە.
- بەهری یەشار زادە (بەها بەگ).
- حافی موسا بەگ لەواری موشە.

- سەلاحەدین بەگ بەشداری راپەڕینی بەتلیسی لە ١٩١٤دا کردووە.
- جەمیل چەتۆ لە گورزانە لە ١٩٢٥ دژی تورکەکان راپەڕیووە.
- ئەمین پیری خان.
- مەحموود بەگ کوری ئیبراهیم پاشای بەناوبانگ کە تەواوی کوردەکانی دیاربەکری یەکخست و بەهۆی ئەو تێشکانەی دوایی کۆچی دوایی کرد.
- کاپوچی زادە مەحموود ئەفەندی.
- جوودی پاشا.
- ساڵح بەگ و مەحموود بەگ.
- مەحموود بەگی فەقێ ئەمین.
- خالید بەگ.
- کۆرحوسێن پاشا.
- حەمید بەگ.
- ناجی بەگ.
- عیزەت بەگ.
- جەمیل پاشا زادە ئەکرەم بەگ.
- عەبدولحەمید بەگ لە فارس دەژیت و کابرایەکی ئازایە.
- لویفی بەگ ئەندامی پێشووی پەرلمانی تورکیایە.
- یوسف زیا بەگ.
- ئومەر تەیمور.
- عوسمان ئاغا.
- عەبدولرەحمان ئاغا.

## کێشەی موسڵ

........ کێشەی موسڵ لە مەجلیسی تورکیا نە تەنیا بۆتە هۆی رەخنە و هەراوهۆریای تورکان، بەڵکو نوێنەرانی کوردی ئەندامی پەرلەمانی تورکیاش دژی لکانی ئەم ناوچەیە بە ئینگلیز یا بە عێراقەوەن و بە توندی نارەزایی خۆیان دەربڕیووە. تورکەکانیش بۆ ئەوەی کوردستان دابەش نەبێت بەڵێنی ئۆتۆنۆمییان داوە بە کوردەکان ...... عەشیرەتی بلباسی هەمزائاغا و حەسەن ئاغا لە ناوچەی تەرگەوەر حاجی ئاغای عەشیرەتی هەرکی لایەنگری سمکۆ و سەید تەهان کە ئەوانیش لەگەڵ شێخ مەحموود بۆ سەربەخۆیی کوردستان خەبات دەکەن[1].

ئەنقەرە

١٩٢٣/٣/٢

## دەوری رووسیا لە کێشەی کورد

...... گومان لەوەدانییە کە کوردستان دەبێ لە تورکیا جیاببێتەوە و ئیتر لە دەست تورکیا دەرچووە. ئەم کێشەیە بۆ تورکیا کێشەیەکی کاتییە و دوورنییە کە زۆر نەخایەنێت.

تا گەشتەکەی عومەر پاشا لە ١٨٥٠ کە دڕندانە کوردەکانی سەرکوت کرد، دەسەڵاتی تورکەکان لە کوردستان، کاتی و لاواز بوو، جگە لە هەندێ شت نەبێ کە سەربەخۆ و ئازاد روویان دەدا. کوردستان لە نێوان بەگەکان دابەش کرابوو، بەپێی یاسا و داب و نەریتی خۆیان بەبێ دەست تێوەردانی تورکیا (جگە لە هەندێ شتی بچووک) دەژیان.بەلاّم بە گەشتەکەی عومەر پاشا کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی تورکیا.

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٨٥-٩٤

....... ئەگەر تورکەکان ئامادەشبان ئۆتۆنۆمی بدەن بە کورد، هەر نەیاندەتوانی جێبەجێی بکەن، چونکە لەلایەك تورك ناتوانن داب ونەریتی سەدان ساڵەی خۆیان بەرامبەر گەلانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان فرێ بدەن و چاوی لێ بپۆشن، لە لایەکی ترەوە سەدان ساڵە بێ غیرەتی وبێ توانایی بەرێوەبردنی خۆیان نیشان داوە. کێشەی کورد چیتر کێشەیەکی ناوخۆی تورکیا نییە بەڵکو بۆتە کێشەیەکی نێونەتەوەیی، بەهەر شێوەیەك بێت رووسیا و ئینگلیز لە چارەسەرکردنیدا بەرژەوەندییان هەیە و فەرەنساش تا رادەیەکی کەم وەك دراوسێیەکی کوردستان لە باکووری سوریا خاوەن بەرژەوەندیە ......

فارس (ئێرانی ئەمڕۆ) دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی زلهێزێك کە ئەو زلهێزە میزۆپۆتامیا بێت و خەریکی یەکخستنی کوردستان بێت.

.... هەبوونی دەور و نفوزی رووسیا لە فارس هەڕەشەی مردنە بۆ ئینگلیز لە هیند، نفوزی ئینگلیزیش لەم ناوچەیە مەترسییەکی گەورەیە بۆ رووسیا بە تایبەتی لەناوچە موسڵمان نشینەکان کە دەکرێ لە رۆژهەڵاتەوە سەرهەڵبدات .

ئەگەر کێشەی تەنگەکانی دەریای رەش بایەخێکی زۆریان هەیە بۆ رووسیا کێشەی کوردستانیش بایەخی لەوانە کەمتر نییە. کەواتە نابێت هەر لە دوورەوە چاودێری رووداوەکانی کوردستان بین چونکە بۆ داهاتوو زیان و زەبرێکی گەورەیە بۆ رووسیا .گەر نەمانتوانی یارمەتی کوردەکان بدەین نابێ لەخۆشمان دووریان بخەینەوە.دەبێ زەمینەیەکی لەباری دەست تێوەردان بۆ کاتی گونجاو خۆش بکرێت، دەبێ ئەوەش بزانین کە دراوسێ ئێمە ئەو کاتە کوردستانە نەك تورکیا، لە بەرژوەندیشمان نییە کوردستان دوژمنمان بێت[1] .

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٤٧-٥٨.

## وتوویژ لەگەڵ نوێنەری پەرلمانی تورکیا

.... شێخ سەروەتیش لەوێ بوو، پێموایە مستەفا کەمال ناردبووی تا بزانێ ئێمە لەچی دەدوێین. لە ماڵێ کۆبووینەوە، تا ناوبراو نەڕۆیشت لەسەر کورد هیچمان نەگوت. دوای ئەو کەوتینە وتوویژ و مەبەستی هاتنەکەم لەسەر کێشەی کورد بوو. چاوەڕێی وەڵام بوو ناچاربووم وەڵامی نێگەتیڤانەی بدەمەوە. پاشان باسی رۆیشتنەکەی خۆی بۆ ئەستەمبوڵ کرد کە مەبەستی چاوپێکەوتنی شێخ قادری کوری شێخ عوبێدوڵڵا بووە و سەبارەت بە کێشەی کورد دواوە. ووتم ئێوە لەو باوەڕەدا نین شێخ قادر لەبەرئەوەی شێخ عوبێدوڵڵای باوکی (کە بە یارمەتی رووسیا لەناوبراوە) دوژمنایەتی رووسیا بکات. ناوبراو وتی دەرفەتی شتی وای پێنادەن و هیواداره شێخ عەبدولقادر پشتی بگرێت، بەڵام دەیەوێت پێش دیدارێکی تر لەگەڵ شێخ عەبدولقادر وەڵامێکی رووسیای پێ بێت، ڕای منی سەبارەت بەچوَنییەتی وتوویژ و چاوپێکەوتنی لەگەڵ شێخ عەبدولقادر وەرگرت، من لە وەڵاما وتم : بە رای من (نەك رای باڵوێز یان دەوڵەتی ئێمە) دەتوانی وتوویژی لەگەڵ بکەیت و لەو باوەڕەدابیت بەشی زۆری مەرجەکان وەڵامیان پۆزەتیڤانە دەبێت.

چەند پرسیارێکم لەسەر هەندێ کەسایەتی ناسراوی کوردلێکردلە وەڵامدا وتی:

١- حاجی موسی کە لە ١٨٩٠ لەگەڵ ژاندارم (بەین باش) بووە لە دیمەشق و لە شەڕی جیهانی یەکەم دژی رووسیا شەڕی کردووە.پەیوەندی هەیە لەگەڵ من و شێخ مەحموود و عومەر تالیف کە لە بۆتانە. خاوەنی دە هەزار تفەنگ وهاوەن و رەشاشە .

٢- عوسمان ئاغا لە تانزە.

٣- رێبەرانی بۆتان بریتین لە (عومەر، تەیمور، عەبدولرەحمان ئاغا، حاجی موسا، یاقوب ئاغا).

٤- عەشیرەتی حاجی موسا و یوسف زیا.

٥- عەشیرەتی موتکی شاکر فەرخۆ.

٦- رێبەرانی عەشیرەتی خێزانی سەید عەلی، سەلاحەدین، سەلاحەدین خەریکی رێکخستنی راپەڕینە دژی تورکیا.

٧- لە بنەماڵەی بەدرخان ئەمیر عەلی لە ئەستەمبۆڵە، کامەران (کرمان) عەلی لە موسڵە. چونکە چەند بەگزادە شوێنی پاشایەتی بەدرخانیەکانیان گرتۆتەوە، نایانەوێ بگەڕێنەوە.

٨- حامید بەگ کە لە هەموویان روناکبیر تر و بە دەسەڵات ترە پەیوەندی لەگەڵمدا هەیە.

٩- یەکێك لە پیاوە گەورەکانی (مەلەکون) بە ناوی شێخ مەحموود ئەفەندی لە گەنجەیە. ناوبراو دەربارەی کەمال بەگ پرسیاری لێکردم، منیش وتم پێموایە لە تیفلیس یان لەیەکێك لە شارەکانی قەفقازە. وتی کەمال پیاوێکی باشە و چاکەی لە دەست دێت و سوودی لێوەردەگیرێت[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٠٢-١٠٣.

## وتوویژ لەگەڵ نوێنەری بەتلیس لە پەرلمانی تورکیا

**٢ی مارتی ١٩٢٣**

٣ی مارت توانیم لە ماڵێ بۆجاری دووەم چاوم بەو نوێنەرە کوردە بکەوێت. بەپێی ئەو بەڵێنەی دابووی مەرجەکانی خۆی و کێشەکانی بەم چەشنە راگەیاند:

١- کوردستان ناتوانێت سیستەمی بەلشەویکی پەسەند بکات.

٢- کوردستان ناتوانێت بچێتە چوارچێوەی رووسیای سۆڤیەتەوە. کوردستان دەبێ سەربەخۆبێت.

٣- ئایا رووسیای سۆڤیەتی دەتوانێت بەو مەرجانەوە یارمەتی کوردستان بدات.

٤- ئایا رووسیا لە کوردستانی فارس بەکارو خەباتی ئێمە رازی دەبێت.

٥- هەڵوێستی رووسیا بەرامبەر تورکیا و فارس چ دەبێت ئەگەر بێت و دەوڵەتی فارس هێرش بکاتە سەر کوردستان.

٦- روسیا لە بەرامبەر ئەو یارمەتییەی دەیدا بە کوردستان چی دەوێ.

دوای ئەوە، ئەو داوای لێکردم رای خۆم سەبارەت بەو داواکاری و مەرجانە دەربرم. منیش بە گشتی وەلامم دایەوەو وتم : رووسیا هیچ کاتێك هەولّی نەداوە بە زۆر سیستەمی خۆی بەسەرئەو گەلانەدا بسەپێنێت کە ئامادەی وەرگرتنی ئەم شتە نەبن، بۆ وێنە بوخارا و خوارەزم دۆستن و لەیەکیەتی کۆمارەکانی سۆڤیەتدا نین کەچی لە لایەن یەکیەتی سۆڤیەتەوە پیشتیوانییان لێ دەکرێت.

بەڵام رووسیا لە بەرامبەر ئەو مەرجانەی کوردان چی دەوێت وتم: رووسیای سۆڤیەتی بەپێچەوانەی هێزە ئیمپریالیستەکان هەرگیز شتێکی ماتریالی لەو گەلە چەوساوانەی یارمەتی داون نەویستووەو ناوێت.گومان لەوەدانییە دەیەوێ ئەم گەلانە ببنە دۆستی هەمیشەیی خۆی و ئەم دۆستایەتییە لە تەواوی هەڵسوکەوتیاندا نیشان بدەن و بەجدی لە پەیماندا دیاری بکرێت.

دوای ئەوە من پرسیم ئایا ئێوە تورکیا و فارس بەدۆستی کوردستان دەزانن بەتایبەتی ئەگەر دەوڵەتی فارس بە پەیمانی خۆی لەگەڵ رووسیا وەفاداربێت، لە وەلامدا وتی:

«ئاشکرایە ئەو دەوڵەتانەی دۆستی رووسیای سۆڤیەتین دۆستی ئێمەشن، جگە لەوە ئێمە بەبێ ئاگاداری یەکیەتی سۆڤیەت هیچ پەیمانێك نابەستین و لەم بارەوە بۆچوونی سۆڤیەت بۆ ئێمە وەك دەستوور وایە» لە وەلامی ئەم پرسیارەی من کە: کوردستان چ دەکات ئەگەر بێتو دەوڵەتی تورکیا بڕیاری خۆی بگۆڕێت و موسڵ دووبارە بخرێتەوە سەر خاکی تورکیا؟

ناوبراو لە وەلاما گوتی:

«ئەو کاتە بە ئۆتۆنۆمی کوردستان لە چوارچێوەی تورکیا رازی دەبین، کە پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ سۆڤیەت نەگۆڕدرێت و کێشەی تەنگەکانی دەریای رەش لە بەرژوەندی سۆڤیەت چارەسەر بکرێت. کێشەی موسڵ هۆیەکی سەرەکی نارەزایی ئێمەیە و ئەو کێشەیە راپەڕینی ئێمە بەرەو پێشتر دەبات».

دوای ئەوە لێکجیابووینەوە و بڕیارماندا لە ٤ی مارت یەکتر ببینینەوە[1].

ئیمائیلۆڤ. ئا

٢ی مارتی ١٩٢٣

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٠٧-١٠٨.

## وتوویژ لەگەڵ یەکێك لە نوێنەرانی کوردی

## ئەندامی پەرلمانی تورکیا (نوێنەری بەتلیس)

**٢٧ی شوباتی ١٩٢٣**

رۆیشتمە ئەرزەڕۆم بۆ لای یوسف زیا بەگ بەڵام لەوێ توشی نوێنەرێکی تری بەتلیس بووم. یوسف زیا لە ناکاو پرسیارێکی لە من کرد «ئایا رووسیا بەرژوەوەندی خۆی لە کێشەی کورددا دەبینێت؟»

روسیای سۆڤیەتی وەك پارێزەری بەرژوەندییەکانی تەواوی گەلانی چەوساوە بێ گومان لە چارەسەکردنی کێشەی ئەم گەلانە و چارەنووسیان بە چەشنێك بەرژەوەندی خۆی تیادەبینێت. هیچ کاتێك ناتوانێت بەرامبەر بە سیاسەتی کۆلۆنیانەی دەوڵەتانی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا بێدەنگ بێت و لەم بارەوە تاڕادەیەك من دەمەوێ وەلامێکی ئەم پرسیارە لە ئێوە ببیستم:

«ئایا لە لایەن ولاتە ئیمپریالیستەکانەوە مەترسییەك بۆ سەر کوردستان هەیە؟»

«ئەگەر بە کراوەیی بلێم من ئێستا بۆچوونێکی ترم بەرامبەر بە کێشەی کورد هەیە. ئێمە وا بۆی دەچین کە پێکەوە لەگەڵ تورکیا بە یەکیەتی خۆمان هێرش و گوشاری ئیمپریالیزم بەرپەرچ دەدەینەوەو لەگەڵ ئەوانیش کێشەی کورد چارەسەر دەکەین. بەڵام ئیمرۆ هەموو هیواکانی ئێمە لەبەر رێککەوتنی تورکیا لەگەڵ ئینگلیز کە ئامادە بووە موسڵی بداتێ (بەئینگلیز) لە دەست چوون. ئینگلیزەکان پێشنیاریان کردووە چاوپۆشی لە موسڵ بکەین ئەگەر دەوڵەتی تورك ئامادەبێت ئۆتۆنۆمی کوردستان رابگەیەنێت. بەڵام تورکیا ئامادە نەبووە بەلکو موسڵی داوەتە ئینگلیز، ئاشکرایە ئەمەش دەبێتە هۆی راپەڕینی گەلی کورد تا چارەنووسی خۆی دیاری بکا[1].

**هاوڕێ کامنیۆڤ. س. س**
**وەزارەتی دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت**
**بۆ فەرماندەی گشتی هێزەکانی کۆمار**
**١٣ی شوباتی ١٩٢٣**

(1) هەمان سەرچاوە ل ١١٠.

## سیاسەتی ئێمە بەرامبەر بە کێشەی کورد و موسڵ بەم چەشنەیە

...... ئێمە نیازمان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە گشتی ئەوەیە «کۆماری رووسیای سۆڤیەتی داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکاو پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ ئۆتۆنۆمیەکی بەربلاو بدا بە کورد. هەر کە وەزارەتی دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت هەڵوێستی خۆی لەسەر ئەم کێشەیە بە تەواوی روونکردەوە ئێمەش بە زووترین کات ئاگادارتان دەکەینەوە(1).

## راپۆرتی فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی کۆماری رووسیای سۆڤیەتی

### ٢٤ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣

**پەیوەندی کۆمیتەی کوردی و مۆسکۆ:**

...... کۆمیتەی کورد دەستبەجێ پاش ئاگادار بوونەوەی پەیوەندی سمکۆ لەگەڵ ئینگلیزەکان کۆبوونەوەیەکی گشتی بە بەشداری رێبەرانی عەشایەری کورد و .... پێك دێنێت و ئەم کێشانەی خوارەوە باس دەکەن:

ئایا یارمەتی ئینگلیزەکان وەربگیرێت یانا؟ ئایا تەنیا پشت بە ئینگلیز ببەسترێت؟ یا بۆ هەمیشە بە یەکجاری واز لە یارمەتی ئینگلیز بهێنرێت؟

...... بە پشت بەستن بە ئینگلیزەکان هیچ کاتێك کوردستان ئازاد نابێت لەبەر ئەوە رزگاربوون لە دەست ئینگلیز سەد قات دژوارترە لە رزگاربوون لە دەست تورکیا. بەپێی ئەم بۆچوونانە کۆمیتە بڕیاریدا واز لە یارمەتی ئینگلیز بێنێت و دەستووری بە سمکۆ و دەوڵەتی کوردی لە سلێمانی داوە کە بە یەکجاری هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە ئینگلیز بگۆڕێ. بەڵام ئەم بڕیارە لەوانەیە تەنیا لەسەر کوردەکانی تورکیا کاریگەربێت و کوردەکانی تر پێشوازی لێ ناکەن چونکە ئینگلیزەکان هەرچەند باوەڕیان بە شێخ مەحموود نییە و خەزێنەی دەوڵەتی کوردستانیان لە دەستخۆیاندا هێشتۆتەوە، ئێستاش یارمەتی دەوڵەتی کوردستان دەدەن.

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١١٣.

بەڵام ئێستا کۆمیتەی کوردی دەستووری کۆکردنەوە و کڕینی چەك و تەقەمەنی لە تەواوی ناوچەکانی کوردستان داوە و بۆ ڕاپەڕین خۆی ئامادەکردووە. هەر چۆنێك بێت کۆمیتە لە هەلێکی لەباردا ڕاپەڕین رادەگەیەنێت. بارودۆخەکە بەستراوەتەوە بە پەیمانی لۆزان و یارمەتی رووسیا کە تورکەکان ناچار بکات بەرامبەر بە کوردان پاشەکشێ بکەن و .....

کۆمیتە لە وەرگرتنی یارمەتی ئینلگیز خۆ دەپارێزێ....پشتیوانی سۆسیالیستەکانی تورك دەکات، سەرۆکی ئەم کۆمیتەیە واتە خالید بەگ لە (ئەرزەڕۆم)ە و سیاسەتی خۆی بەستۆتەوە بە کۆتایی شەڕی یۆنان-تورکیا و کۆتایی کۆنفراسی لۆزان و .....[1]

## دەوری کوردستان لە سیاسەتی ئینگلیز و رووسیا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕووداوەکانی کوردستان

### پەیوەندی کوردو رووسیا لە جەنگی جیهانی یەکەم:

پرستیژی (سومعەی) رووسیا لەناو کوردەکاندا زۆر بەرزە. لەناویاندا ئەم وتەیە باوە کە دەڵێن تورك هیچ کاتێك توانای زاڵبوون و سەرکەوتنی بەسەر رووسیادا نییە و رووسیا دەبێتە دەسەڵاتداری ڕۆژهەڵات....

کوردەکان هەمیشە لە شەڕەکانی ئێمە لەگەڵ تورکیا یارمەتیان داوین.....

### کورتە مێژوویەکی کورد:

بەدرخان پاشا کەمال بەگ لە بەتلیس ڕاپەڕی و دوای ئەم ڕاپەڕینە یەزادنشیر لە ١٨٥٤ تووشی شکست دەبێت لە ١٨٧٨ کوردەکانی ئەوێ حوسێن پاشا و عوسمان پاشا توانییان بە هۆی کوڕانی بەدرخان لەگەڵ تورکان ئاشت ببنەوە و ئەو دەڤەرە لە مەترسی رزگاری بێت. هەروەها بە یارمەتیدانی رووسیا ڕاپەڕینی شێخ عوبێدوڵڵای لە ١٨٨٠ کوژایەوە. کە ڕاپەڕینێکی زۆر

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١١٨-١١٩.

بەربلاو بوو، ئازەربایجانی فارسیشی گرتبۆوە و ورمێی لە ژێر دەسەلاتدا بوو. ئەم راپەڕینە بوو بە هۆی رەخنە و دژایەتی رووسیا. کوڕانی بەدرخان شێخ عوبێدوللا دەهێننە ئەستەمبۆڵ و لەوێشەوە بۆ مەککە تا دەمرێت لەوێ دەمێنێتەوە . بە هۆی دەست تێوەردانی رووسیا ئەم راپەڕینە تووشی شکست دەبێت و کوردەکان بەرامبەر بە رووسیا بەدبین دەبن. ئێستا کوری شێخ عوبێدوللا واتە شێخ عەبدولقادر سناتۆرە و کوڕانی شێخ عەبدولقادریش ناوبانگ و دەسەلاتیان زۆرە. لە ١٩١٣ کوڕانی بەدرخان پاشا واتە حوسێن پاشا و حەسەن بەگ و کامیل بەگ لە ١٨ەی نیسان بەسەرۆکایەتی و رێنوێنی کامیل بەگ راپەڕین، بڕیار بوو تەواوی کوردستان بگەرێتەوە. بەلام تورکەکان ئاگادار دەکرێنەوەو لە ٧یمایس کامیل بەگ دەگیرێت و دەینێرنە ئەستەمبولّ، بەم چەشنە کۆتایی بەو راپەڕینە دێت. بەلام لە رێگادا رووسەکان رزگاری دەکەن و دەینێرنە تیفلس. بەدرخان ئەمیری بۆتان داوای یارمەتی لە رووسیا دەکات و ئامادەیی خۆی دەردەبرێت کە کوردستان لە ژێر پشتیوانی رووسیادا بێت. خزمەکەشی واتە یەزدانشێر هەروا داوای یارمەتی لە رووسیا دەکات.

کە شەڕ دەستی پێکردلە لایەن تورکەکانەوە گیرام. نێردرامە شام، لەوێ کوردەکانی شام پێشنیاریان پێکردم هەلّبێم و دەیانەویست بمنێرنە دیاربەکر لای کوردەکانی خۆیان تا بەلّکو لەوێ ببمە ناوبژیکەری رووسیا و کوردان. کوردەکانی دیمەشق بێ سەبرانە چاوەڕێی پێشڕەوی سوپای رووسیان، دەیانەوێ چەکی بۆ هەلّگرن. ئەوەی زۆر کاری کردۆتە سەر کوردەکان ئەو فاکتەریە کە کوڕ و برازای بەدرخان پاشا لەناو سوپای رووسیادان و من ئەوەم لە کوردەکانی دیمەشق بیست. تێکڕای نوێنەرانی کۆنسولّخانەکانمان وکادیرانی راگەیاندنی سوپامان (لە ئەرزەڕۆم و وان) لەسەر دژایەتی کوردەکان بەرامبەر بە رووسیا راپۆرتیان نووسیوە، نابێ باوەڕیان پێ بکەن. ئەگەر لە نێوان رووسیا و تورکیا شەڕ دەسپێبکات ئەوانە لەگەلّ تورکە موسلّمانەکان دژی رووس و مەسیحییەکان دەوەستن. مەگەرلەبیرتان چۆتەوە جەنگی جیهانی یەکەم چی نیشان داین ... هەر کە شەڕ دەستی پێکرد رەسول بەگ، شەمسەدینوڤ و براکەی حەمید بەگ (کوڕانی ئەیوب پاشا) لەناوچەی قەرەکلیس دەستبەجێ بە خۆیان وسوارەکانی حەمیدیەوە هاتنە ریزی سوپای رووسیا و بەگە ناودارەکانی ناوچەی (دیادین) مەحەمەد بەگ خۆیان تەسلیمی ئێمە کردو سەرۆکی کوردەکانی ئادەمانلی عەلی بەگ ئامادەبوون خۆیان تەسلیمی ئێمە بکەن.

سەرۆك عەشیرەتی حەیدەرانی بە ناوی کوڕی حسێن پاشا لە پـاتنوس لـە بـاکووری گـۆلی وان دەژیت، دەسەلاتی زۆرە، بەس چاوەڕێی نزیکبوونەوەی ئێمەیە. لە لایەن فەرماندەی لەشکرمان لە قەفقاز بەناوی سیزۆڤ بۆ راکێشانی کوردەکان راسپێردرام لە ناویاندا چالاکی بنوێنم.

منیش بە یارمەتی کوڕی بەدرخان پاشا کامیل بەگ لەناویاندا چـالاکی باشـم ئەنجامـدا. کـە گراف وارەنتسۆڤ داشـکۆڤ حـاکمی قـەفقاز بـوو بارودۆخەکـە بـە پێـچەوانەوە گـۆڕا. نـاوبراو نەخۆشکەوت و ژنەکەی گراڤینا (شاژن) بەکردەوە کەوتـە حـوکمڕانی قـەفقاز. بـە دەسـتووری پیتەربورگ هـەموو پاسـەوانەکانیان لـە ئەرمەنـەکان هەڵبـژارد. لـە لایـەکی تـرەوە تـەواوی کاربەدەستانی بەرزی لەشکری و شارستانی دەستیان دایە گێرەشێوێنی و ئاژاوە دژی کـوردان و پاسەوانە ئەرمەنییەکانیش دەستیان بەسەر سـەروەت ومـاڵی موسـڵمانە کوردەکانـدا گـرت و کەوتنە ئازاردانیان. لە ناوچەکەدا پاسـەوانە ئەرمەنییـەکان تـەواوی گونـدە کوردنـشینەکانی ناوچەی بایەزیدیان وێران کرد و رووخاند. دانیشتوانی ئەوێ وایان زانی بوو رووسەکان هـاتوون، بۆیە نوێنەری خۆیان دەنێرنە لایان بەلام بۆیان دەردەکەوێ ئەوانەی هاتوون ئەرمەنین، نوێنەرەکە دەکوژن و پاشان گوندەکە دەگرن و تەواوی دانیشتوانەکەی قەتلوعام دەکەن و لـە بـەر چـاویان سوکایەتی بە ژنەکانیان دەکەن. دوای ئەوەش فەرماندەی رووسەکان کە دەگەڕێتەوە تفلیس لـە باتی ئەوەی دژی کردەوە بێ وێنەکانی ئەرمەنییەکان راوەستێت یا پێشیان پێ بگرێت دەکەوێتە راوەدوونانی کوردەکانی ئەوێ. رەسول بەگ و خالید بەگ کە بەدەستەکانی حەمیدیی خۆیانـەوە هاتبوونە ریزی سوپای رووسیا دەخرێنە زیندان. سەروەت و سامانی موحەمەد بەگ بـە تـالان دەبرێت و سوکایەتی بەژنەکانیان دەکرێت. عەلی بەگ و بەگەکانی تری کورد بۆ جێژنی سوپای رووسیا داوەت دەکرێن و لەوێ نامەردانە دەگیرێن و بۆ سیبریا دوور دەخرێنەوە. کاتێکیش کـە سوپای ئێمە دەکشایەوە ئەرمەنییەکان بەدەرفەتیان زانی ئەو موسـڵمانەی بەسـەلامەت دەرچـوو بـوون دەیانکوشـتن. کوردیـان بـە دیلـی نـەدەگرت هـەر لـەوێ و دەیانکوشـتن، بۆیـە ئـەوانیش نەیاندەتوانی تەسلیمی ئێمەبن. ئاشکرایە نە تەنیا کوردیان لە ئێمـە دوورخـستەوە بـەڵکو وایـان لێکردن بێ رەحمانـە لەگـەڵمان بجـەنگن چـونکە دەیـانزانی بەرامبەرەکـەیان بێبەزەییـە، ناچـار پارێزگارییان لە ماڵ و منداڵیان دەکرد.

ئەم بەرەنگارییە نەترس و نائۆمێدانەی کوردان لە کۆتایی ١٩١٥و سەرەتای ١٩١٦ جموجـوڵی ئێمەی زۆر دژوارکرد و وای لێهات بە هیچ شێوەیەك چالاکی ناساندن (سیخوری سوپایی) مـان پێنەکرا. بەڵام سەیر ئەوە بوو کوردەکان دوژمنایەتی رووسیایان نەکرد. ئەوانە لە بارودۆخەکـە گەیشتبوون دەیانزانی ئەمە کاری ئەرمەنییەکانە.

موسا بەگ سەرکردەی گەورە و بـە ناوبـانگی ناوچـەی مـوش کـە بەرەنگاریـەکی توندوتیـژی بەرامبەر بە کەرتەکانی ئێمە لە بەتلیس کرد بوو فەرمانەدەی کەرتەکانی ئێمـە داوای خـۆ بـە دەستەوەدانی موسا بەگی کردبوو، بـەڵام ئـەویش بـۆی دەنووسـێت ئێمـە رێزمـان هەیـە بـۆ رووسەکان، بەڵام چۆن تەسلیم ئێوە ببین و باوەڕمان بە پاراستن و سـەلامەتی خۆمـان هـەبێت. ئێمە وامان دەزانی کە رووسیا دەوڵەتێکی مەزنە و دەسەڵات و دەستووری بەسـەر هەمووانـدا هەیە، بەڵام ئێستا دەبینین کە ئەرمەنییەکان دەستوور بە رووسیا دەدەن.

سەرەڕای ئەم درندایەتیەی ئەرمەنییەکان بەرامبەر بە کوردان، ئەوان (کوردەکـان) دژی ئێمـە بەشداری شەڕیان نەدەکرد. من لە رێگای کامیل بـەگی بەدرخانـەوە پەیوەنـدیم بـە رێبـەرانی کوردەوە کرد و لە لایەن فەرمانەدەی گشتی هێزەکانیان دڵنیام کردن کە سوپایەك بۆ کوردسـتان دەنێردرێت ئەرمەنییان لەناودا نەبێت. ئەوە بوو لە بەهاری ١٩١٧ راپەڕینی کوردەکانی بۆتـان بەرێنوێنی ئێمە دەستی پێکرد و زیـانێکی گـەورەیان بـە تورکـان گەیانـد بەتایبـەتی رێگـای هاتوچۆی سوپای تورکیـا. راپەڕینەکـە لـە ١٩١٦ لـە بۆتـان سـەری هەڵـدابوو، کوردەکـانی دەرسیمیش یارمەتیەکی زۆری سوپای ئێمەیاندا بەڵام لەبەر ئەرمەنییەکان نەیانهێـشت بـچینە ناو دەرسیم. ئێمە بۆ هەر کوێ کە دەرۆیشتین ئەم وتانەمان دەبیست:

((ئێمە لە رووسەکان ناترسین و بە دڵ و بـەگیان لەگـەڵیان دەڕۆیـن، بـەڵام لـە ئەرمەنییـەکان دەترسین چونکە دەمـانکوژن و سـوکایەتی بـەناموسمان دەکـەن و ئێـوەی رووسـیش رێگـەیان دەدەن)).

پاییزی ١٩١٥ لە لایـەن فەرمانـدەی گـشتی هێزەکانمانـەوە دەسـتوورم پێـدرا پەیوەنـدی بـە کوردەکانەوە بکەم. ئەوە بوو کە لە سەرەتای ١٩١٦ پەیوەندیم پێـوە کـردن و بـە فەرمانـدەی هێزەکانم راگەیاند ئەگەر ئەرمەنییـەکان لـە خۆمـان دوور بخەینـەوە سـەردەکەوین و دەتـوانین کوردەکـان دژی تورکـان هـان بـدەین. سـەرئەنجام لـە فەرماندەکانـەوە دەسـتووردرا نـەهێڵن

ئەرمەنییەکان موسڵمانەکان ئازار بدەن. ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەنی و داشناك سوتونەکان لەسەر ئەم شتە لێم زیزبوون.

.....لەبەر ئەوەی دەنگوباسی زۆر کەمان لەسەر رووداوەکانی کوردستان هەیە زەحمەتە بڵێم پەیوەندیمان لەگەڵ کوردەکان چۆنە. بەپێی راپۆرتی کۆنسوڵمان لە بایەزیدەوە هاورێ مالستۆڤ بە بەشداری ژەنەراڵی رووسی ئاندرەیڤسکی و نوێنەری سۆڤیەت لە ئەنقەرە لەکاتی تێشکانی سمکۆ، کردەوەی دەوڵەتی تورکیایان لەمەڕ تەحویل نەدانەوی سمکۆ بە دەوڵەتی فارس، پرۆتیستۆ کردووە، کوردەکان لەم پرۆتیستۆیەی نوێنەری سۆڤیەت ئاگادار دەبن. هەموو ئەمانە بیرەوەرییەکی تاڵ و ناخۆشیان لەسەر کورد بەرامبەر بە رووسیا داناوە. وەلێ ئەمە کاریگەرییەکی ئەوتۆی نابێت لەسەر پەیوەندی کورد و رووسیادا، جگە لەوە ژەنەراڵ ئاندەریڤسکی لە خزمەتی رووسیای سۆڤیەتیدا نییە بەڵکو لە خزمەتی سوپای سپی دایە.

لە ١٩١٦ راپەڕینی کوردەکان دەستی پێکرد من و کەمال بەگ دەستمان بە چالاکی و پروپاگەندەی زۆر لە سەرتاسەری کوردستاندا کرد. بەڵێنمان بە کەمالدا ئەگەر راپەرینەکە سەرکەوێت بنەماڵەی بەدرخان حاکمی تەواوی بۆتان دەبێت و پاشان لەگەڵ ئێمە پەیمان ببەستێت کوردستان دەکەوێتە ژێر رکێفی ئێمەوە. شۆڕشی تورکە گەنجەکان لە ١٩٠٨ هیچ دەستکەوتێکی باشی بۆ کوردەکان نەبوو. کورد و داشناکەکان پێکەوە پەیمانیان بەستبوو بۆ مافی خۆیان و یەکسانی لەگەڵ تورکان خەبات بکەن. بەڵام ئەم یەکیەتە زۆری نەخایاند، ئەویش تاوانی داشناك سوتونەکان بوو، بەهۆی پیلانی دروستکردنی ئەرمەنستانی گەورە، لەگەڵ کۆمیتەی ئیتیحاد و تەرەقی تورکان دژی کورد یەکیان گرت. ئەرمەنەکان دیسان دەستیان کردەوە بە دوژمنایەتی کوردان، ئەوە بوو تورکیا لە ١٩١٤ توانی راپەڕینی کوردەکان لە بەتلیس سەرکوت بکات.

کوردەکان بە کەڵك وەرگرتن لەو بارودۆخە ئاڵۆزەی تورك تێی کەوتبوو لە مەڕ کێشەی تریپۆلی و بەڵقان و راپەڕینی هەندێ ناوچەی عەرەبی لە ١٩١٤، دەستیا کرد بە راپەڕین. بنەماڵەی بەدرخان، حوسێن و حەسەن پاشا و کەمال بەگ و سولێمان بەگ راپەڕینیان رێکخست، بەڵام راپەڕینەکە سەرکوت کرا و ژمارەیەکی زۆر لە رێبەرەکانی لەسێدارە دران، هەندێك رایان کرد و

سێ نەفەریان لە کۆنسوڵخانەی ئێمە لە بەتلیس خۆیان شاردەوە، بە راگەیاندنی شەڕ ئەوانیش لە لایەن تورکەکانەوە گیران و هەڵواسران.

کۆنسوڵی ئێمە لە بەتلیس هاورێ شیرکۆڤ. و. ی. نەیتوانی یا باشتر بڵێین نەیویست رێبەرایەتی ئەم بزووتنەوەیە بکات.

یەکێکی تر لە بنەماڵەی بەدرخان عەبدولرەزاقە کەپێشتر لە خزمەتی سولتان عەبدلحەمیددا بووە، رادەکاتە فارس و دەچێتە لای سمکۆ و سەید تەها، دەست دەکا بە ئامادەکردنی راپەڕین دژی تورکان. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لەو ناوچانەی بە دەست ئێمەوە بوون، تەنیا کوردەکان لە بەرەی تورکەکاندا شەڕیان دەکرد، ئەوانیش چاریان نەبوو دەبوو یا پاریزگاری لە بنەماڵەکانیان بکەن یا رازیبن رایانگوێزن .

ئێستا بارودۆخی تورکەکان لەبەر کێشەی کورد زۆر ئاڵۆزە، شێخ مەحموود لە باشووری کوردستان و سمکۆش هەروا دژی تورکیا راپەڕیوە. لەساڵی ١٩٢١ راپەڕینی جەمیل چەتۆ لە گرزان و سورمە (رۆژئاوای بۆتان) سەرکوت کرا.لە ساڵی ١٩١٦ەوە من پەیوەندیم بە جەمیل چەتۆوە هەبووە. پاییزی هەر ئەو ساڵەش لە زاری سیواس راپەڕینێکی تر کرا کە تا دەرسیم پەرەی سەند. کەمال پاشا ناچارکرا بۆ سەرکوتکردنی ئەو راپەرینە کە پێویستی بە لەشکرێکی زۆر هەبوو پەنا بباتە بەر عوسمان ئاغای کراسوەند و داوای یارمەتی لە عەشیرە لازەکان بکات. واپێدەچێ ئەم راپەڕینە لە لایەن ئینگلیزەکانەوە رێك خرابێت-چونکە:

دوای کشاندنەوەی هێزی کەمالیستەکان لەبەرەی یۆنان، ئاژاوە گێڕو هاندەرانی ئەم راپەڕینە خۆیان لای ئینگلیزەکان شاردەوە.

لەکاتی رۆیشتنی سوپای ئێمە لە ئازەربایجان لە ساڵی ١٩١٨ سمکۆ زۆر بەهێز بوو، بەو چەك و تەقەمەنیەی تالانکردنی عەنبارەکانی ئێمە لە شەرەفخان سمکۆ خۆی بە باشی چەکدار کردبوو.دەستی کرد بە پێشڕەوی. سمکۆ لە عەشیرەتی عەبدویە کە ناوەندەکەی لە قەتورە. سمکۆ پاشان چاریق دەگرێت و لە قەڵای چاریق نزیکی سنووری تورکیا جێگیر دەبێت. برای سمکۆ جافەر ئاغا لە لایەن حاکمی تەورێزەوە بانگ دەکرێتە تەورێز و لەوێ دەیکوژن. جافەر (جەعفەر) ئاغا مرۆڤێکی ئازا و نەترس، سیما جوان، پاك، میرخاس، بەڵام نەخوێندەوار بوو. کۆنسوڵی ئێمە لە

(خۆی) چیرکۆ بۆ پەرەپێدانی دەوری رووسیا لە کوردستان پەیوەندی پێوە کردبوو. رووسیا دەوڵەتی فارس ناچار دەکا لەگەڵ سمکۆ پێك بێت و پەیمانی لەگەڵ ببەستێ. بەپێی ئەم پەیمانە بەرێوەبردنی ئیدارەی ناوچەکانی خۆی، قەتور، چالّی دیلمان، سۆماوبرادۆست، دەدرێتە سمکۆ.

لە ناوەرۆکی ئەو پەیمانە ئاگادار نیم. رووسیا میدالی پلەدووی ستانسیلاڤی پیرۆز بە سمکۆ دەبەخشێ.

سمکۆ لە بنەماڵەیەکی چالاك و ناودار نەبوو، ئێمە ناوبراومان لەسەر حسابی خەڵکی تر گەورە کرد. بەڵام ئەنجامەکەی بە پێچەوانەوە بوو لە جەنگی جیهانی دژمان وەستا.

عەبدولرەزاق و سەید تەها لەرێگای هاتنیان بۆ لای سمکۆ لە لایەن تورکەکانەوە لە شاری خویە دەگیرێن، بەڵام لەسەر رێگا نزیکی قتور سمکۆ ئازادیان دەکات و لە لای خۆی دەیانهێڵێتەوە.

کە شەڕی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد سمکۆ لەگەڵ عەبدولرەزاق دژی تورکەکان دەجەنگێ. پەیوەندی ئێمە لەگەڵ سمکۆ بە هۆی ژەنەراڵ چیرنەزۆپۆڤ باش بوو، تەنانەت جارێکیان بەشێکی سوپای ئێمە دەکەوێتە گەمارۆی تورکەکان، سمکۆ گەمارۆ دەشکێنێ و رزگاریان دەکات.لە هاوینی ١٩١٥سمکۆ لە نزیکبوونەوەی هێزەکانی تورك بە سەرۆکایەتی خەلیل پاشا ئاگادارمان دەکاتەوە، بەڵام ئێمە باوەڕمان پێنەکرد، هەر لێی دوور کەتینەوە. ئێمە (خۆی)مان چۆڵکرد، بەڵام بۆ فەرماندەی هێزەکانی ئێمە ئەم شتەی لە سمکۆ شاردبۆوە؟نازانم . سمکۆ لەگەڵ ئەوە نەبوو (خۆی) چۆڵ بکرێت، بەڵام پاش ئەوەی هەست بە مەترسی دەکات داوا لە چیرنەزوبۆڤ دەکات بۆ گواستنەوەی شتومەکی بە نرخ و ژن و منداڵەکەی یارمەتی بدات. کەچییارمەتی نادەن و پێی دەڵێن ئێمە هیچ کەرەستەی گواستنەوەمان نییە بۆ خۆت ئەم کارە بکە. سمکۆش کە ناتوانێت ژن و منداڵەکەی بە جێ بێڵێ، لەوێ دەمێنێتەوە. سمکۆ بۆ خۆی لەگەڵ خەلیل پاشا دژی رووسیا شەڕی نەکرد، بەڵام چەکدارەکانیکردبوویان.

دوای ئەمە چیرنەزۆپۆڤ چاوی بینینی سمکۆی نەبوو هەوڵی لەناوبردنی دەدا. خەلیل پاشا لە نزیکی دیلمان دەشکێت و بارەگای هێزەکانی دەگەڕێتەوە بۆ دیلمان.

سمکۆ دەستبەجێ دەگەڕێتەوە خۆی، ژەنەراڵ چیرنەزۆپۆڤ یەکسەر دەیگرێت و لەگەڵ عەبدولرەزاق دەیاننێرێتە تیفلیس و لەوێ زینندانی دەکرێن. تورکەکان کردیانە قاو گوایە

عەبدولڕەزاق لەگەڵ تورکیا پەیوەندی هەبووە. سمکۆ تاتشرینی دووەمی ١٩١٥ لە تیفلیس ژیا. کە پەیوەندیمان لەگەڵ کوردەکان بەرەو باشی چوو، من چوومە باش قەڵا و سمکۆشم لەگەڵ خۆم بردو دانم و بەوەدانا کە خراپ لەگەڵ سمکۆ جولاوەینەتەوە. سمکۆ وتی داوای چەند سەد چەکداری لە چیرنەزۆپۆڤ کردووە تا دژی تورکان بجەنگێ بەڵام نەیداوەتێ. من شێخ سەعیدم لەگەڵ خۆم نەهێنایەوە، چونکە ئاشنایەتیم لەگەڵی نەبوو، تەنیا سمکۆم لەگەڵ خۆم هێنایەوە. ئەو ماوەی لەگەڵ سمکۆ بووم هیچ شتێکم پێوە نەدی یا نەبیست تا شکی لێ بکەم.

لە مارتی ١٩١٦ کە ناوەندی کاروباری خۆم بردە بەتلیس لە ناوچەی وان چیرنەزۆیۆڤ لە هەوڵدا بوو سمکۆ بگرێت سمکۆش پێدەزانێ و ناچار پەنادەباتە بەر چیاکان، لەو ماوەیەشدا هیچ هەنگاوێکی دژی ئێمە هەڵنەگرت. بەڵام ژەنەراڵ چیرنەزوبۆڤ دەستهەڵگر نەبوو و تاوانی دەدایە پاڵ گوایا لەگەڵ تورکەکان پەیوەندی هەیە و زانیاری هەیە کە دژی ئێمە دەستبەکارە، ئەوەبووهێزێکی زۆری ناردە سەری.

من راپۆرتێکم لەم بارەوە بۆ فەرماندەی باڵای هێزەکانی خۆمان لە تیفلیس نارد و نووسیبووم کە سمکۆ دژی ئێمە ناجوڵێتەوە و تەنیا چیرنەزۆبۆڤ رقی شەخسی لە سمکۆیە و دەیەوێ خۆی لە دەستی رزگار بکات. من داوام لە فەرماندەی باڵای خۆمان کرد کە لە رێگای کۆنسوڵخانەی (خۆی) داوا لە سمکۆ بکات بگەڕێتەوە چوار قەڵا و پاراستنی گیانی سمکۆ وەئەستۆبگرێت. پێشنیارەکەی من پەسەند کراو سمکۆ گەڕایەوە چوار قەڵا تاکۆتایی جەنگ هەر لەوێ مایەوە. پەیوەندیم لەگەڵ سمکۆ باش بوو. بەڵام دوای کودەتای شوبات ناوبراوم نەبینییەوە.

بە رۆیشتنمان لە ئازەربایجان ئەرمەنی و ئاسوورییەکان دەکەونە دوژمنایەتی سمکۆ. نابێ ئەوە لە بیربکرێت شەرەکە ئەوان دەستیان پێکرد بۆ ئەوەی دوای رۆیشتنەکەی ئێمە ببنە حاکمی ناوچەکە.

ئاسووری و ئەرمەنییەکان دەکەونە گیانی موسڵمانان و دەست بە کوشتن و تاڵانکردنیان دەکەن و سمکۆش پارێزگارییان لێ دەکات.

سمکۆ مارشەمعونی لە ١٩١٨ ناپیاوانە کوشت گەرچی پەیمانی ئاشتی نێوانیان ئیمزاکرابوو. پاش ئەوە ئەرمەنی و ئاسورییەکان دەستیان دایە کوشتار و تاڵانکردنی کوردەکان و بە دوای سمکۆدا دەگەڕان بیکوژن. هەروەها پاکەتێك کە مەوادی تەقینەوەی لەناودا دەبێت دەینێرن بۆ

سمکۆ و بڕیار بوو لە کاتی کردنەوەی پاکەتەکە بتەقێتەوە، بەڵام سمکۆ گومان لە پاکەتە دەکات و پێش ئەوەی بتەقێتەوە خۆی رزگا دەکات. دەبێ ئەوەش بڵێین: لە کاتی شەڕی سمکۆ لەگەڵ ئەرمەنی و ئاسورییەکان سمکۆ یارمەتی لەتورکەکان وەردەگرێت.

دەوڵەتی ئێرانیش لە ساڵی ١٩٢٥ بە سەرۆکایەتی ژەنەڕاڵ فیلی پۆڤ قەزاق دەنێرێتە شەڕی سمکۆ. بەڵام پاشان سەرۆك وەزیرانی فارس بە دەستووری ئینگلیزەکان قەزاقەکان بانگ دەکاتەوە.

سمکۆ لەم ماوەیەدا پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە دەبێت. ئینگلیزەکان کە لە ١٩١٩ کوردستانیان بەجێهێشت، ژمارەیەکی زۆر ئاسووری و ئەرمەنییان لەگەڵ خۆبردو هێزێکی چەکداری گەورەیان لێ دروست کرد کە ببوونە مەترسییەکی گەورە بۆ تورکان. سمکۆش لەم ماوەیەدا لەگەڵ تورکەکاندا پەیوەندی دەبێت. دوای ئەمە لە نێوان سمکۆ و دەوڵەتی فارس (ئێران) پەیمانی ئاشتی مۆر دەکرێت و نازناوی سەردار نوسرەت دەدرێتە سمکۆ و پاراستنی سنووری هاوبەشی ئێران و تورکیای پێ دەسپێردرێ. سمکۆ دەکەوێتە یەکخستنی کوردەکان تەنانەت دانیشتوانی باکووری ئازەربایجانیش لەبەر ئەوەی لە دەست کاربەدەستانی دەوڵەتی ناوەندی ئێران بێزار ببوون، پشتیوانی سمکۆ دەکەن .

هاوینی ١٩٢١ کاتێك لە تیفلیس بووم سمکۆ حاکمی ورمێ بوو. ناوبراو سوپایەکی رێکوپێکی هەبوو خاوەنی رەشاش و تۆپ و پەیوەندی تەلەفونی . سمکۆ رێگاوبانەکانی چاکسازیکردبۆوە و رێگای نوێی کێشابوو. لە چوار قەڵا رۆژنامەی کوردی دەردەکرد. هاوینی ١٩٢١ فارسەکان سمکۆیان لە سابڵاخ شکاند و سمکۆ رایکرد بۆ تورکیا.

**سەید تەها:**

خزمی یەکێك لە نزیکەکانی سمکۆ واتا فازیل شێخ مەحموودە. لە بنەماڵەی شێخ عوبێدوڵڵا و لە شێخەکانی شەمزینانە. ناوبراو لەگەڵ شێخ عەبدولقادر دوژمنایەتی هەیە لەسەر ئەوەی کامیان گەورەی بنەماڵەکەیان بن. تورکەکان راوەدووی دەنێن، ئەویش لەگەڵ عەبدولڕەزاق دێتە ئێران بۆ لای سمکۆ. ناوبراو خۆی بە دۆستی ئێمە دادەنێت، بەڵام لە تەورێز ژەنەراڵ وارخانۆڤ دەیگرێت و بەتاوانی پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان و چالاکی دژی رووسیا دەینێرێتە تیفلیس و لەوێ بۆ بۆکان.

له پاییزی ۱۹۱۵ لەسەر داوای من دەیهێننەوە قەفقاز و لەوێشەوە بۆ باکۆ، بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا زووتر دەستمان بیگاتێ. دوای کودەتای شوبات دەچێتە فارس (ئێران) و پێموایە چوەتە لای تورکەکان. کابرایەکی ژیر و فێڵبازە.

کاتێك کە تورکان لەسەر هاوکاری کردنی رووسیا لەباشووری کوردستان بێ بەزەییانە دەستیان دایە سەرکوت کردن و کوشتنی کورد، لەگەڵ کەمال بەگ لەناو کوردەکاندا خەریکی پرۆپاگەندە بووین.

وەك پێشتر ئاماژەم پێکرد ئینگلیز بە داگیرکردنی کوردستان، دەبێتە مەترسی بۆ فەرەنسایيەکان لە سوریا. ئەم مەترسی و هەڕەشەیە ئەگەر بۆ فەرەنسا کەم بێ، بۆ رووسیا گەلێك زۆرە. داگیرکردنی کوردستانی ئێران و تورکیا و لکاندنی ئازەربایجان بە کوردستانەوە کە بێ گومان خاکی ماکۆش لەو چوارچێوەیەدا دەبێت، ئینگلزەکان لە سنوورێکی دوور و درێژدا بە قەفقازەوە دەنوسێنێت و رێگا بۆ هاندانی گەلانی قەفقاز دژی ئێمە دەکاتەوە. لە رێگای ماکۆ و جولفاو شابەختیدا رێگا بۆ دەست پێڕاگەیشتنی ئینگلیز بە ئازەربایجانی ئێمە دەکرێتەوە. بزووتنەوەی مساواتیەکان و داگیرکردنی باتۆم و .... هەر بۆ ئەمە بوو ئینگلیز دەستی بگاتە نەوتی باکوور.

پشتیوانی ئینگلیزەکان لە هەر جوڵانەوە یا بزووتنەوەیەك لە فارس (ئێران) ئەم دەوڵەتە لاواز دەکات و بەم چەشنە دەیانەوێ لە رێگای فارسەوە دەستیان بگاتە ئاسیای ناوەڕاست و لەوێوە خەبات دژی رووسیا، پەرەپێبدەن، لە لایەکی تریشەوە هیندوستان باشتر بپارێزێت. جگە لەوە ئەم ناوچەیەش بۆ پێشکەوتنی خۆی پێویستە.

ئەگەر تورکیا بتوانێت لە کۆنفرانسی لۆزان لەگەڵ ئینگلیزەکان پێکبێت. ئینگلیزەکان واز لە پشتیوانی شێخ مەحموود دێنن. بەڵام هەر لەبەر مانەوەی خۆی دیسان ناچارن بەنهێنی پشتیوانی لە کوردەکان بکەن. بۆ تورکان خەبات دژی کوردەکان گرانە.چونکە کێشەی کوردیش وەك کێشەی مەکدۆنی (مەقدۆنیا)ی لیدێت. تورکیا پێشبینی ئەوە دەکات بەگوێرەی بارودۆخی گشتی سیاسی لە داهاتوودا کوردستان لەدەست دەرچێت. ئەگەر بڕیاری لۆزان لە بەرژەوەندی تورکیادا نەبێت تورکەکان ناچارن تەواوی هێزی خۆیان لەبەرەی رۆژئاوا راگرن و ناتوانن هێزێکی زۆر بۆ میزۆپۆتامیا بنێرن، بەبێ ناردنی هێزی زۆریش خەبات دژی کوردان زۆر دژوار

دەبێت، ئەوسا کوردستان لە دەست تورکەکان دێتە دەرێ. ئەگەر تورک بیانەوێ کوردستان ئاوا بمێنێتەوە تەنیا ڕێگایان ئەوەیە دەستبەجێ ئۆتۆنۆمییەکی فراوان لەچوارچێوەی تورکیادا بدەن بەکوردان وەك ئەو ئۆتۆنۆمییەی تورکە گەنجەکان لە ماوەیەکی کەم تا دەست پێکردنی شەڕ دایان بە ئیمام یەحیای یەمەنی، بە هۆی ئەوەش یەمەنییەکان بەسترانەوە بە تورکیا و لە کاتی شەڕ لەگەڵی دابوون و شەڕییان بۆ کرد و تائێستاش پێی وەفادارن.

ڕەنگە بەم چەشنە تورکیا بتوانێت پێش بە پڕۆپاگەندەی ئینگلیزەکان بگرێت، ئەمەش ئەگەر بێزاری کوردان بەرامبەر تورك لەبەر چاو نەگیرێت زەحمەتە حیسابی لەسەر بکرێت . جگە لەوەش زۆر ئەستەمە خودی تورکان هەنگاوی وا هەڵگرن.

فەڕەنسا کە بەشی خۆی لە نەوتی میزوپۆتامیا وەرگرتووە و بەرژەوەندییەکانی لە ئەستەمبوڵ و ئەنادۆڵ پارێزراون، بوونی ئینگلیز لە کوردستان بە دژی بەرژەوەندی خۆی نازانێت، بۆیە زۆر زەحمەتە دژی ئینگلیز لە میزۆپۆتامیا و کوردستان هەنگاوێك هەڵگرێت. رووسیا دەمێنێتەوە، بەڵام چۆن ئینگلیز لە گۆڕەپانەکە دەربکات.

روسیای سۆڤیەتی بە هۆی ئەو پەیوەندییە باشەی لەگەڵ تورکیا هەیەتی (گەرچی لەنگە) و تورکیا بەرژەوەندی ئێمە لە رۆژهەڵات دەپارێزێ، کەوتەوتۆتە بارودۆخێکی دژوار. بەڵام دەبێ چ بکەین؟ دەبێ هەر هەوڵێکی سەربازی لەگەڵ تورکیا بۆ سەرکوت کردنی کوردەکان وەلابنرێت و بیریشی لێنەکرێتەوە، چونکە پرستیژی خۆمان لەناو کوردەکان بەیەکجاری لە دەست دەدەین و لە خۆمان دووریان دەخەینەوە، ئەوسا ئەگەر لەگەڵ تورکیا تووشی شەڕبین لە بەرژەوەندیمان نابێت . جگە لەوە با کوردەکان نەخەینە باوەشی ئینگلیز کە ئەویش بەقازانجمان نییە.

**ئەدی چار چییە؟**

ئێمە دەبێ ناوبژی کوردەکان و تورکیا بکەین بەوەی تورکیا ئۆتۆنۆمییەکی بەر فراوان بدات بە کوردان. ئەوسا ئەنجامی کۆنفرانسی لۆزان هەرچۆنێك بێت باکمان نییە. ئەگەر لە کۆنفرانسی لۆزان تورك و ئینگلیز رێك بکەون ئینگلیزەکان لە کوردستان نامێننەوە و پەیوەندی تورکیا لەگەڵ ئێمە ئاڵۆز دەبێت، ئێمەش دەتوانین داوا لە تورکیا بکەین کە بەدانی ئۆتۆنۆمی کۆتایی

بە کێشەی کورد بێنێت، چونکە مانەوەی ئینگلیز لە کوردستان هەرەشە لە بەرژەوەندییەکانمان دەکات. ئەگەر تورکیا ئامادە نەبێت دەستمان دەبەسترێت.

ئەگەر بێتو کۆنفرانس ئەنجامێکی خراپی بۆ تورکیا هەبێت ئێمە دەتوانین ئامۆژگاری و پێشنیاری خۆمان بە تورکەکان بدەین .هەرچەند تورکەکان ئەم هەڵوێستانەی ئێمە بە دەست تێوەردان لە کاروباری خۆیان دەزانن.

هەر چۆنێك بێ ئێمە نابێت هەر تەماشاکەری کێشەی کورد بین بەڵکو دەبێ خۆمانی بۆ ئامادەبکەین.دەبێ لە هەر رووداوێکی فارس و میزۆپۆتامیا و کوردستان ئاگاداربین. لە لایەکی ترەوە لەگەڵ کوردەکان پەیوەندیمان هەبێت و لەناویدا بۆ نیازی پێویست پروپاگەندە بکەین و پرستیژی رووسیا بگەڕێنینەوە.

پێویستە پارەی بۆ پڕۆپاگەندەو دەنگوباس کۆکردنەوە، تەرخان بکرێت، گرنگترین و بەنرخترین دەنگوباس و زانیاری لەسەر کورد دەبێ لە لەندەن و پاریس و تاران وەدەسبخرێت و کۆنسۆڵەکانمان لەسەر کورد لێکۆڵینەوە بکەن، بۆچوون و رێبازی رێبەران و سەرکردەکانی بزانرێت و بەرەو لای خۆمان رایان کێشین. بۆ ئەم کارەش دەبێ لە کوردەکانی خۆمانەوە دەسپێبکەین واتە کوردەکانی پێشووی ئێریڤان (لەئیگدیری) عەلی ئەشرەف ئاغا، لە گوندی (کارمالو) لەگەل برایانی حەمید و حەسەن بەگی شەمسەدینۆڤ، لە گوندی (ئارگۆڤ) بە سەرۆکایەتی کوردەکانی ئێران دەست پێبکەین. شەمسەدینۆڤەکان وەفاداری ئێمەن و لە تورکیا خزم و ناسیاویان هەیە. پروپاگەندەی ئێمە لەناو ئەوانەدا دەبێ دژی ئینگلیز دەست پێبکرێت و لەباتی ئۆتۆنۆمی لە ژێر حیمایەی ئینگلیزی دەبێ ئۆتۆنۆمی لەژێر حیمایەی رووسیا پێشنیار بکرێت.

دەوری بەدرخانیەکان لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد زۆر مەزنە، دوو پاتی دەکەمەوە زۆر مەزنە، ئێمە کارتێکی براوەی بەهێزمان بە دستەوەیە ئەویش کامیل بەگە کوڕی بەدرخان پاشا کە زۆر وەفاداری رووسیایە و ئێستا لە تیفلیس دەژیت و دەتوانێت ببێتە ناوبژیکەر لە نێوان ئێمە و بنەماڵەکەی. گەرچی وابلاوە بنەماڵەی بەدرخانیەکان ئێستا هەڵوێستکی باشیان هەیە. ئەوانە رێگای ئینگلیزیان نەداوە بێتە ناویان.

ئێمه دەبێ ئۆرگانێکی تایبەتی سەربازی بۆ ئەم کارە لە تیفلیس رێك بخەین و رێبەری سیخوری و لێکۆڵینەوە و پڕۆپاگەندە لەناو کوردەکاندا وەئەستۆ بگرێت و راستەوخۆ لە ژێر دەستی شورای شۆڕشگێری کۆماری رووسیادا بێت، لە هەمان کاتیشدا کۆمسیاری گەل بۆ کاروباری دەروە (وەزارەتی دەرەوە) ئاگادار بکاتەوە.

من بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم سەرنجتان بۆ ئەو شتە گرنگە رابکێشم ئەویش ئەوەیە: دەبێ جارێ تا پەیوەندیمان لەگەڵ کوردەکاندا پتەو نەکرێت. بە هیچ شێوەیەك نابێ ئەرمەنی لە ناو پڕپاگەندەچییەکاندا هەبێت، هەبوونی ئەوانە یەکسەر تەواوی کوردەکانمان لێ دووردەخاتەوە. دوژمنایەتی ئەرمەن و کورد زۆر گەورەیە و پێویستە ئەم شتە بەرەبەرە کەم بکرێتەوە.

لە کۆتاییدا ئەوەش زیاد دەکەم من خۆم بەو باوەڕە گەیشتووم کە کوردەکان نابێ سوزی تایبەتیان بەرامبەر ئینگلیز هەبێت. ئینگلیزەکان کە پێشنیاری کوردستانێکی سەربەخۆ و پارەو چەك و.... بە کوردان دەکەن وئەوانیش وەریدەگرن، بەو مانایە نییە کە کوردەکان ئێمەیان پێ لە ئینگلیزەکان زیاتر نییە، ئەگەر هەست بکەن و ببینن ئێمەش پشتیوانیان دەکەین، کاروبارمان لەناویاندا جێی خۆی دەگرێت. ئەگەر ئینگلیزەکان ئیمڕۆ بە پارە و چەك لەسەرەوەی ئێمەن، دەوڵەمەندن و یارمەتی کوردان دەدەن، ئێمەش لەبەر ئەوەی هاوسنووری کوردستانین و ئینگلیزەکان دوورن، بالادەستین . ئەمەش ئەوەندە بایەخی هەیە رووسیا جارێکی تر بێتەوە سەر شانۆ و هەڵوێستکی رێکوپێك بگرێتەبەر*.

**ئەنقەرە ١٩٢٣/١١/٣**

**لەوە دەچێ شاخۆفسکی نووسیبێتی**

کۆمیتەی کوردی کە بەنهێنی لەگەڵ سۆسیالیستەکانی تورکیا پەیوەندی هەیە (کۆمیتەی ئەرزەرۆم بە سەرۆکایەتی خالید بەگ رێبەری عەشیرەتی جەبرانلی)، سۆسیالیستەکان دەیانەوێ لە رێگای خالید بەگەوە بە کوردەکان بڵێن چاوەڕێی روون بوونەوەی سیاسەتی گشتی دەوڵەتی

---

* هەمان سەرچاوە بە کورت کراوەیی ل ١٤٥-١٧٦.

ئەنقەرە بن و ئەوسا دەست بە راپەڕینی هاوبەش دژی دەوڵەت بکەن. کۆمیتەی کوردی لەگەڵ سۆسیالیستەکان پێك نەهات، چونکە لەناو سۆسیالیستەکاندا هەندێ ناسیۆنالیستی تورك هەن وەك ئەوانەی دەوڵەتی تورکیا.

## رەشنووسی نامەی کۆنسوڵی ئێمە لە قەفقاز

## هاوڕێ لڤۆڤیچ ٢١ی کانوونی دووەمی١٩٢٣

دوو هەواڵم لە لایەن بەشی پاراستنی دەرەوە پێ گەیشتووە کە بۆتانی دەنێرم. هەرچەندە ئەم دوو هەواڵە بەپێی بۆچوونی من شتێکیان ناتەواوە و ئەویش ئەوەیەکە باوەڕی تەواویان تیا بەدی ناکرێت و پێناچێت دەوڵەتی کوردی وازی لە نەریتی سیاسی ئینگلیز هێنابێت. بەپێی ئەم هەواڵە نیوە رەسمیە و نیوە شەخسیە ئەم کێشەیە بەشێوەیەکی ترە:

ئینگلیزەکان دەستووریان بە شێخ مەحموود و سمکۆ و ئەندامانی تری دەوڵەتی کوردی داوە بەشێوەیەکی کاتی نەریتی سیاسی رووسیا بگرنەبەر. تا بەم چەشنە پەیوەندی دوو قۆڵی ئێمە لەگەڵ تورك تێك بدەن. ئێوە بێ گومان لەسەر ئەم کێشەیە زانیاری زیاتر و وردترتان هەیە و لە من باشتر دەتوانن ئەم هەواڵانە هەڵسەنگێنن و تاقییان بکەنەوە[1].

## راستکردنەوەی راپۆرتی هاوڕێ مالتسۆڤ

١٩٢٢/١١/٢٢

کە شێخ عوبێدوڵڵا لە سابڵاخەوە بەرەو ورمێ کەوتە رێ، ئازەربایجانی خستە مەترسییەوە، دەوڵەتی تورکیا نەیتوانی شێخ پەشیمان بکاتەوە یا فریوی بدات. ئەوە بوو دەوڵەتی رووسیا ئۆلتیماتۆمی دا بە تورکیا تا بزووتنەوەی کوردەکان لەناو بەرێت. تورکەکانیش نەیاندەتوانی

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٨٠-١٨٣.

ئۆلتیماتۆمەکەی رووسیا جێبەجێ بکەن. ئەوەبوو عەبدولحەمیدی دووهەم دەچێتە لای کوردەکانی بەدرخان وداوایان لێدەکات بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵا لەناو بەرن. ئەوانیش ئامادە دەبن دوو لەوانە (ناوەکانیانم بیرچۆتەوە) دەچنە لای شێخ عوبێدوڵڵا و رازی دەکەن بێتە (ئەستەمبۆڵ)، دوای ئەمە بزووتنەوەکە بەبێ سەرۆکایەتی دەمێنێتەوە و هێندەی پێناچێت کۆتایی پێدێت و فارسەکان زۆر پێی خۆشحاڵ دەبن. شێخ عوبێدوڵڵا بۆ مەککە دوور دەخرێتەوە، ئەگەر بە هەڵە نەچوبم هەر لەوێ لەساڵی ۱۹۱۳ دا کۆچی دوایی دەکات.

لە سەرەتای ساڵانی ۱۰هەیسەدەی بیستەم عەبدولڕەزاق بەگ رادەکاتە ئازەربایجانی ئێران و لەوێوە لەگەڵ سمکۆ و سەید تەها دەست بە پڕۆپاگەندەی راپەڕین لە کوردستان دەکەن. سەرەتا دژی تورکیا دەجەنگن و لایەنی ئێمە دەگرن، پاشان کە گومانی لێدەکەن پەیوەندی لەگەڵ تورکان هەیە لە بەرەی شەڕەوە دەیگوزانەوە بۆ تیفلیس.

لە پاییزی ۱۹۱۵ کە هەموو پەیوەندییەك لەگەڵ کوردەکان درایە دەست من، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی کۆنسوڵی ئێمە لە ماکۆ (ئۆل فریق) لەسەر ئەم کێشەیە بۆی دەرکەوت کە عەبدولرەزاق بەگ لە لایەن ئەرمەنەکانەوە بوختانی پێکراوە.

(عەبدولڕەزاق بەگ)یان دایە دەست من، منیش بە پێویستم زانی لەو تاوانە بکۆڵمەوە کە دراوەتە پاڵی، دوایی بە تەواوی بەو ئەنجامە گەیشتم کە ئەو شك و گومانەی لەسەر عەبدولڕەزاقە راستە، هەر بۆیەش دووبارە عەبدولڕەزاق بەگ نێردرایەوە بۆ تیفلیس و لەوێشەوە نێردرا بۆ یکاترینیبۆرگ. دوای کودەتای شوبات ناوبراو لەگەڵ سەید تەها کە لە کاتی شەڕدا لە لایەن ئێمەوە بە تاوانی هەبوونی پەیوەندییان لەگەڵ تورکەکان دەستگیرکرابوون رادەکەنە تورکیا. تورکەکانیش لەوێ دەینێرنە موسڵ. سەرەتای شەڕ سمکۆ چەکی لە ئێمە وەرگرت بەڵام پارەی وەرنەگرت(1).

**شاخۆڤسکی**

**۲۰ی کانوونی دووەم ۱۹۲۳**

---

(1) هەمان سەرچاوەی ل ۱۹۱-۱۹۲.

- هۆزی شەمسەدینۆڤ کە ڕێبەری بەشێکی عەشیرەتی جەلالی ناو ڕووسیان زۆربەیان لە ماکۆ دەژین، تاجەنگی جیهانی یەکەم بەهاران لە نزیك ڕۆخەکانی ڕووباری ئاراس دەژیان و ژمارەیان سێ سەد ڕەشماڵ بوو. یەکێك لە شەمسەدینۆڤەکان (وابزانم جەعفەر ئاغا) لەگەڵ پیاوەکانی خۆی لە شەڕی ١٨٧٧-١٨٧٨ شان بە شانی سوپای ڕووسیا دژی تورك شەڕی کردووەو پلەی ژەنەراڵی سوپای ڕووسیای پێدراوە. کوڕەکەی عەلئەسراف بەگ (عەلی ئەشرەف)یش دوای کۆچی دوایی باوکی، پلەی ژەنەڕاڵی سوپای ڕووسیای پێدرا.

لە ١٩١٧-١٩١٨ لە کاتی کوشتاری ئەرمەنی-تاتار عەلئەسراف بەگ لەگەڵ پیاوەکانی ڕۆیشتنە ناو خاکی تورکیای ئیمڕۆ و لە ناوچەی سورمالین نزیك وێستگەی شەمەندەفەر، هێڵی ئاسنی قەفقاز- کامارلو جێگیربوون. دوای گرتنی ئەرمینیا لە لایەن سوپای سورەوە عەلی عەلئەسراف هەوڵی پەیوەندی گرتن بە یەکیەتی سۆڤیەتەوە دەدات(2).

گیرخینشتین

**فەرماندەی سیخوڕی نیزامی**

**ستادی سوپای قەفقاز**

(2) هەمان سەرچاوە ل٢٠٣.

## بۆ: نوێنەری رووسیای فیدراتیڤی سۆڤیەت هاوڕێ ئارالۆڤ

لەگەڵ ئەم نامەیە ئەو مەرجانەی کۆمیتەی کوردی بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ لە ژێر حیمایەی رووسیای سۆڤیەتی گەیاندویانەتە من، ئاراستەتان دەکەم.هەرسێ دەقە تورکی و کوردی و رووسەییەکەی دەنێرم. وشە بەوشەی تێکستە رووسیەکەی لە لایەن یەکێك لە ئەندامانی کۆمیتەی کوردی لە کوردییەوە کراوەتە فەرەنسی بۆیە لەوانەیە دروست وەك تێکستە کوردییەکەی نەبێت و منیش زمانی فەرەنسیم لاوازە.

لە دۆستایەتی و پاکی جیدییەتی کۆمیەتی کوردی نابێت شك و گومان بکرێت، یەکێك لە ئەجیندا نهێنیەکانی من هاوکارم (بیلاکۆن) باوەڕ پێکراو و دۆستی کۆمیتەی کوردییە. ناوبراو ئاگاداری چالاکی و جموجۆڵی کۆمیتەی کوردی بووە و تاقی کردونەتەوەو هیچ شتێکی خراپی پێوە نەدیتوون و ئەوانیش هەروا. کۆمیتە، تێکڕای پیاوە ناودار و دەسەڵاتدارەکانی کوردی یەکخستووە.

ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمیتە بریتین:

- سەرۆکی کۆمیتە خالید بەگ لە (عەشیرەتی جەبرانلی).

- حوسێن پاشا نوێنەری وان لە پەرلمانی تورکیا.

- حوسێن بەگ، سەلیم بەگ، ئیسماعیل حەقی بەگ، کاشیان عەلی بەگ و هتد.... کە لە راپۆرتی تایبەتی سوپایی ناویان هاتووە.

مەرجەکانی کۆمیتەی کوردی کە لە لایەن نوێنەرانی سەرکردە گەورەکانی عەشایەری کوردەوە کاری لەسەرکراوە و ئامادەکراوە، دوای کۆبوونەوەکەیان بە منیان راگەیاندا. لە کۆبوونەکەدا باسی ئەوە کراوە ئەم مەرجانە بدرێتە کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەرۆم یان بە نوێنەری سۆڤیەت (بالۆێز) لە ئەنقەرە.

جگە لەوە دەستبەجێ دوای کۆبوونەوەکە حوسێن پاشا و نوێنەری وان حەسەن بەگ دەچنە ئەنقەرەو و بڕیاریش دەدرێت کە ئەم مەرجانە بدرێتە کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەرۆم.

نابێ کاربەدەستانی تورکیا لەسەردانی حوسێن پاشا بۆ بالوێزخانەی ئێمە ئاگاداربن تا گومانی لێنەکەن.

بە وەرگرتنی ئەم مەرجانە، من داوام کرد بە بروسکە ئاگادارم بکەنەوە کە هەڵوێستی من بەرامبەر بەم کێشەیە چی بێت؟ ومنیش تا وەرگرتنی دەستوورێکی ئێوە هیچ هەنگاوێك هەڵنەگرم، سەبارەت بەم کێشەیە هەتا دەستووری ئێوە نەیەت، مۆسکۆ و تیفلیس ئاگادار نەکەمەوە.

ئەگەر بیرورا و هەڵوێستمان سەبارەت بە کێشەی کورد بپرسن بەم چەشنەیە:

ئەگەر لە رابردوودا شوێنی تێکهەڵچوونی بەرژەوەندییەکانمان لە رۆژهەلات لەگەڵ ئینگلیزەکان لە ئەنقەرە بوو، ئێستا هاتۆتە رۆژهەلاتی تورکیا واتە کوردستان. بۆیە بە بۆچوونی من پێویستە هەڵوێستێکی سیاسی ئاشکرا و پتەو بەرامبەر بە دەوری ناوچەکانی رۆژهەلاتی تورکیا (بە تایبەتی کوردستان)، بگرینەبەر. بۆ رووسیا بێ غیرەتی دەبێت ئەگەر لەسەر کێشەی کورد هەڵوێست وەنەگرێت، لەکاتێکدا ئینگلیزەکان بەشێوەیەکی بەربلاو لە رۆژهەلات دەور دەبینن.

ئێمە ئەگەر بێ لایەن بین زێڕ و پارەی ئینگلیز گەیشتۆتە ئەرزەرۆم، کۆمیتەی کوردی (کە لایەنگری رووسیایە) دەبێ زۆر هەوڵبدات لە بایەخی ئەم زێرو پارەیە کەم بکاتەوە[1].

**پاڤلۆڤسکی**

**کۆنسۆڵی رووسیای فیدراتیڤی لە ئەرزەرۆم**

**٢٠ ی کانوونی یەکەمی١٩٢٢**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢١٠-٢١٣.

## له شورای شۆرشگێری نیزامی بەشی سوپای قەفقاز

### ۱۳ی کانوونی یەکەمی ۱۹۲۲ شاری تیفلیس

بۆ شورای کۆمسیاری گەل لە کاروباری دەرەوەی(وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت) رووسیای سۆڤیەتی. .... تا ئێمە لەمەڕ کێشەی کورد سیاسەتێکی چالاك نەگرینەبەر و بۆ گەیشتن بە ئۆتۆنۆمی کوردستان پشتیوانیان نەکەین کوردەکان هەمیشە وەك دارودەستەیەکی گوێڕایەڵ لە خزمەت ئینگلیزەکاندا دەبن، ئەگەر ئێمە هەڵویستمان نێگەتیڤ بێت ئینگلیزەکان بە ئاسانی دەتوانن دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بکەن کە دەبێتە دراوسێی سنوورەکانی قەفقازمان[2].

### لەسەر کامیل بەدرخان پاشای بۆتان

....... ئێستا لە تیفلیس دەژیت لە خیابانی گودرۆیچ ژمارە ۱۳ی ماڵی ٤.

کوڕە بچووکەکەی بەدرخان پاشایە... عومەر پاشا کاتێك لە ۱۸۵۰ بەدرخان پاشای شکاند. بەدرخان پاشا تەسلیم دەبێت و بەدەعوەت دێتە ئەستەمبوڵ. لەوێوە دوور دەخرێتەوە بۆ دوورگەی کریت. کە کێشەی تەختی پاشایەتی رۆمانی دێتە کایەوە تورکەکان بەدرخان پاشا داوەت دەکەنە ئەستەمبوڵ و بۆ پاشایەتی رۆمانی دەسنیشانی دەکەن بەڵام سەرناگرێت، پاشان دێتە دیمەشق و لە ساڵەکانی ۷۰دا کۆچی دوایی دەکات.

بەدرخان پاشا بۆ تورکەکان زۆر پێویست دەبێت، لەبەر ئەو دەور و کەسایەتییە گەورەی لەناو کوردەکانی ئێران هەیبوو، دەیانەوێ کوردستانی ئێرانیش لە رێگای بەدرخانەوە بخەنە ژێر دەستی خۆیان.

دوای شەڕی کریم برازای بەدرخان یەزدانێشێر و پاشان کورەکانی واتە حوسێن پاشا و عوسمان پاشا راپەڕین. عەبدولحەمید بۆ بەربەرەکانێیان داوای یارمەتی لە بەردخانیەکان دەکات... شێخ

---

(2) هەمان سەرچاوە ل ۲۱٦.

عوبێدوڵڵاش هەر بە پیلانی بەدرخانیەکان لە لایەن تورکەکانەوە دەگیرێت و پاشان دووردەخرێتەوە بۆ مەککە و لەوێ کۆچی دوایی دەکات.

کامیل بەگ کە دەگیرێت پەنا دەباتە بەر کۆنسوڵی ئێمە لە ئەستەمبوڵ، لەوێ لەگەڵ فەرەنساییەکان پەیوەندی دەگرێت وئەوانیش دەینێرنە بەیروت و پاشان بە پاپۆر دەیهێننە پیری و لەوێوە بۆ ئۆدیسا و لەوێشەوە بۆ تیفلیس.کە شەڕی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد کامیل بەگ بە یارمەتی ئێمە لە کوردستان دەستی دایە راپەرین.

بەڵام لە چاوپێکەوتنەکەی (لیواری)، تەلعەت بەگ (تورك) توانی بەڵێن لە نیکۆلای دووهەم وەربگرێت کە دەرفەتی ئاژاوە نانەوەی بەدرخان لە تیفلیس دژی تورکیا نەدات، بە کەمال بەگیش راگەیاندرا بێ دەنگ دانیشێت.

بە بەشداربوونی تورکیا لە شەڕ، کەمال بەگ دەنێردرێتە کەرەکیل بۆ بارەگای ژەنەرال ئاپسیدۆڤ و لەوێ دەستی دایە پروپاگەندە لەناو کوردان. بەڵام قەفقاز کە لە ژێر دەسەڵاتی گرافینا (شاژن) وارەنستوڤا داشکۆڤی دوژمنی کورد بوو کە دەستی هەبوو لە کوشتاری بێ بەزەییانەی کوردەکان لە لایەن ئەرمەنییەکانەوە، رێگەی بە کامیل بەگ نەدا خەریکی کارو باری خۆی بێت، ئەویش ناچار گەڕایەوە بۆ تیفلیس . بەهاری ١٩١٦ کە رۆیشتین بۆ بەتلیس و وان ئەویش لەگەڵمان هات، بەڵام کودەتای شوباتی ١٩١٧ پێشی بەو پرۆژەیە گرت. ناوبراو دوژمنی سەرسەختی تورك و وەفاداری ئێمەیە ئومێدی پێمانە و بەهیوای یارمەتی ئێمەیە.

ناوبراو مانگانە پێنج سەد روبل وەردەگرێت ئێستا کردویانەتە حەوت سەد و پەنجا. باری ژیانی زۆر شپرزە و خراپە و دوا شتی ناوماڵی خۆی فرۆشتووە. واپێدەچێت دەوڵەتی نوێی رووسیای سۆڤیەتی هیچ یارمەتییەکی نەدات. بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە ناوبراو لە کوردستان دەورێکی زۆری هەیە ئەگەر پەیوەندیمان لەگەڵ تورکیا خەوشداربێت، بەکەڵکمان دێت. ناوبراو خوێندەوار، رووناکبیر، تێگەیشتو و زانایە، زمانی فەرەنسی دەزانێت و ئێستا رووسیش فێربووە. زوو زیزدەبێ و خۆ بەزل زانە و خۆی زۆر بە نزیکی رووسیا دەزانێت، بەڵام لە سەر قسەی خۆی سوور نییە.

# رووداوه سیاسییەکان لە ناوچەکانی رۆژهەلاتی تورکیا

## تشرینی دووەمی١٩٢٢

### سەعید پاشا:

لە نیوەی تشرینی دووەمی ژەنەڕاڵ مایور سەعید پاشا لە باتی کازم قەرە بەکر هاتە شاری قامشلۆ. بەخۆڕایی نییە دەڵێن کازم قەرەبەکر پاشا دەیەوێ دەوری کەمال(مەبەست کەمال ئەتاتۆرکە) ببینێت. ژەنەڕاڵێکە ناوبانگی زۆرباشی دەرکردووە. لە کوت و عەمارە بەسەر سوپای ئینگلیزدا سەرکەوت، لە قوتابخانەی ئەڵمانی دەورەی دیتووە و لەبارەی رێکخستنەوە زۆر بە توانایە، لەگەڵ کەمال یەکێك بوو لە دروستکەرانی سوپای تورکیا، لە ماوەی دووساڵدا لە باندە بچووکەکانی چیتێ سوپای رۆژهەلاتی تورکیایان دروست کرد. ناوبراو نیشانیدا کە دەیهەوێ لەناو سوپای تورکیا هەر خۆی دەسەلاتداربێت و دەنگوناویشی زۆر بوو.

ئەنقەرە لە هەوڵدانی سپارتیستانەی ژەنەڕاڵ سەعید پاشا کە لە شەڕی یۆنان و تورکیا خۆی نواندبوو دەترسا، ئەوە بوو دوای شەڕ بە بیانوی بەژداری کردنی لە کۆبوونەوەی دەوڵەت و دیاریکردنی سیاسەتی دەوڵەت پاش شەڕ بانگکرایە ئەنقەرە.

تا ئەو دەمە هەوڵدانی دەوڵەت بۆ کەم کردنەوەی دەسەلاتی قەرەبەکر لە بواری بەڕێوەبەرایەتی شارستانییەوە کۆمسیۆنێکی لێکۆڵینەوەیان پێکهێنا، یەکێك لە ئەندامانی ئەم کۆمسیۆنە سەعید پاشا بوو. بەلام سەعید پاشا کێیە؟

٥٥ ساڵیەتی دیمەنێکی رێویانەی هەیە، بە ئارامی دەدوێ، ئاسایی دەنووسێ، میهرەبان و لەسەرخۆیە بە پێچەوانەی قەرەبەکر زۆر سوورە لەسەرقسەی خۆی، لەخۆبایی و لێوەشاوەیە، ئەمەش بەرەو ئەو دیکتاتۆریەتەی هەوڵی بۆ دەدات، رایدەکێشێ.

سەعید پاشا هەروا لەگەڵ غالیب پاشا لە عەرەبستان بەشداری شەڕی کردووە، بەلام سەرکەوتنی ئەوتۆیان بە دەست نەهێنا و بە دانیشتنی لە مەککە هیچ شتێکی بۆ ناوبانگی خۆی زیاد نەکرد.

دوو شتی هەیە:

**یەکەم:** نزیککردنەوەی رووسیا و فەرەنسا بە یارمەتی تورکیا.

**دووەم:** یەکخستنی موسڵمانانی شیعە و سووننە (بەتایبەتی لەگەڵ فارس واتە ئێران)، لەسەر ئەمە لێی وەشك کەوتوون دەڵێن ئەندامی کۆمسیۆنی لێکۆڵینەوەی ولایەتەکانی رۆژهەڵاتە، کە بۆ ئەوێ سەفەر دەکات لە (ئەندەگان) ئاگادار دەکرێتەوە کە کابرایەك تورکە سوونەکان دژی فارسە شیعەکان هان ئەدا، بانگی ئەکا ولەبەر چاوی هەمووان بە گۆچان لێی دەدا و دەیکوژێ. نیشانەیەکی نزیك بوونەوەی تورکیا و فارس لە ولایەتەکانی رۆژهەڵات، سیاسەتی نوێی دەوڵەتی تورکیایە لەمەڕ کێشەی کورد کەدوورنییە سەعید پاشا دەوری تێدا هەبێت:

ئەو سیاسەتەی کە قەرەبەکر پاشا بەرامبەر بە کێشەی کورد و ناوچە کوردنشینەکانی ئێرانی هاوسنوری تورکیا گرتویەتەبەر، ئاشکرابوو. دڕندایەتی و بێ بەزەیی تا گوللەباران کردن و سەرکوتکردن و دوورخستنەوەی ئەو کوردانەش کە دەوریان کەمە.هەڵوەشاندنەوەی فەوجی عەشیرەتەکان، دووبەرەکی دروستکردن لەناو عەشیرەتە گەورەکانی کورد، هەوڵدان بۆ دروستکردن و ناردنی دەستەی چەکدار و رێگر و چەتە بە مەبەستی داگیرکردن و زیان گەیاندن بە ناوچە کوردنشینەکانی ئێرانی سەر سنووری تورکیا. ناوبراو پشتیوانی سمکۆی دەکرد. پشت بەستن بە مەلای بەناوبانگی کوردان سەید تەقی، بەدانی چەك و پارە تا لەگەڵ ئینگلیزەکان کێبرکێ بکات لە رێگای چەتە و رێگرەکان دەیانەوێ هەردوو ئازەربایجانی ئێران بەرەو تورکیا رابکێشن و بیانخاتە سەر کوردستانی تورکیا. هاوکات ناوبراو رێبەرە کوردەکانیشی هیوادار دەکرد کە ئەنجومەنی تورکیا دەستووری پێکهێنانی کوردستانی سەربەرخۆ دەدات و بەم چەشنە ویستوویەتی دژی ئەرمەنەکانی ناوچەی نەخجەوان و زەنگ بەکاریان بێنێت.لەگەڵ ئەمەشدا سەعید پاشا خەریکی دڵگەرمکردنی خانی ماکۆ بوو گەلێك بەڵێنی پێداوە و پیاوێکی ئەجیندای خۆی وەك کۆنسۆڵی تورکیا لە تەورێز بەناوی قەدری بەگ بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکانی لە ماکۆ و ئازەربایجان، داناوە.

دەوری تورکیا لە پیلانی سمکۆ بۆ گرتنی ئازەربایجانی ئێران ئەوەندە ئاشکرابوو کە دوای شکستی سمکۆ دەوڵەتی ئێران داوا لە تورکیا دەکات سمکۆی تەسلیم بکاتەوە، داواشی لە

نوێنەری رووسیای سۆڤیەتی کردبوو بۆ تەسلیم کردنەوەی سمکۆ ببێتە ناوبژیکەری نێوان دەوڵەتی ئێران و تورك.

لە بارووددۆخێکی وا روون و ئاشکرادا کتوپڕ هەموو شتەکان ئاوەژوو دەبنەوە واتە سیاسەتی پێشووی تورکیا بەرامبەر بە کێشەی کورد لەسەر ناوچە کوردنشینەکانی سەر سنووری ئێران، دەگۆردرێت.

سمکۆ وەك سەربازێکی بەرەی رۆژهەڵات بوو دوای تەقەکردن لە کەرتەکانی سوپا بۆ گەڤەر هەڵدێت و دەچێتە چیاکانی سەر سنووری ئێران. براکەی ئۆمەر ئاغا لەلایەن تورکانەوە دەگیرێت و دەیبەنە بارەگای ناوەندی بەرەی رۆژهەڵاتی لەشکری تورك. تورکیا لەم پیلانە خۆگێل دەکات و ٣٥ ئەفسەری تورك دەنێرێتە ژێر دەستی شازادە میرزا ئەمانوڵا، بەم چەشنە سوپای ئێران دام و دەزگای سەربەخۆی خانی ماکۆ لەناو دەبا و تورکەکان لەم بارەوە بێ دەنگ دەبن.

قەدری بەگ لە تەورێزە، دێتە سەروقامیش و لەسەر پەیوەندی دۆستایەتی نێوان دەوڵەتی ئێران و تورك دەکەوێتە وتووێژ. پاش ئەمە بڕیار دەدرێت کە دەوڵەتی فارس لە قارس و سەروقامیش و ئەرزەڕۆم کۆنسوڵخانەی خۆی بکاتەوە. گەلێك بازرگانی ئێرانی وەك وەهابۆڤ و عەباس ئاغا دەچنە تورکیا و باسی پەرەپێدان و بەهێزبوونی دۆستایەتی نێوان تورکیا و ئێران و باسی سەرمایەگوزاری خۆیان لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا دەکەن. سەرئەنجام کارمەند یان فەرمانبەرێکی سەفارەتخانەی ئێران لە تفلیس بەناوی ئیبراهیم ئاغا دەکەنە کۆنسوڵی ئێران لە قارس. ئەم هەنگاوانە بە یەکجاری پەیوەندی نێوان هەردوو وڵات دەگۆڕن. جگەلەوەش فەرماندەی هێزەکانی تورکیا لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا پیاوێکی لایەنگری نزیك بوونەوەی تورکیا و ئێران بوو.

کێشەی کورد کێشەیەکی نوێ نییە لێکۆڵینەوەیەکی ورد و جدی و سوودمەندی پێویستە، کێشەیەکە لە سیاسەتی تورکیا و ئێراندادەوری هەیە.

ئەمە قۆناخێکی کاتییە لە سیاسەتی دەوڵەتی تورکیا بەرامبەر بەکورد، بێ گومان دەگۆڕێ و هەروا نامێنێتەوە، بۆیە ئێستا پێویستە لە هەموو کاتێك پتر چالاك و بەپەلە خەریکی

لێکۆڵینەوە بین لەسەر کێشەی کورد. سەرەڕای ئەوەی سەرکردەکانی کورد لەرزۆك و ناپایەدارن، بەڵام لەسەر داخوازییەکەیان ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان هەر سورن و حکومەتی تورکیا تا ئێستا نەیانتوانیوە (گەرچی هەوڵی زۆری داوە) ئەوانە سەرکوت بکا یا بە چۆکییاندا بێنێ یا دەسەڵاتیان بەسەردا بسەپێنێ بگرە نەیتوانیوە خزمەتی سەربازیشیان پێ بکا، لەکاتێکدا دەیانتوانی کەڵك لە هێزی ڕێکخەری لاوەکانی بزووتنەوەی کورد وەربگرن و نەهێڵن بچنە ریزی ئەو بزوتنەوەیە .

گرینگ ئەوەیە ڕۆڵی سەرکردە بەناوبانگ و کەسایەتیەکانی کورد لە و ئاژاوەگێڕان جیابکرێتەوە واتە لەوانەی بۆ بەرژەوەندی و خۆهەڵکێشانی خۆیان کەڵك لە هەستی پاکی کورد و نارەزاییان بەرامبەر بە داگیرکەرانی کوردستان، وەردەگرن. وەکو فاتحە کە خزمی سمکۆیە و هیچ دەور و ریزێکی لەناو کوردەکاندا نییە، بەڵام بە پێچەوانە کەسانی وەك مەلا ساحیب تەها، براکانی شەمسەدینۆڤ بەتایبەتی برا گەورەکەیان، عەلی ئەشرەف ئاغا، عوسمان عەبدولرەحمان ئاغا، ئاسکۆ ئاغا، حوسێن پاشا، خالید بەگ و ئەمیرتومان لەناوچەی (ماکۆ) پێویستە بایەخیان پێ بدرێت.

ئێستا کە خەریکی لێکۆڵینەوەین لەسەر کێشەی کورد، دەبێ هەموو کاروبارەکانمان لەم بارەوە یەکبخەین .

**مالستۆڤ**

**-کۆنسۆڵی رووسیای فیدراتیف لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا**

**٢١ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢١**[1]

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٢٧-٢٢٩.

## بەدرخانەکان و کامیل بەگ

کامیل بەگ ئێستا لە تیفلیس دەژیت، کوڕە بچووکی بەدرخان پاشای عەزیزییە لە سەدەی حەوتەم کاتێ یەکێك لە یارانی موحەمەد خەلیفە سەیفوڵڵا لە تایەفەی قوڕەیش ئەم ناوچەیە دەگرێت و تێیدا جێگیر دەبێت. لەو ساتەوە تا ئێستا واتە تا ۱۸۵۰ وەك نیوە سەربەخۆ پاشایەتی ئەوێ دەکەن. سوڵتان عەبدولمەجید لە ترسی پەرەسەندنی دەسەڵات و هێزی بەدرخانییەکان هێزێکی گەورەی بۆ سەرکوتکردنیان ناردە ئەو ناوچەیە. بەدرخان پاشا تێکدەشکێ و بەدیل دەگیرێت و دەینێرنە دوورگەی کیرت. کە کێشەی داگیکردنی رۆمانیا هاتە گۆڕێ ناوبراو بانگ دەکرێتە ئەستەمبوڵ.

بەڵام کارل گۆگینتسیلیر تاج و تەختی پاشایەتی رۆمانی گرتەدەست و بەدرخان هێندەی پێناچێ دەرواتە دیمەشق و دوای ساڵێك لەوێ کۆچی دوایی دەکات (وابزانم لە سەرەتای ساڵانی ۷۰ بوو).

کە بەدرخان پاشا خۆی بەدەستەوەدا وایدەزانی تورکەکان ماڵ و سامانەکەی لێ ناستێنن و بۆ بنەماڵەکەی دەمێنێتەوە. بەڵام تورکەکان بەڵێینی خۆیان شکاند و دەستیان بەسەرهەموو موڵك ومالەکەی داگرت و شتێکی زۆرکەمیان دایەوە بە بنەماڵەکەی.

بنەماڵەکەی عەزیزی و دەسەڵاتی پاشایەتی لە بۆتان، لە بارەی ئایینەوە وەك پاشماوەی بنەماڵەی خەلیل سەیفوڵڵا تا ئێستا دەوری خۆیان پاراستووە.

رۆڵێکی هێندە مەزن و بەهێزییان هەبوو، سوڵتانەکانی تورك دەبوو پرسیان بە بەدرخان کردبا و بیروڕایان لەبەر چاو گرتبا، ئەگینا کاروباریان لە بۆتان نەدەڕۆیشتە پێش، تا بەدرخانیەکان داوایان لە خەڵك نەکردبا هیچ دەستوورێك جێبەجێ نەدەکرا.

دەوڵەتی تورکیا بەتایبەتی عەبدولحەمید ئەوەندە لە دەورو کەسایەتی دەسەڵات و بنەماڵەی بەدرخانیەکان لە بۆتان دەترسا نەیدەهێشت بەدرخانیەکان بگەڕێنەوە کوردستان و لەهەرکوێ

بان لە دەرەوەی کوردستان دەبوو ئیمزایان لێ وەرگرن کە نەگەڕێنەوە کوردستان. لە دەرەوەی کوردستان رایاندەگرتن تا لێك دوور و بنەماڵەکەیان پارچە پارچە بێ. لە لایەکی ترەوە بە دەستەمۆ کردنی بەدرخانیەکان دەسەڵاتدارانی تورك کاروباری خۆیان لە کوردستان بەڕێوەدەبرد. سوڵتان عەبدولحەمید خەلاتی دەکردن و پلەوپایەی پێدەدان تا لەئەستەمبول بمێننەوە.

کوڕەزای گەورەی بەدرخان پاشا عەبدولڕەزاق، کە پاشان رایکرد بۆ رووسیا، لە لای سوڵتان عەبدولحەمید سەرۆکی تەشریفاتی دەربار بوو.

کاتێك بە دەستووری عەبدولڕەزاق یەکێك لە پیاوە نزیکەکانی شارەوانی ئەستەمبۆڵ کوژرا،سوڵتان عەبدولحەمید عەفووی نەکرد، لەبەر ئەوە بەدرخانیەکان دوورخرانەوە بۆ ناوچەکانی تر و لەوێ زیندانی کران، تا کودەتای تورکە گەنجەکان لە زینداندا مانەوەو دوای ئەوە ئازادکران.

بەڵام بەدرخانیەکان نەیانتوانی بەرامبەر لە دەستدانی دەسەڵات و ماڵ سامانیان لە کوردستان بێ دەنگ بن و چاوپۆشی لێ بکەن. ئەو سەروەت وسامانە زۆرە داهاتی بنەماڵەکەیان بوو هەمیشە داوای گەڕاندنەوەیان لە دەسەڵاتدارانی تورك دەکرد و جاروباریش بۆ ئەم مەبەستە دەگەڕانەوە کوردستان و دژی تورکیا راپەڕینیان رێکدەخست.

گەورەترین راپەڕین، رابوونی کوردەکان بوو بە سەرۆکایەتی یەزدانشێر برازای بەدرخان پاشا، دوای گەڕانەوەی لە بەشداری شەڕی کریم. راپەڕینەکە لە لایەن برایانی کامیل بەگەوە واتە عوسمان پاشا و حوسێن پاشا واتە دوای شەڕی ٧٧-٧٨ سەدەی پێشوو سەریهەڵدا.دواتر راپەڕینی نیسانی ١٩١٤ لە لایەن کامیل بەگ رێکخرا کە لە بەتلیس بوو.

جگەلەوە، راپەڕینەکانی کوردان گەرچی درێژخایەن نەبوون یەك لە دوای یەك دژی دەسەڵاتدارانی تورك لە کوردستان بەرپابوون.

دەسەڵاتدارانی تورك داوای هیچ شتێکیان لە کوردەکان نەدەکرد چونکە هێزی پێویستیان بۆ سەرکوت کردنی کورد و ئارامکردنەوەی کوردستان نەبوو، بۆیە عەبدولحەمید بۆ هێورکردنەوەی بۆتان دەبوو پەنابباتە بەر یارمەتی بنەماڵەی بەدرخان.

راپەڕینەکانی عوسمان پاشا و حوسێن پاشا لەسەر داوای سوڵتان عەبدولحەمید لە برایانی بەدرخان کە ئەوسا لە ئەستەمبوڵ بوون، کۆتایی پێ هات.

پاشان شێخ عوبێدوڵڵا شەمزینی لە شەمدینان راپەڕی و گەیشتە ئازەربایجان و مەترسی خستە سەر ورمێ. لەو ترسە دەوڵەتی رووسیا بەتوندی پرۆتیستی خۆی و تەنانەت هەڕەشە و ئولتیماتۆمی دایە دەوڵەتی تورك و داوای کرد بەزووترین کات بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵا لەناو بەرێت.

عەبدولحەمید کە دەترسێت و هێزێکی ئەو تۆ شك نابات ئەم بزووتنەوەیە سەرکوت بکا ناچار پەنا دەباتە بەر برا گەورەی بەدرخانەکان واتە کامیل بەگ و تکای لێدەکا ئەم بزووتنەوەیەکپ بکاتەوە.

ئەوانیش ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن و دەچنە لای شێخ عوبێدوڵڵا و دەیهێننە (ئەستەمبوڵ). ئەمەش بوو بەهۆی دامرکانەوەی راپەڕینەکە و لەناوچوونی دەوری بەدرخانیەکان لە باشووری کوردستانی ئێران.

دوای کودەتای تورکە گەنجەکان ژمارەیەك لە ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانەکان، حوسێن پاشا، حەسەن بەگ، کامیل بەگ و برازایانی سولێمان بەگ دەچنەوە بۆتان و دەست بە راپەڕین دەکەن دژی تورکان.

سەرکردەی ئەم راپەڕینە حوسێن پاشا بوو، توانی کوردەکانی دەڤەری رووباری دیجلەش رەگەڵ خۆی بخات. کەچی هێندەی پێ نەچوو توورك ژەهرخواردیان کرد و مرد. بە وتەی کامیل بەگ بە مردنی حوسێن پاشا راپەڕینەکە کۆتایی هات. کامیل بەگ جێی حوسێن پاشا دەگرێتەوە و راپەڕینی بەتلیس رێك دەخات، بڕیار بوولە ١٨ی‌نیسانی ١٩١٤ لەگەڵ ناوەندی باشووری کوردستان پێکەوە راپەڕن.

هەرچەند ئامادەکردنی ئەم راپەڕینە زۆر بەنهێنی بوو، بەڵام تورکەکان هەر پێی دەزانن، کامیل بەگیش دەزانێ تورکەکان زانیویانە، بۆ ئەوەی دەرفەتییان نەدات بەرامبەر بەم راپەڕینە هەنگاو هەڵگرن و خۆ ئامادەبکەن، دەسپێشخەری دەکا. راپەڕینەکە لە بەتلیس لە ناوەراستی مانگی مارت دەستی پێکرد و فریای ئاگادارکردنەوەی ناوەندەکانی تری راپەڕین نەکەوت. سەرەتا

سەرکەوتوو بوو، بەڵام پاشان تورکەکان بە کۆکردنەوەی هێزی زۆرتر ئەم راپەڕینەیان سەرکوت کرد، چەند سەرکردەی بەناوبانگی بزووتنەوەکە گیران و لە بەتلیس لەسێدارەدران. چەند سەرکردەی تریش لە کۆنسوڵی رووسیا لە بەتلیس خۆیان شاردەوە و هەر لەوێ مانەوە تەسلیمیان نەکردنەوە، کە رووسیا شەری دژی تورکیا راگەیاند ئەوانیش گیران و لە سیدارە دران. کامیل بەگ لە (سیرتی) گیرا و نێردرا بۆ (ئەستەمبۆڵ). لە ئالپو دەتوانێ پەیوەندی بە کۆنسوڵی ئێمەوە بکا و داوای پشتیوانی دەوڵەتی رووسیا دەکات، بالوێزی ئێمەش لە ئەستەمبولْ لەگەڵ باڵوێزی فەرەنسا رێکدەکەون، باڵوێزی فەرەنسا دەستوور بە کونسوڵی خۆیان دەدا لە بەیروت بە پاپۆڕی کۆمپانیای (ماس شیری ماریشی)کامیل بەگ بنێرنە ئەستەمبولْ و بەبێ ئیجازەی بالوێز، تەسلیمی تورکیا نەکرێتەوە. لەوێش هەر بەو پاپۆڕە دەنێردرێتە پیری و لەوێشەوە هێنرایە ئۆدیسا و پاشان گوێزرایەوە بۆ تیفلیس.

کامیل بەگ لە تیفلیس دەبوو بە یارمەتی ئێمە لە رێگای ئێرانەوە راپەڕینی کوردەکان ئامادە بکات، بەڵام چاوپێکەوتنی ئیمپراتۆر نیکۆلا بەڵێن بە تەلعەت بەگ دەدات کە دەرفەتی بەدرخان پاشا نادات لە رووسیاوە دژی تورکیا ئاژاوە بگێڕێت و بە کامیل بەگ دەڵێن بێدەنگ لەماڵی خۆی لە تیفلیس دانیشێت. ئەمان پێش پلانی ناوبراو کامیل بەگیان گرت. تەنیا کاتی راگەیاندنی شەڕی رووسیا دژی تورکیا کامیل بەگ بۆ کارکردن بانگ دەکرێتەوە، سەرەتا لە قەرەکلیس لە ناوەندی سەرکردایەتی هێزەکانی ژەنەراڵ ئاباتسیڤ کاری دەکرد و پاشان لەگەڵ من.

کودەتای شوبات کارەکەی ئێمەی راگرت. کاتێك لە بەهاری ١٩١٨ ئەڵمانیەکان و پاشان تورکەکان هاتنە ناو تیفلیس کامیل بەگ بە قەفقازدا رادەکا بۆ ستاڤراپول و پاشان بورۆستۆڤ، لەوێ دەبێت تا تورکەکان لە تیفلیس دەردەچن پاشان دەگەڕێتەوە بۆ تیفلیس.

فەرەنساییەکان و ئاشوورییەکان هەوڵی هەڵخەڵەتاندن و بەکرێ گرتنی کەمال بەگ دەدەن. بەڵام ئەو ئامادەنابێت و تەواوی پێشنیارەکان رەتدەکاتەوە و پێیان دەڵێت کە ئامادە نییە دژی رووسەکان بجولێتەوە. هەر ئەو وەڵامەشی بۆ ئەمریکاییەکان هەبوو کە بەڵێنیان پێدابوو ژیانی دابین بکەن بەمەرجێك ئامادەبێت دەرهێنان و کەڵك وەرگرتن لە کان و سەروەت وسامانە سروشتیەکانی بۆتانیان بداتێ. لە مانگی شوباتدا نوێنەری ئێران مورتەزا دەولە کە لە تفلیس

دەبێت کامیل بەگ بانگ دەکاتە لای خۆی و هەوڵی زۆری لەگەڵ دەدات وداوای لێ دەکات بگەڕێتەوە تورکیا.بەڵام کامیل بەگ لە وەڵاما دەڵێت نایەوێ بەمەرەدی عەبەلڕەزاق بچێ کە چۆن گەڕایەوە تورکیا و نێردرا بۆ موسڵ و لەوێ ژەهریان دایە و کوشتیان.ئینجا مورتەزا دەولە داوای لێ دەکات یا بگەڕێتەوە تاران یا تەورێز، لەوێ گوزەرانی بە باشی دابین دەکرێت و ڕیزی لێ دەگرێت. پێی دەڵێن کە لە تیفلیس هیچ کارێکت نییە، کامیل بەگیش لەوەڵامدا دەڵێ لە تارانیش کارێکی ئەوتۆم نییە، لەوێش لە راپەڕین دان و بە ئاسانی دەتوانن بە هاوکاری کردنی سمکۆ تاوانبارم بکەن.

ئامۆژگارییەکانی مورتەزا دەولە بۆ کامیل بەگ کە بگەڕێتەوە بۆ تورکیا یان ئێران لەبەر ئەوە بوو کە گوایا ئیسلام لە مەترسیدایە و پێویستە موسڵمانەکان یەك بگرن. و سەرکردە موسڵمانەکان پێکەوە کار بکەن. ئەم قسانە وادەگەیەنن لەسەر کێشەی کورد ئێران و تورکیا پێکەوە ئیش ئەکەن، ئەم پێشنیارەی مورتەزا دەولە بۆ کامیل بەگ بە دەست پێشخەری ئەنقەرە بوو.

کامیل بەگ دەیەویست ئەم وتووێژانە بە هاوڕێ میلیڤان بگەینێت، بەڵام هاوڕێ میلیڤان لەبەر سەفەری ڤییەنا نەیتوانی چاوی بە کامیل بەگ بکەوێت. هاوڕێ میلیڤان بە منیشی گوت کە کامیل بەگ ویستوویەتی بیبینێت.

کامیل بەگ بەتەواوی وەفاداری رووسیایە، سەرەڕای ئەوەی ئەرمەنیەکان و لایەنگرەکانیان دەیانەویست و دەیانەوێ لە دەوری کامیل بەگ کەم بکەنەوە، بەڵام لەبەر ئەو دەورە گەورەی لەکوردستاندا هەیەتی بۆئێمە زۆر بەکەڵك دەبێت.

ئێستا کە کامیل بەگ لە تیفلیس بێ دەسەڵاتە، بەفرۆشتنی کەلوپەلی تایبەتی خۆی و شتیماڵەکەی لەگەڵ ژنەکەی دەژیت.

کامیل بەگ ژن و منداڵی لە ئەستەمبوڵ هەیە و جێی هێشتوون، لە کۆتایی۱۹۲۰ەوە تا ئێستا هیچ پەیوەندییەکی پێیانەوە نییە. پێشنیاری من ئەوەیە کامیل بەگ لای خۆمان بهێڵینەوە بۆ گۆڕینی بارودۆخی ئەنادۆڵ کەسێکی تر ناتوانێ بۆ ئێمە جێی ئەو بگرێتەوە، کارتێکی بەنرخە لەدەست ئێمەدا. جێبەجێ کردنی ئەمە بۆ ئێمە زۆر ئاسانە چونکە کامیل بەگ لایەنگری ئێمەیە

و تەنیا پێویستە کەمێك ژیانی دابین بکەین ئەوسا ئامادە دەبێت و دەتوانین لەباری زانیارییەوە کەڵکی لێ وەربگرین.

باشترین شێوە ئەوەیە رایکێشین بۆ هاوکاری سوپای ئێمە لە قەفقاز. دەتوانێ بۆ کۆکردنەوەی دەنگوباس و هەواڵ لە کوردستانی تورکیا و ئێران خزمەتمان بکات. ناوبراو پێشتر مووچەی وەردەگرت ئەگەر ئێستاش ژیانی دابین بکرێت هەمیشە دەتوانین کەڵکی لێ وەربگرین بەتایبەتی کاتێك کە پێویست بێت.

جگەلەوە ئێمە لە رێگای ناوبراوەوە دەتوانین پەیوەندی بە بنەماڵەی بەدرخانەکانەوە بکەین لە ئەستەنبۆڵ کە گەورەترین فاکتەری دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆن.

ئەم هاوکاریە دەبێ نهێنی بێت تا نەبێتە جێی شك و گومانی تورکان، چونکە بوونی (کامیل بەگ)یان لە تیفلیس بەدڵ نییە، ئەگەر نێوان تورکیا و رووسیا تێك بچێت بۆنی کامیل بەگ دەکەن.

من ئەو شتەم لە مێژە هەست پێ کردووە چونکە سەعۆ بەگ لە دوو چاوپێکەوتندا بەگاڵتەوە پێی گوتم هیوادارە چیتر وەك سەردەمی شەڕ لە کوردستان گیروگفت بۆ ئەنقەرە دروست نەکەم.

کامیل بەگ پێی ناوەتە ٥٢ساڵی، لە رابردوودا لە تورکیا پلەوپایەی جۆراوجۆری بەڕێوەبەرایەتی هەبووە، دوای هاتنی بۆ بۆتان لە سەردەمی تورکە گەنجەکان بە ئەندامی شورای بەڕێوەبەرایەتی بەتلیس هەڵبژێردرا، دوای رووداوەکانی مارتی ١٩١٤ لە بەتلیس گیرا، بەڵام لە کاتی گواستنەوەی بۆ ئەستەمبۆڵ ئێمە رفاندمان، ناوبراو خوێندەوارێکی ئەوروپی، مرۆڤێکی بە کەلتور، جینتیلمەن، ژیر و فێڵبازە. زۆر بەعیزەتە، ورد بین و بە ئەدەبە، بۆ رێبازی خۆی زۆر وەفادارە، زەحمەتە لە رێگا لابدرێت، پێش هەمووان ئامادەیە لەم بارەوە خۆی نیشان بدات.

لە باری نهێنی کاریەوە زۆر باشە، بەڵام کە کار دەگاتە دەست پێکردن دەترسێت و زۆر سوور نییە، بۆیە پێویستە کەسێك هەبێت هانیبدا.

لەبەر خۆ خۆشویستن دەبێ بەوریایی لەگەڵ کەمال بەگ بجولێینەوە. بەتایبەتی ئەو لایانەی رقیان لە کوردەو ناحەقیان بەرامبەر دەکەن. بۆ وێنە بەرامبەر کامیل بەگ زۆر بێ ئەدەبانە دەدوێن،

دەڵێن کوردەکان کێوین و لە ورچ دەچن و دەبێ دەرمانداو بکرێن، کورد ناتوانێت ببێتە روناکبیر و.... کامیل بەگ بەرامبەر ئەم شتانە تورە دەبێت و واتێدەگا ئەویش بە کێوی لە قەڵەم دەدەن. غیرەت ونەفس بەرزی ئەو کابرایە لە بارووزۆخی خراپی ژیانیدا دەردەکەوێ، بۆ باشکردن وسووك کردنی باری ژیانی خۆی داوای یارمەتی لە هیچ کەس ناکات.

کاتێك کامیل بەگ لەسەر داخوازی سەرکردایەتی سووپای رووسیا لە قەفقاز راپۆرتێکی بۆ نووسیبوون ئەو پارەی بۆی نێررابوو وەری نەگرت ئەوەش لە کاتێکدا کە دسکورت بوو، وتبووی بۆ پارە ئیش ناکات بەڵکو بۆ بەرژەوەندی کاری خۆیەتی. باشترین شێوە بۆ راکێشان و بەخۆوەبەستنی کامیل بەگ ئەوەیە، وەك هاوکارێکی نهێنی سوپای رووسیا لە قەفقاز مووچەی بۆ ببڕدرێتەوە. لە هەواڵەکاندا لای کامیل بەگ بە باشی باسی کوردان بکرێت، چونکە کابرایەکە هیچ شتێکی بیرناچێ، ئەو چاکەی لەگەڵی کراوە باسی دەکا، بایەخی پێدەدا و لەبەر چاویەتی و دەیەوێ چاکە بداتەوە، بەڵام هەر شتێك کە لەرووی بەزەییەوە بێ وەری ناگرێ و پەسەندی ناکات.

ناوبراو ناسیۆنالیستێکی تۆخی کوردە و کوردان ئایدیالیزە دەکات و هەوڵ دەدات بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان لە ژێر حیمایەی رووسیا. ئینگلیز و فەڕەنساییەکان نەیانتوانیوە لەم هەڵوێست و رێبازە لای بدەن.

زۆر سوپاسی رووسیا دەکات کە پاراستوویە و ویستوویەتی کوردستان رزگار بێت و پێیوایە رووسیا پشتیوانێکی سروشتی کوردستانە.

فۆرمی بەڕێوەبردنی سیستەمی رووسیای بەلاوە گرینگ نییە، دەڵێ بۆ ئەو گرینگ نییە کێ سەرۆکی ئەم وڵاتەیە ئەو خزمەتی دەوڵەت ناکات بەڵکو خزمەتی رووسیا و بەرژەوەندی نیشتیمانەکەی خۆی دەکات(1).

**بارسیوڤ**

**ب. تفلیس، ١٥ی ئابی ١٩٢٢**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٤٤-٢٤٦.

# بەشی سێیەم

## پێشەکی

سەرەتای بەڵگەکان چەند هەواڵێکی سەرکەوتنی سمکۆی تێدایە بەرامبەر بە هێزەکانی ئێران لەگەڵ هەواڵی کوژرانی فەرماندەی سوپای ئێران لەو شەڕانەدا بەناوی سەردار ئەرشەد.

بەشداری هێزی شاهسەوەند و قەزاق لەگەڵ جەندرمە و هێزی ئێران دژی سمکۆ و هێنانی هێزێکی تریش لە لایەن رژێمی ئێرانەوە لەسەر داخوازی کۆنسوڵی رووسیا بۆ ناوچەی ورمێ و شەرەف خانە کە ژمارەیەکی زۆر ئەرمەنی و ئاشوورییان تێدا بووە. سەرکەوتنی سمکۆ لە شەڕەکانی دژی ئێران گوایا مەترسییەکی گەورەی خستۆتە سەر ئازەربایجانی ئێران و دەستی ئینگلیزیشی تێدایە، دەڵێن لە داهاتوودا ئینگلیز لەوێوە دەتوانێ یارمەتی هێزەکانی دژی شۆڕشی سۆڤیەت بدا.

کەوابوو سۆڤیەتیش لە تێکشکانی سمکۆ بەرژەوەندی هەبووە و هەوڵیشی داوە. بەڵام بە پێچەوانەی هەواڵەکانی پێشوو، ئینگلیزەکان یارمەتی سمکۆیان نەداوە.

گوایە سمکۆ پەلاماری هێزی چەکداری ئاشوریەکان دەدات کە ئینگلیز دروستی کردوون، لە لایەکی ترەوە دەڵێن سمکۆ بەفیتی تورکان جوڵاوەتەوە، تورکەکانیش پاش ئەوەی سمکۆ دەشکێت و بەرەو کوردستانی تورکیا دەڕوات بە دوای دەکەون بیکوژن ئەویش ناچار دەبێ لەوێوە بچێ بۆ لای شێخ مەحموود لە سلێمانی.

سەیر ئەوەیە قەزاقەکانی رووسیای تیزاری کە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ لە ئێران دەمێننەوە دژی رژێمی بەلشەفیکی بە سەرۆکایەتی فیلیپۆف دەبن بە بەشێك لەهێزەکانی ئێران و دژی سمکۆ دەجەنگن لەو لاشەوە سۆڤیەتیەکان بەتایبەتی کۆنسوڵەکانیان لە ورمێ و تەورێز و

ماکۆ بە دەستووری دەوڵەتەکەیان یارمەتی رژێمی ئێران دەدەن و داوای لێدەکەن بۆ لەناوبردنی سمکۆ و شۆڕشەکەی هێزی زۆرتر بنێرێتە ناوچەکە.

هەواڵێك باسی چۆنیەتی گەمارۆدانی سمکۆ لەلایەن سوپای تورکیا و کوژرانی کوڕەکەی و هاوڕێکانی و بەدیل گرتنی ژنەکەی دەکات، هەروەها باسی وتوویژی ئێران و تورکیا دەکات بۆ لەناوبردنی سمکۆ. بەڵگەنامەکان، باسی شێخ مەحموود و سەید تەها و سمکۆ و کەسایەتی تری کورد و پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان و رووسیا و ئینگلیز، دەکەن. کۆنسوڵی سۆڤیەت لە بایەزید هاوڕێ مالستۆڤ دان بەوەدا دەنێت کە بەلشەفیکەکان یارمەتی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانیان داوە و بوونەتە هۆی تێکشکانی شۆڕشی سمکۆ.

دەڵێت لەناو کوردەکاندا قاوە کە سمکۆیان لە سایەی سەری بەلشەفیکەکانەوە تێك شکاندووە.... دەستوور دراوە بەکۆنسوڵەکانی سۆڤیەت لە کاتی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان پێیان بڵێن: دروشمی سەربەخۆیی کوردستان کاتی نەهاتووە.....(لە جەنگی دووهەمی جیهانیشدا هەر هەمان سیاسەتیان هەبوو) کۆنسوڵی سۆڤیەت لە بایەزید لە راپۆرتێکی تردا دەنووسێت: مەبەستی شێخ مەحموود کە ئینگلیزی لە پشتە هەر ئازادکردنی کوردستانی باشوور نییە بەڵکو هەموو کوردستانە.

پاش دەرکردنی هێزی تورك لە رەواندوز شێخ مەحموود دەیەوێ وان و موش و بەتلیس بگرێت و لە کوردستانی ئێرانیش کوردەکان بۆ ئەم مەبەستە بە سەرۆکایەتی سمکۆ رادەپەڕن.

چالاکی سمکۆ و سەید تەها هەم لە کوردستانی ئێران و هەم لە تورکیا بۆ ئەم مەبەستە زۆر بەرچاو و سەرکەوتووانەیە. سمکۆ دەیەوێ تا تەورێز ناوچەکە بخاتە ژێر دەستی خۆی و پەیوەندی بە سەرۆك هۆز و عەشایەرەکانەوە دەکا تا بۆ بەهار ئامادەبن.

نووسەر هۆی کوشتنی مارشەمعون سەرۆکی ئاشوورییەکان بە دەستی سمکۆ،بە تۆڵە سەندنەوەی سمکۆ دادەنێ لە بەرامبەر پلانی هاوبەشی ئەرمەنی و ئاشووری لە ١٩١٨ کە بوو بە هۆی شکستی سمکۆ. لە هەمانکاتدا کە ئینگلیزەکان هێزێکی ئاشوریان خستبووە ژێر دەستی شێخ مەحموود و سمکۆش هاوکار و هاوپەیمانی شێخ مەحموود بوو، هەندێ گیروگرفتیان لەم بارەوە بۆ دروست بوو.

پیلانی تورك و فارس بۆ تێکدانی مەملەکەتی شێخ مەحموود بە دوو مەبەست بووە: کورد کیانێکی نەبێت سبەینێ ببێتە پێگە و هیوای بەشەکانی تری کوردستان، لە لایەکی ترەوە شۆرش بۆئەو بەشانەی تری کوردستان کە لە ژێر دەستیانە، تەشەنە نەکا. ئێمە (واتە رووسیا) تا ئێستا دەستمان بە رووی کوردەکانەوە ناوە و لە خۆمان دوورخستونەوە، یارمەتیمان بۆ دەوڵەتی فارس و بەشداری جەنەراڵ ئاندرەلڤسکی لە تێکشکانی مانگی ئابی١٩٢٢ لە کوردستان شاراوە نییە.....

ئێستاش قاوە دەڵێن: هاورێ ئارالۆڤ (باڵوێزی سۆڤیەت لە ئەنقەرا) پرۆتیستی داوەتە تورکیا کە بۆچی سمکۆیان دەسگیر نەکردووە و تەسلیمی ئێرانیان نەکردۆتەوە.

ئێمە دەبێ لەناو ئەو کوردانەی هێشتا پروپاگەندەی ئینگلیز و مەحموود و سمکۆیان پێ رانەگەیشتووە کار بکەین و دەوڵەتێکی لەمپەرلە نێوان ئەرمینیا و کوردستانی ئینگلیز دروست بکەین....

هەبوونی کوردستانێکی ئینگلیز لە تەنیشتمان، بۆ ئێمە زۆر گران تەواو دەبێت. بۆ ئەوەی ئەم شتە روونەدات پێویستە دەست بەکاربین، بەڵام بیروڕای کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەرۆم بە پێچەوانەی کۆنسوڵی بایەزیدە.

جێی سەرسوورمان نییە هەندێ بەڵگە باسی هاوکاری کۆنسوڵەکانی رووسیا و تورکیا دەکەن لە کوردستانی ئێران دژی چالاکییەکانی شێخ مەحموود و سمکۆ و کوردەکان.

زوڵم و زۆری عەجەم و جێگیرکردنیان لە ناوچەکانی ماکۆ و... و دەست بە سەراگرتنی زەوی و زاریان و سەرئەنجام دەرکردنیان بابەتێکی تری بەڵگەکانە.....

نوێنەر یان سکرتێری شێخ مەحموود کە دێتە تەورێز و لە شوباتی١٩٢٣سەردانی کونسوڵی سۆڤییەت دەکات، نامە و راسپاردەی شێخ مەحموودی پێ دەبێت، کۆنسوڵ لە راپۆرتەکەی بۆ مۆسکۆ دەنووسێت: دوور نییە سەردانی ئەو شاندەی داوای یارمەتی بۆ سەربەخۆیی کوردستان دەکات و دەیەوێ کوردستان لە ژێر پشتیوانی سۆڤیەتدا بێت بە دەستووری ئینگلیزەکان هاتبێت و پلانێکی ئەوان بێت. ئەمە لە کاتێکدا بووە کە شێخ پاش چەند شەڕی خوێناوی لەگەڵ ئینگلیزەکان و تێکچوونی پەیوەندییەکانیان نامە یا شاندەکەی خۆی بۆ لای سۆڤیەتیەکان دەنێرێت.

هەروەك لە بەڵگەکانی تردا دەردەکەوێت سۆڤیەت لە رێگای پەیوەندییەکانی خۆی (کە زارەکی بووە نەك بە نووسراو) لەگەڵ شێخ مەحموود، هەروەها لە رێگای خالید بەگی جوبرانلی سەرۆکی کۆمیتەی

کوردی لە ئەرزەرۆم و پاشان لە ڕێگای کەمالیستەکانەوە بەڵێنی پووچ و بەتاڵ و فریودەرانەی زۆر بە شێخ مەحموود دەدات کە ئەگەر خۆی لە ئینگلیزەکان دابڕێت و دژیان راوەستێت یارمەتی دەدا و پشتیوانی دەکات.

لە بەڵگەنامەکان بۆمان دەردەکەوێت رووسیا دەورێکی چەپەڵی هەبووە لەبەرەو هەڵدرێربردنی شێخ و تێکدان و ئاڵۆزکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئینگلیز، شێخیش ساکارانە بێ ئەوەی جارێك یارمەتی لە رووسیەکان وەربگرێت درێژە بە ناردنی شاند و نامە یەك لە دوای یەکەکانی خۆی دەدات بۆ بەلشەفیکەکان، بە ئاشکراش لایەنگری رووسەکان دەکا و دژایەتی خۆشی بەرامبەر ئینگلیزەکان بە کردەوە نیشان دەدات.

لە لایەکی ترەوە شێخ مەحموود ناردنی نامە و شاند بۆ رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان واتە ئێران و تورکیا، هاتۆچۆ و هاوکاری لەشکری و بەستنی پەیمانی سەربازی لەگەڵ تورکەکان و هاوشێوەی ئاڵای حکومەتەکەی لەگەڵ ئاڵای تورکیا (هیلال و ئەستێرە) بۆ ئینگلیزەکان شتێکی شاراوە نەبوو، بەڵام سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بە کێشەی کورد یا بڵێین سیاسەتی کوردی ئینگلیز ئەو کاتە بە یەکجاری گۆڕاو کە شێخ لەگەڵ رووسیای سوڤیەتی درێژەی دا بە پەیوەندییەکانی خۆی، تا ئێستاش گەلی کورد تاوانی ئەو کردەوەی شێخ دەداتەوە. بەلشەفیکەکان دەورێکی نامەردانەیان گێڕا لە نزیك کردنەوەی شێخ مەحموود و(کەمال ئەتاتورك)ی رەگەزپەرست و هاوپەیمانیان.

لە بەشێکی تردا ئاماژە بە چاپەمەنیەکانی سەردەم دەکەین لە هەڵوێستی رەسمی دەوڵەتی سۆڤیەتەوە بەرامبەر بە راگەیاندنی مەملەکەتی شێخ مەحموود تا تێکچوونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەریتانیا، دەبینین چۆن بە دوژمنی دادەنێن و بە پیاوی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی لەقەڵەم دەدەن.

بەڵام پاش نامە نووسینەکانی شێخ بۆ کاربەدەستانی سۆڤیەتی ٣٦٠ پلە سیاسەتیان دەگۆڕێت. سەیریش ئەوەیە کە پاش دۆڕانی سیاسەتیان بەرامبەر تورکیا و رژێمی ئێران رۆژهەڵاتناسەکانیان بە تایبەتی کوردناسەکانیان هەزار و یەك درۆ و بوختان دەکەن بۆ سەرنەکەوتنی شێخ مەحموود و پاکانە بۆ سیاسەتی خۆیان دەکەن، بەڵام هەرگیز ناڵێن بەرامبەر بەو هانایانەی کە شێخ و خالید بەگی جەبرانلی و..... هێنایان، دەوڵەتەکەیان هیچ یارمەتیەکی گەلی کوردی نەدا، جگە لەو تاوانە، رێڕەوی بزووتنەوەی کوردیشیان تێکدا.

هەندێ زانیاری لەسەر والی پشتکۆ واتە لورستان و سەربەخۆیی ئەو والی نشینە و چەك و جبەخانەکەی لە بەڵگەکاندا هەیە باسی عەشایەر و هۆزەکانی گۆران دەکات کە لە بەربەرەکانێیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ناوەندی تەواوی زەوی و زاریان دەستی بەسەردا گیراوەو ناچار ئاوارەی کورستانی باشوور بوون.

بەپێی راگەیاندنی کۆنسۆڵەکانی رووسیا کوردەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان بە سەرۆکایەتی سمکۆ و والی پشتکۆ و کوردەکانی باکووریش لەگەڵ مەملەکەتی شێخ مەحموود و دەوڵەتی کوردی، هاوکاری و پەیوەندی برایانەیان هەبووە.

دیارە هەم شێخ مەحموود هەم سەرکردە نیشتیمانپەروەرەکانی تری هەموو کوردستان بۆ رزگاری نەتەوەکەیان و کوردستانێکی سەربەخۆ کەم یان زۆر هەوڵیان داوە.

بەڵام لێرەش بەلشەفیکەکان لە رێگای سیخور و کۆنسۆڵ و باڵوێزخانەکانیان پێش وەخت دەسەڵاتدارانی تورك و ئێرانیان لەجموجوڵی کورد ئاگادار کردووە و چاویان لەسەر هەڵنەگرتوون.

راگەیاندنی مەلیکایەتی شێخ مەحموود بۆ هەموو بەشەکانی کوردستان و بۆ هەموو گەل وەك کۆماری کوردستان لە مهاباد و کوردستانی باشووری ئیمڕۆ جێی هیوا و شادی بووەو پشتیوانی لێکراوە و بووەتە هۆی بووژانەوە و جموجۆڵ و سووربوون لەسەرئەو کیانە.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و بایەخدانە لەو بەڵگە و دیکومێنتانەدا، ئەوەیە: پشتگیری و بەهاناوە هاتنی گەلی کورد لە سەرانسەری کوردستان بۆ مەلیکایەتی شێخ مەحموود لە مێژووی کورد بێ وێنە بووە. بەڵگەکان باسی هاوکاری رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان دەکەن بەتایبەتی ئێران و تورکیا کە چۆن پێکەوە دژی مەلیکایەتی شێخ مەحموود و سەرنەگرتنی ئەو کیانە کوردیە هەوڵیانداوە، چۆن رێگەیان لە هێزەکانی کوردستانی ژێر دەستیان گرتووە نەچن بۆ پشگیری شێخ مەحموود، چۆن ئێران رێگەی بە هێزە سەرکوتکەرەکانی تورکیا داوە تا لە کوردستانی رۆژهەڵاتەوە بچن بۆ بەربەرەکانێ و شەڕ و ئاژاوە دژی کوردستانی باشوور.

بەلشەویکەکانیش تا ئەو جێگایەی پێیان کراوە بۆ نزیککردنەوەی ئەو دوو داگیرکەرە و ئامۆژگاری کردنیان لە دژی ئەو کیانە کوردیە کە گوایە دەسکردی ئیمپریالیزمی ئینگلیزە و بۆ تاران و ئەنقەرا و مۆسکۆ مەترسی هەیە، درێخیان نەکردووە.

**هەروەها لە بەڵگەکاندا:**

داوای دەوڵەتی ئێران لە تورکیا کە سمکۆ تەسلیمی ئێران بکاتەوە و چالاکیەکی هاوبەشیش بۆ گرتن یان لەناوبردنی بکرێت تاکو نەتوانێت کوردەکانی کوردستانی رۆژهەڵات و باکووری کوردستان بۆ یارمەتیدانی شێخ مەحموود هانبدات.

کێشەی برا ئاشوریەکانیش و تەنگ پێهەڵچنینیان و دەرکردنیان لە ناوچەی ورمیٚ لە لایەن رژێمەکانی تورکیا و ئێرانەوە یەکێکی تر بووە لە خاڵە گرینگەکانی رێککەوتنیان، گوایە ئەوانە دژی موسڵمانەکانی هەردوولا و داروودەستی ئیمپریالیزمی ئینگلیزن و لەگەڵ کوردەکان هاوهەستن.

بەپێی رێککەوتنیان لەشکری هەردوولا بەبیٚ ئاگادارکردنەوەی یەکتر دەتوانن لەناو خاکی یەکتر چالاکی بنوێنن، تەنانەت بشمێننەوە. هەروەك کۆنسوڵەکانی سۆڤیەت دەڵێن بە بەستنی پەیمانی ئەوتۆ مەترسی هاوبەشیان، سەبارەت بە کورد و ئاسوری نامێنێت.

سەیر ئەوەیە لە بەڵگەنامەیەکی تردا هاتووە: شێخ مەحموود پەنای بۆ رووسیا هێناوە داوای یارمەتیمان لێدەکات، دەیەویٚ بەم چەشنە ئەو یارمەتیە بشارێتەوە کە لە ئینگلیزی وەردەگرێت. ئەو دەروون رەشیەی بەلشەفیکەکان پاکانەی بۆ ناکرێت، شێخ لەو کاتەدا لە دژی ئینگلیزەکان لەشەر دابوو ئەگینا پەنای بۆ سۆڤیەتیەکان نەدەبرد.

لە بەڵگەنامەکاندا باسی پەیوەندی چەند سەرۆك هۆز و خێڵی کورد کراوە کە یا لایەنگری سۆڤیەتن یا پەیوەندی دۆستانەیان هەبووە و هەندێکیان داوای پەنابەریەتییان لە سۆڤیەت کردووە، بەڵام ئەوانەی رۆیشتوون کیٚبوون؟ چەند کەس بوون؟ لە کویٚ جێگیر بوون؟ چییان بەسەر هاتووە؟ ئایا ئەوانیش وەکو دانیشتوانی کوردستانی سۆڤیەت کەوتوونەبەر ئەنفالی بەلشەفیکی؟ ئەمەش بابەتێکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون هەیە.

کۆنسوڵەکان لە راپۆرتەکانیاندا زۆرجار نووسیویانە کوردەکانی ئێران و تورکیاش هەموویان داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکەن لە ژێر رێبەرایەتی شێخ مەحموود و بۆ ئەم مەبەستەش خەریکی کۆکردنەوەی چەك و هێزن، دەسەڵاتدارانی تورکیا و ئێرانیش زۆر زەحمەتە بتوانن کوردستان بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، بەتایبەتی هەوڵی تورکەکان لەم بارەوە تائێستا بیٚ کەڵك و سەرنەکەتوو بووە. (بڕوانە راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە بایەزید و ماڵستۆڤ ٢٢-٣-١٩٢٣) هەر لەم بەڵگەیەدا دەڵێت:

کۆمیتەی ئەرزەڕۆم (لایەنگری سۆڤیەت) بڕیاری داوە یارمەتی لە ئینگلیزەکان وەرنەگرێت و دەستوورێکی ئەوتۆشی بە سمکۆ دابوو بەڵام سمکۆ مەرجی بۆ ئەو پێشنیارەی سۆڤیەت دانابوو.

لە لایەکی تر کۆنسۆڵ دەڵێت: کوردەکان ئێستا بە هیچ شێوەیەك ناتوانن دەسبەرداری یارمەتی ئینلگیزەکان بن.وەرنەگرتنی یارمەتی لە ئینگلیز بۆ کورد لەم کاتەدا بە مانای تێکشکان و لەناوچوونی بزووتنەوەکەیانە........

لە درێژی راپۆرتەکەدا دەڵێت: لەبەر ئەو شتانەی کە باسمان کرد دەبێ دان بەوە دانرێت کە ئێمە رووسیا لە بەرامبەر مەترسیەکی جیدی داین واتە دروستکردنی (کوردستانێکی سەربەخۆ) کە بەتەواوی لە ژێر کاریگەری ئینگلیزەکاندا دەبێت.با ئەم دەوڵەتە بچووك و زۆر گرینگیش نەبێت، بەڵام هەر چۆنێك بێت لەویّ(لەو شوێنەدا) مەترسیەکی زۆری بۆ ئێمە دەبێت.

بۆیە لە راپۆرتەکانی پێشوودا نووسیوومە پێویستە لە بزووتنەوەی کورداندا چالاکانە بەشداربین، بە هەڵوێستی تەماشاچی بوغان کوردەکان دەخەینە باوەشی ئینگلیز کە زۆر زەحمەتە قازانجێکی بۆ ئێمە تێدابێت.

لە مانگی شوبات دا لەبەر هەندێ ئیش و کار رۆیشتمە ماکۆ و لەگەڵ هاوڕێ دۆبسون لەسەر کوردستان بە گشتی و بەتایبەتی لەسەر کێشەی کورد بیروڕامان ئاڵوگۆڕکرد.گەیشتینە ئەو ئەنجامە کە بۆچوونەکانمان لەم بارەوە وەك یەکەو پێویستە بەشداری کێشەی کورد بین.دواکەوتنمان لەوانەیە لە داهاتوودا زیانێك بێ قەرەبووکردنەوەی زۆر زەحمەت بێت. وادیارە نوێنەری ئێمەش لە تورکیا هاوڕێ ئارالۆڤ (واتە نوێنەری سۆڤیەت یان باڵوێز) هەمان بۆچوونی هەیە. چونکە نامەی ئەوم پێگەیشتووە کە بۆچوونەکانی منی بە تەواوی لاپەسەندە.

بەڵام سەرم لەم بروسکەیەی مۆسکۆ سوڕماوە کە دەڵێت: (بۆ هەموو کاربەدەست و سیخوڕەکانی سۆڤیەت لە ئێران و تورکیا) مۆسکۆ خۆی دەپارێزێ لە بەشداری چالاکانە لە کێشەی کورددا.....

هەر چۆنێك بێت ئەم بڕیارەی مۆسکۆ نێگەتیڤانەیە و ئەم شتانەش کە من لێرە باسیان دەکەم لەبەر ئەوەیە، پێموایە ئەرکی سەر شانمە بیروڕای خۆم و هاوڕی دۆبسۆن دەربڕم کە راستەوخۆ لە کوردستان ئیش دەکەین و لە نزیکەوە شارەزای ناوچە و رووداوەکانین.

بەڵگەیەکی تر لەو بەڵگانە نامەی کۆنسوڵی سۆڤیەتە لە شاری قارس بە ناوی تومانۆڤەوەیە لە ڕێکەوتی ٢٣ی مارتی ١٩٢٣. قارس شارێکی خنجیلانەی کوردستانە کە ئەو دەم لە چوارچێوەی یەکیەتی سۆڤیەتدا بووە پاشان بەبێ لە بەرچاوگرتنی هیچ یاسایەکی نێونەتەوەیی و مرۆڤایەتی، بەبێ پرس کردن بە دانشتیوانەکەی، بۆ خۆنزیککردنەوەی زۆرتر لە کەمالیەکان بەلشەفیکەکان پێشکەش بە تورکیای دەکەن. قارس بەهۆی شەڕەکانی رووسیای تیزاری لەگەڵ دەوڵەتانی عوسمانی و ئێران تووشی زەرەر و زیانێکی گیانی و ماڵی زۆر بووە و دانشتیوانیشی بە تاوانی لایەنگری رووسیا کەوتنە بەر شاڵاوی بێ بەزەییانەی تورکە رەگەزپەرستەکان و پێشتریش لە لایەن ئەرمەنە رەگەزپەرستەکانەوە کوردێکی زۆر کوژراوە و پەرەوازەی هەندەران بوون.

بەڵێ لەو شارە خنجیلانەیە، یەکێك لە کوڕەکانی بەدرخان کە بە هیوای یارمەتی وەرگرتن و پلانی هاوبەشی کورد و سۆڤیەت بۆ سەربەخۆیی کوردستان و رزگارکردنی لە ژێردەستی دوژمنی دێرینی کورد و رووسیا دێتە ناو خاکی رووسیای سۆڤیەت، ماوەیەکی زۆر بە درۆ و دەلەسە و بەڵێنی بێ کردەوە وەك دەس بەسەر و بارمتە دەیهێڵنەوە، نە وەڵامی دەدەنەوە، نە بەسەری دەکەنەوە، نە ڕێگای دەدەن بگەڕێتەوە کوردستان یا پەنا بۆ زلهێزێکی ترببا، نە دەهێڵن بەشداری بکا لە خەباتی رزگاریخوازی گەلەکەی. ناوبراو کە شازادە، خاوەن نفوز، دەورگێر و ناودار بووە لە ترسی ئەوەی نەك پەنا بباتە بەر ئینگلیزەکان یا هاوکاری شێخ مەحموود و سمکۆ بکات یا ئاژاوە بۆ تورکیای کەمالیستی هاودەستیان بنێتەوە لەوێ دەیهێڵنەوە. وەك لە نامەکەدا دەردەکەوێت نەك هەر گلەیی و گازاندەی لە کاربەدەستانی سۆڤیەت هەیە کە پەیوەندی و راوێژی لەگەڵ ناکەن بەڵکو لەو شارەی ماویشەتەوە بە هەژاری و کولەمەرگی دەژی. وادیارە کەمال بەگ بە هیوای ئەوە بووە لانی کەم رووسیای سۆڤیەتی وەك نێوبژیکەرێك لە نێوان کورد و تورك، ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان وەدی بینێت ئەگەر بەرواڵەتیش بێت کەمال بەگ وادەردەبڕێت کە تەنیا رووسیا دەتوانێ یارمەتی کوردان بدات، بەڵام تۆ بڵێی رووسەکان بەهۆی ئەو پەیوەندییە دۆستانە و تەنانەت برایانەش کە لەگەڵ تورکەکان هەیانبووە رۆژێ لە رۆژان گوشاریان خستبێتە سەرتورکان کە چارەسەرێکی ئاشتیانەی کێشەی کورد بکەن.

کەمال بەگ دەڵێ:کاربەدەستانی سۆڤیەتی هێندە کێشەی کورد بەجدی ناگرن و بەلایانەوە گرینگ نییە بۆیە تورکیای کەمالیش وەڵامیان ناداتەوە.

له بەڵگەنامەکاندا زۆرجار باسی خانی ماکۆ یان سەرداری ماکۆ دەکرێت کە بۆخۆی خاوەن دەسەڵاتێکی تایبەتی بووە لەناوچەکەدا، دەور و پەیوەندی ئەم خانە لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و رووسیا و ئینگلیز و ئێران و تورکیا جێی سەرنج و بایەخپێدانە.

راستیەکی تر کە کاربەدەستانی سۆڤیەتی لە ئێران و تورکیا ئاماژەی پێدەکەن ئەوەیە: تێکڕای هەوڵ و تەقەلای تورکان بۆ لاوازکردن یان لابردنی دەسەڵاتی شێخ مەحموود (لە رێگای سەربازی و هاندانی کوردەکان)و دژی ئینگلیز بێ ئەنجام و سەرنەکەوتوو بووە، دەڵێ ئێستا تورکیا ترسی لە کوردەکانی ژێردەستی خۆی هەیە و دەیهەوێ بە وتووێژدا لەگەڵیان رێك بکەوێت, نەکا سیناریۆی کوردستانی باشووریش لە باکووری کوردستان دووپات ببێتەوە.

بەڵام مەخابن هەڵەی مێژوویی شێخ مەحموود، واتە تێکدانی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئینگلیزەکان، بەهۆی نزیکبوونەوەی لە بەلشەفیك و کەمالیەکان، لەگەڵ چەند هۆیەکی تر، تراژیدیای روخانی حوکومەتەکەی سولێمانی و سەر نەگرتنی پلانی کوردەکانی باکوور و رۆژهەڵاتی کوردستانیشی بەدواوە بوو.

تەنانەت شێخ گوشار دەخاتە سەر سمکۆ کە لەگەڵ کەمالیەکان ئاشت بێتەوە، ئەنجامەکەشی ئەوە بوو سمکۆش لە کاتێکی چارەنووسسازدا بە قسەی شێخ دەکات و پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان دەبەستێتەوە و ئینگلیزەکانیش بەرامبەر بە سمکۆ دەکەونە شك و دوو دڵی......

بەڵگەیەکی تر کە سەرنجراکێش و لە راستی زۆر نزیکە ئەوەیە: ئەو مەرج و پێشنیارانەی ئینگلیزەکان دەیدەن بە شێخ مەحموودی، لە کۆبوونەوەیەك لە ٢١ و ٢٢ شوبات لە سلێمانی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود دەخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، شێخ ئامادەی جێبەجێ کردنیان دەبێت، دوور نییە تورکەکان یا سەرەتا بەلشەفیکەکان ئاگاداری ئەم کۆبوونەوە بووبن، چونکە شاندێکی دەوڵەتی تورك دەسبەجێ خۆی دەگەیەنێتە سلێمانی بۆ پەشیمانکردنەوەی شێخ یان با بڵێین تێکدانی ئەو رێککەوتنە.

بەپێی راپۆرتەکە ئەوە دەبێت : شێخ پەشیمان دەبێتەوە و دەکەوێتە ژێر کاریگەری فروفێڵ و بەڵێنی پان و بەرینی تورکان و ئینگلیزەکانیش لە هاتن و تێکدانی ئەم رێککەوتنە ئاگادار دەبن و شەڕ دەستپێدەکاتەوە. سەیر ئەوەیە چۆن بەلشەفیکەکان یان کەمالیەکان لەم کۆبوونەوە ئاگاداربوون؟ کامەیان زووتر زانیویانە؟کامەیان دەوریان لە تێکدانی پەیوەندی شێخ و ئینگلیزدا هەبووە؟ یاخود

دوور نییه هەردووك پێکەوه هەوڵیان دابێت، کێ ئەو هەوڵانەی گەیاندۆتەوه لای بەلشەفیك و کەمالیەکان؟ئەمانە هەموویان جێی پرسیارن.

بەڵام ئەوەی جێی داخە لاوازی نهێنکاری و دیبلۆماسیەتی کورد بووه. هەروەها لە بەڵگەنامەکاندا دووبەرەکی نێوان شێخ مەحموود و هەندێ کەسایەتی بەدی دەکرێ، وەك شێخ قادری برای و سمکۆ لەبەر هەڵوێستیان بەرامبەر بە ئینگلیز و تورك و بەلشەفیکەکان، بەڵام تۆ بڵێی ئینگلیزەکانیش بەشك و گومانەوه نەیانڕوانیبێتە هەڵوێستی ئەوانە بەتایبەتی برای شێخ مەحموود.

ئایا ئەوانیش تاسەر لە سەر بیروڕا و هەڵوێستی خۆیان ماونەوه؟ یان لە ترس و کاریگەریەتی شێخ مەحموود وازیان هێناوه؟ ئەگەر بەردەوام بوون بۆ کاربەدەستانی ئینلگیز چارەنووسی گەلی کوردیان کردۆتە قوربانی هەڵوێستی نابەجێی شێخ مەحموود و بە زۆر کوردستانیان لکاندوه بە دەوڵەتی دەستکردی خۆیانەوه واتە عیراق؟.

بۆ شێخیان نەگرت و کەسێکی تر بکەنە حوکمداری کوردستان و سیاسەتی خۆیانی پێ دیکتە بکەن و کیانێك بۆ گەلی کورد دروست بکەن؟.

تاوانی ئینگلیز لەم بارەوه پاکانەی بۆ ناکرێت. دەوری شێخ حیسامەددینیش لە راکێشانی شێخ مەحموود بۆ لای تورکەکان بابەتی بەڵگەیەکی ترە.

لەناو بەڵگەکاندا ئاماژە بە چەند نامەیەکی شێخ مەحموود دەکات کە بۆ کاربەدەستانی رووسیای سۆڤیەتی ناردووه گەرچی نامەکان لە رووسییەوه وەرگێڕدراونەتەوه سەر کوردی و وەرگێردراوه رووسیەکانیش دیاره باش نین و لەوانەیە تێکستی نامەکان هەموویان وەرنەگێردرابنە سەر زمانی رووسی و لە لایەکی تر نوێنەرانی (شێخ)یش کە زۆر شت و وتەی ئەویان پێبووه دەبوایە بەدەم بە کاربەدەستانی سۆڤیەتی بگەیەنن، دیار نییە کە بایەخی زۆرتر لە نامەکاندا بووه یا نا، بەداخەوه کۆپی نامەکانی (شێخ)یش دەست نەکەوتن. پێدەچێ کاربەدەستانی سۆڤییەت زارەکی وەڵامی نامەکانی (شێخ)یان دابێتەوه، روون نییە. بەڵام ناوەڕۆکی نامەکان و مەبەستی شێخ دیاره کەوا داوای یارمەتی بۆ سەربەخۆیی کوردستان و خەبات دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیز و بەستنی پەیمانی هاوبەشی نێوان (شێخ) و بەلشەفیکەکان دەکا، کوردستانی ئازادیش بە بۆچوونی شێخ دەبێ لە ژێر چاودێری و پاراستنی یەکیەتی سۆڤیەت دابێت.

دەنگدانەوەی هانا بردنی شێخ بۆ بەلشەفیکەکان لە چاپەمەنیەکانی ئەو دەمی (سۆڤیەتی)دا دەرکەوتووە، جگە لەوەش هاتنی شاندەکانی شێخ مەحموود بۆ پەیوەندی گرتن بە رووسەکانەوە بۆ ئینگلیزەکان شاراوە نەبووە.

مەترسی پشتگیری بەلشەفیکەکان، ئەگەر دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردیش نەبوو بێت، خۆ ئاژاوەنانەوە و سەر ئێشەیەك بووە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دژی بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز و ئەو دەوڵەت و ناوچانەی دەستی بەسەردا گرتبوون، کە بەخوێن و خەرجیەکی زۆر لەگەڵ ئانتانتەکان هێندێ دەوڵەتیان لەسەر شوینەواری ئیمپراتۆرە روخاوەکەی عوسمانی دروست کردبوو، ئینجا چۆن دەرفەت بدات پاڵپشتێك یان هاوپەیمانێکی رووسیای سۆڤیەتی لە ناوچەکە دروست ببێت، یان رێگە بدەن تورکەکانیش وەك ئەتاتورك لەو دژایەتیەی شێخ مەحموود و ئینگلیز بۆ گەڕاندنەوەی ولایەتی موسڵ و شوێنە لە دەست چووەکانی تر کەڵك وەربگرن. تۆ بڵێی شێخ و هاوکارەکانی بیریان لەوە نەکردبێتەوە کە ئینگلیز بە یارمەتی هاوپەیمانەکانی و ئەو گەلانەی دەوڵەتیان بۆ دروست کردوون ناهێڵن پلانێکی وا سەربگرێت.

تۆ بڵێی شێخ و راوێژ کارەکانی ئەوەیان لەبەر چاو نەگرتبێت کە ئەگەر بەلشەفیکەکان ئامادەی هاوکاری و یارمەتیدانی کورد بان ئەگەر بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردیش نەبێ بۆ ئاژاوەنانەوە دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیز و تورکیای دۆست و ئێرانی هاوپەیمانیان ناهێڵن شتی وابکات، کە هەرکام دوو پارچەی کوردستانیان لە ژێر دەستە و هەمیشە کێشەی کورد و راپەڕینی کوردەکانیان بە درێژایی مێژوو بۆ بۆتە نیگەرانی و مەترسیەکی گەورە، ئینجا رووسیا بێت و پشتیوانی دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی بکات لە بن گوێی ئەوان و ببێتە قەڵایەك بۆ ئازادکردنی کوردستانی بن دەستی تورکیا و ئێران، ئەوە لەگەڵ واقعی ئەو سەردەمەدا نەگونجاوە، کام فاکتەر و هۆ، لەسەر چ بنەما و مەنتقێك، پاڵیان بە شێخ و راوێژکارەکانییەوە ناوە هەنگاوی ئاوا هەڵگرن.

خۆ مێژووی سیاسەتی رووسیای قەیسەری بەرامبەر بە دۆزی کورد کە بەلشەفیکەکانیش درێژە پێدەری بوون بۆ شێخ شتێکی شاراوە نەبوو، بەلشەفیکەکان کەی و لە کوێ پشتیوانیان لە دۆزی کورد و دروستکردنی دەوڵەتی کوردی کردووە؟ یان لەو پەیوەندییە دۆستانەی لە لەگەڵ ئەتاتورك و ئێراندا هەیانبووە کەی هەوڵی ئەوەیان داوە هەتتا مافی کلتوری لە لایەن ئەو رژێمانەوە بە کورد بدرێت؟ لە کام کۆڕی نێونەتەوەیی بەلشەفیکەکان کێشەی کوردیان هێناوەتە گۆڕێ؟.

تەنانەت سەبارەت بە پەیمانی سیڤەر و پوچەڵکردنەوەی تا ئەو جێگایەی بۆیان کرا پشتی تورکە رەگەزپەرستەکانیان گرت و کوردستانی باشووریان لە سەردەمی حوکمداری شێخ مەحموود بە کوردستانی ئینگلیز و شێخیان بە نۆکەر و دەستەمۆی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دادەنا کە مەترسی بوو بۆ سەر ئەنقەرا و تاران و مۆسکۆ.

ئایا شێخ نەیدەزانی رووسیای سۆڤیەتی داوای گەڕانەوەی ولایەتی موسڵ دەکا و بە میراتی شەرعی و قانوونی تورکیای دادەنێ، بۆ گەڕاندنەوەی بەچەك و پارە و کاری دبلۆماسی پشتی ئەتاتورك دەگرێ.

**د. ئەفراسیاو هەورامی**

## وەرگێراو لە رۆژنامەی (رۆژی کوردستان) ژمارە (٧)

بەڵگەنامەکان بابەتی گرنگیان تێدایە، بەتایبەتی ئەو نامانەی لە نێوان سمکۆ و شێخ مەحموود ئاڵوگۆڕکراون و تیایدا هەستی برایانە و نیشتمانپەروەری سەرکردەکانی کوردمان بۆ روون دەبێتەوە. داوای لێبووردن لە خوێنەرانی بەرێز دەکەم کە وەرگێڕاوی ئەو ژمارەی رۆژی کوردستانم وەك نامەکانی شێخ مەحموود لە رووسییەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی، بەهۆی نەبوونی نامەکان و ئەم ژمارەیەی رۆژی کوردستان نەمتوانیوە دەقاودەق لێرە پێشکەشیان بکەم.

مرۆڤ بە خوێندنەوەی نامەکانی شێخ کە تیایدا هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بەریتانیا دەربڕیوە سەری سوڕدەمێنێت، لە کاتێکا بۆ گەیشتن بە مافی رەوای گەلەکەی هەموو هیوایەکی بە ئینگلیزەکان بووە و داوای ئەو مافە لەوان دەکات و دەزانێ چارەسەری کێشەکە لە دەست ئەوان دایە و بەبێ ئەوان سەرناگرێت و لەدەست هیچ وڵاتێکی تر نایات. کەچی بەداخەوە

هێندەی پێناچێت هەڵوێستی خۆی دەگۆڕێت تەنانەت گوشاری سمکۆ و شێخ قادری برای و موستەفا پاشا و سەید تەها و.... بۆ سەر شێخ بێ کەڵك دەبێت.

یەکێك لە کۆنسوڵەکانی سۆڤیەتی لە راپۆرتێکیدا دەنووسێت: کوردەکانی تورکیا و فارس (ئێران) بە ئاشکرا هاوسۆزی و پشتیوانی خۆیان بۆ کوردستانی ئازاد (باشووری کوردستان بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود) دەردەبڕن، خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئازادکردنی هەموو کوردستان بە کۆکردنەوەی چەك و رێکخستنی کۆبوونەوەی سەرکردە و سەرۆك هۆز وسەرۆك خێڵی نیشتمانپەروەری کورد چ لە ئێران چ لە تورکیا کە دەیان ساڵە شەڕ و کێشەی خوێناوی لەنێوانیاندایە.

هەر لەو راپۆرتەدا باسی هەوڵ و تەقەلای سۆڤیەتیەکان دەکات کە بە رێگای کۆمیتەی ئەرزەڕۆم بە سەرۆکایەتی خالید بەگی جەبرانلی دەیانهەوێ ئەو کوردانە بەرەو خۆیان رابکێشن و نەهلێن پشتیوانی لە حکومەتەکەی شێخ مەحموود بکەن کە بە دەستی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دروست بووە، گوایە پەیمانێکیش لە نێوان سۆڤیەتیەکان و کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردستان لەم بارەوە دەبەسترێت، سۆڤیەتیەکان بەڵێنی یارمەتی بە خالید بەگ دەدەن و هەوڵ دەدەن لەگەڵ کەمال ئەتاتورك لەسەر ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان لە چوارچێوەی تورکیا ناوبژیوی بکەن و چالاکی بنوێنن. بەلشەفیکەکان کە ماوەیەکی زۆر لە رێگای کۆنسوڵ و باڵوێز و ئەجینداکانی خۆیانەوە پەیوەندییان بە کۆمیتەی ئەرزەڕۆمەوە دەبێت بەبیانوی ئەوەی تورکیای شۆڕشگێڕ لە خەباتی دژی ئیمپریالیزمی دایە و نابێ دژی رابوەستن، ئەگەر تورکیا یان کوردستانی تورکیاش وەك کوردستانی باشوور بکەوێتە ژێردەستی ئیمپریالیزم رزگاربوونی کوردان زۆر زەحمەتتر دەبێت. وەك ئەوەی بە کوردەکان بلێن ئێوە بە یارمەتی وەرگرتن یا پشتبەستن بە ئینگلیز وەك ئەوەیە لەناو ئاگر بکەونە ناو چاڵ واتە لەناو چاڵەکە (ئینگلیز) دەربازبوون زۆر زەحمەتترە. واتە زوڵم و زۆر و چەوسانەوە و دەسەڵاتی زلهێزێکی ئەوروپایی لە رژێمی داگیرکەر و دواکەتووی سەدەکانی ناوەڕاستی حاکم بەسەر کوردستاندا گەلێك سامناکترە. بە واتایەکی تر عەرەب و تورك و فارس کە بە درێژایی مێژوویان نە لانەیگری سەربەخۆیی و مافی گەلان بوون و نەهێشتوویانە گەلانی ژێردەستیان سەرەتایی ترین مافیان هەبێت و ئەو گەلانەش کە لە ژێردەستیان رزگاریان بووە یان بەخوێن یا بەزۆر و بە هۆی

ئەوروپاییەکانەوە بووە، ئەمانەیان لەکۆلۆنیالیستەکانی ئەوروپایی پێ باشتر بووە کە بەهەموو کەم وکورپییەکانیانەوە باوەڕیان بەمافی چارەی خۆنووسین و دیموکراسی هەبووە و کیانیان بۆزۆربەی گەلانی جیهان دروسکردووە یاناچار بوون بۆیان دروسبکەن.

هەر لەو راپۆرتەدا لە لایەك رووسەکان پێش بە یەکگرتنی کوردەکانی باکوور و رۆژهەلات لەگەڵ کوردستانی باشوور دەگرن، لەلایەکی تریش گوایە تورکیا زاوای شێخ مەحموود بانگ دەکاتە (ئەنقەرە) و ئامادەیی خۆی بۆ پشتیوانی شێخ مەحموود دەردەبڕێت بەو مەرجەی دەست لە کاروباری کوردستانی تورکیا نەدات. ئەم هەلۆیستەی تورکیا وەنەبێ لە رووی دلسۆزیەوە بێت، بەلکو لە رووی ناچاری و مەترسییەوە بووە کە نەکا کوردی باکووریش داوای جیابوونەوە یان پشتیوانی لە کوردی باشوور بکەن. دەیەوێ لە ڕێگای شێخ مەحموود گوشار بخاتە سەر کوردی باکوور و گەرەنتی وەربگرێت کە شێخ دەست لە کاروباری کوردستانی تورکیا وەرنەدات. رەوتی رووداوەکانی دوایی وانیشان دەدەن کە تورکیا لەم بارەوە بەرهەمی هەبووە.

پەیوەندی باشی شێخ لەگەڵ کەمالی و بەلشەفیکەکان، تێکچوون و شەڕی شێخ لەگەڵ ئینگلیزەکان، هاتووچۆی نوێنەرانی دەولەتی تورکیا بۆ سلێمانی و ناردنی هێزی چەکداری تورك بۆ باشوور و...... بابەتی تری بەلگەنامەکەن.

سەرئەنجام تورك و رووسیا بەو ئامانجە گەیشتن کە نێوان شێخ و ئینگلیز تێك بچێت، نە کیانەکەی شێخ مەحموود مایەوە و نە کوردستانی گەورەش گەیشتە سەربەخۆیی کە رووسیا و تورك و ئێران لێی دەترسان. هێزێکی تریش نەبوو شێخ مەحموود پالی پێوەبدات، بەربەرەکانی شێخیش لەگەڵ ئینگلیز دەرژێتە جۆگەی ستراتیژی (بەلشەویزم و کەمالیزم). تورکیای کەمالی وەك (سیاسەتی ئیمرۆی بەرامبەر بە کوردستانی باشوور) ئامانجی ستراتیجی ئەو دەمی ئەوە بوو کیانە کوردیەکەی باشوور سەرنەگرێت و کورد لە ژێر دەسەلاتی عیراق یان ئینگلیزدا بمێنێتەوە چونکە مەترسی لێناکرێت سبەینێ لەگەڵ هەرکامیان بێت رێکدەکەوێت و هەر واشی لێهات. تورك ئەو بەربەرەکانیە و دەست تێوەردانەی لە کوردستان هەیبوو لە بەلقان و ولاتانی عەرەبی و ئاسیایی و ئەفریقایی و ولاتانی ئەورپایی رزگارکراو، نەیبوو کە لە ژێر چەپۆکی ئیمپراتۆری روخاوی عوسمانی دابوون و رۆژئاواییەکان پێی خۆیان تێدا چەقاندبوو.

چونکە هەر کوردستانی لە ژێردەستدا مابۆوە و دەبوایە بەهەر شێوەیەك وهەر نرخێك بێ کوردستان ڕاگرێت و بڕوبیانووی لە کوردستانی باشووری ژێر دەستی ئینگلیزیش بۆ ئەوە بوو نەهێڵێ ڕۆژئاواییەکان دەست بەسەر کوردستانی باکووردا بگرن. بە بیروڕای من لای تورکەکان روون و ئاشکرا بوو گەڕانەوەی موسڵ یان بە واتایەکی تر کوردستانی باشوور بۆ باوەشی تورکیا لە هەراو هۆریا بەولاوە زیاتر نەبوو، تەنیا بۆ پووچەڵکردنەوەی پەیمانی سیڤەر و وازهێنانی ڕۆژئاواییەکان لە تورکیا کەوتنە سەودا لەگەڵیان کە ئەویش ئەگەر بەلشەفیکەکان پشتیان نەگرتبان نە تەنیا کوردستانی باکووریشیان لە دەست دەچوو، بەڵکو رژێمێکی سەر بە ڕۆژئاواش حوکمی ئەستەمبۆڵ یان ئەنقەرەی دەکرد.

کوردستانی باشووریشی کە لە دەست دەرچوو بوو وەك عیراق و سوریا و لوبنان و.... گەڕانەوەشی بۆ باوەشی تورکیا وەك ئەو دەوڵەتە نوێیانە مەحاڵ بوو. ئەو ئاژاوە و دەست تێوەردانەی لە باشووری کوردستان، دەرئەنجامی هەڵە و ڕێکنەکەوتنی کورد لەگەڵ ئینگلیزەکان بوو زەمینە و بیانووی بۆ ئەو هەنگاوانەی تورکیا رەخساند، ئەگینا بۆ داوای گەڕانەوەی ولایەتی شام و بەسرە و...... ئەوانەی نەدەکرد؟ یان بۆ نەیدەوێرا هێزی چەکداری خۆی بنێرێتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سوریای ئیمڕۆ کە ئەوسا لە ژێر دەستی فەڕەنسا بوو؟.

پرسیارێکیتر سەبارەت بەوەی کە تورکیا بە ڕێگای زاوای شێخ مەحموود داوای کردووە ئامادەیە پشتیوانی شێخ مەحموود بکات بە مەرجێك دەست لە کاروباری کوردەکانی تورکیا نەدات، ئەوەیە کە ئایا تورکیا هەرگیز خۆی پاراستووە لە دەست تێوەردانی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و پیلان گێڕان، تەنانەت ناردنی سوپاش بۆ باشووری کوردستان لەوانە بە سەرۆکایەتی ئۆزدەمیر؟. لە درێژەی راپۆڕتەکەدا نووسەر دەڵێت: ئەگەر شێخ مەحموود پێشنیاری تورکەکانیش قەبووڵ بکات ئەوە ناگەیەنێ کە واز لە ئیش و کاری خۆی لەناو کوردەکانی تورکیا بێنێت. من ئەو یەکگرتنەی کوردەکانم زوو هەست پێکردووە و رەگ و ریشەی زۆر قووڵە.

نە دیاریکردنی سنوورەکان نە پۆستەی گومرگ و...... ناتوانن پێش بە پەیوەندی کوردەکانی (باکوور و باشوور) بگرن. نووسەر لە درێژەی راپۆرتەکەیدا زۆر بە قووڵی و بە جوانی بۆ کێشەی کورد دەچێت، بەڵام مەخابن دەسەڵاتدارانی رووسیا گوێڕاگری نین، گلەیی دەکاو رەخنە لە

هەڵوێستی دەوڵەتەکەی خۆی دەگرێ و دەڵێ: وا ساڵێك بەسەر راپەڕینی کوردەکاندا تێپەڕ دەبێت و ئێمە شتێکی باشمان بۆ نەکردوون، دەڵێ دوو دەوڵەت هەیە کوردەکان پەنایان بۆ بەرن ئینگلیز و رووسیا، وادەگەیەنێت کە تائێستا ئینگلیزەکان بەهانایانەوە چوون و لەمەولاش دەرئەکەوێ کێ لەگەڵیانە (مەبەستی ئەوەیە رووسیا یان ئینگلیز). نووسەر باوەڕی بەو دۆستایەتیە رواڵەتیەی نێوان رووسیا و تورکیای کەمالی نییە و دەڵێت: ئایا ئێمە هەر بەو «دۆستایەتیە» کاتیە و خەیاڵیەی تورکیاوە دەنوسێین کە تائێستا هیچ بەرهەم و دەستکەوتێکی بۆ ئێمە نەبووە و جگە لەوەی لەباری ماددی و ئەرزییەوە زیانمان پێ گەیشتووە و سووکایەتیشمان پێکراوە. ئایا ئەوانە باشترن یان پشتیوانی کردنی گەلێکی تازە پێگەیشتووی وەك (کورد) کە دەیەوێ لە ژێر ئاڵای کۆمارێکی سۆسیالیستیدا خەبات بکات بۆ ئازادی.

لە راپۆرتی کۆنسوڵی رووسیا لە ئەرزەڕۆم کە چاوی بە کاپیتان نەزمی بەگ سکرتێری کۆنسوڵی تورکیا لە ماکۆ کەوتووە، باسی گۆڕینی سیاسەتی دەوڵەتەکەی دەکات بەرامبەر بە کێشەی کورد و دەڵێت کوردستان لە ژێر حیمایەی رووسیا یان ئینگلیز هەرکامیان بێت بۆ (تورکیا) خراپە.

ئەنقەرا ئەم شتەی پێشبینی کردووە و پێیوایە دەبێ بەهانای کوردەکانەوە بچێت و رێگە لە دەست تێوەردانی دەوڵەتانی بیانی بگرێ لە کوردستان. بەڵگەی گۆڕینی سیاسەتی تورکیا بەرامبەر بە کێشەی کورد لە لایەن کۆنسوڵی سۆڤیەتیشەوە باس دەکرێت کە چاوی بۆلتنێکی نهێنی لەشکری تورکی کەوتووە کە تیایدا دەڵێت دەوڵەتی تورکیا چیتر دوژمنایەتی کورد ناکات و هەڵوێستی توندیان بەرامبەر بە دەوڵەتی شێخ مەحموود نابێت و..... لە راپۆرتێکی تری ئەم بەڵگەنامە گرینگانە پەیوەندی سەرکردەی کۆمیتە کوردییەکانی ئەرزەڕۆم و ئەستەمبۆڵ بە بەلشەفیکەکانەوە چ لە تورکیا و چ لە یەکیەتی سۆڤیەتی لە تیفلیس و..... وادەردەکەوێت ئەو یارمەتیەی بڕیاربوو رووسەکان بیدەن بە کوردەکان، شەش مانگی بەسەردا تێپەڕیوە و پێناچێ دابێتیان، چونکە کەسایەتیەکی تری کورد کە نوێنەری پەرلەمانی تورکیابووە پانزە رۆژی تر بۆ وەڵامدانەوەی رووسەکان دادەنێت و دەڵێت ئەگەر لە ماوەی ئەو پانزە رۆژەدا وەڵام وەرنەگرین ناچارین سەر بە دەرگایەکی تردا بکەین، کابرای رووسیش لە راپۆرتەکەیدا

دەڵێت: شك و گومانی خۆی لەسەر ناوبراو ناشارێتەوە و پێیوایە سیخوری تورکیایە بە دەستووری ئەوان هاتووە.

سەرەڕای ئەوەی خالید بەگی جەبرانلی سەرۆکی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم ناوبراوی پێشتر ناساندوە بە رووسیەکان و جێی باوەڕ و متمانەبووە و لەگەڵ خۆشیدا هێناویەتی بۆ لای کاربەدەستانی رووسی و یوسف زیاش بە نهێنی هاتووە بۆ لایان جگە لەوەش پێشتر پەیمان لە نێوان بەلشەفیکەکان و کۆمیتەی ئەرزەڕۆم بە سەرۆکایەتی خالید بەگی جەبرانلی بەستراوە، جگە لە دانانی پلانێکی هاوبەش کە رووسیا یارمەتی چەك و دراویش بدات بە کورد، جگە لە نامەکانی شێخ مەحموودیش.

کۆنسۆڵی رووسیا لە بایەزید مالستۆڤ دەڵێ: بەپێی ئەو هەواڵانەی لە باشووری کوردستانەوە گەیشتوون ماوەیەکە هێزەکانی ئینگلیز و تورك لە جێی خۆیان وەستاون، دیارە لە ژێرەوە پەیوەندی لەنێوان تورك و ئینگلیز هەیە و دەیانەوێ بە رێگای دبلۆماسی کێشەکان چارەسەربکەن و چاوەڕێی بەستنی کۆنفراسی لۆزان دەکەن لەسەر موسڵ. دبلۆماتی رووس دەنووسێ: ئەگەر کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم بە سەرۆکایەتی خالید بەگی جەبرانلی بتوانێ کوردەکان لە ئینگلیز دابڕێت ئەوا لە داهاتوویەکی نزیکدا دەردەکەوێت، تائەو کاتەش هەڵوێستی ئێمەش بەرامبەر بە کێشەی کورد ڕوون دەبێتەوە.

هەروەك پێشتر ئاماژەم پێکردووە لە زۆر بەڵگەشدا هاتووە رووسیا بە هۆی ئەو کۆمیتەوە نەیهێشتووە کوردی باکوور و رۆژهەڵات راپەڕن و پشتیوانی شێخ مەحموود بکەن، بەڵکو هەوڵی دابڕان یان تێکدانی پەیوەندییەکانی شێخ مەحموود و ئینگلیزی داوە، رووسیاش بەو مەرجە ئامادەی هاوکار و ئامادەی ناوبژیکردنی نێوان کورد و تورکە رەگەزپەرستەکان بووە بە سەرکردایەتی مستەفا کەمالی هاوپەیمانیان کە واز لە ئینگلیز بێنن.

دوور نییە دابڕانی شێخ لە ئینگلیزەکان بە هۆی ئەو سیاسەتەوە بووبێ جگە لەوە بەلشەفیکەکان نە تەنیا چاوی بینینی سمکۆیان نەبووە، بەڵکو هەوڵی لەناوبردنیشیان داوە. ئەو سمکۆیەی بەلشەفیکەکانی تاقی کردبۆوە و ناسیبوونی، و خالید بەگی جەبرانلیش کە بەرێنوێیی رووسەکان راسپێردرابوو سمکۆ بکاتە دژی ئینگلیز و واز لە پشتگیری شێخ مەحموود بێنێ، بەڵام سمکۆ پەیوەندی ستراتیژی نێوان رووسیای سۆڤیەتی و تورکیای کەمالی دەزانێ و باوەڕێ

بەوە هەبووە کە بە هۆی ئینگلیزەکان وەك زلهێزێك و دەسەڵاتداری ناوچە و حاکمی عێراق، کوردیش دەتوانێ بە مافی خۆی بگات و.....

سەرەڕای ئەوەش سمکۆی زانا و بەئەزموون بۆ وەڵامی پێشنیارەکانی رووسیا مەرج دادەنێت. لە هەواڵەکانی ورمێ کۆنسۆڵ دەنووسێ: هێزێکی لەشکری تورك کە ژمارەیان حەوت سەد کەس بوون و پاشماوەی ئەو هێزە بووە کە لە ناوچەی رەواندوز و بەدەستی سەید تەها تێك شکێندراوە، دێنە شنۆ و لەوێوە چەکەکانی خۆیان تەسلیمی فەرماندەی پادگانی ناوچەی سەلماس (کەلەب عەلی خان) دەکەن و لە ژێر پشتیوانی قەزاقەکانی ئێران بەرەو دیلمان و لەوێشەوە بۆ ناو خاکی تورکیا بۆ باش قەڵا بەرێ دەکرێن. رۆژی (٣)ی مانگی مایس هێزێکی تر بە سەرۆکایەتی ئوزدەمیر پاشا بەرەو ورمێ بەرێ دەکەون. ئەم هەواڵە زۆرشت دەردەخات کە خۆ تەسلیم کردنی سوپای تورك بە کاربەدەستانی ئێران و بەرێ کردنیان بۆ ناو خاکی تورکیا هاوکاری و هاوبەشی تورك و ئێران و لە لایەکی تر لە ترسی گیرانیان لە لایەن سمکۆ و داننان بە شکستی ئەو هێزەی تورك بە دەست سەید تەها و هاوکاری کوردی پارچەکانی تر لەگەڵ شێخ مەحموود دەردەخات.

سەرئەنجام لە بەڵگەیەکی تردا دەرئەکەوێت دەوڵەتی رووسیا بەڵێنی ئەو یارمەتیەی بە هەردوو کۆمیتەی کوردی داوە، کۆمیتەی ئەرزەرۆم بە سەرۆکایەتی خالید جەبرانلی و کۆمیتەی ئەستەنبۆڵ بە سەرۆکایەتی زیا بەگ کە هەردووکیان یەکیانگرتووە. بەڵێنی رووسیا پەنجا هەزار لیرە و چل هەزار چەك بووە.

بەڵام لە ئاکامدا ئەو یارمەتیە نادرێت و لە باتی ئەو یارمەتیە پێشنیاری ٤ تا ٥ هەزار لیرە بە کەسایەتی زیا بەگ دەکرێ بۆ خەرجی خۆی، (زیا بەگ)یش وەریناگرێتو دەڵێ: من بۆ خۆم پێویستم بە پارە نییە.

زیا بەگ جارێکی تر لە ئەرزرۆم داوا لەکۆنسۆڵی رووسیا دەکات لە ئەنقەرە و مۆسکۆ بپرسێ ئایایارمەتیەکە دەدەن بە کورد یا نا؟، بە کۆنسۆڵی رووسیا دەڵێت: وەرنەگرتنی وەڵام تا تێپەڕبونی ماوەیەکی زۆر،پوچەڵی وتووێژەکانی نێوان نوێنەرانی کورد و رووسیایە، دەڵێ: ئەم بەڵێنە درۆیانە و ئەم کردەوەی رووسان گاڵتە پێکردن و بێ حورمەتی بەو کەسانەیە کە بیروڕای ((کوردستانێکی سەربەخۆیان)) هەیە و خەباتی بۆ دەکەن. جگە لەوە بەوتەی کۆنسۆڵ، یوسف

زیا بەگ وتوویەتی کە ئەو یارمەتیەی رووسیا بەڵێنی دابوو، بڕیار بوو پێشەکی و بۆ سەرەتای شۆڕش بێت.

یوسف زیا بە رووسەکان دەڵێت رووس و کورد یەك دوژمنی هاوبەشیان هەیە. پاش وتوویژ لەگەڵ کۆنسوڵی رووسیا بە دڵ ساردیەوە لە لای دەرِوات و (خالید بەگی جەبرانلی)یش بەوتەی کۆنسوڵ پاش ئەو وەلامەی یوسف زیا وەری گرتبۆوە پەیوەندی خۆی لەگەڵ کاربەدەستانی رووسیا پاش حەوت مانگ چاوەڕوانی دەپچڕێنێت.

لە درێژەی راپۆرتێکی تردا باسی بۆمبارانی دزلی دەکات لە هەورامانی کوردستانی رۆژهەلات کە فرۆکەکانی ئینگلیز پێی هەستاون، پاشان چالاکی هاوبەشی هێزەکانی ئینگلیز و ئێران لە ناوچەی دزلی کە چوار گوندیان سوتاندووە، فەرماندەی هێزەکانی ئێرانیش بە سەرۆکایەتی گیگوی ئەرمەنی بووە.

سەرئەنجام لە نێوان شێخ و ئینگلیز شەڕێکی قورس دەستی پیّ کردووە و هەورامانی کوردستانی رۆژهەلاتیشی گرتۆتەوە کە لەگەڵ شێخ مەحموود بوون.

یارمەتیەکە نەدرا نە بە شێخ نە بەدوو کۆمیتەکەی کوردی کوردستانی باکوور، بەلام چاپەمەنیەکانی رووسیا بۆ پروپاگەندەی دژی ئینگلیز باسی دڕندەیی ئینگلیز لە کوردستان دەکەن و باسی نووسینی نامەی شێخ بۆ سەرۆك وەزیرانی ئێران و نوێنەرانی دەوڵەتانی ئەمریکا و تورکیا و ئیتالیا و فەڕەنسا و رووسیای سۆڤیەتی لە تاران، دەکەن.

رووداوەکان بە پەلە و ئەوەی چاوەڕوان دەکرا سەبارەت بە نزیك بوونەوەی شێخ مەحموود و تورکیا شێوەیەکی ئاشکراو رونتر بەخۆوە دەگرێت کە لە نامەی نوێنەری دەوڵەتی رووسیا لە ئەنقەرا بۆ کۆنسوڵی خۆیان لە قارس لە رێکەوتی ١٩٢٣/٧/١٩ دەردەکەوێت و دەڵێت دەستەی نوێنەرایەتی شێخ بە سەرۆکایەتی (رەفیق) دێنە ئەنقەرە و لە گەڕانەوەیاندا دەستەیەکی ئەفسەری تورك لەگەڵیان بەرەو سلێمانی دەکەوێتە ریّ.

مەبەستی دەوڵەتی تورك و پیلانەکانیان دیارە چی دەبێت و هەڵوێستی ئەم جارەی ئنیگلیزەکانیش دیارە چەند بەبیّ زەیی یانە و شێتانە دەبێت، بەبیانووی تۆڵە سەندنەوە لە شێخ دەبیّ کوردستان بە فرۆکە و هێزی سوپا کاول بکرێت و خەڵکی بیّ تاوان لەناو بچێت و کێشەی

کورد و خاکی کوردستان بخرێتە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی دەسکردی خۆیان. لەوە باشترە تورك کە بە خوێن، بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم دەرکرابوون بگەڕێنەوە یان بەلشەفیکەکان و کەمالیزم پێکەوە بەهۆی شێخ مەحموود پێگەیەك بۆ خۆیان دروست بکەن و ئاژاوە بۆ ئینگلیزەکان بنێنەوە.

لە بەڵگەنامەیەکی تردا باسی شەڕی یۆنان و تورکیا دەکات کە کوردەکان لەوێش دوو بۆچوونی جیاوازیان هەبووە، کوردی رۆژهەلات (ئێران) بە سەرۆکایەتی سمکۆ پێیوابووە دەبێ بەهۆی ئەو شەڕەوە کەڵك لە لاوازی تورکیا وەربگرین و راپەڕینی کوردەکانی رۆژهەلات بەهۆی لاوازی دەوڵەتی ناوەندی ئێرانەوە دەتوانێ سەرکەوتوانە لەگەڵ کوردی تورکیا بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ یەك بگرێ.

بەلاّم کۆمیتەکانی کوردی کوردستانی باکوور کە گوێرایەڵی رووسیا بوون بە پێچەوانەوە لەگەڵ راپەڕین و خەباتی دژی تورکیا نەبوون.

بەگوێرەی کۆمیتەکانی کوردی، لەسەرەوەی هەموویان خالید بەگی جەبرانلی لەگەڵ ئۆپۆسزیۆنی تورکیا پەیوەندییان دەبێت، لە ترسی ئەوان و رووسیا کە گوایە تورکیای کەمالی خەباتی دژی ئمپریالیستی دەکات و نیشتیمانی تورکیا لە مەترسی دایە، باسی کوردستانی سەربەخۆ ناکەن.

لە درێژەی راپۆرتەکەدا باسی پەرەسەندنی شۆڕشی کورد دەکات بەهۆی کوردستانی باشوور لە موسڵ و سەردەشت و سابلاخ و ناوچەی لورستان و باشووری کرماشان.

کۆنسوڵی سۆڤییەت لە زمانی سەرۆك کۆمیتەکانی کوردەوە لە باکووری کوردستان،باسی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی ئەنادۆڵ دەکات، گوایە هەر لە ساڵی (١٩١٨)ەوە دەستی پێکردووە تا ئەم ساڵانەی دوایی کە لە چەند قۆناغ یا خاڵدا دەتوانین شییان بکەینەوە:

١- پشتیوانی کوردان لە داروودەستەی کەمال و ئۆپۆسزیۆنی شۆڕشگێڕی دژ بە سوڵتان لەبەر ئەوە بوو ئەوان ئامادەبوون لە چوارچێوەی تورکیای نوێ مافی ئۆتۆنۆمی کوردان بە رەسمی بناسن.

٢- دەرکەوت کە ئەم بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەی بە سەرۆکایەتی کەمال ئەتاتورك دەسەڵاتی گرتەدەست لەرژێمی پێشوو زۆردارتر، دیکتاتۆرتر، شۆفێنی تر بوو بەرامبەر بە کورد، بۆیە کوردەکان هیوایان پێ نامێنێ و دژی دەوەستن.

٣- بڕیار دەدرێ ئەمجارەیان هاوکاری ئۆپۆسزیۆنی دژ بە کەمال بکەن واتە دژی دەسەڵاتی نوێ، هەوڵبدەن بۆ لابردنی ئەم دەسەڵاتە چ بە کودەتا چ بە شۆڕش. خەبات بکەن بۆ بەدی هێنانی رژێمێکی دیموکراتی لە تورکیا و مافی کورد لە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتەدا.

٤- شەڕی یۆنان و تورك دەست پێ دەکات ئۆپۆسزیۆنی تورکی نەیاری کەمال، لەو شەڕەدا زۆربەیان پشتی کەمال دەگرن و کوردەکانیش بەدوای خۆیاندا رادەکێشن و واز لە بەربەرەکانێی کەمال دێنن.

ئەو رژێمە نوێەی کە چیتر پێویستی بە تاقیکردنەوە نەبوو، بەڵێنەکانی خۆی نەبردە سەر و لە کاتی ئەم شەڕەشدا تەنانەت ئامادە نابێ وەك تاکتیکیش تا کۆتایی شەڕەکە هیوایەك بە کورد ببەخشێت.

کۆمۆنیستەکانی سەر بە رووسیاو تورکیا لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی تر بەرگری لە پاشماوە روخاوەکەی ئیمپراتۆری تورك دەکەن (ئەی بۆ نابێ کورد لەو سەردەمەدا هەوڵی دروستکردنی کیان بۆ خۆی بدا. کە کێشەی تورکیا لەگەڵ رۆژئاواییەکان نەبڕابۆوە هەموویان دژی بوون، هێشتا کەمالیەکان جێی پێی خۆیان قایم نەکردبوو، باشووری کوردستانیش ئازاد کرابوو، لە کوردستانی رۆژهەڵاتیش سمکۆ پێشنیاری راپەڕینی پێکردن،کەچی لەبەر ئۆپۆسزیۆن و رووسیا نەیانوێرا یا قەناعەتیان نەکرد).

٥- ئۆپۆزسیۆنی تورکیا وڵاتی تورکیای پێ گرنگ ترە، رووسیاش شەڕی کەمالیەکان دژی ئینگلیز و یۆنان، بەڵام ئەی کورد دەبێ چ قازانجێکی لەگەڵ ئەو دوو تاقمە هەبوویێت، ئایا تورکیا لاواز تر و بچووکتریش بکرابایەوە بە زیانی کورد دەبوو؟

کورد دەڵێ تا تەندور گەرمە نانی پێوەدە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو پەندە دەجولێتەوە، چاوەڕێی ئەگەرەکان و بە دەسەڵات گەیشتنی ئۆپۆزیسیۆنە کە فریوی بەڵێنەکانی رووسیای خواردووە (کوردیش بەشێك بووە لەو ئۆپۆزیسیۆنە).

٦- بێ دەنگ نەبوونی کورد لە کاتی شەڕی یۆنان و تورکیا دەیتوانی کێشەی کورد لە لای وڵاتە رۆژئاواییەکان گەورەتر بکاو و زەمینە بۆ بڕیارێکی نێونەتەوەیی خۆش بکا، ئەوانیش بەرژوەندییان لە لاوازتر کردنی تورکیا دابوو کە نەیاری ئەوان و هاوپەیمانی بەلشەفیکەکان بوو.

لە لایەکی تر تورك چیتر نەیدەوێرا گوشار بخاتە سەر کوردستانی باشوور و دەستی تێوەربدات دواتر پاڵپشتێك بوو بۆ سمکۆ و شێخ مەحموود و یارمەتیەك بوو بۆ یۆنان و هێزەکانی دژ بەتورکیا.

٧- کەمالیەکان بە یارمەتی رووسیا و ئۆپۆسزیۆن (بە کوردیشەوە) لە شەڕی یۆنان سەرکەوتن. سەرکردەی کۆمیتەکانی کوردیش قەناعەت بە دڵی خۆیان دەکەن و دەڵێن تا رژێمی کەمال دکتاتۆرتر بێت باشترە و ئۆپۆسزیۆنەکان زووتر هەنگاو بۆ لەناو بردنی کەمال دەنێن و بە دەسەڵات دەگەن ئەوسا کوردیش لەو دەسەڵاتە بەشدار دەبێت و ئۆتۆنۆمیش وەردەگرێت، گوایە رووسیاش بەڵێنی هاوکاری بۆ لەناوبردنی کەمال داوە.

٨- تورکیا بەپێی بۆچوونەکانی کورد پاش سەرکەوتن بەسەر یۆنانیەکان بەهێزبووە و رژێمی کەمال نارۆخێت و ئۆپۆسزیۆنی تورکیاش لاوازە، هەندێکیان هێشتا دوو دڵن کە ئایا رژێمی کەمال لە کۆنفرانسی لۆزان لەگەڵ ئینگلیزەکان رێکدەکەوێت یان نا؟ رووسیاش بە رواڵەت چاوەڕێی کۆنفرانسی لۆزان دەکات (روسیا لە کۆنفرانسی لۆزان بەکردەوە هەوڵی هەمە لایەنەی خۆی دەدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر، پشتگیری و رێنوێنی رژێمی کەمال دەکات و بۆ ئەم مەبەستە یارمەتی دیبلۆماسی دەدا) کەچی لەولاشەوە بە ئۆپۆسزیۆن و کوردەکانیش دەڵێت ئەگەر تورکیا لە لۆزان بەرامبەر رۆژئاواییەکان تەنازولی کرد ئەوا ئێمە هەموومان پێکەوە دژی رادەوستین و بۆ لەناوبردنی کەمال هەوڵ ئەدەین. بۆ ئەوەی پتر گوشار بخرێتە سەر تورکیا، پێویستە کورد پێش بەستنی پەیمانی لۆزان یا لە کاتی بەستنەکەیدا جارێکی تر بە خەباتی خۆی بێتە مەیدان و وەبیر بەشدارانی کۆنفرانس بخاتەوە کە کێشەی کورد چارەسەر نەکراوە و پێویستی بەچارەسەرکردن هەیە. بەڵام بەپێچەوانەوە کورد بە ناردنی نامە بۆ کۆنفرانس یان چاوەڕێ کردنی ئەنجامەکەی، هەڵوێست وەردەگرێت.

٩- کۆنفرانسی لۆزان بە پاشەکشەی تورکیا بەرامبەر رۆژئاواییەکان کۆتایی‌هات. رووسیای سۆڤیەتیش بەڵێنەکانی خۆی سەبارەت بە یارمەتیدانی کوردان و ئۆپۆسزیۆن بەجێنەگەیاند، سیاسەتی خۆی بەرامبەر بە کەمال نەگۆڕی و کودەتاشی لێنەکرد.

شێخ مەحموودیشیان کردە دوژمنی ئینگلیز کە بەکردەوە دۆستی کەمال و کورد بوو ئەو دەستکەوتەی باشووری کوردستانیش لە دەست چوو.

کورد بە وتەی سەرکردەکانی ئێستا یەك رێگای لەبەردەمدا ماوە، پەنا بباتە بەر رووسیای سۆڤیەتی مەزن و هاوسێی کە بەڵێنیشی پێ داوە یارمەتی بدات، واتە کورد یەك لا بۆتەوە وەك رابردوو نییە شێخ مەحموود و سمکۆ بەرەو ئینگلیز و کۆمیتەکانی کوردی کوردستانی باکوور بەرەو رووسیای ببەن، ئیمرۆ هەموو دژی بەرتیانیا و دۆستی رووسیان.

بەڵام مەخابن بە دەست کێشانەوەی ئینگلیز لە کێشەی کورد و لەناوچوونی کوردستانی سەر بە ئینگلیز بەلشەفیکەکان خۆیان لە کێشەی کورد نادەن. هەروەك سەرکردەکانی کوردیش تێبینییان کردبوو، ئەگەر رووسیا لە یارمەتیدانیان خۆی بپارێزێت تاکە رێگایەك کە دەمێنێتەوە هاوکاری کردن و هانا بردنە بۆ ئۆپۆسزیۆنی تورکیا، کە ئەوانیش دیاربوو یا لەبەر لاوازی یا هەڵوێستی تورکیستانەیان کە بە درێژایی مێژوو لەگەڵ چارەسەکردنی کێشەی کورد نەبوون و نین.

کاریگەری بەلشەفیکەکان لەسەر کۆمیتەی ئەرزەڕۆم بە سەرۆکایەتی خالید بەگی جەبرانلی دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەتی کوردی لە سولێمانی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئینگلیز بپچڕێنێت. وەك لە بەڵگەنامەکاندا هاتووە دەبێتە هۆی دووبەرەکی لەناو سەرکردەکانی کورد بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود و هەموویان لەگەڵ ئەوە نابن دژایەتی ئینگلیز و دۆستایەتی رووسیا و کەمالیستەکان بکەن. بەڵام بڕیاری سەرەکی و دەوری چارەنووس ساز شێخ مەحموود دەیبینێت کە ئەویش دیارە ئەنجامەکەی بە کوێ گەیشت.

لە لایەکی تریشەوە هەروەك لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە زیا بەگ سەرۆکی کۆمیتەی کوردی لە ئەستەنبوڵ پاش راوێژ لەگەڵ نوێنەرانی شێخ مەحموود و خالید بەگ پێشنیار بە رووسەکان دەکات کە بۆخۆی بچێتە لۆزان و وەك نوێنەری تەواوی کوردستان قسەبکات، تەنانەت

پێشنیاریش دەکات کە لە لەگەڵ دەستەی نوێنەرایەتی رووسیای سۆڤیەتیش بچێت بۆ لۆزان، بڕیارەکە دەداتە دەست بەلشەفیکەکان، بەڵام مەخابن ئەویش پەسەند ناکرێت.

لە بەڵگەیەکی تردا کۆنسۆڵەکانی سۆڤیەت باسی سیاسەتی رووسیای قەیسەری دەکەن لە ناوچەی ورمێ و سابلاخ وشوێنەکانی تر، پێش جەنگ، پاش جەنگ و لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم، دەڵێن کۆنسۆڵەکانی رووسیای قەیسەری لەناوچە کوردنشینەکانی ورمێ زەوی و زاری خەڵکەکەیان کڕیوە کەبۆتە هۆی نارەزایی دەرەبەگەکانی کورد، جگە لەوەش میسیونێرە ئایینیە خاچپەرەستەکانیان لەوێ ئاژاوە و گیروگرفتی زۆریان بۆ کوردەکان دروست کردووە، دەرئەنجامی ئەو سیاسەتە ئەوە دەبێت، کوردەکان تا شەڕی یەکەمی جیهانی لەساڵی ١٩١٤ لایەنگری تورکان بکەن، لە کاتی شەڕیشدا سیاسەتیان بەرامبەر بە کورد ناگۆڕن، دەڵێن هەڵسوکەوتی خراپ و بێ بەزەییانەی فەرماندەکانی رووسیا کوردەکانی کردە دوژمنی ئێمە.

بۆیە دەڵێن رووسیای سۆڤیەتی نوێ بەرامبەر بەو هەموو تاوان و قوربانیانەی کوردەکان داویانە بەهۆی راکردنیان لەناو سوپای تورکیا لە ناوچەی موسڵ، تاوانبار یا قەرزداری کوردانە.

لە درێژەی ئەم باسەدا دەنووسێت لەبەر چی رووسیای سۆڤیەتی هەڵوێستی بەرامبەر بە کورد نەگۆڕاوە؟. چالاکی ئوزدەمیر لە باشووری کوردستان، نامەی سمکۆ بۆ کاربەدەستانی ئێران و تاوانبارکردنیان، نامەی سەرۆك هۆز و عەشایر و پیاوە بەناوبانگەکانی کوردستانی رۆژهەڵات بۆ کاربەدەستانی ئێران، گازاندە و رەخنە و تاوانبارکردنی کاربەدەستانی ئێران کە لە باتی ئەو خزمەتەی بە درێژایی مێژوو بۆ پاراستنی ئێران کردوویانە، حاڵی دانیشتوانی کوردستان کە بەدەست هێزە سەرکوتکەر و کاربەدەستە تاڵانکەر و بەرتیلخۆری ئەو هێزەوە، دەناڵێنن، بابەتی تری بەڵگەکانن.

کۆنسۆڵی سۆڤیەت لە تەورێز لە بەڵگەیەکی تردا ناوەرۆکی نامەیەکی تری شێخ مەحموود بۆ کاربەدەستانی سۆڤیەتی دەخاتە رووکە دەڵێ: حیجاز و فەلەستین و عێراق بە یارمەتی ئینگلیز، سوریاش بە یارمەتی فەرەنسا دەوڵەتی خۆیان پێکهێنا، منیش کە پەیوەندیم بە ئێوەوە کردووە، پیاوی جەنگاوەرم زۆرە و پێویستم بە چەك و یارمەتی هەیە و (٥) ساڵە بە هیوای یارمەتی ئێوەم، ئێستا لەو پەڕی نیگەرانی داین، داواش دەکات یارمەتی سمکۆ بدەن. باسی هێرشی وەزیری جەنگی ئەو دەمەی ئێران رەزاخان بۆ سەر کوردەکانی لایەنگری خۆی

واته شێخ مەحموود دەکات و دەڵێت: رەزا پیاوی ئینگلیزە، ناوی ئەو سەرۆك عەشایرانەی کوردستانی باشوور و رۆژهەلاتیش دەنووسێت کە لەگەڵ شێخ دان.

وەلامی سۆڤیەتییەکان ئەوە دەبێت لەبەر ئالۆزی بارودۆخی نێونەتەوەیی (وەك هەمیشە/وەرگێڕ) ناتوانین و یارمەتی ئێمە لەم قۆناغەدا بارودۆخی شێخ خراپ دەکات، هانای شێخیش بۆ کەمال ئاتاتورك هەروەك بەلشەفیکەکانە، بیانوی کەمالییەکانیش کە ناتوانن یارمەتی شێخ بدەن ئەوەیە: لەبەر کۆنفراسی لۆزان، وتووێژ و رێککەوتن لەگەڵ ئینگلیز، لە ئارادایە.

سەرئەنجام هەروەك پێشتر بە پشت بەستن بە بەڵگەکان، ئاماژەمان پێکرد، سمکۆش دەکەوێتە داوی کۆمیتەکانی باکووری کوردستان و شێخ مەحموود، واتە پەیوەندی بە سۆڤیەتەوە بکرێت. ئەویش بە نامە، شاند یا نوێنەر داوا و هەڵوێستی خۆی بە دەوڵەتی سۆڤیەت رادەگەیەنێت. پێویستە ئەوەش بگوترێت کە سمکۆش وەك ئەندامی سەرکردایەتی کۆمیتەی کوردی لە رۆژهەلاتی کوردستان هەڵدەبژێرن. سمکۆ لە رێگای نوێنەرەکانیەوە وەك موحەمەد ئەمین بەگ و کەمال فەوزی بەگ، بە نامە و بەدەم لە کوردستانی رۆژهەلات پەیوەندی بە کۆنسوڵەکانی سۆڤیەتەوە دەکات، بەتایبەت لە ورمێ و ماکۆ. لە یەکێك لەو پەیوەندییانەدا، سمکۆ لە پەیام و داخوازەکانیدا دەڵێت: من بایەخێکی زۆر دەدەم بە گەورەیی دەوڵەتی سۆڤیەت کە بۆ رزگاری مرۆڤایەتی کەوتۆتە خزمەت و یەکێك لە مەبەستە راگەیەندراوەکانی دەوڵەتی مەزنی بەڕێزتان ئەوەیە، دەیەوێ گەلانی چەوساوە ئازادبن، ئەگەر لە دونیادا گەلێکی بە شەرەف و میرخاس هەبێت کە تائێستا سەربەخۆیی و شانازی خۆی بە دەست نەهێناوە و دراوسێی لە مێژینەی ئێوەیە و بە راستی پێویستی بە یارمەتییە، گەلی کوردە، کە منیش یەکێکم لەو گەلە، من و تەواوی گەلی کورد لەو باوەڕەداین تەنیا دەوڵەتی مەزنی یەکیەتی سۆڤیەت دەستی یارمەتی راستەقینە و هاوکاریمان بۆ درێژ دەکات، نە تەنیا ئێمە دەخاتە ژێر باڵی خۆی بەڵکو لەباوەشیشمان دەگرێت... من لە ناخی دڵمەوە رایدەگەێنم کە ئامادەم هەموو دەستوورەکانی دەوڵەتی بەشەرەف و مرۆڤ دۆستی ئێوە جێبەجێ بکەم..... دەبێ چ هاوارێك ئەوەندە بەزەییخواز، جوان، موستەحەق، و موخلیس و بە ناوەڕۆك بێت، تۆ بڵێی هەستی رێبەرانی سۆڤیەتی نەبزواندبێت.

کەمال فەوزی لەورمیێ وەبیر کۆنسۆڵی سۆڤیەتی دێنێتەوە کە نوێنەرانی سۆڤیەت (باڵوێزی سۆڤیەت لە ئەنقەرە) بەڵێنی یارمەتییان بە کۆمیتەی کوردی دابوو، بەڵام هەر لە چوارچێوەی بەڵێن مایەوە، کوردیش بە هۆی نەبوونی ئەو یارمەتییە ئەو دەرفەتە لەبارەی لە دەستدا (مەبەست کاتی شەڕی یۆنان و تورکیایە). ئێستاش کەمالییەکان سەرکەوتوون و دەیانەوێ سیاسەتی کۆنی سوڵتان لە کوردستان بەڕێوەبەرن و خەریکن خۆیان لە کوردستان بەهێز دەکەن و جێگیر دەبن، بەڵام بەشێوازێکی نوێ ئەم سیاسەتە پیادە دەکەن، کورد دەگوازێتەوە بۆ رۆژئاوای ئانادۆڵ. بۆ وەستان دژی ئەم سیاسەتە و بە کەڵك وەرگرتن لەم زوڵم و زۆرە، ئێستا هەلی راپەڕینی کوردان لەبارە بەڵام بە نەگەیشتنی یارمەتی ئەویشمان لە دەست دەردەچێ. کەمال فەوزی بەگ لە کۆتایی قسەکانی دا بە کۆنسۆڵ دەڵێت «پێم بڵێن سەر ئەنجام رووسیای سۆڤیەتی یارمەتی کورد دەدات یا نا؟» کۆنسۆڵ وەڵام ناداتەوە، ناڵێ ئەرێ یا نا، بەڵام پێشتر دەستووری نهێنی دەوڵەتی خۆیانی وەرگرتووە کە تێدا دەڵێت دروشمی سەربەخۆیی کوردستان ئیمپریالیزم خستویەتیە سەر زاری کوردان و بەڵێنەکانی ئێمەش بۆ ئەوان جێبەجێ ناکرێت.بەڵام نابێ بیانترسێنین و پەیوەندییان لەگەڵ مەبڕن بۆ ئەوەی ئاگاداری کاروباریان بین...... لە هەمان کاتیشدا باوەڕیان بە سمکۆ نییە کە ئەم لاو ئەو لا دەکات، پێشتر بەهۆی خالید بەگی جەبرانلی و یوسف زیاد و شێخ مەحموودە راینگەیاند کە سمکۆ واز لە پەیوەندی و هیوا بەستن بە ئینگلیزەکان بێنێ، ئێمە هاوکاری دەکەین. سمکۆ کەوتە داوی سۆڤیەت و ئێستاش ئاوای پێ دەڵێن. لە لایەکی ترەوە بەوە تاوانباری دەکەن کە لەگەڵ تورکەکانە (هاوپەیمانی بەلشەفیکەکان ئەوانەی داویان لە کوردان دەکرد تورکیا لە خەباتی دژی ئیمپریالیزمدایە دەبێ پشتیوانی لێ بکەن). لێرەش پەیوەندییەکی ناباوەڕانەی سمکۆ بە تورکەکان بۆتە هۆی بەدناوکردنی سمکۆ.

سمکۆ هەر لە سەرەتاوە لەو باوەڕە دانەبوو بەلشەفیکەکان بتوانن یا بیانەوێ خۆیان لە کێشەی کورد بدەن، لەبەر ئەو پەیوندییە باشانەی لەگەڵ تورکیا و ئێران هەیانبوو لەبەربەرەکانێی ئینگلیز لە ئاستی جیهانی و ناوچەکەدا. کوردی هەژار و بێ کەسیش بۆی نەبوو خۆی لەو ململانێیە بدا و دژی بەلشەفیکەکانیش نەبوو. دژایەتی ئینگلیزیشی بە هەر شێوە و لە هەر کاتێکدا بێ، بەزیانی کوردی دادەنا، لەنامەیەکیش بۆ شێخ مەحموود ئەم راستییانە دەردەکەون.

سۆڤیەتییەکان پێیان رەوابوو کورد لە باشووری کوردستانی ئازاد دژی ئینگلیز راپەڕن، بەلام لە باکوور و رۆژهەلاتی کوردستان نەتەنیا دژی راپەڕینی کوردان بوون بەرامبەر بە دەسەلاتدارانی ئەنقەرە و تاران، بەلکو پشتیشیان گرتن هەر لە هاتنە سەر دەسەلاتی کەمال ئەتاتورکەوە تامردنی. بەلێ راپەڕینی کوردان لە باشووری کوردستان بۆ بەلشەفیکەکان و کەمالییەکان پێویست بوو، چونکە ئینگلیزی بەو راپەڕینەوە خەریك دەکرد، بەمەش گوشاری ئینگلیز بۆ سەر تورکیای کەمالی و بەلشەفیکەکان لە قەفقاز کەم دەبێتەوە.

کۆنسۆلی سۆڤیەت لە ورمێ لە راپۆرتێکیدا لەسەر کوردەکانی ماکۆ و ورمێ لە (١٩٢٣) پاش راپۆرتێکی دوور و درێژ سەبارەت بە پەیوەندی ناوخۆی هۆز و عەشیرەتەکانی کورد و پەیوەندییان لەگەل تورکیا و ئێران و سۆڤیەت و هەروەها کۆچ کردنی کوردەکانی ئەو ناوچەیە بۆ ناو خاکی تورکیا و هۆی ئەو کۆچ کردنانە و هەندێ زانیاری سەرنج راکێش لەسەر عەشیرەتەکانی جەلالی و میلان و پروکی و..... دەخاتە روو، باسی سیاسەتی خۆیان لەسەر کێشەی کورد و چۆنیەتی پەیوەندییان لەگەل کوردی ئێران و تورکیا و کوردستانی ئینگلیز دەکات. سەرئەنجام دێتە سەر ئەوەی کە باشترین رێگا بۆ سیاسەتی کوردی ئێمە دەبێ لە کوردەکانی خۆمانەوە دەست پێ بکەین و لەوێشەوە بۆ کوردەکانی تر و تێیدا دەلێت: ئێمە ئەوەمان لە بیرچۆتەوە لە چوارچێوەی فیدراسیۆنی رووسیای سۆڤیەتی کوردمان هەیە و ژمارەیان تا شەڕی جیهانی یەکەم تەنیا لە ناوچەی (ئەلیزابێت پول)ی پێشوو دەگەیشتە (٨) هەزار کەس. چارەسەرکردنی کێشەکەیان دەبێتە نموونە یا سیمبۆل بۆ کوردەکانی هەموو کوردستان و ئەوسا هەموویان سۆزو هەستیان ئاراستەی ئێمە دەبێت و چاو لە کوردەکانی ئەم بەری رووباری ئاراس دەکەن، دەست لە کوردستانی ئینگلیز واتە کوردستانی باشوور هەلدەگرن یا دەبێتە هۆی هەلگەڕانەوەیان لە ئینگلیز. دەبێتە نموونە یان ئاگادارییەك بۆ تورکیا کە ئۆتۆنۆمی بدا بە باکووری کوردستان. ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی سۆڤیەت دەبێتە هۆی پتەوبوون و پاراستنی سنوورەکانی ئێمە لەسەر رووباری ئاراس. ئەمانە بنەمایەکن دەبێ لە کاتی لێکۆلینەوەی کێشەی کورد لەبەرچاو بگیرێن. سەرەڕای ئەو هەموو بێ مافی و کوێرەوەری و تراژیدیایەی کورد بە سەریدا هاتووە لە راپۆرتێکدا دەخوێنینەوە: کەلب عەلی خان حاکمی ورمێ هەندێ سەرۆکی کورد لە ورمێ دەردەکا بەبێ ئەوەی مافی گەڕانەوەیان هەبێ، هاتووچۆی ژمارەیەکی زۆریش بۆ ناو شاری ورمێ بەبێ مۆلەت قەدەغە دەکات. کورد لە ولاتی

خۆشمان دەبێ بۆ مانەوە یان ڕۆشتنی بۆ شوێنێکی تری وڵاتەکەی مۆڵەتی هەبێ، ئیتر خۆ بە عەجەم کردنی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەو ناوچانە و بەفارس کردنی باشووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەرباس ناکرێت.

چارەنووسی عەشیرەتی (بروکی) کە پاش (١٩١٧) دەکەونە ئەم بەر و ئەو بەری سنوری دەستکردی نێوان سۆڤیەت و تورکیا واتە کوردستانی سۆڤیەت و تورکیا زۆر خەمبار و تراژیدیانەیە تا (١٩١٧) سنورەکانی ڕووسیا بە ڕووی عەشیرەتەکانی کوردا دانەخرابوو، بە دریژایی مێژوو ئەم بەر و ئەو بەری ڕووباری ئاراس هەوارگەی ئەو عەشیرەتە مەزنە و عەشیرەکانی تری کورد بووە.

نووسەر جێ و شوێن و هەوارگە و گوند و ژمارەی ماڵبات و هۆز و خێڵەکانی ئەم عەشیرەتە لەم بەروئەوبەری سنوورەکان دەنووسێت، ئاماژەش بەوە دەکات کە ئەو عەشیرەتە هەم لە لایەن تورکەوە و هەم لە لایەن ئەرمەنییەکانەوە تووشی ئازار و راونان و کوشتن بوون و دەبن، بۆ نموونەدەڵێ: لەساڵی (١٩١٩) لە گوندی شاروربێ لە ناوچەی گەنجە (١٥) خێزان بە دەستی داشناکەکان سەربڕان.

سیاسەتی کوردی دەوڵەتی بەلشەفیکی لە بڕیار یان دەستووری وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەوددەمەی سۆڤیەت دەردەکەوێ. چیچیرین لە ٤ی حوزەیرانی (١٩٢٤) بۆ پیترۆڤ بەرپرس یان کاربەدەستی کۆمێنترن دەنووسێ،و وێنەیەکەیشی دەنێرێ بۆ باڵوێزەکانی سۆڤیەت لە تورکیا و ئێران و هەروەها لەوانیشەوە بۆ کۆنسوڵەکانیان و کاربەدەستانی لەشکری و سیخوڕییان لەو وڵاتانەی کە کوردی تێدایە.

**ناوەڕۆکی ئەم بەڵگەیە بەم چەشنەیە:**

وتووێژەکانی ئێمە لەگەڵ ئینگلیز لە لەندەن پەیوەندی باشی ئێمە لەگەڵ تاران و ئانکارا و بارووددۆخی گشتی دونیا ئەمانە هەموویان بواری ئەوەمان نادەنێ خۆ لە کێشەی کورد بدەین. دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ دژی بەرژەوەندی ئێمە و ئێران و تورکیایە، بۆ دروست بوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد کە ئێمە ئەگەر پشتیوانی لێ بکەین (کە ناتوانین لەبەر نەبوونی ئیمکانیات) راستەوخۆ ڕووبەڕووی ئنیگلیز و تورکیا و ئێران دەبینەوە.

کوردەکان بەبێ یارمەتی ئێمە یا ئینگلیز ناتوانن بەو دەوڵەتە سەربەخۆیە بگەن، لە لایەکی تریشەوە کوردەکان بناغەیێکی ئابووریيان نییە کە بتوانن دەوڵەتی نەتەوەیی کوردی دروست بکەن. ئینگلیز لە دروستکردنی دەوڵەتێکی وا بەرژەوەندی هەیە و ئەم دروشمە هەر لە مۆنۆپۆلی سیاسەتی ئەودایە ئێمەش بەبێ ئەو ئیمکاناتە و ئەو پێگەیەی ئینگلیز لە ناو کورداندا هەیەتی ناتوانین لەگەڵیدا پێشبڕکێ بکەین.

پشتیوانی ئێمە لە کوردەکان بۆ ئەم مەبەستە دەبێتە پاڵپێوەنانێك بۆ تورکیا و ئێران کە بکەونە باوەشی ئینگلیز و تێشکانی سیاسەتی ئێمەی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست، بەدواوە دەبێت.

ئێمە ناتوانین کوردستانی سەربەخۆ بپارێزین و رابگرین، کە وابێ دەبێ کوردەکان بەخۆمانەوە نەبەستین و خۆبەستنەوە بە ناسیونالیزمی کوردی کارێکی پڕ لە مەترسییە. ناسیونالیزمیك کە ئێمە تائێستا هیچ باوەڕێکمان پێی نەبووە، ئێمە ناتوانین گەرانتی ئەوە بکەین کە ئەگەر یارمەتی کوردان بدەین سبەینێ سەرکردەکانیان ناگۆڕێن و بەرەو ئینگلیز ناچنەوە، ئەوەشمان لە بیرنەچێت کە ئینگلیزەکان بە پێچەوانەی ئێمە لەناو کوردەکان ئیش و کاری زۆریان کردووە، کەوابێت شانسی ئەوان زۆرترە تا کوردەکان بەرەو لای خۆیان راکێشن، راپەڕینی ئێستای کوردەکان چ سەرکەوتووبێ و چ شکست بێنێت تەنیا لە دەست ئینگلیزەکاندایە.بە لەبەرچاو گرتنی ئەو هۆیانە ئێمە دەبێ دەسبەجێ راپەڕینی کوردەکان راگرین و پێشنیاریان پێبکەن هەموو هێزی خۆیان بۆ رزگاری کوردستان لە دژی ئینگلیز یەك بخەن و لە ئینگلیزەکان دابڕێن و راپەڕینی خۆیان هەڵگرن بۆ بارودۆخێکی لەبارتری نێونەتەوەیی. دروست کردنی کوردستانێکی سەربەخۆ کاتێك دێتە دی کە بارودۆخی جیهانی ئاڵۆزببێت، لە کۆتاییدا دروشمی سەربەخۆیی بۆ کوردستان و خۆهەڵقورتاندن لە کێشەی کورد لە بەرژەوەندی ئێمە نییە و پێویستیشمان پێی نییە.

**چیچیرین**

وەڵامدانەوەی ئەم نامەیە یان ئەم سیاسەتەی سۆڤیەت تابڵێی دووروودرێژ دەبێت بەڵام هەم دیسان ناتوانم بەسەریدا تێپەڕم:

١- ئەو هەلوومەرجە ئاڵۆزەی دونیا کە وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت باسی دەکات لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم و شەڕی سارد و... دروست بوو، بەڵام دیتمان کۆمارە ساواکەی مهاباد چۆن بە نەوت فرۆشرا و لە لایەکی ترەوە کۆمەڵەی (ژ.ك) کە داوای کوردستانێکی سەربەخۆی دەکرد لە لایەن سۆڤیەتەوە هەڵوەشایەوە و کێشەی کوردیان هەر لە چوارچێوەی ئێران قەتیس کرد، جگە لەوەش سۆڤیەت بە درێژایی مێژووی خۆی هەرگیز لایەنگری دروشمی سەربەخۆیی کوردستان نەبووە.

٢- ئەو دروشم و پرنسیپانەی بەلشەفیکەکان هەر لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمیان وەك یارمەتی گەلانی چەوساوە و مافی چارەنووس و.... بەم نامەیە هەمووی گومانی لێدەکرێت.

٣- ئەم دەستوورە یان بڕیارە نهێنیەی مۆسکۆ بۆ ژێردەستەکانی خۆیان بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنانەن کە سۆڤیەتییەکان دەیان جار لە چاوپێکەوتنەکاندا بە سەرکردە و کەسایەتییەکانی کوردیان گوتووە ئەگەر دەست لە ئینگلیز بەردەن و دژی راوەستن ئێمە یارمەتیتان دەدەین. ئەمە گاڵتە کردن یا تاوانە بەرامبەر بە گەلێکی چەوساوە و دراوسێ و بێ کیانی کورد.

٤-گوایە تێکچوونی پەیوەندییەکانی سۆڤیەت لەگەڵ تورك و فارس بەهۆی خۆتێهەڵقورتاندنە لە کێشەی کورد و سەرئەنجام تێشکانی سیاسەتی سۆڤیەتە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لەندەن و مۆسکۆ دوای دەرچوونی ئەم بڕیارەی چیچیرین لە لەندەن رێککەوتن لەسەر ئەوەی دەست لە کاروباری یەکتر لە وڵاتانی ژێردەستیان وەرنەدەن، هەم لەناوچەکە هەم لە سەرتاسەری دنیا و دژی بەرژەوەندی یەکتر رانەوەستن. کەواتە تێشکانی سیاسەتی سۆڤیەت لەو ناوچەیە چ پەیوەندی بە کوردەوە هەیە!.

٥- ئەوە کێشەی کورد یا سۆڤیەت نەبوو تورکیا و ئێرانی خستە باوەشی ئینگلیز و رۆژئاوا، بەڵکو تورکیا و ئێران خۆیان بە پیریانەوە چوون، بەبێ ئەوەی سۆڤییەت روویان لێوەرگێڕێ یا یارمەتیان نەداو پشتیوانیان نەکا.سۆڤییەت دەستی لێبەرنەدان تا بەئاشکرا نەبوونە دوژمنی.

٦- دەڵێ کوردستان سەربەخۆ بێت بەدەست هەر لایەك بێت لەکۆتاییدا دەکەوێتە ژێر دەستی ئینگلیز.

٧- کوردەکان بناغەی ئابوورییان نییە بۆ سەربەخۆیی، ئەی ئەو گەلە رەش و رووتانەی ئاسیا و ئەفریقا کە هێشتا زۆربەیان (پاش دەیان ساڵ سەربەخۆیی) بناغەی ئابوورییان نییە و ئەگەر هەشیانبێ پتر لە نیوەیان برسی و هەژارن، چۆن گەیشتنە سەربەخۆیی. کەچی بە پێی زۆر فاکتەری مێژوویی ئەودەم و ئەمڕۆ کوردستان لە هەمو بارێك لە زۆربەیان باشتر بووە و باشترە.

٨- دەڵێ ئێمە توانامان نییە کوردستانی سەربەخۆ راگرین و پشتیوانی بکەین، خۆ کورد بە سەد یەکی ئەو چەك و تەقەمەنییەی (ئیتر باسی دراو و یارمەتی ئابووری و دیبلۆماسی و سیاسی ناکەم) سۆڤییەت دای بەکەمالییەکان، رزگاری دەبوو. لە ماوەیەکی زۆر کورتیشدا چاڵەنەوت و کانگا سروشتییەکانی تری کوردستان سەد قات یارمەتییەکەی بۆ سۆڤییەت قەرەبوو دەکردەوە.

٩- لە هەمووی خراپتر دەڵێ: کوردەکان لە راپەڕیندا ڕاگرین و دژی ئینگلیز هانیان بدەین، هەرواشیان کرد، پێش ئەوەی وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت جەنابی چیچیرین دەستووری سیاسەتی دەوڵەتەکەی بەرامبەر بە کێشەی کورد بنێرێت بۆ ژێردەستەکانی خۆی دەیان راپۆرت و نامە لەسەر کێشەی کورد دەگاتە دەستی، یەکێك لەوانە لە رێگای پاستۆخوفەوە کە بەرپرسی بەشی رۆژهەلاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت بووە. ئەم راپۆرتە پاش وتووێژی نووسەر واتە کۆلیکۆڤ لەگەڵ یەکێك لە سەرکردەکانی کورد بەناوی یوسف زیا بەگ نووسراوە. لەڕاستیدا راپۆرتەکە ناوەڕۆکی وتەکانی یوسف زیا بەگە کە لە (١٩٢٣/٥/٢٥) رایگەیاندووە. یوسف زیا بەگ سنوورەکانی کوردستان دیاری دەکات، بەلام کوردستانی رۆژهەلاتی وەبەر نادات و دەڵێ پاش رزگارکردنی کوردستانی تورکیا نۆرەی کوردستانی ئێران دێت، تەنانەت باسی کوردستانی باشووری ژێردەستی ئینگلیز و کوردستانی ژێر دەستی فەڕەنسا (سوریا)ی تێدا نییە. هەر چۆنێك بێ بیانوو ناداتە دەست، تا سۆڤیەت لە ئینگلیز و فەڕەنسا و ئێران بکاتە دوژمن و مەترسی بەرەنگار بوونەوەی دەوڵەتانی ناوبراو دروستبکات. فەڕەنسا و ئینگلیزیش هەر کام پارچەیەکی کوردستانیان لە ژێر دەستە و سۆڤیەتیش با بەشەکەی رووسیای قەیسەری بۆ بە میرات بمێنێتەوە.

سۆڤیەت بیانوو فاکتی بەدەستەوە بوو، دوور نەبوو فەرەنسا و ئینگلیزیش لەبەر دژایەتی تورکان بێ دەنگ بوونایە، خۆ قەل بە قەل نالێ رووت رەش، گرنگ ئەوە بوو وەك ستراتیجێك لاوازبوونی و پارچە-پارچە بوونی تورکیا بە قازانجی هەمووان بوو.

یوسف زیا داوای یارمەتی دەکات بۆ راپەرین لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستان و دەڵێ بارودۆخی راپەڕین کامڵ بووە ئەگەر یارمەتیمان نەدەن ناتوانین پێش بە راپەڕینی کۆمەلانی خەڵك بگرین، ئەوسا رابەرایەتی راپەڕین دەکەوێتە دەست خەڵکی تر. ئەمە بۆ خۆی ئاگادارییێکە بۆ بەلشەفیکەکان کە رەنگە جڵەو یا سەرکردایەتی راپەڕینەکە بکەوێتە دەست ئینگلیزەکان.

یوسف زیا باسی ئەوە دەکات کە کوردستانی سەربەخۆ هاوسنووری یەکیەتی سۆڤیەتە، واتە مەترسی تورك و ئینگلیز لە داهاتوودا بۆ سەر یەکیەتی سۆڤیەت لە خاکی کوردستانەوە نابێت، بەبێ ئەوەی یوسف زیا ئاماژەی پێبکات یا مەبەستی ئەوە بێت سۆڤیەت یا کوردستانی سەربەخۆ دژایەتی تورك بکەن.

یوسف زیا بەپێچەوانەی وتەی سەرکردەکانی تری کورد و خۆی ئەم جار دەڵێت: ئێمە جیابوونەوەی خۆمان لە ئۆپۆزسیۆنی تورك ناشارینەوە و لەم باردوە پێکهاتووین. لە وەڵامی پرسیارێکی کۆلیکۆڤ کە دەڵی چ سیستەمێکتان بۆ دەولەتی کوردی دەوێت؟، یوسف زیا دەڵێ وەك سیستمی ئێوە بەڵام دژی مەلا و شێخ نابین و باسی بیروباوەڕی کۆمۆنیستی ناکەین و پارتی کۆمۆنیستیش لە کوردستان دروست ناکەین.

پاشان دێتەسەر داخوازییەکانی زیا بەگ بۆ گەلی کورد کە شەش خاڵن، یەکێکیان کە سەرنج راکێشە ئەوەیە: سۆڤیەت پشتیوانی سیاسییان لێبکات و بەڵگەشیان نزیکبوونەوەی سۆڤیەت و ئینگلیزە کە وتووێژیان لە لەندەن بەردەوامە، داوا لە سۆڤیەت دەکەن داوا لە ئینگلیزە بکات کێشەی کورد لە کۆنفرانسی لەندەن بەرزبکرێتەوە، دەڵێ ئەگەریش پێویست بێت کورد خۆی نیشان بدات و کاربکاتە سەر کۆنفرانسەکە، ئامادەن دەست بەخۆپیشاندان و راپەرینی چەکدارانە بەکەن. بەڵام مەخابن بەلشەفیکەکان ئەم کارە مرۆڤانە، ژیرانە و بێ سەر ئێشەشیان نەکرد، هەتتا لە کۆنفرانسی لەندەن داوایان نەکرد تورکیا ئاشتیانە چارەسەری کێشەی کورد بکا.

لە بەڵگەکان نامەیەکی تر وەك لەسەرەتای لاپەڕەکەدا هاتووە، بروسکەی شێخ مەحموودە بە باڵوێزخانەی تورکیادا بۆ باڵوێزی ئەمەریکا و سۆڤیەت و ئەفغاستان و ئێران لەرێکەوتی(٥-١٩٢٤/٣/٧). باسی دڕندەیی و بێ ڕەحمی ئینگلیز بەرامبەر بە گەلی کورد و بۆمبارانی سلێمانی و راکردن و ئاوارەبوونی گەلی کورد دەکا و خوازیاری یارمەتییە لە دەوڵەتی ناوبراو بۆ راگرتن و پێشگیری سیاسەتی سەرکوتکەرانەی ئینگلیز دژی گەلی کورد. وەك لە وەرگێڕانەکەدا ئاماژەی پێکردووە دوورنییە ئەم نامەیە تورکەکان نووسیبێتیان، چونکە شێخ مەحموود لەو کاتەدا دەیتوانی نامەکان راستەوخۆ لە ئێران و تورکیاوە یان لە دەرەوە ئاراستەی باڵوێز یان کۆنسوڵەکانی ئەو ولآتانە و ولآتانی تر بکات، وەك ئاشکرایە دەوڵەتانی تورکیا و ئێران و ئەفغاستان و سۆڤیەت و تەنانەت ئەمەریکاش کە لەو سەردەمەدا لە ململانێ وسەنگەری دژایەتییەکی ئینگلیز دابوون، هەموویان جگە لە ئەمەریکا رۆڵێکیان لە سیاسەتی جیهانی و ناوچەکەدا نەبوو.

پرسیار ئەوەیە بۆچی تەنیا نامەکە ئاراستەی ئەو دەوڵەتانەکراوە؟ بۆ لە رێگای باڵوێزی تورکیاوە؟ بۆ لە نامەکەدا ناوی هەندێ کەسی تیایە کە کورد نین؟ تۆ بڵێی شێخ ئەم نامەیەی نووسیبێت بۆ ناحەز و نەیارەکانی ئینگلیز و زیاتر ئینگلیزەکان دژی خۆی و گەلەکەی هانبدات؟ یا ئاگای لەم نامەیە نەبووە؟.

راستە ئەوکات ئاشوورییەکان لە خزمەت سوپای ئینگلیزدا بوون و دژی تورکیا هانی دەدان هەواڵی نیشتەجێ کردنیان هەبوو لە بادینان و پاراستنی سنوورەکانی کوردستانی باشووریان لەگەڵ تورکیا پێ سپاردبوون،بەلآم هەواڵی هاتنیان بۆ سلێمانی نەبوو. پێموانییە ئاشوورییەکان لەو سەردەمەدا کە بە برایەتی و ئاشتی لەگەڵ کوردان بوون ئامادە بووبن هێرش بکەنە سەر سلێمانی. شێخ مەحموودیش ئەوەندە کورت بین و نەزان نەبووە تراژدیای ئاشوورییەکانی بە دەست تورك و عەرەب لەیاد بردبێ و هەستی بە مەترسی لە لایەن ئاشوورییەکانەوە نەکردبێت و حسابی گەلی ئاشوری لە چەکدارەکانی ژێر سەرکردایەتی ئینگلیز جیانەکردبێتەوە، لە لایەکی تریشەوە لەبەر خاچپەرەستی دونیای رۆژئاوا کە ئاشوورییەکانیش هاودینیانن، کێشە بۆ خۆی و گەلەکەی دروست بکات.

سەرەڕای بۆچوونەکانی من یان بەپێچەوانەوە راپۆرتێکی تر بە دوای نامەکەی شێخ مەحموددا هاتووە لە زمانی کابرائێکی موسلآوییەوە دەگێڕێتەوە: باسی بێ ڕەحمی و تاوانی ئاشوورییەکان

دەکا لە کەرکوك و سلێمانی، لەوانە هێرش بۆ سەر حەمامی ژنان و بردنی زێر و زیویان و دەست درێژی بۆ سەرناموسیان.

هەڵوێستی سۆڤیەت بەرامبەر سەربەخۆیی یا دامەزرانی دەوڵەتێکی کوردی لە رۆژنامە رەسمییەکانی سۆڤیەتیشدا رەنگی داوەتەوە، گوایە کوردستان هەمیشە پێگەی سیخورەکانی ئینگلیز بووە، کورد و کوردستانیان کردۆتە چەکێك بۆ دژایەتی تورکیا و ئێران و سۆڤیەت. بڕوانە ئیزڤیستیای ۳۱ی ئابی۱۹۲٤.

لە راپۆرتێکی تردا باسی رۆڵی زۆر زووی شێخ عەبدولقادر لە ناو کوردەکاندا دەکات و دەڵێ ئێستا تورکیا خزمەتی ناوبراو دەکا و بەشان و باڵیدا هەڵدەڵێ بەڵام کە راپەڕین، بێگومان شێخ عەبدولقادر لایەنی کوردەکان دەگرێت و دەبێتە یەکێك لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی کورد. نووسەر پێش بینی دەکا کە تورکەکان ناوبراو لەناو دەبەن. هەرواش بوو.

راپۆرتێك لەسەر کۆنفرانسی ئەستەنبوڵ سەبارەت بە کێشەی موسڵ پاش کۆنفرانسی لۆزان پەیوەندی نێوان ئینگلیز و تورکیا و کێشەی کورد و سیاسەتی سۆڤیەتی دەخاتە روو دەڵێ: ئێستا ئینگلیزەکان جیا لەوەی ناهێڵن تورکیا چی تر لەسەر بەعێراقەوە لکاندنی موسڵ و کەرکوك و سلێمانی کێشەیان بۆ دروست بکات، داوای جیاکردنەوەی سێ سەنجاقی ناوچەی هەکاریش دەکەن کە لە تورکیا جیاببنەوە یا بخرێنە سەر عێراق یا ئەوپەڕەکەی لەوێ دەوڵەتێك بۆ ئاشورییەکان دروست بکەن، دەڵێ ئەم سیاسەتەی ئینگلیز جدی نییە زیاتر دەیەوێ گوشار بخاتەسەر تورکیا. لە لایەکی تر دەنووسێ: جێ پێکەنینە بیر لە دروسکردنی دەوڵەتێکی ئاشوری بکرێتەوە لەناو کورداندا.

دەڵێ ئینگلیزەکان گەلێك پیلانی تریان بە دەستەوەیە وەك رێکخستن و پشتیوانی کردنی بزووتنەوەی لوڕستان و خوزستان (ناوچەی ئەهواز لەئێران)، تا لەوێوە دەستیان بگاتە سەر دەریا و رۆژهەڵات و پاشانیش دەست بەسەر کوردستانی باکوور دابگرن کە مەترسی دەبێت بۆ سەر سۆڤیەت.

نامەکە رەخنە لە کاربەدەستانی سۆڤیەت دەگرێ لەسەر کێشەی موسڵ، گوایا بۆ ئەوەی نەهێڵن موسڵ بکەوێتە ژێر دەستی ئینگلیز بە گوێرەی پێویست هەوڵیان نەداوە و کەمتەر خەم بوون یا بە واتایەکی تر دۆڕاندویانە لە هەمانکاتدا هەوڵیان نەداوە بشگەڕێتەوە بۆ تورکیا. دەڵێت دەست بەسەرداگرتنی موسڵ لە لایەن ئینگلیزەکان وەك ئەوەیە ئینگلیز لە قەفقاز بێت.

لە درێژەی ڕاپۆرتەکەدا دەڵێ: ئێمە، واتە سۆڤیەت هەمیشە ئامادە بووین بە ئاگاداری و نیازی پاکەوە هەموو چەشنە پێشنیارێکی دەوڵەتی تورکیا بۆ چۆنیەتی بەشداری و یارمەتی دانی ئەنقەرە لەمەڕ کێشەی موسڵ پەسند بکەین. وێڕای ئەوەی تورکیا لەم هەڵوێستەی ئێمە ئاگاداربوو، دەبینین لە ژێرەوە یاریمان پێ دەکات کە تا ئێستاش پێی کردووین، جگەلەوەش ئاگاداری نەکردووین نیاز و پیلانی چییە و تاکوێ ئامادەیە بەرامبەر ئینگلیزەکان پاشەکشێ بکا، پێی نەوتووین بە پشتیوانی و یارمەتی کێ دەیەوێ ئەم کێشەیە چارەسەر بکا تا ئێمەش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کاربکەینە سەر ئەو لایەنانە و لە کۆمەڵگای نەتەوەکان لەسەر کێشەی موسڵ یارمەتی تورکیا بدەین. وەك دەبینین بەلشەفیکەکان ئامادەی هەموو هاریکارییەکی کەمالییەکانن، بەڵام وادیارە ئەوانە نە پرسیان بە سۆڤیەت کردووە نە داوای هاوکاری و پشیتوانییان لێکردوون نە گوێ ڕایەڵی پێشنیارەکانیان بوون. زلهێزێکی وا ئەوەندە بوودەڵەو بێ توانای سیاسی بێ پاش ئەو هەموو یارمەتیدانەی، سەربازی، دروای، ئابووری، سیاسی و دیبلۆماسی، جێی داخ و سەرسوڕمانە.

لەناو بەڵگەکاندا هەندێ ڕاگەیاندنی کورت هەیە کە یەکێك لەوانە کۆنسۆڵی سۆڤیەت پاش چاوپێکەوتن لەگەڵ(.......!) خواحافیزی لێ ناکات سەرەڕای هەڵوێستی نادۆستانەی تورکان لەگەڵ سۆڤیەت کۆنسۆڵی سۆڤیەت دەڵێ زۆر شت هەیە ئێمە و تورکەکان بە یەکەوە دەبەستێتەوە و لە هەمان کاتیشدا ئەم پێکەوە بەستنەش دژی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی فارس نین. لە ڕاپۆرتێکی تر باسی ناردنی قورئان و دیاری و وێنەی کەمال ئاتاتورك دەکا بە ئیمزای خۆی، بۆ سەرۆك هۆز و خێڵ و عەشیرەتەکانی کورد کە لە ناوچەکانی ورمێ و ماکۆ دەژین. فرِوفێڵی تورك و مەبەستی کەمال لەم کردەوەیەدا شاراوە نییە.

لە ڕاگەیاندنێکی تر کۆنسۆڵی سۆڤیەت لە ورمێ باسی جموجۆڵی کاربەدەستانی ئێران دەکات لەناوچەی ورمێ و دەیانەوێ کوردەکان بیر لە شەڕی شێخ خەزعەل نەکەنەوە کە دەیەویست ناوچە عەرەب نشینەکانی باشووری ئێران لە ئێران جیاکاتەوە و وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ یا دەڵێن بە تەمابوو بە عێراقەوەی بلکێنێ. ماوەیەکی زۆر بە یارمەتی ئینگلیزەکان ناوچەکە لە ژێر کۆنترۆڵ و بەڕێوەبەری شێخ خەزعەل دەبێ، تارژێمی تاران لەگەڵ ئینگلیز ڕێك نەکەوێ تێکڕای شەڕ و هەوڵەکانی ئێران بۆ سەرکوت کردنی شێخ خەزعەل بێسوود دەبێت،ئەوسا کۆتایی بە دەسەڵاتی شێخ خەزعەل دێت. ڕژێمی ئێران بۆ شەڕ لەگەڵ شێخ خەزعەل لەسەرانسەری کوردستان بە زۆرەملێ هێز کۆدەکاتەوە.شێخ خەزعەلیش نامە بۆ سەرکردەکانی

کورد دەنوسیٚ و دەڵیٚ: سەربەخۆیی کوردستان لە کۆنفرانسی ڤێرسای دابین کراوە ئێوەش سەربەخۆن منیش لە خەباتمدا دژی دەوڵەتی تاران خەبات بۆ سەربەخۆیی ئێوەدەکەم. کوردەکانیش بەپێی راگەیاندنەکە نایانەوێ بچن بۆ شەڕی شێخ خەزعەل، بەڵام دیارە ژمارەیەك بە زۆر دەنێرن بۆ ئەهواز و ئابادان و ئەوانیش یا شەڕ ناکەن یا هەڵدێن.

مانەوەی شێخ قادر برای شێخ مەحموود لە سلێمانی پاش دەرچوونی شێخ مەحموود و رۆیشتنی بەرەو کوردستانی رۆژهەڵات لەگەڵ سەید تەها کە هیوایان بە ئینگلیزەکان هەر دەمێنیٚ، لە لایەن کاربەدەستانی ئینگلیزەوە بەرێوبەرایەتی هەندێ ناوچەی کوردستانیان پیٚ دەسپردریٚ و پشتیوانییان لیٚ دەکرێت. دوایین راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ورمیٚ چەند هەواڵێکی تێدایە دەڵیٚ: هەوڵی کاربەدەستانی سوپای ئێران بۆ راکێشانی کوردەکان و ناردنیان بۆ شەڕی شێخ خەزعەل سەرکەوتوو نەبوو.ئەوەی سەرنج راکێشە و گرنگە لەبەڵگەکەدا ئەوەیە: ئەمیر لەشکەر کاربەدەستی یەکەمی رژێمی تاران لەناوچەکە بە کۆنسوڵی سۆڤیەت دەڵیٚ ئێمە پێشوو نەماندەتوانی ئەم ناوچەیە چۆڵ بکەین نەك هەر سوپای خۆمان بەڵکو کوردەکانیش بنێرینە باشووری ئێران، بەڵام ئێستا دڵنیاین، چونکە سۆڤیەت دراوسێمانە. ئەم وتەیەی ئەمیر لەشکەر جارێکی تر هەڵوێستی سۆڤیەت بەرامبەر بە رژێمەکەی ئێران و کێشەی کورد دەردەخا و ئەوە دەگەێنیٚ دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت بەڵێنیان بە رژێمی ئێران داوە کە لە ئاست سۆڤییەت بەرامبەر بە کێشەی کورد هیچ نیگەران نەبن. سۆڤیەت بەکردەوەش هەروای کردووە، چونکە کوردستانی سەربەخۆ بۆ ئەنقەرە و تاران و مۆسکۆ وەك یەك مەترسی هەیە و دەبێتە پێگەی ئیمپریالیزم. دەبیٚ راپەڕینی کوردان لە دژی تاران و ئەنقەرە رابگرین، بەهۆی کۆمیتە کوردییەکانی کوردستانی باکوور شێخ مەحموود لە ئنیگلیز دابڕپن و بزووتنەوەی کورد دژی ئینگلیز هانبدرێت.....

دیارە کۆنترۆڵی ناوچەکە، دەنگوباس، پەیوەندی کوردەکان بە کۆنسۆڵەکانەوە، نیاز و پیلانی داهاتوویان هەمووی گەیندراوە بە کاربەدەستانی رژێمی ئێران. سۆڤیەتییەکانیش لە هاندانی رژێمی ئێران بۆ ناردنی کوردەکان دژی شێخ خەزعەلی سەر بە ئینگلیز دەوریان هەبووە، بۆیە بە دڵنیاییەوە رژێم نەتەنیا ناوچەکە چۆڵ دەکات و هێزەکانی خۆی دەنێرێت بۆ باشووری ئێران بەڵکو داواش لە کوردان دەکا بەشداری ئەو شەڕە بکەن. راگرتنی کوردەکانی باکووریش (تورکیا) کە دژی کەمالییەکان راپەڕین هەر ئەنجامی ئەو سیاسەتە بووە، بۆیە کەمالییەکان هێزەکانی خۆیان دەنێرنە باشووری کوردستان. ئەگەر لە کوردستانی باکوور راپەڕین و خەبات

بەردەوام بوایە ئایا رژێمی لاواز و تازە پێگرتووی کەمالییەکان دەیوێرا لەشکەری خۆی بنێرێتە کوردستانی باشوور؟ بێ گومان نەخێر. لە راپۆرتەکانی پێشوودا ئامۆژگارییەکانی دەسەلآتدارانی سۆڤیەت بۆ خالید بەگی جەبرانلی و یوسف زیا بەگ کە نابێ دژی رژێمی کەمال ئەتا تورك راپەڕن و بەوردی باسکرا و ئەمە تەنیا بۆ وەبیرهێنانەوە بوو.

بایەخی تری ئەم بەلگەیە دانپیانی ئەمیر لەشکەر و تاوانی دەولەتەکەی بەرامبەر بە کوردانە، دەلێ: کوردەکان بۆ خۆیان هاوولاتی باشن، ئەگەر لە رابردوودا کوردەکانیان بە خائن و رێگر و پیاوکوژ داناوە، تاوانبار کوردەکان نەبوون بەلکو کاربەدەستانی دەولەت بوون. کاربەدەستانی دەولەت جگەلەوەی دەیانچەوساندنەوە تالآنیان دەکردن و بەرتیلیشیان لێوەردەگرتن. یەکێك لەو کاربەدەستانەی دەولەت بۆ ئەوەی ببێتە ئیلخانی کوردەکان، (٣٠) هەزار تمەن بەرتیل دەدا بەناوەندەی دەسەلآت لە ناوچەکە کاتێك دەیکەن بە ئیلخان و دێتە ئەو دەڤەرە لە ماوەیەکی کەمدا سەد هەزار تمەن بەرتیل لە کوردەکان وەردەگرێت و لەناویاندا ئاژاوە دەنێتەوە و پاشان بروسکە بۆ تاران دەکات کە کوردەکان راپەڕیون، دەولەتیش باوەڕ دەکاو مووچەیەکی باش بۆ خۆی و ژن و منالەکەی دەنێرێت.... لە کۆتاییدا دەلێ ئەگەر بە باشی لەگەلّ کوردەکان جولآبایەنەوە نیشتمان پەرەستی یان دەردەکەوت، من بۆ خۆم وەك مرۆڤێکی ساکار چوومە ناو کوردەکان ئەم راستییەم بۆ دەرکەوت.

## کوردستان- سمکۆ

دوای تێکشکانی ئێران لە (١٨)ی کانوونی یەکەمی (١٩٢١) سمکۆ دووبارە خەتی شکەیازسوی و حاجی قزلچەی گرت و رێگای خۆی-جۆلفای کردەوە. ئینگلیزەکان بە ئاشکرا پشتیوانی سمکۆ دەکەن، یەك تیرباری کوێستانی و (١٢) رەشاش وسێ ماشێنی سوارییان داوەتێ. «لە پیرس بولیتوی ژمارە (١) سالّی (١٩٢٢) ل (١٧) وەرگیراوە».

ئینگلیزەکان دژی راگەیاندنی سەر کۆمار بوونی سەردار رەشید خان نین لە ناوچەی کرماشانی کوردستان، دووریش نییە ناردنی (١٥٠) نەفەر لە هێزەکانی ئینگلیز بۆ قەسری شیرین هەر بەو مەبەستە بێت «پیرس بولیتون ژمارە (٣) سالّی (١٩٢٢)».

## سوپای نێردراوی ئێران دژی سمکۆ

هێزەکانی دەوڵەتی ئێران بە سەرکردایەتی یاوەر ئەحەمد ئاغا لە تارانەوە نێردراون بۆ تەورێز بۆ بەربەرەکانی سمکۆ.

لە (١٥)ی دیسامبەری (١٩٢٢) قەزاقەکان بەبێ شەڕ.سابلاخیان گرت، لە لای شەرەفخانە هێزەکانی دەوڵەتی گوندی ستراتیژێکی شەکریازیان گرت.

هەروەها هێزەکانی ژاندارمری کە ژمارەیان هەشت سەد نەفەربووە بە یارمەتی هێزەکانی تری ئێران بەرەو جادەی خۆی-دیلەمان بەری کەوتوون تا لەگەڵ هێزەکانی سەردار ئەرشەد یەك بگرنەوە. هێزەکانی سەردار ئەرشەد کە ژمارەیان (٣) هەزار چەکدار بوو بەرەو رۆخەکانی گۆلی ورمێ کەوتوونەتە رێ و شەش سەد نەفەریان شاهەندی سوارەن.

دەستە چەکدارەکانی ئەرمەنی-ئاشوریش کە ژمارەیان (٢٥٠) نەفەر دەبێت لای چەپی رۆخەکانی گۆلی ورمێ یان گرتووە. هێزی سەرەکی سەردار ئەرشەد ئێوارەی (١٩٢٢/٢/١٧) گەیشتە گوندی ئالمی ساروی، سەردار دەیەویست شەو لەوێ بمێنێتەوە بۆ ئەوەی سبەینێ هێرشەکەی خۆی درێژە پێ بدات، پێشڕەوی هێزەکانی سەردار ئەرشەد تووشی(٦٠) چەکداری کورد دەبن کە بەبێ شەڕکردن بەرەو دیلەمان پاشەکشێ دەکەن. سمکۆ تا دوو هەزار چەکدار لە هێزەکانی خۆی لە گوندی سۆخیانا لە (١٠) فەرسەخی باکوور- رۆژهەڵاتی دیلەمان کۆدەکاتەوە و شەوی (١٧ لەسەر ١٨)ی کانوونی یەکەمی(١٩٢٢) هێرشی کردە سەر هێزەکانی ئێران کە خەریکی پشوودان بوون، هاوکات هەشت سەد سواریش دەنێرێتە سەر بەرەی ژاندارمەکان. هێرشەکە هێندە چاوەڕوان نەکراو و گورج و گۆڵ بوو سوپای ئێران لەگەڵ سوارە خانەکان هیچ بەرەنگارییەکیان پێ نەکراو لە ترسان و بەپەلە بەرەو شەرەفخانە هەڵهاتن. لە شەڕی دەستەکانی خان لەگەڵ چەکدارانی کورد لە لای ئالمی سەرای، سەردار ئەرشەد دەکوژرێت. دوای کوژرانی سەردار ئەرشەد هێزەکانی دەوڵەت بەگشتی تێکشکان و لێك بڵاوبوون، بەشێکیان چوونە قەرەداد و هەندێکیشیان لە شەرەفخانە مانەوە. لەسەدا (٢٥)ی هێزی ژاندارمیری لەوانە (٧) ئەفسەر لەناوچوون و بەرەو سۆفیان پاشەکشەیان کرد، دەستە چەکدارەکانی ئاشوری-ئەرمەنیش بڵاوەیان پێکرا، و بەشێکی کەمیان لەگەڵ گروپێکی کەمی ژاندارم لە رێگای سۆفیانەوە خۆیان گەیاندۆتە شەرەفخانە.

سمکۆ هێزەکانی دەوڵەتی لە ئوغلی سەرای و شەکریازی تێکشکاند و بڕستی لێبڕین، سمکۆ شاری خۆی نەگرت و نامەی بۆ دانیشتوان نووسی کە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ سەرداری ماکو هەیە و نایەوێ داگیری بکات. ئێستا لە شاری خۆی (١٥٠٠) چەکداری سەرداری ماکۆی لێیە و دەوڵەت خەریکە هێزەکانی شەرەفخانە بە هێز بکات و دەکرێ بڵێین هێزەکانی دەوڵەت لە شەرەفخانە بەم چەشنەیە:

نزیکەی هەزار قەزاق و سەربازی لێیە، (٥٠٠) چەکداری ئاشوری-ئەرمەنی تێدایە، دوو سەد چەکداری تریشیان بۆ بە هێزکردنی هێزەکانی ئێران دوای تێشکانیان ناردۆتە ئەوێ کە ڕەق و رووت ماونەتەوە.

بەهێزکردنی ئەو بەرەیە زۆرتر لەسەر پێ داگرتنی هاورێ دومییس بووە. شاهسەوەندەکان هەموویان ئەو بەرەیان بەجێهێشت و گەڕانەوە ماڵێ و١٠ی شوباتی (١٩٢٣) سمکۆ سابلاخی گرت و بۆ جاری دووهەم تالانی کرد.

## سمکۆ

بارودۆخی سمکۆ بەهۆی راپەڕینی لاهوتی خان زۆر بەهێزبووە، بەم چەشنە ئازەربایجان بوو بە ناوەندێکی گەورەی سیاسی ئینگلیزەکان کە بە یارمەتی ئەو دەتوانن ئازەربایجان بە پەرت و بەلاو بوو جێبهێڵن و یارمەتی هێزەکانی دژی شۆڕش بدەن دژی کۆمارەکانی سۆڤیەت، سمکۆ بە تێکشکاندنی هێزەکانی دەوڵەتی لە شەرەفخانە رازی نەبووە و هێرشی کردۆتە سەر سابلاخ و ساین قەلا و میانداویشی گرت. بەم چەشنە مەترسی خستۆتە سەر ناوچەی مەراغە کە ناندەر و ناوچەی بەرهەمی گەنمی ئازەربایجانە،بە لەدەستدانی، تەورێز دەکەوێتە بەر مەترسی برسییەتی.

لەبەر ئەم مەترسیە گەورەیە دوور نییە دەوڵەتی ئێران لەگەڵ سمکۆ بکەوێتە وتووێژ (ئەگەر بێتوو نەتوانێت هێزێکی پێویست بۆ بەربەرەکانی سمکۆ کۆبکاتەوە)[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٤.

## ئینگلیزەکان

نۆئیل ئەفسەرێکی ئینگلیزی لەگەڵ چەند سیخوری تری ئینگلیز بۆ یەکخستنی عەشایرەکانی بەختیاری و لوڕ و کورد هەوڵێکی زۆر دەدەن، مەبەستی ئینگلیزەکان لە راپەڕین دژی دەوڵەتی ناوەندی ئێران و جیاکردنەوەی کوردستانە لەفارس. ئینگلیزەکان دەیانەوێ هەندێ لەو لوڕانەی لە بەغدان چەکدار بکەن و بیاننێرێنە کوردستان و لەگەڵ ئەو عەشایرە کوردانەی پێشتر چەکدارکراون و سەرۆکی عەشیرەتی کەڵهور ئەمیر ئەلعزم (امیر العظیم) و سولیمان خانیش بۆ رێکخستنی راپەڕین دژی دەوڵەتی ناوەندی ئێران، پەلە بکەن[1].

## بەرەی دژی سمکۆ، مارتی (١٩٢٢)

رەزاخان بایەخیکی زۆری بەو هێزەی سوپای ئێران داوە کە دژی سمکۆ لە شەڕدان. ٢٠ی مارتی (١٩٢٢) هێزێکی هەزار و پێنسەد نەفەری و(٨) تۆپخانەی لە تارانەوە ناردۆتە تەورێز، چاوەڕێش دەکرێ هێزێکی هەزار و دووسەد نەفەریش لە هەمەدانەوە بگەنە ئێرە، فەرماندەی هێزەکانی سابلاخ دراوەتە دەست خالۆ قوربان، هێزی خالۆ قوربان دوو هەزار جەنگاوەرە، سەر بە لەشکەر نین.

فەرماندەی بەرەی شەرەفخانەش خراوەتە ئەستۆی ژەنەراڵ سەفەرالدولە، لەم بەرەیەدا و لە شاری (خۆی) دەستەکانی قەزاق جێگیرن کە ژمارەیان سێ هەزار و پێنسەد کەسە و سوارەی خانیان تێدانییە. بەپێی هەندێ زانیاری سمکۆ چوار تۆپی چاککراوە لە سیستمەی شنایدەر و پانزە رەشاشی هەیە گوندەکەی بە شەبەکەی تەلەفۆنەوە گرێ داوە، سابلاخی نەگرتووە. دەوڵەمەندەکان یان خۆش گوزەرانەکانی میاندواویش هەڵاتوون بۆ تەورێز[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٩.

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٧.

# ڕەشنوسی ڕاپۆرتی کۆنسۆڵی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم

**هاوڕێ پاڤلۆڤسکی**

**لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢**

## کێشەی کورد (مێژووی بزووتنەوەی کورد)

بەوتەی سەرکردەیەکی کورد بەناوی خالد بەگ بزووتنەوەی کورد لە ژێر دروشمی «کوردستانی ئازاد» لە سەردەمی پێکهێنانی دەوڵەتی موستەفا کەمال بەم شێوەی خوارەوە دەستی پێکرد:

لە (١٩١٨) کاتێك بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی لە ئانادۆل دەستی پێکرد بەشێك لە ڕووناکبیرانی کورد بە دانانی مەرج بۆ پێکهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان چوونە ڕیزی ئەو بزووتنەوەیە. لە کۆبوونەوەیەکی نهێنیێ ڕێبەرانی کورد لە ئەرزەڕۆم بڕیاریادرا، یارمەتی شۆڕشگێڕانی تورکیا بدرێت و ئەگەر دەوڵەت دان بەمافی سەربەخۆیی گەلی کورد دانەنێت لە هەموو ناوچەکانی کوردستان ڕاپەڕین ڕابگەیێندرێت. ئەم بڕیارە بە یەکێك لە سەرکردەکانی کورد بە ناوی سمکۆ سپێردرابوو کە جێبەجێی بکات، لەم کاتەدا لە ژێر کارتێکردنی دەنگوباسی شۆڕشەکانی تورکیا و ڕووسیا ژمارەیەك لە کوردەکان لە گۆڕان و دوو دڵی دابوون، بەپێچەوانەی بڕیاری کۆنگرە کە پێکەوە لەگەڵ شۆڕشگێڕانی تورك هەنگاو هەڵگرن، سمکۆ بڕیار دەدات پێشنیاری ئینگلیزەکان سەبارەت بە یارمەتیدانی بۆ گەیشتن بە «کوردستانی سەربەخۆ» و ڕزگاربوون لە دەست زوڵم و زۆر و دیکتاتۆرییەت پەسەند بکات. پاشان دوای چەند جار وتووێژ لەگەڵ فەرماندەی سوپای تورك و ڕوونکردنەوەی دەوری ڕاستەقینەی ئینگلیز، کوردەکان بە سەرۆکایەتی سمکۆ لە فارس ڕاپەڕین بۆ جێبەجێ کردنی دوو ئەرك:

یەکێکیان ڕزگاربوون لە دەست ڕژێمی فارس و دووهەمیان جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکە بوو کە تورکەکان نەخشەیان بۆ کێشا بوو ئەویش تێکدانی ئەو دەستە چەکدارە ئاشورییە بوو کە ئینگلیزەکان پێکیان هێنابوو.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی دووهەم سمکۆ لە بەرامبەر سوپای ئێران بەسەختی تێکشکا و رایکرد بۆ ناو خاکی تورکیا. لێرەش قەناعەت بە سمکۆ کرا کە نابێ باوەڕ بەم دەوڵەتەی ئێستا بکا، چونکە بەپێچەوانەوەی بەڵێنەکانی فەرماندەی گشتی هێزەکانی تورك (کە لە دەستەی سنوور پارێزانی وان و بەشەکانی تر پێکهاتبوو)، ویسال بەگ دەیەوێت سمکۆ بگرێت و تەسلیمی دەوڵەتی فارسی بکاتەوە، دەستگیرکردنی سمکۆ سەری نەگرت و دوای شەڕێکی سەخت کە سمکۆ (٥٠) کەسی لێکوژراو رای کردە سلێمانی و دیسانەوە کەوتە ژێر رکێفی ئینگلیزەکان.

ئەمە کورتە مێژوویەك بوو خالید بەگ باسی کردووە. دوایین وتە خالید وتی سیاسەتی دووفاقی سمکۆ لەبەر باروودۆخی کوردەکانە، گەرچی سمکۆ لای سەرکردەکانی کورد خۆشەویست و جێی رێزە و هتد.... بەڵام بۆ خۆی وەك کەسایەتییەك بچووکە ئەگەر سمکۆش بمرێت بیروباوەڕی «کوردستانی سەربەخۆ» هەر دەمێنێت. ئێستا لە ئەرزەڕۆم کۆمیتەیەکی تری کوردی پێك هاتووە پەیوەندی لەگەڵ سۆسیالیستەکانی توورك هەیە کە لە بەرنامەیاندا ئۆتۆنۆمییان بۆ کوردستان پەسەندکردووە. سەرۆکی ئەم کۆمیتەیە خالید بەگە، ئەو خۆی سەرۆکی عەشیرەتی جەبرانلییە و لە بنەماڵەی حوسێن پاشایە، خالید بەگ نازناوی ئاپۆ (مامە) خالیدە و لەبارەی کۆمەڵایەتییەوە رێزێکی لەناو کوردان هەیە، هەڵسوکەوتی ناوبراو و کوردەکانی سەر بە خالید، بەستراوەتەوە بە سیاسەتی داهاتووی دەوڵەتی تورکیا دوای شەڕی تورکیا و یۆنان.

لە کۆتایی چاو پێکەوتنەکەدا خالید وتی: زۆر دەوڵەمەندە و دەتوانێ لە ئەورووپا بژیت و لەو بارەوە کەموکوڕی نییە، بەڵام چارەنووسی گەلەکەی کە دەبێ هەر رزگاری بێت و پێش بکەوێت هانی دەدات لێرە بمێنێتەوە و بۆ نزیك بوونەوەی کاتژمێری رزگاری دەسبەکاربێ و چالاکی بنوێنێ[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٦٤-٦٣.

## بۆ: نوێنەری یەکیەتی سۆڤیەت لە ئەنقەرە هاوڕێ ئارلوڤ

**٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٢٢**

**کورت کراوەکەی (وەرگێڕ)**

باسی شێخ عوبەیدولا و شۆڕشەکەی لە (١٨٨٠) و کوڕەکەی شێخ عەبدولقادر و پاش وی شێخ عەبدولڕەزاق و سەید تەها و پاشان دێتە سەر شۆڕشی سمکۆ وجێگرەکەی جەعفەر ئاغای برای کە نامەردانە لە تەورێز دەکوژرێت.

دەوڵەتی سمکۆ لە سەرەتای شەڕی جیهانی یەکەمدا دژی رووسەکان شەڕ دەکات و پاش ئەوەی رووسەکان تا موسڵ پێشڕەوی دەکەن لەگەڵیان پەیوەندی دەگرێت و دەکەوێتە وتووێژ، سمکۆ پێشنیار بەرووسەکان دەکا ئەگەر چەك و تەقەمەنی نوێ بۆ جەنگاوەرەکانی دابین بکەن و مانگانەش هەزار روبڵ بدەن هاوکاری رووسیا دەکات. رووسەکان ئەم مەرجانەی سمکۆ پەسەند دەکەن و سمکۆ بۆ چەند مانگێك دژی تورکەکان شەڕ دەکات، بەڵام چەند جار لە نێوان تورك رووسەکان ئەم بەرو ئەو بەر دەکا. دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر قورخانەی چەکەکانی (سۆڤیەت) لە شەرەفخانە تالان دەکات و دەچێتە چەهریق قەڵا.

سمکۆ لە (١٩١٨) و (١٩١٩)لە ئینگلیزەکان نزیك دەبێتەوە و یارمەتییان لێوەردەگرێت. لە ساڵی (١٩٢٠) دەوڵەتی ئێران بۆ سەرکوتکردنی سمکۆ هێزێکی زۆر لەگەڵ قەزاقەکانی رووسیا بە فەرماندەیی فیلیپۆڤ دەنێرێتە کوردستان، دەکرێ بڵێین سمکۆیان تێکشکاند. بەڵام بە دەست تێوەردانی ئینگلیزەکان لە رێگای سەرۆك وەزیرانی ئێرانەوە کە لایەنگری ئینگلیز بوو پێش بە درێژەی هێرشی قەزاقەکان دەگرێت. سمکۆ لە ١٩٢١یش لەلایەك لە ئینگلیزەکان و بەنهێنیش لە رێگای فەرماندەی بەرەی رۆژهەڵاتەوە واتە کازم قەرەبەکر، یارمەتی لەتورکیا وەردەگرێت، ئەم یارمەتییە دوولایەنە، دژی یەکتربوون.

کازم بەکر بەپێچەوانەی سیاسەتی تورکیا ئەم کارەی دەکرد، چونکە دەیەویست ئاژاوە لە سنوورەکاندا هەبێت یا بەرەی رۆژهەڵات کە بڕیاربوو بگوازرێتەوە بۆ شوێنی تر، سەر نەگرێت. تورکان توانییان کوردەکان دژی ئەرمەن هان بدەن. لەساڵی (١٩١٩) کاتێك کە ئینگلیزەکان لە

کوردستان چوونەدەر ژمارەیەك ئەرمەنی و ئاشورییان لەگەڵ خۆیان بردە موسڵ و بەغدا. هێزی چەکداریان لێدروست کردن کە بوو بە هۆی مەترسی تورکیا لە سەر سنوورەکانی باشوور، (فەرماندەکانی هێزی ئاشوری و ئەرمەنی ئەفسەری ئینگلیزبوون) تورکەکانیش بڕیاریاندا یارمەتی سمکۆ بدەن.

لە ئابی (١٩٢٢) هێزەکانی دەوڵەتی ئێران چاریق (چەهریق) دەگرن و سمکۆ رادەکاتە تورکیا. سەرەتای‌کانوونی یەکەم دەگەڕێتەوە کوردستانی ئێران و دەکەوێتە وتوویژ لەگەڵ دەوڵەتی ئێران و گوێڕایەڵی خۆی بەرامبەر بە دەوڵەتی فارسان و خزمەت کردن لە ریزەکانی سوپای ئێران رادەگەیەنێ. بەڵام دەوڵەتی ئێران باوەڕی پێ ناکات و پێی دەڵێ خزمەت لە ریزەکانی سوپای ئێران دەبێ بەبێ چەکدارەکانی بێ. سمکۆ پەسەندی ناکات و وتووێژەکە سەر ناگرێ و دیسان دەگەڕێتەوە تورکیا و لە گوندی (قەرەحسیار) لە ماڵی ژن براکەی بە ناوی (سادو بەگ) دەمێنێتەوە و پێدەچێت دووبارە کەوتبێتەوە وتوویژ لەگەڵ دەوڵەتی تورك.

تورکەکان کە لە ناوچەی موسڵەوە هەستیان بە مەترسی دەکرد و دەیانویست سمکۆ ناچار بکەن هاوکاریان بکا دژی ئینگلیز، بەڵێنی زەوی و زار و هەموو چەشنە پێداویستیەکی ژیانی پێدەدەن. لەوانەیە سمکۆ وەك جاران بە فێڵ وەڵامی پۆزێتیڤانەی بە تورکان دابێتەوە، هەر بۆیەش توانیویەتی بە ئازادی ئاماوەیەك لەوێ بژی، لە کاتی وتووێژیش لەگەڵ تورکان دەستی لە چالاکی و مەبەستی خۆی هەڵنەگرت. سمکۆ لەگەڵ شێخ مەحموود پەیوەندی هەیە، شێخ مەحموود لە نامەیەکدا بۆ سمکۆ دەنوسێت و پێی دەڵێ یان وەرە بۆ ئێرە یان لەگەڵ عەشایەرە کوردەکان پەیوەندی بە ئینگیزەکانەوە بکە، ئینگلیزەکان پشتیوانی ئێمەن. وەرە بۆ ئێرە تا لەگەڵ کاروباری ئینگلیزەکان ئاشنا بیت، بەڵام پێشوەخت بەڵێن لەو عەشایەرە کوردانەی ئەوێ وەربگرە.

تێکرای عەشیرەتەکانی (وان)، (شەمزینان)، (نیری)، (دەلی)، (ئاباگا) و (ئاردیشا) بەڵێن بە سمکۆ دەدەن بە سەروگیان پشتیوانی لێبکەن. بەڵام ئەفسەری راکردووی تورکیا (کازم بەگ) بۆ ئەوەی پاکانە بکا و لە سزای دەوڵەت رزگاری بێ لە لای سمکۆ هەڵدێت و دەوڵەتی تورك لە تەواوی پیلانەکانی سمکۆ ئاگادار دەکاتەوە.

ئەوە بوو سمکۆ لە لایەن هێزەکانی سوپای تورکیاوە گەمارۆ دەدرێت و لە کاتی شەڕدا دوو کوڕی دەکوژرێن و ژنەکەی (جەواهیر خانم) و ژنی ئەحمەد ئاغای برای دەکوژرێن. دوو ژنەکەی تری لەگەڵ خەسرەوی کوڕی لە لایەن هێزەکانی تورکیاوە بە دیل دەگیرێن و لە رێگای ساری قامیشەوە دەنێردرێنە ئەنقەرە. سمکۆ بۆ خۆی لەگەڵ ئەحمەد ئاغای برای و دەیان سواری تر بەرەو شوێنی دیارینەکراو دەڕۆن. لەم کاتەدا دەوڵەتی تورك و فارس بۆ دەستگیرکردنی سمکۆ هاوکاری یەکتر دەکەن. ئێستا ئینگلیزەکان شێخ مەحموودیان هێناوەتە قیستان، دوو ساڵ لەمەوبەر هێنابوویانە پێشەوە.

شێخ لەگەڵ سەید تەها پەیوەندی و هاوکاری هەیە، سەید تەها دوای تێکشکانی سمکۆ تەسلیمی دەوڵەتی ئێران دەبێتەوە و ئێستا هاوکاری شێخ مەحموود دەکا.

ئینگلیزەکان لقێکی چەکداری ئاشوریان خستۆتە بەردەست شێخ مەحموود. تورکەکان ٩ فەوجی سوپای خۆیان کە لە نزیك (وان) جێگیربوون، دەنێرنە شەڕ دژی شێخ مەحموود. ئەوەبوو کە تورکەکان سەرکەوتن، جگە لەوە هەموو هێزەکانی تورکیا لە ئیگدری و بایەزیدیش دەکەونە شەڕ دژی شێخ مەحموود. بۆیە سمکۆش دەچێتە لای شێخ مەحموود، ئێستا ئاشکرایە نابێ گومان لە گرتن یاکوشتنی سمکۆ بکرێت.

تورکەکان ئێستا دەیانەوێ (بانە) بگرن. ئەگەر شێخ مەحموود سەربکەوێ بڕیارە لەوێش راپەڕین دەست پێبکات. دەوڵەتی ئێرانیش کە نیگەرانی پێشڕەوی و نزیك بوونەوەی هێزەکانی ئینگلیز و شێخ مەحموودە لە رەواندز، یەکێك لە سەرکردە ناودارەکانی سوپای سمکۆی بە ناوی عومەر خان بە شەش سەد کوردەوە لە تەورێز لەگەڵ قەزاقەکان دەنێرێتە سەر سنووری ئێران و تورکیا.

پێویست ناکا بڵێم سەرکەوتنی ئینگلیزەکان لە کوردستانی تورکیا چ مەترسییەکی بۆ سەر ئێمە هەیە، مەترسیەکی گەورە کە نابێ بە بچووك تەماشا بکرێت. مەترسییەکی تر ئەوەیە ئێمە لەمەڕ کێشەی کورد وازمان لەچالاکی سیاسی هێناوە و بەم چەشنە کوردەکان دەدەینە دەست ئینگلیز. کاتێك کە هاتمە ئێرە رووسیای سۆڤیەتی لەناو کورداندا خۆشەویست بوو، بەڵام دوای تێکشکانی سمکۆ، لەناو کوردەکاندا وابلاوبۆتەوە کە سمکۆ لە سایەی سەرِی بەلشەفیکان تێشکاوە. من تا ئەو جێگایەی بۆم کرابێ ئەم هەواڵانەم بە درۆخستۆتەوە. بەڵام بڕوا ناکەم هیچ لە هەڵویستیان گۆڕابێت.

بەپێی ئەو دەستوورانەی ئەو کاتەی لە ئەنقەرە بووم، وەرم گرتن ئەوە بوو: پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ کورد ببەسترێت، ئەگەر هاتوو راستەوخۆ کوردەکان کێشەی سەربەخۆیی کوردستانیان هێنایە ئاراوە وەڵامیان بدەینەوە بلێن کاتی خۆی نەهاتووە. کوردەکان گەرچی درِن بەڵام نەزان (ئەحمەق) نین، زۆر زەحمەتە پێیان بگوترێت کە ئەم کێشەیە لە کاتی خۆی دایە یا نا؟

کاتێك دەبینن ئینگلیزەکان پێیان وایە ئەم کێشەیە لە کاتی خۆیدایە (واتە سەربەخۆیی کوردستان)، ئاشکرایە دەبێ لەمبارەوە بیر لە مەبەستەکانی ئینگلیز بکەنەوە. ئینگلیزەکان لە کوردەکان کەڵکی ریئالی وەردەگرن، زەحمەتە وایان باربێنن بەکەڵکی ئێمە بێن. من ناڵێم لەسەر کێشەی کورد پێویستە لەگەڵ ئینگلیزەکان پەیوەندی ببەستین. بەڵام پێموایە نەبوونی سیاسەتی چالاك و سەربەخۆی ئێمە لەمەرِ کێشەی کورد بێشك زیان بە بەرژەوەندییەکانمان دەگەیەنێت.

تورکەکان لەسەر لکانی ماکۆ بە خاکی تورکیاوە کەوتوونەتە وتوویژ. من لەمبارەیەوە لە ماکۆ پرسیارم لە هاورِێ دوبسون کرد. ناوبراو وتی: سەردار دەیەوێ دەسەڵاتی دەوڵەتی فارس لێرە هەر بەناو و سنووردار بێت. خانی ماکۆ پەیوەندی لەگەڵ سمکۆ هەیە، دەزانن کە لاواز بوون یا لەناوچوونی هەر کام لەوانە، دەبێتە هۆی لاوازبوون یان لەناچوونی ئەوی دی.[1].

**مالسۆڤیو مالتسۆڤ**

**کۆنسۆڵی رووسیای فیدراتیڤ**

**لە بایەزید**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٦٦-٦٩.

## راپۆرتی هاوڕێ مالتسۆڤ کونسۆڵی سۆڤیەت لە بایەزید
## بۆ نوێنەری رووسیای سۆڤیەتی هاوڕێ ئارالۆڤ

**١٩٢٢/١٢/٢٤**

بزووتنەوەی کورد لە مانگی رابردووا پتر پەرەی سەندووە. پشتیوانی ئینگلیزەکان لە بزووتنەوەی کورد ئەمڕۆ زیاترە لە سەردەمی سمکۆ ولە کوردستانی (فارس) شێوازی پۆلیسی بەخۆوە گرتووە. ئەگەر ئەوسا کەمتر و بەنهێنیێ بەتایبەتی بە پارە پشتیوانی سمکۆیان دەکرد، بەڵام ئێستا شەرم ناکەن و بە ئاشکرا پشیتوانی کوردەکانی باشوور دەکەن و لە چوارچێوەی پارە و چەکدار بەدەرە، بەهێزی زیندووش واتە لەباری لەشکریشەوە یارمەتیان دەدەن، هێزی زیندوویان ئەو هەنگەی ئاشورییەکانە کە ئینگلیزەکان لە موسڵ پێکیان هێناوە و ئێستا خستوویانەتە بەردەستی شێخ مەحموود. بە یارمەتی ئەم هێزە بوو شێخ مەحموود لە کۆتایی ئەیلول دەستی بە چالاکی بەرچاوکرد لەگەڵ سوپاکەی بەرەو رەواندز رۆیشت، دوای تێکهەڵچوون لەگەڵ لەشکرەکانی تورك توانی ئەوێ بگرێت، پاشان بەرەو قەزاکانی شەمزینان و هەکاری پێشرەوی کرد و لە گوندی نەهریێ دەستی دایە هێرش کردن. دەوڵەتی تورکیاش هێزەکانی لە (وان) کشاندەوە. سەرەتای کانوونی دووەم توانیان پاشەکشێ بە شێخ مەحموود بکەن بکشێتەوە بۆ ناوچەکانی ئۆرەمار و جولەمێرگ، لە کۆتایی تشرینی یەکەمەوە تا ئێستا لەوێ تێکهەڵچوون بەردەوامە، تورك پەیتا پەیتا تێدەشکێن و بریندارەکانی خۆیان دەنێرنە بال کال. دیارە بارودۆخی کوردەکانیش شپرزەیە، هەر بۆیە گوتیان لەبەر «هۆی ستراتیژی» دەبێ بال کالیش لە دەست بدەن تا شێخ مەحموود لە (وان) جێگیربکەن و لەوێ بە زەبرێکی کۆتایی لە ناوی بەرن.

ئێستا وادیارە شتەکە گۆڕاوە و دەنگوباسی وایان لە ئێران و تورکیا بڵاوکردۆتەوە کە شێخ مەحموود لە ئینگلیزەکان جیابووەتەوە و موسڵی گرتووە. سەید تەهاش کە جێی متمانەی ئینگلیزەکانە لەلایەن شێخ مەحموودوە گیراوە و شێخ عەبدولقادریش وەك لایەنگری شێخ مەحموود لە لایەن ئینگلیزەکان گیراوەو بردویانەتە بەغدا. ئەم دەنگوباس و هەواڵانە لە لایەن تورکەکانەوە پەیتا پەیتا بڵاودەبنەوە و گەورە دەکرێن.

تورکەکان دەیانوست منیش(مالتسۆڤ) والیّ بکەن باوەڕیان پێبکەم. بەڵام دەرکەوت ئەم دەنگوباسانە هیچ کامیان ڕاست نین، بە پێچەوانەوە مەحموود و ئینگلیزەکان یەکن، چونکە بەم دواییانە فڕۆکە، ڕەشاش، بۆمب، چەك، تەقەمەنی، جل و بەرگ و پارەیان پێداوە و کاربەدەستی سوپایی و فڕۆکەوانیان بۆ ناردووە. مەبەستی سەرەکی مەحموود و ئینگلیزەکان ئەوەیە، وان و بەتلیس و موش بگرن. بەڵام ئینگلیزەکان و ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی کورد لە هەوڵدانی خۆیان نەکەوتوون بۆ سازکردنی ڕاپەڕین لە کوردستانی فارس. ئێستا لەویّ چالاکانە خەریکی ڕێکخستنی ئەم کارەن، ئەوەتا هەر لە سەرەتاوە دەستکەوتیان هەیە، بۆ نموونە لەناوچەی وان بەرەو باشووری گۆلی ورمیّ کوردەکانی سەردەشت کە (سیّ هەزار) بنەماڵە دەبن ڕاپەڕیون و موچەخۆرانی گومرگی دەوڵتیان دەرکردون. بۆیە دەوڵەتی فارسیش سوپای خۆی لە ورمیّ و سەلماسەوە دەنێرێتە ئەویّ.

ڕاپەڕینەکە بە سەرکردایەتی سمکۆ یان سەید تەهایە، بەڵام هێشتا رووننەبۆتەوە کامیانە. بەپێی ئەو زانیارییانەی بە دەستمان گەیشتووە ئینگلیزەکان یارمەتیەکی زۆری ڕاپەڕیوان دەدەن و هەر لە سەرەتای (١٩٢١)ەوە لەناویاندا کاردەکەن، عەشیرەتە دراوسێیەکانی کوردی تورکیاش ئامادەن بچنە ریزی ڕاپەڕینەکە و لەگەڵیان یەکبگرن.

بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە سمکۆوە هەیە ئەوەیە: ناوبراو ئێستا لە کوردستانی تورکیا خەریکی ئیش و کار و چالاکییەو لەناو کوردەکانی تورکیادا زۆر سەرکوتووە، بۆ بەهاری داهاتوو یارمەتی کوردەکانی فارس دەدا لەناوچەکانی سەلماس و ئورمیە و سابلاغ. ئێستا بەهۆی بەفر و ڕێبەندانەوە کوردەکانی ئێران لێك دابڕاون. بەڵام بەڵێنیانداوە بۆ بەهار بچنە ریزی شۆڕشی سمکۆ و ئەو کوردانەی تورکیا کە لە دەوری سمکۆ کۆبوونەتەوە. کوردەکانی تورکیای ناوچەی وان لە شەمزینانەوە بگرە تا ئەردیشا لە مێژە لە ژێر سەرکردایەتی سمکۆ یەکیان گرتووە. پیلانی سمکۆ بۆ کوردەکانی فارس بەم شێوەیەیە:

ناوبراو دەیەویّ نزیکەی هەموو ئازربایجان تا تەوریز بگرێت. بۆ جێبەجیّ کردنی ئەم پیلانە خەریکی وتووێژە، بۆ نموونە لە نیوەی یەکەمی تشرینی دوەم سمکۆ لە لای خالید ئاغا بووە و چەند ڕۆژێکیش لای ماوەتەوە. ویستویەتی چاویشی بەخانی ماکۆ بکەوێت بەڵام سەرداری ماکۆ ناوبراوی وەرنەگرتبوو. چونکە لە دەڤەری ماکۆ سوپای دەوڵەتی لێیە وخانی ماکۆ کەوتۆتە

بارێکی زۆر نالەبار و پێوەندی کردنی بە سمکۆوە هەم بە باش نازانێت و هەم مەترسیشی تێدایە. سمکۆ لە ماکۆوە بە بایەزیدا چووە بۆ لای عەشیرەتی زیلان و لەوێشەوە بۆ سلێمانی.

بەڵام سەبارەت بە پێوەندی سمکۆ و تورکیا بەم چەشنەیە:

ژنی سمکۆ (موعتەبەر خانم) تلگرافێکی بۆ مامۆستا کەمال پاشا بۆ ئەنقەرە ناردووە دەڵێ: دەوڵەتی تورکیا لە رێگای فەرماندەیەکی سوپای تورکیاوە بەناوی جاوید بەگ کە ئێستا نوێنەرە لە پەرلمانی تورکیا، چەك و تەقەمەنی داوە بە سمکۆ بۆ رێکخستنی راپەڕینی دژی دەوڵەتی فارس. ئێستاش دوای تێکشکانی سمکۆ لە فارس، تورکیاش دوایین زەبری لێدا، بۆیە ناچاربوو هەڵبێت و پەنابباتە بەر کێوەکان. لە وەڵامی ئەم تەلگرافە ئەنقەرە دوو سەد لیرەی زێڕیان بۆ ناردووە. کوڕی سمکۆ (خەسرەو) لەگەڵ دوو خزمەتکاری لە شاری قامیشە، لە ١٩٢٢/١٢/١٢یەکێك لەو خزمەتکارانە دەنێرێتە قەرەگیسار بۆ لای ژنی سمکۆ (موعتەبەر خانم) کە نامەی فەرماندەی هێزەکانی تورکی لە شاری قامیشی پێ دەبێت، لەم نامەدا بە ژنی سمکۆ رادەگەیەنێ سمکۆ دەکەوێتە بەر لێبوردن ئەگەر خۆی تەسلیمی تورکیا بکات، دەوڵت دەستوور دەدا ئەو ماڵ و سامانەی لە لایەن تورکانەوە لەم شەڕانەی دواییدا دەستی بەسەردا گیراوە پێی بدرێتەوە. لە نامەکەدا داوا لە موعتەبەر خانم دەکات سمکۆ ئاگادار بکات و قەناعەتی پێبکات ئەم پێشینارە پەسەند بکا و پێی بڵێ چارەنووسی ژن و کوڕەکەی بەوەوە بەستراوەتەوە.لە ١٩١٨دەستەکانی ئاشور-ئەرمەن دژی سمکۆ راپەڕین و توانیان پاشەکشێی پێبکەن. سەرئەنجام سمکۆش پەنای بردەبەر فرۆفێڵی جارانی، بەڵێنی بەرێبەری ئایینی ئاشوریەکان (مارشەمعون)دا کە ئاشتی خوازە، هەر بەوبۆنەشەوە داوەتی کرد تا پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ببەستێت. ئەویش بە خۆی و چل سوارەوە دێتە لای سمکۆ دوای میوانداریەکی زۆر رازاوە لە لایەن سمکۆوە پەیمانی ئاشتی دەبەسترێت، کاتێك مار شەمعون بە رەشنووسێکی پەیمانەکەوە دێتە دەرێ بۆناو حەوشە کە لەوێ چل سوارەکەی چاوەڕێی رۆیشتنیان دەکرد، کتوپڕ بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە هەموولایەکەوە لە سەربانەکانەوە تەقەی لێدەکەن و تەواوی ئاشورییەکان لەوانە مارشەمعونیش، دەکوژرێن.

لەو کاتەوە ئاشورییەکان چاوی بینینی سمکۆیان نییە و ناتوانن چاو لەم کوشتارە بپۆشن. ئێستا کە ئینگلیزەکان هەندێك جەنگاوەری ئاشورییان خستوەتە بەردەستی شێخ مەحموود، هەندێ کۆسپ هاتووەتە پێش کە ئەویش ئەوەیە: ئاشورییەکان نایانەوێ لەگەڵ سمکۆ کار بکەن. هەر

بۆیەش شێخ مەحموود سمکۆی راسپاردووە ئیش و کاری رێکخراوەیی و پروپاگەندەیی لەناو کوردەکان بەرێوەببات. هەر ئەم ئەرکەیش ئێستا لە لایەن سەید تەهاوە (هەر چەند نووسەر نووسیویەتی سەید ئاغا) بەرێوەدەچێت. ئەم فاکتانەن کە تائێستا من ئاگاداریانم، هەروەك وتم... یەکەم ئەرکی ئینگلیزەکان و کوردەکان ئەوەیە کە وان و بەتلیس و موش بگرن. هاوکاتیش پێویستە لە کوردستانی فارس راپەڕن. ئەم بەشەی ئەرکەکەیان واتە راپەڕینیان لە وان جێبەجێ کرد و ناوەندی بەرێوەبەرایەتیەکەشی بێ گومان سلێمانیە. ئێستا لەم کاتەدا لەبەر هۆی سەرەکی واتە باروودۆخی سروشتی، ناتوانن نەخشەو پیلانەکانیان جێبەجێ بکەن بۆیە بەهاریان هەڵبژاردووە. تا کوردەکانی تورکیا و فارس بتوانن پەیوەنییان هەبێ و پێکەوە دەست بەکاربن و هاتووچۆی سوپایی ئاسانتر بێت، جگە لەوە ناوەندی سەرەکی بزووتنەوەکەش لە موسڵەو کە تورکەکانیش دەیانەوێ پێش هەموو شتێك ئەوێ بگرن.دیارە بەهێزی سوپایی ئەم کارەیان بۆ ناکرێت و بە رێگای ئاشتیانەشدا زۆر زەحمەتە. بەپێی ئەو دەنگوباسانەی کە لەناو خەڵکدا لەسەر پەیمانی لۆزان بلاوە (هیچ هەواڵێکم لەسەر کۆنفرانسی لۆزان و دەنگوباسێکی ترم لەو بارەوە پێی نەگەیشتووە) بەو ئەنجامە گەیشتووم کە تورکەکان ناتوانن موسڵ بگرنەوە و بەبێ ئەوەش ناتوانن دەرەقەتی بزووتنەوەی کورد بێن و لەناوی بەرن، هەر چەند بەشێکیان سەرکوت کردووە بەلاّم نەیانتوانیوە ناوەندی ئەم بزووتنەوەیە لە ناوبەرن. چونکە:

١- هەبوونی ناوەندەکانی بزووتنەوەی کوردی وەك موسڵ (ناوەندی سەرەکی و هەمیشەییە) (سلێمانی و رەواندوز و وان) یان هەیە کە بە دەستیانەوەیە.

٢- هێزی زیندووی وەك فەوجی ئاشوری و کوردەکانیان هەیە.

٣- ئینگلیزەکان یارمەتی جەنگییان دەدەن : وەك فڕۆکەی،جەنگی، رەشاش، تۆپ، پسپۆری سوپایی و فڕۆکەوان.

٤- یارمەتیەکی دراوی زۆر لە ئینگلیزەکان وەردەگرن.

٥- فاکتی یەککگرتنیان لەگەڵ کوردەکانی ویلایەتی وان ئەو راستیە دەسەلمێنێ دەکرێ بڵێن جێبەجێ کردنی پیلانەکەیان بۆ بەهارێ، مسۆگەرە.

لە راپۆرتی پێشووم نووسیبووم: پێموایە خۆ تێنەگەیاندن لە ئیش و کاری سیاسی و چالاکی نەکردنمان لەناو کوردەکان، ئەنجامێکی خەماوی بەدواوە دەبێت. وەك وەلاّم من نامەیەکم لە

هاوڕێ میرۆڤیچەوە پێ گەیشت کە تێدا داوام لێدەکات بەشێوەیەکی کۆنکرێتی پەیوەندی لەگەڵ ڕێبەرانی کورد ببەستم. دەڵێ چۆن کاری ڕێکخراوی دەزگاکەمان لەناو کوردەکاندا ئاراستە بکەم؟ و چ کەرەستەیەك بۆ ئەم کارە پێویست دەبێت؟ و...

لەبەر ئەوەی ئەم داوایانە ناتوانن وەڵامی ڕاپۆرتەکانی پێشووی من بدەنەوە، نامە و ڕاپۆرتەکەی من هاوکات نێردراون و بەرەوڕووی یەکتر بوونەتەوە چونکە من لە ناوەڕۆکی ئەم داواکارییانە سەرسامم.

ئایا بۆتە هۆی ئەوەی پێویست نەکا ئێمە چالاکیمان لەناو کوردەکاندا هەبێت یا شتێکی ترە؟ لە حاڵەتی یەکەمدا من ئەم پرسیارە لە جێی خۆیدا نابینم. لە ڕاستیدا سەبارەت بە چۆنیەتی کاروباری دەزگاکانمان لەناو کوردەکاندا پرسیاردەکەن بەڵام ئەم دەزگایە دەبێ چ مەبەستێکی هەبێت؟هیچ وەڵامێك نییە، بۆیە لە باروودۆخێکی ئاوادا زۆر زەحمەتە شتێك بگوترێت.

لەبەر ئەوەی کۆنسوڵخانەی ئێمە لە بایەزیدە، دەتوانین بڵێین پەیوەندی کردن بەسەرکردایەتی کوردەوە بە هیچ شێوەیەك ناکرێت. گرفتی پەیوەندی کردن بەو ڕێبەرە زۆر چالاکانەی کورد و ئەو کەسایەتیيانەی لە ویلایەتی وان و باشوورن کاتێك جێبەجێ دەکرێ کە کۆنسوڵخانە ببرێتە وان. تا ئەوشوێنەی من ئاگادارم ئەو پرسە چارەسەرکراوە. بە هەبوونی کۆنسوڵخانە لە وان دەکرێ لە دوو لاوە لەم بوارەدا ئیش بکرێت، هەم لەناو کوردەکانی ئیگدەر و بایەزید و ماکۆ واتە لەناو ئەو کوردانەی هێشتا چالاك نین و هەم لەناو کوردەکانی وان کە چالاکانە ڕێگایان گرتۆتەبەر. لەبەر بارووودۆخی بایەزید پەیوەندی لەگەڵ سمکۆ و سەید تەها و شێخ مەحموود تەنیا بە هۆی فەرمانداری ئاواجیکەوە واتە ئەمیر تومانەوە جێبەجێ دەکرێت. ئەگەر کۆنسوڵخانە بێتە وان لەوێ ڕێگایەکی نوێ بۆ پەیوەندی کردن دەکرێتەوە و ئاسانتر دەبێت.

بەڵام سەبارەت بە ئیش و کاری ئێمە لەناو کوردەکان بە بۆچوونی من ئێستا ڕاکێشانیان بۆ سەر ئاراستەی سیاسیمان ئاسان نییە، نابێ ئەوەش لە بیر بکرێت ئێمە ئەوەندەی ئینگلیزەکان زێڕمان لە دەست دانیە: بەداخەوە ئەمە تائێستا یەکێکە لەو فاکتەرە گەورانەی کوردەکان بەرەو ئەم لا یا ئەو لادا دەبات. هۆی دووهەم ئەوەیە: ئیش و کاری هاوبەشی کورد و ئینگلیز زۆر بە ئاسانی چۆتە پێش، بۆ یەکەم جار نییە ئینگلیزەکان یارمەتی کۆنکرێتیان داون، ئەوان هەر بەڵێن نادەن بەڵکو یارمەتی ڕاستەقینەیان دەدەن.

بەش بەحاڵی خۆم ئەوەی تا ئێستا کردوومانە ئەوە بووە کە دەستمان بەڕووی کوردەکانەوە ناوە و لە خۆمان دورمان خستوونەتەوە. یارمەتی ئێمە بۆ دەوڵەتی فارس و بەشداری ژەنەڕاڵ ئاندرەیڤسکی لە تێکشکانی سمکۆ لە مانگی ئەیلول لە کوردان شاراوە نییە، ئەوان بە ئاشکرا دەڵێن بەلشەفیکەکان لە تێکشکانی سمکۆدا یارمەتی دەوڵەتی فارسیانداوە. ئێستاش دەنگوباسی نوێ تر بڵاوبووتەوە کە هاوڕێ ئارالوڤ پروتیستی داوە بە دەوڵەتی تورکیا کە بۆچی سمکۆیان دەستگیر نەکردووەو تەسلیمی ئێرانیان نەکردۆتەوە. ئەم دەنگوباسانە بۆ ئێمە زۆر زیانبەخشن، راستن یان نا من نازانم، بەڵام لەسەر ئەو پڕوتیستە من لە ئەنقەرەوە ئاگادار نەکراوم. کوردەکان هیچ شتێك لەبارەی رووسیای سۆڤیەتی نازانن لە سەدایەکیشیان بە زەحمەت دەزانێ رووسیای قەیسەری نەماوە. بڵاوکردنەوەی دەنگوباس لەسەر رووسیا هەر قەدەغەیە، چونکە تورك ئەم شتە بە پروپاگەندەیەکی بەلشەفیکی تێ دەگەن. سەرەڕای ئەو شتانەی باس کرا پێموایە کاری ئێمە دەبێ بەم چەشنە بێ: نابێ کات بەفیرۆ بدەین دەبێ بڕیار بدرێ دەسبە ئیش و کار بکرێ لەناو کوردەکانی بایەزید و ماکۆ و ئیگدیر واتە ئەو کوردانەی کە هێشتا پیروپاگەندەی ئینگلیز و مەحموود و سمکۆیان پێنەگەیشتووە. ئێمە دەبێ لە پارە خەرج کردن بۆ راکێشانی ئەم کوردانە دریغی نەکەین، بۆ رێبازی سیاسی خۆمان هەوڵی زۆر بدەین. بەم چەشنە جۆرە دەوڵەتێکی لەمپەر و جودا لە نێوان ئەرمینیا و کوردستانی ئینگلیز دروست بکەین. ئەمە یەکەم ئەرکی ئێمەیە و دەبێ بەم رێگایەدا دەسپێبکەین و نابێ لە سەرەتادا پیلانی زۆر گەورەمان هەبێت و خۆمانبخەینە مەترسیەوە. لێکدابڕانی عەشیرەتە کوردەکان و لکانی ناسروشتیانەیان بە ئینگلیزەکانەوە دەرفەتی ئەوەمان دەداتێ بیر لەوە بکەینەوە کە بەم رێگایەدا دەتوانین شتێك بەشتێك بکەین. لەمبارەوە دەتوانین پشت بە کوردە رووسە-ئیگدەریەکان ببەستین کە سەرۆکەکەیان برایانی (شەمسەدینۆڤن). شەمشەدینۆڤەکان لەناو کوردەکانی رووسیادا دەورێکی باڵایان هەیە، دەوری ئەوان لەو دیوی ئاراراتەوە نییە. هەروەها لە نێوان کوردەکانی تورکیا و کوردەکانی رووسیا دوژمنایەتی هەیە. بۆ کارکردن لەناو کوردەکانی بایەزید دەتوانین بە هۆی سەرۆکی عەشیرەتی جەلالیەکانەوە ئیبراهیم بەگ کاریان تێبکەین (جەلالی عەشیرەتی هەرە گەورەی سەنجاقی بایەزیدن) ناوبراو دوای ئەوەی کە تورکەکان بە وەرگرتنی هەزار روبڵی زێڕ لە من تاوانباریان کرد، دەترسێ چاوی پێم بکەوێ یا سەردانم بکا. بەڵام من پەیوەندیم بە کوڕەکەیەوە (مەمەد بەگە) هەر هەیە کە پەیوەندی

لەگەڵمان باشە. بەڵام لە لایەن کوردەکانی بایەزیدیەوە زۆر ترسێندراوە. باشترە یا لە ڕێگای جەلالیەکانی فارسەوە بە هۆی سەرۆکەکەیان (خەلیل ئاغا) یا لە ڕێگای ئەمیر تومانەوە پەیوەندییان پێوە بکەین.

لەبەر نەخۆش بوونم ناتوانم وەك دەمەوێ درێژە بەم راپۆرتە بدەم، بەڵام هەر چۆنێك بێ پێموایە ئەوەندەم نووسیوە بزانن کاتەکە ناگاتە بەهار، واتە تا دەست بەکاربونی کوردوئینگلیزەکان کاتی زۆر نەماوە. بەم چەشنە یا بە شێوەیەکی تر پێویستە بڕیاری لەسەر بدرێ و بەپێی هەل و مەرج و ئیمکانات دەست بەکاربکرێ نەك لە بیروباوەڕێکی چەق بەستوودا لەمەڕ کێشەی کورد گیر بخۆین و کوردەکان بدەینە دەست ئینگلیزەکان. بێگومان دەتوانین بڵێین کاریگەری زۆری لەسەر کۆماری سۆڤیەت دەبێ، چونکە بوونی «کوردستانێکی ئینگلیز» لە تەنیشت ئێمە زۆر زەحمەتە بگونجێ یا ئاسایی بێت. بۆ ئەوەی ئەم شتە روونەدات پێویستە دەست بەکاربین. ئەم راپۆرتە کاتێك نووسراوە کە هەواڵم پێ گەیشت سمکۆ دیسان گەڕاوەتەوە (یۆگیل) وهێشتا هەر لەوێیە. ئەم پێشهاتە دەبێ پاڵمان پێوە بنێ و قەناعەتمان پێبکا دەست بە کاربین، چونکە کوردەکانی ماکۆ خەریکن دەکەونە ژێر کارتێکردنی سمکۆ و دواییش بێ گومان نۆرەی کوردەکانی بایەزید دێت.

مالتسۆڤ کۆنسوڵی سۆڤیەت لە بایەزید لە راپۆرتێکیدا باسی کوردەکانی ئەوێ دەکات بە تایبەتی لەبارەی ئەتنۆگرافیاوە کە لێرە تەنیا ئاماژە بە ناوەڕۆکەکەی دەکەین.

«.... زۆربەی دانیشتوانی ئێرە کوردن و ژمارەیەکی کەمیش قەرە پاپاخ و تورکی لێیە....»

... ژنە کوردەکانی ئێرە بە سەرڕوتی دەگەڕێن و سەریان داناپۆشن و ئەگەریش هەبێت بە سەرپۆشێکی تەنکەوە دەبینرێن. ژنە دەوڵەمەندەکان کڵاو و زێر و پلپلە و گوارەی زێر و زیویان لەبەرە[1].

(1) هەمان سەرچاوە ل ۱۰۷-۱۱٤ و ۱۳٤.

# راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم

**کانوونی دووەمی ۱۹۲۳**

## کێشەی کورد

کوردەکان لەو بارودۆخەی کەتێی کەوتوون (بەسەر سێ دەوڵەتی تورکیا و فارس و قەفقازدا دابەشکراون) زۆر ناڕازین.

.... ڕاپەڕینی شێخ مەحموود و سمکۆ و ڕێبەرانی تری کورد پیلانێکی تری ئینگلیزەکانە کە لە سیاسەتیاندا ئیشیان بۆ کردووە و دەیانەوێ هەڵوێست و پێگەی تورکیا لە کۆنفرانسی لۆزان لاواز بکەن و ناچار بێ پاشەکشێ بکات.

تورکەکان بە ئاسانی ناتوانن بزووتنەوەی کورد لەناو بەرن لەبەر ئەوەی دانیشتوانی کوردستان بە گشتی دژی دەسەڵاتدارانی تورکن. گەرچی کاربەدەستانی دەوڵەتی تورك بە رواڵەت دەڵێن بایەخێکی ئەوتۆ نادەنە ڕاپەڕینی کوردەکان. بۆ نموونە شەڕی سوپای تورك بە سەرکردایەتی مەمەد عەلی پاشا لەم دواییانەدا تووشی هەندێك تێکشان بووە کەچی باسی ناکەن، بەپێچەوانەوە بزووتنەوەی کورد لە پەرەسەندن دایە و بۆ کوردستانی فارسیش پەڕیوەتەوە. لەناوچەی (بانە) موچەخۆرانی دەوڵەتی فارس دەرکراون کە بۆتە هۆی نیگەرانی تورکەکان، هەر بۆئەو مەبەستەش سوپای خۆیان بۆ ورمێ دەنێرن. ئینگلیزەکان هەر لەوێ کوردەکان چەکدار دەکەن.

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە ئەوەیە کە دەبێ جارێ مەند و تەماشاکەری ئەو ململانێیە بین.

زۆربەداخەوە ئێمە درەنگ خۆمان لە کێشەی کورد گەیاند. کاتی خۆی ئەم بۆچوونە سەرنجی ئەنقەرە و مۆسکۆی ڕاکێشابوو، گوایە ئنیگلیزەکان دەیانەوێ بزووتنەوەی کورد دژی (مۆسکۆ-ئەنقەرە) بەکاربێنن و لەم بارەوەش دەستوورگەلێکیان بە هاوڕێیان (مالسۆڤ) لە بایەزید و (پاڤلۆڤسکی) لە ئەرزەڕۆم دابوو کە ئاگاداری سەرکردەکانی کورد بن و بە وردی مەبەست و

کردەوەکانی ئینگلیزیان بۆ روون بکەنەوە. ئەو هەواڵ و زانیارییانەی لەوانەوە پێم گەیشتووە راستی بۆچوونەکانی من دەردەخەن. ئێستا هەرچەشنە پەیوەندی کردنێك بەسەرانی کوردەوە زەحمەتە. ئینگلیزەکان بە گێرانی دەوری خۆیان لە کاتی پێویستدا، واتە بەدانی زێر و چەك زەمینەیەکی لەباریان بۆ پیادەکردنی سیاسەتی خۆیان لەناو کورداندا سازکردووە. پەیوەندی کردن بەو سەرکردە کوردانەی لایەنگری تورکیان بە مانای پەیوەندی کردنە بە (سیخورەکانی) تورکیا و خۆ بەدناوکردن و گومان دروستکردنە لای تورکان. پێویست ناکا کەڵك لەم رێگایە وەربگیرێ، من پیشنیارم بە هاورێیان مالتسۆڤ و پاڤلۆڤسکی کردووە لەم رووەوە زۆر ئاگادار بن و هەر لەمبارەوە بروسکەی هاورێ قەرەخانم پێ گەیشیت دەڵێ: دەبێ زۆر ئاگادار و دورەپەرێز بین، هاورێیان و کۆنسۆڵیشم هەر بەم چەشنە ئاگاداركردۆتەوە.

سەبارەت بە کردنەوەی کۆنسۆڵخانەمان لە وان دەبێ بڵێم کە کاتمان لە دەست داوە. وا بیر دەکەمەوە ئێستا تورکەکان بۆ کردنەوەی ئەم کۆنسۆڵخانەیە گرفتمان بۆ دروست دەکەن و دوای دەخەن چونکە لە بەرژەوەندیان نییە دەوڵەتێکی دۆست شاهیدی هەڵسوکەوتیان بێ، دژی کوردان [1].

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٣٦-١٣٧.

# راپۆرتی کونسوڵی سۆڤیەت لە فارس

## هاوڕێ میرو ڤیچ

**(١)ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣**

### کێشەی کورد

دەوڵەتی ئەنقەرە پێی وابوو دوای کۆنفرانسی (مۆران) کۆنفرانسی ئاشتی لەگەڵ ئانتانتەکان دەبەستێت، بۆیە هەندێك لە کەرتەکانی سوپای خۆی نارد هێرش بەرنە سەر موسڵ. بەڵام ئینگلیزەکان لە کوردستان دەستیان بە رێکخستنی راپەڕین کردبوو، لە باری تکنیکیەوە هەندێك دەستەی چەکداری کورد و ئاشورییان بۆ هێرش بردنە سەر کوردستانی تورکیا لە دەڤەری موسڵ ئامادەکردبوو. بەگشتی بارودۆخی کوردستان بۆ ئینگلیزەکان لەبارە. سمکۆ کە لە پشتیوانی ئەنقەرە بێ بەش کرابوو لە بەرامبەر فارسەکاندا تێکشکا و ناچاربوو بەرەو چیاکان هەڵبێت. ناوبراو پێشنیاری بە دەوڵەتی فارس کرد کە بە خۆی و چەکدارەکانی ئامادەیە لە ریزەکانی سوپادا خزمەت بکات، بەڵام دەوڵەتی فارس پێشنیارەکەی پەسەند نەکرد چونکە باوەڕی پێنەبوو،دەوڵەت پێشنیاری کرد بەبێ چەکدارەکانی ئامادەیە وەری بگرێت، سمکۆش ئەم پێشنیارەی رەتکردەوەو رۆیشتە گوندی (قەرەحیسار) و بۆ ئەوەی وتوویژی خۆی لەگەڵ ئینگلیزەکان بشارێتەوە لە رێگای شێخ مەحموودەوە دەستی کرد بە وتوویژێکی ساختە لەگەڵ تورکەکان گوایە ئامادەیە خۆی و هێزەکانی بڕۆن بەرەو موسڵ. سمکۆ بەڵێنی لە عەشیرەتەکانی شەمزینان، نەهری، دۆڵی ئابگاو ئاردیشی وەرگرتبوو.

سمکۆ دەبوو رۆیشتبا بۆ نەهری و لەوێ چاوی بە شێخ مەحموود و نوێنەرانی ئینگلیز بکەوێت، بەڵام هێندەی پێ نەچوو تورکەکان بە هۆی ئەفسەرێکی تورك بەناوی (مایور کازم بەگ) کە بە رواڵەت لە خزمەتی سمکۆدا دەبێ، وتوویژی نێوان سمکۆ و ئینگلیزیان ئاشکرا کرد. کە تورکەکان پێدەزانن هێرش دەکەنە سەری، سمکۆش دوای دەست بەسەراگرتنی سەروەت و سامان و لە دەست دانی دوو کوڕ و ژنەکەی و ژنی براکەی، لەگەڵ دە کەس لە چەکدارەکانی خۆی

دەرباز دەكات و لەگەڵ براكەی (ئەحمەد ئاغا) دەچێتە موسڵ. دوای ئەوە بە دەستووری ئینگلیزەكان بۆ بینینی خانی ماكۆ بە تەواوی كوردستاندا تێپەڕدەبێت.

خانی ماكۆ نایەوێ چاوی پێ بكەوێت، سمكۆش ناچار لە ڕێگای بایەزیدەوە بە هاوكاری عەشیرەتی زیلان دەگەڕێتەوە سلێمانی.

هاوكات سەید تەها دووهەم سەركردەی گەورەی كورد كە پاش تێشكانی سمكۆ خۆی تەسلیمی دەوڵەتی فارسەكان كردبوو لە ورمێ و بۆ لای شێخ مەحموود هەڵدێ و پەیوەندی بە ئینگلیزەكانەوە دەكات. ئینگلیزەكان فڕۆكە و ڕەشاش و چەكی قورس و پسپۆڕ و ئەندازیاری سوپایی و پارە دەدەن بە شێخ مەحموود، ئەویش لە سەرەتای تشرینی یەكەم ڕەواندز دەگرێت لە كۆتایی تشرینی دووەم بە هێزەكانی خۆی و چەكدارە ئاشوورییەكانەوە لەگەڵ هێزەكانی توركیا بە سەركردایەتی (مەمەد عەلی پاشا) لەناوچەی (وان) تووشی تێك هەڵچوون دەبن و هێزەكانی تورك ناچاردەكرێن بەرەو ئورمەو و جولە مێرگ پاشەكشێ بكەن. توركەكان تێدەشكێن و بریندارێكی زۆر دەگوازنەوە بۆ تۆتیشلو. لە هەمانكاتدا كوردەكانی بانە و عەشیرەتی سەردەشت كە ژمارەیان دەگاتە سێ هەزار ماڵ ڕادەپەڕن. ڕاپەڕین، ناوچە سنوورییەكانی كوردستانی توركیاشی گرتۆتەوە و كاربەدەستانی ئێرانیان لەناوچەی سەردەشت دەركردووە، بەپێی ئەو هەواڵانەی گەیشتوون، ئینگلیزەكان یارمەتیان ئەدەن، لایەنگرانی سمكۆش لە چەند ناوچەی كوردستانی توركیا دەبینرێن.

**ئەنجامەكان:**

بارودۆخەكە زۆر ئاڵۆز و جدییە، پێویستە توركیا بەپەلە هەنگاو هەڵگرێت و ئەو هەنگاوانەش كەس نازانێ چین[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٣٩-١٤٠.

# لە راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم

# هاوڕێ پاڤلۆڤسکی

**لە ١٩٢٣/١/١٨**

## کێشەی کورد

لەم مانگانەی دواییدا جوڵانەوەیەکی زۆر بەهێز لەناو کوردەکانی تورکیادا و عەشیرەتەکانی هاوسێیان لە کوردستانی فارس بەدی دەکرێت و لەسەرتاسەری کوردستان خەریکە پەرەدەستێنێ. لەبەر ئەوە تورکەکانیش هێزی خۆیان لە سەر سنوورەکانی ئێران زۆرتر کردووە. بەڵام ناردنی هێز ناتوانێ پێش بەم جموجوڵە گەرمەی کوردەکان بگرێت. لەبەر راپەرینی عەشیرەتی میلان لەشکری شەشی سوارەی تورکیا سێ هەفتە پێشتر نێردراوە بۆ ناوچەی دیار بەکر و لەوێ جێگیر بووە. ئەو هێزەی سەرۆکایەتی (سابیت سامی بەگ) بە قوربانیدانێکی زۆر توانی راپەڕینی ئەو عەشیرەتە دامرکێنێت و ژمارەیەك ئەفسەر لەو شەڕەدا دەکوژرێن و ژمارەیەکیش دەچنە ریزی کوردە راپەڕیوەکان. ناوچەی راپەڕینی کوردەکان بریتییە لە: موسڵ، کەرکوك، سلێمانی، لۆرستان، سابلاخ، باشووری گۆلی ورمێ[1].

## کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم:

کۆمیتەی ئەرزەرۆمی کوردی بە سەرکردایەتی رابەرێکی ناوداری عەشیرەتێکی کورد وەك رابردووە لە لایەنگری سیاسی رووسیا بەردەوامە. مەبەستی ئەم کۆمیتەیە دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆیە لە ژێر حیمایەی رووسیای سۆڤیەتی. ماوەیەك لەمەوبەر ئەندامێکی سەکردایەتی کۆمیتەی کوردی ئەستەمبوڵ بۆ روونکردنەوەی هەڵوێستی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم سەبارەت بە راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی دێتە لای سەرۆکی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم،[2] کە هەر وەك وەکو خۆی ماوەتەوە.

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤١.

(2) هەمان سەرچاوە ل ١٤٩.

## ڕەشنوسی پیرس بۆلتیۆنی ژمارە (١) کانوونی دووەمی ١٩٢٣

### کوردەکانی ماکۆ

مانگی کانوونی یەکەم، بۆ عەشیرەتەکانی جەلالی و میلان پاش تێشکانی سمکۆ، کاتیَ وەخۆهاتنەوە و تێگەیشتن و ئەزموون وەرگرتن بوو. لەو تێشکانەی بەهاری ئەمساڵ، گەیشتن بوو بە قۆناغێکی سیاسی و جموجولێکی چالاکانەتر کە تا ئێستا ناوەڕۆکێکی ناوچەیی وەخۆ گرتووە، سەرەڕای ئەوەش برەوی زۆری پەیدا کردووە. کوردەکانی ماکۆ لەبەر ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵ کوردەکانی خۆیان و تورکیا هەیانە ئاگاداری ڕووداوەکانی کوردستانی تورکیا و ناوچەی سەلماس و ورمێن. مانگی ڕابردوو جەلالیەکان لەگەڵ عەشیرەتەکانی تر بەتایبەت لەگەڵ خانی کانلۆ و مەسیرکانلۆ لێکنزیك بوونەوەو یەکیان گرت. لە نیوەی دووەمی کانوونی یەکەمدا خالید ئاغاو تاهیر ئاغا پێشنیاریان کرد کۆتایی بە دوژمنایەتی خوێناوی و تۆڵە سەندنەوە بێنن کە نزیکەی سێ ساڵە لە نێوانیاندا هەیە. هۆی ئەو دوژمنایەتییەش پەلاماردان و ڕێگرتنی مەڕ و ماڵاتی خالیکانلۆ بوو لەلایەن عەشیرەتی مەسیر کانلۆوە. مەسیرکانلۆ ڕانەمەڕێکی ئەوانیان بەتاڵان بردووە لە ئەنجامدا سێ کەسیان لێکوژراوە و دوانیشیان بریندار بووە، تا ئێستا وتوویژی سەرۆك عەشیرەکانی کورد بۆ ئاشتەوایی سەرکەوتوو نەبووە. تایەر ئاغا ڕانەکەی گەڕاندۆتەوە لەگەڵ عەشیرەتی خالیکانلۆ ئاشت بۆتەوە.

بەم چەشنە ئەگەر خالید ئاغا بتوانێت لەگەڵ بەگی خالیکانلۆکانیش ئاشت بێتەوە (کە دوژمنایەتی لەگەڵیاندا هەیە) دەبێتەهۆی یەکگرتنی تەواوی جەلالیەکان بۆ ڕاپەڕینی بەهاری داهاتوو.زۆر جاریش شتی ئاوا ڕوویداوە. میلانیەکان بەچەك و تەقەمەنی کە لەقاچاخچییانی سنوورەکانی ئێمە دەیکڕن، خۆیان چەکدار دەکەن (پاسەوانەکانی سنوور لەبەر کەمی هێز ناتوانن سەرکەوتوانە بەرەنگاری ئەو قاچاخچیانە ببنەوە). لە ڕاستیدا میلانییەکان نایەنەویَ لەگەڵ دالاییەکاندا یەکبگرن، دووبارە دەستیان کردۆتەوە بە تاڵان کردن و ڕفاندنی مەڕ و ماڵاتی شێخ کانلۆوەکان و بۆ شەری یەکتر خۆیان ئامادە دەکەن. دەردەکەوێت میلانیەکان شەڕخوازن و خەریکن گێرەوکێشەی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی فارس چارەسەر بکەن و پێگەی خۆیان بەهێز دەکەن. ئەمەش لاوازی دەوڵەتی فارس بەرامبەر بە سیاسەتی کوردی دەردەخا.

سەرداری ماکۆ دوو ساڵ لەمەو بەر توانی دووبەرەکی بخاتە ناو عەشیرەتی میلان و بیانکاتە دوو گرووپی دوژمن بەیەك، واتە شێخ کانلۆوەکان مامی کانلۆوەکان لە لایەك و دالایی و کیجەلانیەکان لە لایەکی تر. بەڵام ئەم رووداوە رێگای لە عەلی حوسێنی نەگرت هاوین بچێتە لای سمکۆ و ببێ بە یەکێك لە فەرماندەی هێزەکان، یا عەبدوڵڵا ئاغا ئەویش، چووە ریزی هێزەکانی سمکۆ.ناوچەیەکی گەورە و پان و بەرین لە ژێر دەسەڵاتی سمکۆ دایە و ئەمە دەرفەتە بۆ سمکۆ کە هەر یەك لەو هۆز و خێڵە دوژمنانە بنێرێ بۆ ناوچەیەك یا بەرەیەکی شەڕ و لێکیان بکاتەوە و بەم چەشنە لە هەردوولا کەڵك وەربگرێت. بەشێکی زۆر لە سەرکردەکانی میلان لە شۆڕشی سمکۆ بەشداریان کرد کە بەزیانی دەوڵەتی فارسی کە هەڵەی خۆی بوو کۆتایی هات. هەروەها چالاکی و جموجۆڵ لەناو حەیدەرانلۆوەکان کە هەمیشە دژی سەردار بوون بەرچاودەکەوێت، دوژمنایەتیان لەگەڵ سەردار لەسەر خالیس-قەرەنی بوو، لەلایەکی ترەوە لەبەر کەمبوونی ژمارەیان لەم هاوینەدا بەرامبەر بە سمکۆ هەڵوێستکی تەماشاچییان هەبوو. سەرۆکەکەیان حەیدەر ئاغا خەریکی پەیوەندی کردنە لەگەڵ هۆزەکانی خۆی واتە ئاباگینیەکان بەتایبەتی لەگەڵ حوسێن بەگ، بێ گومان حەیدەرانلوەکانی ماکۆ هەڵوێستیان بەستراوە بە دەستووری ئاباگەوە. بۆیە پێویستە ئاگاداری جموجۆڵ و چالاکی کوردەکانی ماکۆ بین چونکە لەگەڵ راپەڕینی کوردەکانی تر لە بەهاردا، بێ لایەن نابن ئەوانیش رادەپەڕن[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤٢-١٤٣.

## پەیوەندی ئەمیر لەشکر لەگەڵ سەردار رەشید و سەنجابی

نێوان ئەمیر لەشکر و سەردار رەشید کەمێك باشتربووە، بەڵام ئەمیر لەشکر وەك رابردوو هەر دوژمنی سەنجابیە، بەفێڵباز و خائینی دادەنێ، دەڵێ: هیچ کاتێك بەدووری نازانێ بچێتە لای ئینگلیزەکان، بەڵام لە راستیدا ئەم فاکتەرانە نین، بەڵکو سەربەخۆیی زیاتری سەنجابی و ئەو رۆڵەیەتی کە پاڵی بە ئەمیر لەشکرەوە ناوە هەڵوێستی دۆستانە نەگرێتەبەر بەرامبەر سەردار موقتەدیر و سالار زەفەری سەنجابی[1].

## یەکێتی (شورای) عەشیرەتەکان

لە کانوونی یەکەمی ساڵی پارەوە گۆڕانێکی بەرچاو لەناو ئەو عەشیرەتانەی کە بوونەتە ئەندامی یەکێتی (شورای) عەشیرەتەکان روویندەداوە. کۆچی زستانەی سەنجابیەکان لەسەر سنووری میزوپۆتامیا لە کۆتایی کانوونی یەکەم دوای هات، هەروا خەریکی خۆرێکخستن و چەکدارکردنی خۆیانن. لەم دواییانەدا عەشیرەتی سەنجابی خۆیان زۆر بە هێزکردوە کە ئەویش پتر هەوڵی سەردار موقتەدیر و سالار زەفەرە.هاوکات لەگەڵ سەنجابیەکان بەشێکیش لە عەشیرەتی گۆران کۆچیان کردووە بۆ میزوپۆتامیا و دەیانەوێ لەوێ بمێننەوە، چونکە جگە لەزوڵم وزۆرو بەرتیل وەرگرتنی دەسەڵاتدارانی سوپا دەوڵەتی فارس داوای مالیات و باجێکی زۆریان لێدەکات. سەنجابیەکان ئەوەش بە دور نازانن کە دەسەڵاتدارانی تاران لە داهاتوویەکی نزیکدا لەگەڵیان بکەوێتە وتووێژ و ئەگەر تاران داخوازییەکانیان جیبەجێ نەکات لە کێشەی زەوی زار پاشگەز نەبێتەوە جۆرێکی تر دەجوڵێنەوە و باردەکەن.

لە هەمان کاتدا سەنجابیەکان لەسەر ئەو یەکگرتنە سیاسیەی سەردار ناسر بەردەوامن و بۆ ئەم مەبەستەش دەیانەوێ ئەوانەی بێ سەرکردە مابوونەوە یاپێشتر لە هۆز و خێڵەکانی کورد جیابوونەوە بەرەو لای خۆیان رایانکێشن و هەوڵ دەدەن تابۆیان بکرێت کادیرەکانیان زیاد

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤٣.

بکەن، بۆ ئەم کارەش میتۆدی جۆراوجۆر بەکاردەهێنن. بۆ نموونە لە ڕێگای کاربەدەستێکی وەك مورتەزاخان کە لەناو ئەو عەشیرەتانەی دۆستی ئێمەن جێگا و ڕێزی خۆی هەیە. ئەم هەنگاوە لە لایەکەوە شتێکی باشە و لە لایەکی ترەوە لەوانەیە ببێتەهۆی ساردبوونەوەی پەیوەندی عەشایرەکانی تر لەگەڵ سەنجابیەکان و مەترسیشی تێدابێت. ئێستا پەیوەندی سەنجابیەکان لەگەڵ عەشیرەتی کەڵخانی گۆران و وەڵەد بەگی و عەشیرەتە بچووکەکانی تر کە هاتونەتە ریزی یەکێتی عەشیرەتەکان زۆرباشە. ئەمیر مەخسوس (موعەززەم کەلهوڕ) دوای کوشتنی نەیارەکەی واتە ئەمیر ئەعزەم جێگای خۆی لەناو عەشیرەتەکەیدا پتەوترکردووە. بەهۆی لایەنگری و یارمەتی وەرگرتن، ئەمیر لەشکر هەڵوێستێکی دوژمنانەی بەرامبەر بە سەنجابیەکان و دواجار بەرامبەر بە یەکێتی عەشیرەتەکان وەرگرتووە. بەشداری ناڕاستەوخۆی ئەمیر لەشکر لە کوشتنی ئەمیر ئەعزەم ئەم راستیەی ئاشکرا کرد کە لە کاتی تەقەکردندا سێ سەرباز لەوێ بوون و هیچ هەنگاوێکیان بۆ گرتنی بکوژەکانی پاشاخان هەڵنەگرتووە. ئێستا لەناو تێکرای عەشیرەتەکانی روژئاوا برای ئەمیر مخصوص کەلهوڕ جێی متمانەی تەواوی ئەمیر لەشکرە.

گەرچی دۆستی فەرماندەی لەشکر ئەو کەسەیە کە ئەمیر لەشکر نازناوی رەئیس عەشایری (سەرۆك عەشایر) لێناوە و تائێستا چەند دیاریەکی بەناوبراو (ئەمیر مەخسوس)بەخشیوە.وەلێ چاوەڕوان ناکرێ پێگەی ئەمیر مەخسوس بۆ ماوەیەکی درێژ هەروا بە هێز بێ، چونکە سەرۆکەکانی عەشیرەتی سەنجابی بەنهێنی پروپاگەندەیەکی زۆری بۆ دەکەن و زەمینە خۆش دەکەن لەناو کەلهوڕەکاندا دەربکرێت. ئێستا سەنجابیەکان بە رێبەرایەتی کەریم خان برای ئەمیر ئەعزەمی کوژراو هێزی خۆیان بۆ دژایەتی کردنی ئەمیر مەخسوس لە مەندەلی (لە میزوپۆتامیا) کۆکردۆتەوە. هەروەها ژمارەیەکیش کەلهورییان رەگەڵ خۆ خستووە، لەم دواییەشدا مەهدی خان لەگەڵ سوارەکانی خۆی چۆتە ریزی هێزەکانی کەریم خان. مەهدی خان زاوای ئەعزەمی کوژراوە و وا چاوەڕێ دەکرێ هێزەکەیان پەرە بگرێت. وەك پێشبینی دەکرا کۆنەپەرستان لە کرماشان کردوویانە قاو گوایە کەریم خان پشتیوانی ئینگلیزەکان دەکا، بەم چەشنە دەیانەوێ پێش ئەوەی دەسبە راپەڕین بکا بەدناوی بکەن. پێگەی سەردار رەشید زۆر بە هێزبووە بەلاّم ئەگەری تێکهەڵچوونی لەگەڵ لەشکری ئێران هەیە. لە هەمان کاتیشدا ئینگلیزەکان بە یارمەتی قایمقامی کوردستان و کۆنەپەرستی ناوچەکە (ئەسەف الدەولە)

گوشارێکی هەمەلایەنەیان خستۆتە سەر سەردار رەشید تا نێوانی لەگەڵ یەکیەتی عەشایرەکان تێك بدات. لە نیوەی یەکەمی کانوونی یەکەم کۆنسوڵی ئێمە لە کوردستان هەواڵی پێگەیشتووە سەردار رەشید دیسانەوە پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە کردووە،بەلاّم راستی و ناڕاستی ئەم هەواڵەمان تاقی نەکردۆتەوە.دەڵێن (میرزا فەتحولاّ)ش ئەجیندای پێشوی سمکۆ، هاوینی رابردوو هەوڵی داوە پەیوەندی لە نێوان سمکۆ و سەردار رەشید دروست بکات،گوایە ماوەیەك لەمەوبەر بەفەرمانی سەردار رەشید هاتۆتە (کرماشان) تا بەرەبەرە پەیوەندی لە نێوان سەردار رەشید و ئینگلیزەکان بخولقێنێ.

رۆشتنی (وەلی زادە) لە سەرەتای کانوونی یەکەم بۆ شار، گوایە هەر بە دەستووری سەردار و بە مەبەستی وتووێژ لەگەڵ ئەمیر لەشکربووە. دەچێتە کۆنسوڵی ئینگلیز لە تاران بۆ دانەوەی ئەو قەرزەی رەشید دوو ساڵ لەمەوبەر لە کونسوڵی ئینگلیزی وەرگرتووە و نایەوێ بیداتەوە بە دەوڵەتی ئێران.

بەلاّم سەردار رەشید سەنجابیەکان و عەشیرەتەکانی تری ئەندامی «یەکیەتی عەشایرەکان»ی لە رۆشتنەکەی وەلی زادە ئاگادار کردبۆوە. بۆیە دوور نییە پەیوەندی سەردار و ئینگلیز درۆ بێ (1).

## ئیش و کاری کونسوڵی تورکیا لە سنە:

ئەمرۆ لە کوردستان نزیکەی هەزار کەسی خەڵکی تورکیای لێیە کە لەلایەن قائمقامەوە تەنگاو دەکرێن. بەلاّم کۆنسوڵی تورکیا (میرزا فەخروڵلاّ) هێندەی ئاگای لە عەشایرەکانە ئەوەندە ئاگای لە هاوولاّتیانی خۆی نیە. بۆ نموونە دەورێکی بەرچاوی بینی لە ئاشت بوونەوەی سەردار رەشید و جەعفەر سوڵتان (جافرسان) و عەشایری هەورامان(2).

(1) هەمان سەرچاوە ١٤٤-١٤٥.

(2) هەمان سەرچاوە ل ١٤٥.

## پەیوەندی کۆنسۆڵی رووسیا لەگەڵ کونسوڵی تورکیا میرزا فەتحوڵڵا:

کۆنسوڵی ئێمە لە کرماشان درێژە بە پەیوەندی خۆی لەگەڵ کۆنسوڵی تورکیا دەدات و ئەم پەیوەندییە زۆر گرنگە، چونکە ناوچەی ژێر چاودێری ئەو سەر بە ناوچەی چالاکی و ئیش و کاری شێخ مەحموودە، هەر لەبەر ئەوەشە سیخوڕی کۆنسوڵی تورکیا لە سەقزە و پەیوەندییەکی بەردەوامی لەگەڵ فەتحوڵڵادا هەیە. ئەمەش دەرفەتە بۆ ئێمە تا لەناو عەشایرەکانی کوردستاندا ئیش و کاری خۆمان بکەین[1].

## بزووتنەوەی شێخ مەحموود- بەهێزبوونی

لەم چەند مانگەی دواییدا شێخ مەحموود زۆر بەهێز بووە وبزوتنەوەکەی خەریکە کوردستانی فارسیش دەتەنێتەوە. دوای راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، شێخ مەحموود ژیرانە دەستی بە رێکخستنی سوپاکرد. هەر نەفەری سوپای پیادە و سوپای سوارە لە مانگێکدا هەشتا روپیە و جل و بەرگیش وەردەگرن.

ئینگلیزەکان سێ فڕۆکەیان ناردۆتە سلێمانی. ئالای دەوڵەتەکەی مانگ (هیلال) و ئەستێرەیە، پایتەختی کوردستانی سەربەخۆ سلێمانییە، لەوێ رۆژنامەی (بانگی کورد) بە زمانی کوردی دەردەچێت. بۆ کۆنترۆڵکردنی کاروباری دەوڵەتی کوردی لە سەرەتای تشرینی دووەمدا ئینگلیزەکان (مابۆرنۆئێل) و (پیرسی کۆکس)یشیان وەك ئەجیندای خۆیان لەبەغداوە ناردە سلێمانی. وادەردەکەوێ ئینگلیزەکان باوەری تەواویان بە شێخ مەحموود نییە، لەبەر ئەوە پول و پارەی دەوڵەتی کوردستان لە دەست ئەواندایە.

تۆڕی هەواڵگری زانیاری پەیداکردووە کە ناوچەی باشووری (باش قەڵا) تا قازی مەحمەد بە تەواوی کەوتۆتە ژێر کاریگەری و کونترۆڵی شێخ مەحموود. ئەفسەرانی تورك و موچە خۆرانی دەچنە سەر سنووری تورکیا لە ناوچەی رەواندوز لە (باش قەڵا) بە خاکی فارسدا واتە سەلماس - ەواندوز. لە ٣ی کانوونی یەکەم ئەفسەرێکی تورك لەگەڵ سێ سەرباز دێنە سەلماس و دوو ئەفسەری تورکیش هاتوونەتە ورمێ و.... دەنگۆیە سوپای تورك بە خاکی فارسدا دەچنە

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤٦.

ڕەواندوز. شێخ مەحموود لە خاکی ئێران لە ناوچەکانی سەردەشت و بانە زۆر چالاکە، بۆیە سوپای ئێرانیش لە ورمێ وە بەرەو وێ کەوتووەتە ڕێ[1].

## پەیوەندی شێخ مەحموود و عەشیرەتە کوردەکانی فارس (ئێران)

شێخ مەحموود بۆ نزیك بوونەوە لە عەشیرەتە کوردەکانی کوردستانی فارس، (مەحموود خانی دزلّی)کردە قائیمقامی هەڵەبجە، کە ڕێبەرێکی ناوداری کوردەو تا ئەم دواییانە یەکەم کەس بوو دژی ئینگلیز ڕاوەستابوو. بەڵام هێندەی پێ نەچوو شێخ مەحموود ئەم بڕیارەی گۆڕی، شێخ کەریمی کردە قائمقامی هەڵەبجە. کوردەکان دەڵێن شێخ مەحموود بەم کارەی نەیارێکی گەورەی بۆ خۆی دروست کردووە، چونکە مەحموود خانی دزلی لەناو کوردەکانی سەر سنوور زۆر بەناوبانگە. شێخ مەحموود توانی سەرۆکی عەشیرەتی هەمەوەند (کەرکی بەگ) بۆ لای خۆی ڕابکێشێت کە لە مانگی حوزەیرانی ئیمساڵ دوو ئەفسەری ئینگلیزی کوشتووەو سەرکەوتوانە ئەو هێزانەی ئینگلیز تێکدەشکێنێت کە دوای دەکەون. کەریم بەگ لەگەڵ ئینگلیزەکان ئاشتبۆتەوەو بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ شێخ مەحموود چۆتە سلێمانی[1].

## هەڵوێستی عەشیرەتە کوردەکانی فارس بەرانبەر شێخ مەحموود

کوردەکانی ئیران زۆر بە پەرۆش و ورياييەوە دەڕواننە کردەوەکانی شێخ مەحموود، بەڵام بۆچوونیان وەك یەك نییە، هەندێ دەڵێن شێخ مەحموود وەك ڕابردوو لایەنگری ئینگلیزە و دەیەوێ هەتا بتوانێ یارمەتییان لێوەربگرێت و پاشانیش دژیان ڕاوەستێت. هەندێکی تر دەڵێن بەدڵ لەگەڵ ئینگلیزەکانە. هێشتا هەڵوێستێکی دیاریکراویان سەبارەت بە کوردستانی سەربەخۆ نییە[2].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤٦.

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤٦.

(2) هەمان سەرچاوە ل ١٤٧.

# کوردەکانی ماکۆ

لە بەشێکی راپۆرتەکەمان سەبارەت بە کوردەکانی ماکۆ گوتمان جموجۆڵ لەناویاندا زۆرە و دەوڵەوتی فارس زۆر لەوە دەترسێت راپەڕن. بەڵام بیروباوەڕ و مەبەستیان چییە؟ دیار نییە، ئەوەی گرینگە ئەوەیە: دەبێ بزانین عەشیرەتی میلان کە لایەنگری تەواوی سمکۆ بوون بیروڕایان چییە؟. بە پێی ئەو پرسیارانەی لە خەڵکی ئاسایی عەشیرەتی میلان کراوە، بۆیە پشتیوانی سمکۆ دەکەن هەموویان دەڵێن: «سمکۆ ناوچەیەکی پان و بەرینی لە ژێردەستایە هەم رێکوپێکی تێدایە هەم باشترین لەوەڕگایە، لێرە عەجەمەکان چییان بوێت پێمان دەکەن و لەوەڕگا و هەوارگەکانمان لێ دەستێنن و ناچارمان دەکەن خزمەتیان بکەین، دژی یەکتر شەڕ و ئاژاوەمان بۆ دەنێنەوە و هیچ یاسایەك نییە. لای ئێمە فەرق ناکا سەر بەکێ بین، گرنگ ئەوەیە یاسایەك هەبێت، بەڵام نەك وەك یاسای فارسەکان،یا یاسایەك وەك یاسای رووسەکان». سەبارەت بە رێبەرانی میلان، سمکۆ فریوی داون و یارمەتی ماددیان دەدات بۆ نموونە: بەڵێنی بە عەبدوڵڵا ئاغا داوە ئەگەر بێتو شەڕ بکا دوای سەرکەوتن دەیکاتە قائمقامی مەحاڵ.

عەجەم، میلانیەکانیان لەسەر باشترین زەوی و زاری باوباپیرانییان دەرکردووە بۆ نموونە لە زەوییە پڕ بەرەکەتەکانی مەحاڵ و چای پاریان لێستاندون و ناچاریان کردوون لە گوندەکانی خان جێگیربن و وەك رەعیەت کاربکەن، لەوێ هەم زەوی کەمە و هەم لەوەڕگاشی لێ نییە. بارووDۆخی جەلالیەکان کە کۆچەرن لە سایەی پاسەوانانی سنوورەوە نەگۆڕاوە چونکە پشتیان بەوان (بە جەلالیەکان) بەستووە. هەروەها سمکۆ بەڵێنی قائمقامیەتی ماکۆی بە خالید ئاغا داوە. هەم عەشیرەتی میلان و هەم جەلالی باش دەزانن کە سیاسەتی خانی ماکۆ ئەوەیە کە هەمیشە بەگژ یەکتریاندا بکات. ئەوانە هەموویان دژی عەجەمن و دەیانەوێ دەوڵەتی کوردی و حوکمداری کوردیان هەبێت(1).

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤٧-١٤٨.

## کوردەکانی ناوچەی ورمێ و ماکۆ

لەناو کوردەکانی ئەو دوو ناوچەیەشدا جموجۆڵی زۆر دەبینرێت، بەنهێنی چەکێکی زۆریان کڕیوە، هەر بۆیە چەك لێرە لە چاو ناوچەی (خۆی) گرانترە.

## پەیوەندی نێوان فارس و کورد سەبارەت بە کێشەی کورد

لە گەشتەکەی فەرماندەی هێزەکانی باکوور-رۆژئاوای دەوڵەتی فارس عەبدوڵڵا خان بۆ ناوچەی ورمێ و سەلماس و چەند شوێنێکی تری باکوور-رۆژهەلات، دەکرێ بگوترێت کە دەوڵەتی فارس و تورك لەسەر هەندێك کێشەی کورد نزیك بوونەتەوە[1].

## مەترسی ئینگلیز لە چالاکی هاوبەشی سوپای فارس و تورك دژی شێخ مەحموود

بەپێی ئەو زانیارییانەی هەمانە ئینگلیز لە نزیك بوونەوەی تورك و فارس زۆر نیگەرانە. گوایە تورکیا دەیەوێ بە سەلماس و ورمێدا سوپای خۆی بۆ بەرەی موسڵ بنێرێ، و بۆ ئەم مەبەستەش پسپۆڕەکانی سەربازی خۆی کە ژمارەیان چل کەسە، ناردۆتە ناوچەکە بۆ ناسین و تاقیکردنەوەی رێگاکان. تورکیا هاوکات دژی گەڕانەوەی مەسیحیە هەلاتووەکان پروپاگەندە دەکات.

کۆنسوڵی ئینگلیز لە تەورێز لەم بارەوە بە بروسکە کاربەدەستانی خۆی لە تاران ئاگادار کردۆتەوە، لە (١٨)ی کانوونی یەکەمدا داوای لە شای ئێران کردووە بەزووترین کات سیخورەکانی دەوڵەتی تورکیا لە ناوچەکە وەدەرنێ. و لە (٢٠)ی هەمان مانگدا کۆنسوڵی ئینگلیز لە چاوپێکەوتنی قائمقامی تەورێز (ئیسماعیل خان) و فەرماندەی لەشکری فارس عەبدوڵڵا خان بارودۆخی ورمێ و سەلماسیان بە دوورودرێژی باسکردووە. کاربەدەستانی ئێران لە وەلامی کۆنسوڵی ئینگلیزدا دەڵێن: ئەم دەنگوباسانە لە راستیەوە دوورن، دەسەلاتی ئێران لە ناوچەکانی سەر سنووری تورکیا بەهێزو وشیارە.

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤٨-١٤٩.

لە (٧)ی کانوونی یەکەمدا وەزیری جەنگ و وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی فارس فەرمانداری ناوچەکە بەم بروسکەیە ئاگادار دەکەنەوە: «ئاگادارکراوینەتەوە کە پێت رابگەیەنین ژمارەیەك تورك بەبێ لەبەرچاوگرتنی یاسا بۆ مەبەستی خۆیان ئاودیوی سنووری ئێمە بوون بەتایبەت لەناوچەی سەلماس، ئەم کردەوەیە بۆتە هۆی نیگەرانی دەوڵەتەکەمان لە ئاڵۆزبوونی پەیوەندیمان لەگەڵ دەوڵەتی دۆست و هاوسێ (تورکیا)، پێویستە پێش بەو هاتووچۆیانە بگیرێت تاڵە داهاتوو دووپات نەبنەوە. سەرکردەکانی کوردیش ئاگاداربکەنەوە کە هاتووچۆی تورکیا نەکەن[1].

## شێخ مەحموود و دەسەڵاتی سۆڤیەتی

لە ١٠ی فێبرایەری ١٩٢٣ کوردێك کە خۆی وەك سکرتێری شێخ مەحموود ناساند هاتە کۆنسوڵی ئێمە لە تەوریز، نامەی شێخ مەحمودی پێبوو، لەم نامەیەدا شێخ بۆ سەربەخۆیی کوردان داوا دەکات پشتیوانی گەلی کورد بکەین دژی ئینگلیزەکان. هەروەها داوای یارمەتی و چەك دەکات لەبەرامبەریدا، وەفاداری خۆی بۆ دەوڵەتی رووسیا دەردەبڕێت.(کوردەکە نامەی بۆ فەرماندەی لەشکریش پێبوو) لەبەر ئەوە لەوانەیە ئەمە پیلانێکی تری ئینگلیزەکان بێت. باڵوێزی ئێمە لە تاران دەستووری بە کۆنسوڵ داوە بە نوێنەری شێخ بگوترێ نابێ کارێکی وابکا ئینگلیزەکان لێی بکەونە شك. لە هەمانکاتدا کۆنسوڵەکانی سەرسنوورمان بەگشتی دەستوورێکیان سەبارەت بەکێشەی کورد داوە. کە کورتییەکەی ئەمەیە: (ئێمە ئێستا ناتوانین هاوسۆزو لایەنگری بیروباوەڕی سەربەخۆیی کوردستان بین، ببێتە دەوڵەتێکی سەربخۆ و پیشوازی لێبکەین، چونکە بێگومان دژی ئێمە کەڵکی لێوەردەگرێ. بۆیە دابین کردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانەی تێیدا دەژین، لە بەرژەوەندی ئێمەدایە)[1].

## چاپەمەنی کوردی

لە سلێمانی رۆژنامەی (رۆژی کورد) بە زمانی کوردی و تورکی کە لە مانگێکدا چوار جار دەردەچێت و ئۆرگانی رەسمی دەوڵەتی کوردستانە، سەرنووسەری ئاغا کەماڵە و بەرپرسیاری نوریەیە.

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٤٩-١٥٠.

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٥٠.

یەکەم ژمارەی لە ١٥ی نۆڤەمبەری ١٩٢٢ دەرچوو. بۆ شارەزا بوون لەم رۆژنامەیە، وەرگێڕاوی ژمارە ٧ی لە ٣ی جانیوەری ١٩٢٣ پێشکەش دەکەین.

١- بروسکەی شێخ مەحموودی تێدایە لە ٣٠ی دیسامبەری ١٩٢٢ بۆ کاپتن چیمەن جێگری کۆمسیاری بەرزی ئینگلیز لە بەغدا. شێخ مەحموود تێدا وەڵامی پیرۆزبایی ناوبراو دەداتەوە بە بۆنەی راگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستان و سوپاسی دەوڵەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا دەکات کە یارمەتی کوردی داوەو پشتیوانی کردووە، هیواداری خۆی دەرەبڕێت کە لەداهاتوودا خوا یارمەتی کوردستان بدات.

**ئیمزای مەلیکی کوردستان**

ژمارەی ٧ی رۆژنامەی (ستارە)ی ئێران هەواڵێکی پێچەوانەی راستی بڵاوکردۆتەوە کە بۆیە ئێمە ناچارین بۆ روونکردنەوەی ئەم کێشەیە ئەو وتووێژانەی کە لە نێوان ئیسماعیل ئاغای سمکۆ و سەید ئاغا لە لایەکەوە و خاوەن شکۆ و مەلیکی کوردستان لە لایەکی ترەوە بەڕێوەچووە بڵاوبکەینەوە.

بروسکەی سمکۆ لە هەولێرەوە. لە رۆژی ١٤ی کانوونی یەکەم کە بۆ مەلیکی کوردستان ناردوویەتی: «لەبەر ئەوەی کە داهاتووی چارەنووسی گەلی کورد لە دەست خاوەن شکۆدایە و بەبێ ئیجازەی وی ئێمە نامانەوێ هیچ هەنگاوێك هەڵگرین، بۆ رزگارکردنی نیشتمان و گەلی چەوساوەی کوردستان داوای یارمەتیتان لێ دەکەین».

## وەڵامی شێخ مەحموود

**پاڵەوانی کوردستان- ئیسماعیل ئاغا:**

لەوانەیە ئێوە ئاگاداربن کە من بە تەنیا بۆ پارێزگاری لە مافی گەلی کوردستان تووشی چ کوێرەوەرییەك بووم. پێم وایە پێویست بەوە ناکات ئارەزووی خۆم سەبارەت بە چالاکی هاوبەش لەگەڵ قارەمانێکی نەتەوەیی وەك ئێوە دەربڕم.

ئاشكرایە كە خەباتێكی ئاوا بەبێ یارمەتی تەنیا بۆ پارێزگاری لە مافی گەل دەكرێت و تەنیا بۆ گەیشتن بەم مەبەستە گەلی كورد توانیویەتی گیانی خۆی بكاتە قوربانی. ئێستا مافی ئەوەمان پێ نەدراوە بۆ راپەڕاندنی گەلەكەمان بۆ داواكردنی مافی خۆمان بەرامبەر بە دوژمنان پڕۆپاگەندە بكەین. ئەو مافەی كە ئێمە داوامان كردووە بەبیانووی هیچ و پوچەوە هێشتا چارەسەرنەكراوە ئەوە سێ مانگە دەوڵەتی بەرێزی بەرتیانیا بەڵێنی یارمەتی پێداوین بەڵام لە سەدا یەكیشی جێبەجێ نەكردووە لەبەر ئەوە ناتوانم بانگەوازی گەلی كورد بكەم بۆ ئیش و كار. من ئەمەوێ تەنیا كار بۆ راستی بكەم و خۆم لە خوێن رشتنی خۆڕاییی لەسەر كێشەی موسڵ دەپارێزم.

ئەگەر مافی ئێمە چارەسەبكرێت بۆ دەركردن و لەناوبردنی دوژمنانمان ئامادەی هەموو قوربانی دانێكین و ئەگەریش بێتو چارەسەر نەكرێت دەمانەوێ لە ژێر چاودێری دەوڵەتی ئینگلیز بین و پێی وەفادار و دڵسۆز بین و بێ لایەن بمێنینەوە. ئەگەر پێویست بە وردبوونەوە دەكا داوات لێ ئەكەم بۆ وتووێژكردن بێی بۆ لامان.

## بەپەلە، سلێمانی، خاوەن شكۆ مەلیكی كوردستان

جگە لە دەوڵەتی بەریتانیا كەس ناتوانێت مافی خۆمانمان پێبدات. دەوڵەتی بەریتانیا چاوەڕێی خزمەتە لە ئێمە و لە بەرامبەر یارمەتی دانمان بەو دەوڵەتە ئێمە دەتوانین مافی خۆمان وەرگرین و تەنیا خاوەن شكۆ دەتوانێت بەم ئەركە هەڵستێت و بە یارمەتی خوا بەبێ رژانی خوێنی موسڵمانان ئێمە مافی خۆمان وەردەگرین. پێموایە دەبێ لە سەرەتادا دەست لەناو دەستی یەكتر بكەین و دوژمنی ناومان دەركەین و پاشان ئێمە دەتوانین لە دەوڵەتی بەریتانیا مافی خۆمان وەرگرین.

لە خزمەتتانم

**سمكۆ**

**١٤ی كانوونی یەكەم**

## قارەمانی کورد ئیمساعیل ئاغا لە هەولێر

راستیەکەی ئەوەیە کە دەبێ سوپاسی ئەو یارمەتی و چاکەیە بکرێت کە بەرامبەرمان کراوە. جگە لە دەوڵەتی بەرێزی بەریتانیا کەسێکی تر مافی ژیان و بەختەوەریمان پێ نادات. ئەوەندەی کە حەز دەکەم دژی دوژمنەکانمان خەبات بکەم هێندەش نامەوێ شەڕ بکەم. ئەگەر دەوڵەتی بەریتانیا ئەو بەڵێنانەی پێداوین جێبەجێیان بکات و ئەو یارمەتییە مادیەی بڕیارەیان داتێ بۆ بەرەنگابوونەوەی دوژمنانمان، ئەو دەم تەواوی گەلی کورد ئامادەیە بۆ وەدەرنانی دوژمنانی وڵاتەکەمان. جارێ نازانم دوژمنی گەلەکەمان کێیە؟ و نازانم کێ مافی خۆمان پێ دەدات؟ و کێ دژمان رادەوەستێ؟، هۆی ئەوەش نازانم کە بۆچی ئەو مافە بە دەست خۆمان نییە؟ و نازانم دەبێ دژی کێ ئێمە خەبات بکەین؟ و لەسەر حیسابی کێ خوێنی خۆمان بڕێژین؟. ئەگەر ئێمە رێگای خوێن رشتن بگرینەبەر یەك کوردمان لە پشت نابێ. بۆیە ئەگەر لێمان بپرسن بۆچی خەڵك دەکەنە قوربانی ئێمە وەڵامێکمان نابێت. لەبەر ئەوە پێموایە باشترە گوێرایەڵی دەوڵەت بی و بێلایەن لە ماڵی خۆت دابنشیت.

**«مەحموود»**

## بەپەلە، رەسمی، ١٤ی کانوونی یەکەم، سلێمانی

## خاوەن شکۆ مەلیکی کوردستان

دەستەکانت ماچ دەکەم و خۆم بە بەختەوەر دەزانم ئەگەر ئەوەندە بەرامبەر بە من لوتفتان هەیە. تەواوی پرسیارەکانم بە ئیسماعیل ئاغا وتووە.

**«سەید ئاغا»**

## وەڵامەکەی ١٤ی دیسامبەر

## برای بەڕێز سەید ئاغا لە هەولێر:

سوپاستان دەکەم کە دەرهەق بە من ئاگادارن و چاوتان لە منە، وەڵامەکەتم بە ئیسماعیل ئاغادا نارد. من کوردم و خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە بە کوردی بژیم و خۆشحاڵم کە گوێبیستی هەستی نەتەوایەتی و نیشتیمانی سەدان پاڵەوانی کوردی ئاوا دەبم.

## راگەیاندن

١- لابردنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی پشکنین.

٢- عارف سائیب ئەفەندی بەسکرتێری دووەمی بارەگای خاوەن شکۆ مەلیك مەحمود دانراوە.

٣- کەرەتەکانی سوپایی و پۆلیسی کە لە پایەتەختی کوردستانەوە نێردرابوون بۆ رانیە گەڕاونەتەوە. تەواوی کاربەدەستانی گەورە (ئەرستوکرات) و پیاوە ناودارەکان چوون بۆ پیشوازیان و بەدەم تەپڵ لێدانەوە گەیشتە رانیە و ئالای پیرۆزی کوردیان لەناوەندی رانیە هەلکرد. شوکر ئیتر ئەم ئالا پیرۆزە لە رانیە دەشەکێتەوە.

لەچاپخانەی دەوڵەتی لە سلێمانی چاپکراوە[1].

## عەشیرەتەکانی ناوچەی کرماشان

**کەڵهوڕ:** عەشیرەتی خالیدی –هامان- هارون ئاباد- ماسولی-شیانی-شین سیا-کارگە کولیای-قوبادی، ژمارەی چەکدارەکانیان شەش هەزار کەسن و ژمارەی گشتی دانیشتوانیان سی هەزار کەس. بەهاران لە مایدەشتەوە بۆ کرینە و لە زستاناندا لە خارسیمایەوە بۆ باشووری قەسری شیرین کۆچ دەکەن.

**سەنجابی:** ژمارەیان دوو هەزار بنەماڵەیە واتە حەوت هەزار کەسن پێنج سەد چەکداریان هەیە.

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٥٠-١٥٤.

ژمارەیەك لە عەشیرەتەكانی ئەحمەد كەلهورِ و ئەحمەدی و داوەند گۆران و جاف سەر بە سەنجابییەكانن.

سەردار ناسراو، سەردار موقتەدیر و سالار زەفەر دیموكراتن كە ساڵی ١٩١٩ گیرابوون و دوو ساڵ لە زیندان بوون و پاشان ئینگلیزەكان ئازادیان كردن.

**هۆزی جەلال وەند:** سێ هەزار بنەماڵەن كە لە پێشكۆ تا پشتكو دەژین و ژمارەی گشتیان هەشت هەزار كەسن پشت كۆ: بیست هەزار بنەماڵەن و شەست هەزار نەفەرن و نۆ هەزار چەكداریان هەیە. والی پشت كۆ بە تەواوی لە دەسەڵاتداری تاران سەربەخۆیە، جگە لەمالیات هیچ شتێكی تری دەوڵەتی ناوەندی بە رەسمی ناناسێت و لەناو عەشیرەتە عەرەبەكانی سەر سنوور دەورو رێزی هەیە.بەیەكێك لە دەوڵەمەندەكانی فارس دەناسرێت و ئامادە نییە سەر بەهیچ دەوڵەتیكی بێگانە بێت یان بكەوێتە ژێر ركێفیان. زیاتر خەریكی كشتوكاڵ و زەوی و زارن. ئاژەڵ و خوری (ئەپیوم) دەنێرێتە میزوپۆتامیا و كرماشان. پایزی ١٩٢٢ كوڕی والی (زەرغەم ئەلسەڵتەنە) بە پشتیوانی ئینگلیزەكان دژی والی راپەڕی. بەڵام لە لایەن والیەوە سەركوت كرا و لە رێگای میزوپۆتامیاوە چوو بۆ دەرەوە. بە گشتی ژمارەی ئەوانە لە بیست و پێنج هەزار كەس كەمتر نییە، چەكەكانیان ئینگلیزی كۆی، رەندل، مارتینی و فارسین و چوار تۆپیشیان هەیە لەگەڵ كەرەستەیەكی زۆری نیزامی و قورخانەیەكی بچووك.

**گۆران:** قەڵخانی قەڵخانی شێر-تیروجا-تفەنگچی-تای شین. شوێنی كۆچ كردنیان ناوچەی زەهاو تا قەسری شیرین و كێوەكانی نزیكی گەوەرەیشە. ژمارەیان (٣٠) هەزار كەسە چەكداریان شەش هەزار كەسە. سەرۆكەكانیان رەشید سوڵتان-سالار مەنسور-سالار ئیقبال، دەوڵەت دەستی بەسەر تەواوی زەوی و زاریان داگرتووە. زستانی ١٩٢٢ و ١٩٢٣ بۆ میزوپۆتامیا كۆچیانكرد. قەڵخانیەكان گەورەترین،عەشیرەتی گۆرانن، ئیش و كاریان تالاَن وچەتەییە.

**كولیایی:** حەوت هەزار بنەماڵەن، زستان و هاوین لەناوچەكانی سونقر و بیلەدار و هەمەدان تا پشت كۆ و هەروەها تا نزیكەی سنە و كەنگاوەریش كۆچ دەكەن. ژمارەی چەكدارەكانیان سێ هەزار و ژمارەی گشتیان بیست و پێنج هەزار كەسە.

فاختیس سولتّان منسور الدەولە -سالار مەنسور- سەردار ئەشرەف-حەسەن پاشا خان لە سەرۆکەکانیانن. فاختیس سولتّان لە کاتی شەڕی جیهانی یەکەمدا پەیوەندی بە رووسیای قەیسەریەوە هەبووە. ئەپیوم لە کولیایی زۆر بەربڵاوە و پێنج هەزار چەکداری لێیە.

**ئەحمدی :** عەشیرەتی دەماوەند و دوراجمان سێ سەد بنەماڵە و سێ سەد و پەنجا چەکداریان هەیە سەرۆکەکەیان میهر عەلی خانە کە سەر بە سەنجابیەکانە.

**گەشیکی:** پێنج سەد تا شەش سەد بنەماڵەن هەزار و پێنج سەد کەسن. عەزیزوڵڵاخان کوڕی قەرەجوڵڵاخان سەرۆکیانە و سەدوپەنجا چەکداریان هەیە[1]

( .

# له یاداشته‌كانی كۆنسۆلی سۆڤیه‌ت له ئه‌رزه‌ڕۆم

١٩٢٣/٢/١٥

## كێشه‌ی كورد

له‌م دواییانه‌دا له نێوان تورك و ده‌وڵه‌تی كوردی له‌سه‌ر راكێشانی كۆمه‌ڵانی كورد بۆ لای خۆیان كێبركێ هه‌یه. خه‌ریكی به هێزكردنی خۆیان و خۆ ئاماده‌كردنن بۆ چالاكی سوپایی. له بانگه‌واز و راگه‌یاندنه زۆره‌كانی ده‌وڵه‌تی كوردی له ناوچه‌كانی كوردستانی توركیا (له رێگای ئنیگلیزه‌كانه‌وه و به یارمه‌تی فرۆكه‌ش) واده‌رئه‌كه‌وێ نه ته‌نیا ده‌یانه‌وێ ئه‌و كوردستانه‌ی داگیریان كردووه به‌ڵكو داوای هه‌موو كوردستان ده‌كه‌ن تائه‌رزه‌ڕۆم و سیواس (و به یه‌كه‌م ناوچه‌ی كوردستانی داده‌نێن). ده‌وڵه‌تی توركیاش له به‌رامبه‌ر ئه‌م پروپاگه‌نده‌یه‌دا ژماره‌یه‌كی زۆر له پروپاگه‌نده‌چی شێخ سه‌نوسی و ژماره‌یه‌كی تری پیاوی ئایینی ناردۆته ئه‌و ناوچانه‌ی لایه‌نگری ده‌وڵه‌تی كوردی مه‌حموودیان تێدایه. ئه‌ركی سه‌ر شانییان ئه‌وه‌یه دژی ده‌وڵه‌تی سلێمانی خۆفرۆش به ئینگلیز، هه‌ستی ئاینی خه‌ڵكه‌كه ببزوێن. شێخ سه‌نوسی ماوه‌یه‌ك له‌مه‌وبه‌ر له (ترپیۆلیه‌وه) هاتوه‌ته ئه‌م ناوچانه و دیاربه‌كری وه‌ك ناوه‌ندی پروپاگه‌نده‌ی خۆی هه‌ڵبژاردووه. له‌به‌ر ئه‌م پرۆپاگه‌نده دووفاقه‌و نادیاری پارسه‌نگی سیاسی و سوپایی، كورده‌كانی توركیا هه‌ڵوێستی ته‌ماشاچی و بێ لایه‌نیان گرتۆته‌به‌ر. چاوه‌ڕێ ده‌كرێت پارسه‌نگی هێز به‌كام لادا بكه‌وێت كورده‌كان روو له‌وێ بكه‌ن.

فه‌رمانده‌كانی ده‌وڵه‌تی كوردی ئه‌مانه‌ن:

١- وه‌زیری جه‌نگ مسته‌فا له كوشتنی ئه‌ندامانی كۆمه‌ڵه‌ی پێشكه‌وتن (ترقی) له ساڵی ١٩١٨ له ئه‌سته‌مبۆڵ به‌شداربووه.

٢- سمكۆ كه شه‌ش هه‌زار چه‌كداری له باشووری كوردستاندا هه‌یه.

٣- سه‌لاحه‌ددین (كوڕی سه‌ید عه‌لی) فه‌رمانده‌ی هێزه‌كانی سیرت.

٤- حه‌مدی پاشا فه‌رمانده‌ی هێزه‌كانی لوڕستان.

٥- سه‌ید ئاغا فه‌رمانده‌ی هێزه‌كانی دیار به‌كر.

# له راپۆرتی کۆنسۆڵی سۆڤیەت له بایەزید

## هاوڕێ مالتسۆڤ

**١٩٢٣/٢/٢٢**

### بزووتنەوەی کورد

زستان بەتوندی جڵەوی پەرەسەندنی بزووتنەوەی کوردی گرتووە. نە تەنیا لە باکووری کوردستان بەڵکو لە باشووری کوردستانیش چالاکی کوردەکانی راگرتووە. لەبەر باران و بەفرێکی زۆر تەواوی رێگاوبانەکان گیراون، تەنانەت بە رێگا ئاساییەکانیشدا ماوەی چەند مانگێك دەبێت هاتووچۆ نییە، ئەمەش پەیوەندی نێوان کوردەکانی تورکیا و کوردەکانی فارسی زۆر دژوار کردووەو دەرفەتی ئەوە نادات دەوڵەتی کوردی لە باشووری کوردستان پەرە بە چالاکی خۆی لە باکووری کوردستان بدات.

ئەم دەرفەتە یا دواکەوتنە بە قازانجی دەوڵەتی تورکیایە، چونکە ماوەی پتر دەداتێ تا بەهار دادێ خۆی بۆ پیلانێکی سوپایی داڕێژراو وتۆکمە ئامادە بکات. جموجۆڵی سوپایی بەهارێ لەوەناچێ سادەبێت، وا دەرئەکەوێت شەڕێکی گەورە و قورس بەڕێوەبێ.

ئێمە زانیاریمان دەربارەی بارودۆخی ناوخۆی (دەوڵەتی) تازە بە دەسەڵات گەشتووی مەحموود کەمە. سەرماو رێبەندانی زستان نەتەنیا زیانی بە مەحموود گەیاندووە بەڵکو زەرەری لە ئێمەش داوە،لەبەر ئەوەی کاناڵکانی هەواڵگریمان زۆرە دەنا لەوێوە هیچ دەنگ وباسێکمان پێ ناگات. ئەم پڕۆپاگەندەیەی ئەجینداکانی شێخ مەحموود لەناو عەشیرەتەکانی کوردی ئێران و تورکیا لەبەر زستان نەگەشتۆتە ئاستی پڕۆپاگەندەی هەلومەرجێکی لە بار. هەوڵدانی مەحموود بۆ وەدسهێنانی پشتیوانی سەرکردە هەرە بەناوبانگەکانی عەشایری کورد و هەندێ کەسایەتی جگە لە سەرداری ماکۆ زۆر، سەرکەوتوو نەبووە. هەر بۆیە ماوەیەك لەمەوبەر کابرایەکی دەرۆێش لە شاری (خۆی)ەوە دێتە لای سەردار، سەرداریش بە رێز و شکۆوە میوانداریی و لە نزیك ماڵەکەیەوە پێشوازی لێدەکات، کە دەروێش دەیەوێ بڕوا پێشنیاری پارەو ئەسپی پێدەکەن. بەڵام دەروێش لەبەر نهێنیکاری وەریانناگرێت و بەپێ دەڕوات.

پاشان دەرکەوت ئەم دەروێشە نێردراوی تایبەتی شێخ مەحموود بووە،لەگەڵ سەردار چ بڕیارێکیان دابێت و چییان وتبێت ئاشکرا نییە. بەڵام بارودۆخی ئێستای سەردار وەهایە دەیەوێ هاوسەنگەر بۆ خۆی بدۆزێتەوە، چونکە جگە لە کوشتن و گیران چاوەڕێی هیچ شتێکی تر لە دەوڵەتی فارس ناکات. بۆیە لە ناخی دڵیەوە، گەرچی زۆر زەحمەتە، ئارەزووی هاوسەنگەری شێخ مەحموودە. کۆنسوڵی ئێمە لە ماکۆ هاوڕێ (دۆبسۆن) کە هەڵوێستی لەمبارەیەوە چارەنوس سازە، پێیوایە ڕۆژانی کۆتایی سەردار نزیکبۆتەوەو ئەم هاوسەنگەرییە سەرناگرێت، لەبەر ئەوەی ئێران دەست وپێی سەرداری بەستووە و ڕێگای هەر جۆرە دژایەتییەکی دەوڵەتی ناوەندی لێبڕیوە. بەڵام دەبێ ئەوەش لەبەر چاو بگیرێت کە سەردار لەم دواییانە سیاسەتی خۆی لەناو کوردەکانی ماکۆدا گۆڕیووە. پێشان سیاسەتی (دووبەرەکی بنێوەو لێدە)ی بەڕێوەدەبرد کە بەلایەوە باش بوو، بەڵام ئێستا زۆر چالاکانە هەوڵ دەدات دوژمنایەتی لە نێوان خێڵەکانی ئەوێ نەهێڵێ و ئاشتیان بکاتەوە.ئەم کارەش سەرکەوتوانە دەچێتە پێش و سەرنجی زۆرینەی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە و دڵێی دەستووریان لێی وەرگرتووە. ئاشکرایە ناردنی ژمارەیەك کوڕە شێخی عەشیرەتە کوردەکان، بۆ لای فەرماندەی لەشکری باکوور-ڕۆژئاوای فارس (ژەنڕاڵ عەبدولاخان) لە تەورێز، بەمەبەستی بارمتە دانانە.

لە سەرجەمی ئەو شتانەدا دەردەکەوێت، ئەگەر سەردار بۆ خۆی لە ڕاپەڕینی بەهارێ بەشدار نەکا، دوورنییە تاڕادەیەك بتوانێ کوردەکانی ماکۆ هان بدا بە قازانجی شێخ مەحموود ڕاپەڕن.

لە ناوچەکانی باشووری ورمێ و لە سەلماس کوردەکان هەروا خەریکی کڕینی چەکن و دیارە چاوەڕێی بەهار دەکەن تا لە بەرەیەکدا دژی دەوڵەتی فارس ڕاپەڕن. ئەم ناوچانە لە ڕابردووشدا پشتیوانی تەواوی ڕاپەڕینەکانی سمکۆیان کردووە، دیارە لەناوچە هەرە شەڕکەرەکانی کوردستانن، نە تەنیا دەوڵەتی فارس زۆر مەترسییان لێیدەکات، بەڵکو تورکیاش نیگەرانە. بۆیە دەوڵەتی فارس زۆر بە وشیاری چاودێری ڕووداوەکانی ئەو ناوچەیە دەکا. و ماوەیەکیش لەمەوبەر ئەفسەرە فارسەکان وەدوای خزمێکی شێخ مەحموود دەکەون کە هاتبۆە لای کوردەکانی سابلاخ، دەیگرن و پاشان لە سێدارەی دەدەن.

بە ڕۆژنامەکاندا دیارە کابینەی دەوڵەتی پێشووی فارس (قەوام ئەلسەلتەنە) کە لایەنگری ئینگلیزەکان بوو ئامادەیە داخوازی ئینگلیزەکان جێبەجێ بکات و ((سەربەخۆیی کوردستان)) و شێخ مەحموود بەرەسمی بناسێت. بەڵام ڕووخانی دەوڵەتی قەوام و هاتنەسەرکاری کابینەی ناسیۆنالیستەکان، ئێستا دەوڵەت (بەرەسمی ناسینی دەوڵەتی کورد)ی هەر بەخەیاڵیشدا نایا. بەم

چەشنە ئینگلیزو مەحموود و کوردستان توشی تێشکانێکی گەورە بوون، کەواتە نیازی یارمەتیدانی ئەم لایەنە، بێ مانایە. بارووDۆخی کوردستان بەم چەشنەیە:

بارووDۆخی کوردستانی باکوور وەك کوردستانی فارس نییە. لەوێ تورکیا زۆر بەهێزەو کوردەکان بە زۆر و بەترساندن راگیراون، رێگە نادەن کەس لەسەر شێخ مەحموود یا سمکۆ یا کوردستان بدوێ، هەموو دەزانن هەر کەس لەدەمی دەرچێ سەری دادەنێ. بۆیە ئەگەر کەسێکی غەریب بۆ یەکەم جار بێتە ئێرە واتێدەگا کە هیچ رووی نەداوە و ئەگەر لەم بارەشەوە بپرسی پێت دەڵێن شێخ مەحموود کێیە، یان دەڵێن کورد و تورك هەمیشە وەك براژیاون و دەژین. بەڵام ئەمانە هەمووی رواڵەت و دیوی دەرەوەیەتی. ئەگەر ناوەوەی تەماشابکەی هەندێك لێی بکۆڵییەوە تێدەگەی وەك بورکان وایە.

بە رواڵەت هیچ نەگۆڕاوە بەڵام لە هەموو جێیەکی کوردستان، کوردەکان خۆیان بۆ خەبات دژی تورکیا ئامادە دەکەن و چاوەڕێ یەك (ئیشارە)ن تا دەست بەکاربن. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە: ئەو هۆیانەی پاڵییان بە کوردەکانی تورکیاوە ناوە دژی دەسەڵاتدارانی تورك بن بەپێچەوانەی ئەو هۆیانەن کە پاڵیان بە کوردەکانی فارسەوە ناوە دژی دەسەڵاتدارانی تاران راوەستن. راپەڕینی کوردەکانی ئێران دژی دەوڵەتی ناوەندی لەبەر لاوازی رژێمی ئێرانە لەناوچەکە، لەبەر نەبوونی دەسەڵات بە هیچ شێوەیەك ناتوانن سەبارەت بە لەوەرگا و مەروماڵاتی خۆیان ئارام و ئاسوودە بن.

واتە لەوێ یاسایەك نییە و دەیانەوێ دەسەڵاتێکی پتەو هەبێت (ئەوە بیروڕای هاوڕێ دۆبسیۆنە). بەڵام لەتورکیا بەپێچەوانەوە دەوڵەت دەسەلاتێ تەواوی هەیە واتە یاسایەك هەیە پەیوەندی یاسایی موڵکداریەتی بپارێزێ. جگە لەوەش هەر حەز لە چارەی تورکان ناکەن و هەوڵ دەدەن خۆیان لە ژێر چەپۆکیان رزگاربکەن. پێموایە هۆیەکی سەرەکی خەباتی کورد دژی دەوڵەتی تورك واتە راپەڕینی کوردەکانی باکوور لەبەر ئەم دەسەڵاتە بەهێزەیە. تا ماوەیەکی زۆر کەم لەمەوبەر کوردەکان نەیاندەزانی ماڵیات چییە، سەر بە تورکیا بوونیان هەر بە رواڵەت و بەناو بوو، خزمەت لە ریزی لەشکری حەمیدیە بوو بە هۆی ئەوەی کەس دەستیان لێ نەدات و دەستوور یا یاساکانی تورك کە دەدرا بە شێخ و سەرکردە و فەرماندەکانیان (ئەوانەی پلە و پایەیان هەبوو) هەرگیز جێبەجێ نەدەکران، بەڵام ئیستا بارووDۆخەکە گۆڕاوە و لە سەربەخۆیی رابردوو تەنیا سێبەریان بۆ ماوەتەوە.

ئێستا کورد ئیتر عەشەر و ئەغنام (دەیەکی ماڵیات و سەرانەی مەڕ) دەناسن، بە تایبەتی کە زیانی ئابوورییان لی دەدات، ئەو زەبرە هەست پێدەکەن کە دەوڵەتی تورك لەم دواییانەدا خەریکی

جێبەجێ کردنیەتی. کەس ناتوانێ لە نەدانی عەشەر و ئەغنام سەرپێچی بکا. ئەم کردەوەیە پێشان هەستی پێ نەدەکرا. تورکەکان ئەمڕۆش شەرم لەوە ناکەن کە بۆ وەرگرتنی عەشەر و ئەغنام، گوندەکان وەبەر توپ و رەشاش بدەن و.... بەواتایەکی تر ئازادی و سەربەخۆیی پێشوو کۆتایی هاتووە.ئەم کردەوانەی دەوڵەتی تورك بۆتە هۆی قین و تورەیی کوردەکان بەرامبەر بە تورك، ئەگەر پێشتر بە ئاشکرا و بەجدی لایەنگیری شۆڕشی سمکۆیان نەدەکرد ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە پێشوازی لە شۆڕشی شێخ مەحموود دەکەن، چونکە: یەکەم ـ سمکۆ لەناو خاکی فارس —کوردستانی رۆژهەڵات- جموجوڵی هەبوو.دووەم ـ سمکۆ لەناو کوردەکاندا تاڕادەیەکیش نەیاری هەبوو تەنانەت هەندێکیان دوژمنی بوون. ئێستا بارودۆخ گۆڕاوە، شێخ مەحموود ئەگەر کەسایەتیەکیش نەبێ تێکڕای ئۆپۆزسیۆن لە بەرامبەریدا بێ دەنگ بێ، هەر چۆنێك بێ توانیویەتی پیشتوانی زۆربەی رێبەر و شێخەکانی کورد بەدەست بێنێ. لە سایەی رێکخستن و بەڕێوەبردن، دەستووری شێخ بۆ خەڵکی کوردستان بایەخێکی تایبەتی هەیە و بێ چەندوچون جێبەجێی دەکەن. نابێ ئەوەش لە بیربچێت کە هەستی نەتەوایەتی و تێگەیشتنی کوردەکانی تورکیا لە کوردەکانی فارس زۆر بەهێزترە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی تورکەکان لە دژی پێکەوە ژیانی کوردو ئەرمەن کەڵکی لێوەربگرن. بە گشتی بیروباوەڕی ناسیۆنالیستی کوردی فارس لەبیروباوەڕی کوردانی دژی دەسەڵاتدارانی تورك کەمترە، چونکە بە درێژایی مێژوو ژیانی کوردەکانی تورکیا وا هەڵکەوتووە پشتیوانی ئەم بیروباوڕە بکەن. بەم دواییانە بەشێوەیەکی نائاسایی و ناسروشتی لەکوردستانی فارس بڵاو بۆتەوەو پەیوەندی پێوە کراوە.

هەر چۆنێك بێ ئەو هەستە گەشە دەکاو بەرەبەرە پەرەدەستێنێ و لەناو ناچێ. ئێستا شێخ مەحموود نەك تەنیا لە باشوورەو هێزێکی راستەقینەیە بۆ دروستکردنی کوردستانی سەربەخۆو جیابوونەوە لە تورکە رەگەز پەرستەکان بەڵکو بەشێکی ئەم کوردستانیشی ئازاد کردووە و دەستی بەسەر چەند شاردا گرتووە (گەرچی بەیارمەتی ئینگلیزەکان بوو). کوردەکان لە ژێر کاریگەری ئەو مەرجانەی سەرەوە ئامادەن سەرۆکی خۆیان بە رەسمی بناسن و بچنە ریزی لەشکرەکەی. بۆپشتیوانی ئەم وتانە، هەندێ فاکت دێنمەوە کە نیشاندەری جموجوڵی ناو کوردەکانی باکوورن و پەیوەندییان بە شێخ مەحموودەوە هەیە. بە وتەی کاربەدەستانی رەسمی کردەوەکانی شێخ مەحموود لای تورکان ئاشکرایە،ئەفسەر و کارمەندانی تورکیا لە باکووری کوردستان بەدوای ئەجینداکانی مەحموودا دەگەڕێن، بەڵام هیچیان لەدەسنایا، چونکە لە لایەن خەڵکەوە دەشاردرێنەوە و تورکەکان ناتوانن بیانگرن. لە مانگی کانوونی یەکەم لەناو شاری بایەزیددا دوو سیخوڕیان گرت. لەو بەڵگانەی کە

دەست کەوتوون ئاشکرابوو کە هەندێك شێخی ناوچەکەیان بەناوی عیسا بەگ بەدناو کردووە. دەرکەوت هەموو شێخەکانی ناوچەکە پەیوەندیان لەگەڵ شێخ مەحموود هەیە،لەبەر ئەوەی دەسەلاتدارانی تورك بەڵگەی تەواویان بەدەستەوە نییە جارێ ناتوانن هیچ هەنگاوێك لەمبارەوە هەڵگرن.. شێخی عەشیرەتی ناوچەکە (حەسو سۆران عەلی بەگ) لای من دانی بەوە دانا کە لەگەڵ مەحموود پەیوەندییان هەیە، وتی کە سەرەڕای ئەوەی تورکەکان بانگەوازیان بۆ ئامادەبوونی فەوجی حەوتەمی عەشایەری کردووە بەڵام ئەوان ئامادە نین دژی مەحموود شەڕ بکەن.

یەکێك لە فەرمانبەرانی ناوچەکە سکرتێری دادگایە بڕیاری داوە لە کوردستان بڕوات چونکە تورکەکان پێیانوایە باروودۆخەکە بۆ بەهار لەوانەیە بگۆڕدرێت و ئەوسا هیچیان پێ ناکرێت جگە لەکۆکردنەوەی باروبنەو هەلاتن لە بایەزید. ئەم وتانە دەکرێ ئەوە بگەیەنێت کە تورك لەبەر بزووتنەوەی مەحموود بارودۆخی کوردستان لە بەرژەوەندی دەسەلاتی خۆیان نازانن. ڕاستە فاکتەری زۆر لەمبارەوە نییە بەڵام بەپێی ئەو فاکتانەی سەرەوە چاوەڕێی تەقینەوە دەکرێ.

لە سەرەتای ڕاپەڕین تورکەکان باوەڕیان بە جدیەتی شێخ مەحموود نەدەکرد و چاوەڕوانی ئەوە نەبوون زێر و چەك لە ئینگلیزەکان وەرگرێ و لە خۆیان دوورکەوێتەوە.، چونکە دووساڵ لەمەوبەر مەحموود دوژمنێکی سەرسەختی ئینگلیزەکان بوو لە دژیان شەڕی دەکرد. زۆر خۆشحاڵ بوون و کردیانە قاو کە شێخ مەحمودلە مانگی کانوونی یەکەمەوە دژی ئینگلیز ڕاپەڕیوە. بەڵام ئەو دەنگوباسە وای لە مەحموود کرد پتر بەرەو ئینگلیزەکان بچێت و تەواوی ئەو دەنگوباسەی تورکەکانی بەدرۆ خستەوە کە گوایە دەیەوێ لە تورکیا نزیك بێتەوە و پەیمانی لەگەڵ بەستوون. کێشەکە لەوەدابوو، دوای تێشکانی سمکۆ کوردەکانی فارس لە عەشیرەتی شوکاك ڕایانکردە ناوچەی وان، تورکەکان لەوێ تالانیان کردن و ناچاریان کردن بگەڕێنەوە بۆ جێ و شوێنی خۆیان و تەسلیمی دەوڵەتی تاران ببنەوە. ئەم ڕووداوە بوو بە هۆی تەقینەوەی کوردەکان و بێزاریان بەرامبەر تورکان و دروستبوونی دیوارێك لە نێوانیدا و پاشان بوو بەهۆی چەند سەرکەوتنێکی شێخ مەحموود. لەو کاتەوە ئەجیندای سیاسی سەرکەوتوانە دەچێتە پێش و پشتیوانی کوردەکانی باکووری کوردستانی دەستەبەر کردووە.[1]

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٥٨-١٦٢.

## هەنگاوەکانی دەوڵەتی تورکیا

لە باکووری کوردستان تورکەکان جارێ هیچ هەنگاوێکی چالاکانە دژی بزووتنەوەکە هەڵناگرن. هەر چاودێرن دەیانەوێ سەربەخۆیی ئەو کوردانەی تائێستا بە کردەوە لێیان جیان بخەنە ژێر رکێفی خۆیان. لە رۆژهەلاتی ناوچەی پێشووی سۆرمالین سێ گۆشەیەك هەیە، واتە نێوان رووباری ئاراس و سنووری رووسیا و فارس کە لەرووی یاساییەو هەمیشە سەر بە دەوڵەتی فارس بووە. بەپێی پەیمانی تورکمانچای سنووری نێوان دەوڵەتی فارس و رووسیا روباری ئاراس بووە و رووسیا بە زۆر ئەم پارچەیەی داگیرکرد و پۆستی پاسەوانی لێدانا، بورالان و کراسینی خوار و.... لەم هێڵە سنووریەدان و چەند هەوارگەی زستانی کوردانی لێیە. لە سەردەمی قەیسەر سەرەتا عەشیرەتی برۆکانی لێبوو (دوور نییە برۆکی یا برۆکانلی بێت، وەرگێڕ)، ئێستا یەکێك لە عەشیرەتە کوردەکانی ماکۆ بە ناوی جەلالی و عەشیرەتی قزلباش ئۆغلی لەوێ دەژین.

ئێستا تورکەکان خۆیان بە میراتگەری رووسیا دەزانن و داوای تەواوی ناوچەی سورمالین دەکەن و ئەوە لەبەر چاوناگرن کە رووسیا مافی ئەوەی نییە ئەو پارچە خاکەیان بداتێ کە لەباری یاساییەوە سەر بە ئێرانە. سوپایەکی سێ سەد کەسیان لەگەڵ ئەفسەر و تۆپخانە ناردووە تا پۆستی تورالان بگرن.ئەم کەرتە سوپایەی تورکیا، پاشان بەرەو پۆستی کەراسینخوار و کە دەکەوێتە نێوان رووباری ئاراس و رووباری قەرەسویخوار، کەوتنە رێ. لێرە جگە لە جەلالییەکان عەشیرەتی خالیکانلوی لێیە. تورکەکان پێشنیاریان هەم بەوان و هەم بە خەڵکی تر کردووە بچنە ریزی هێزی چەکداری عەشیرەتەکان و پێیان دەسەلمێنن کە هەموویان خەڵکی تورکیان، تەنانەت پێشنیاری ئەوەشیان پێکردوون کە لە هێزی سوپای تورکیا خزمەت بکەن، بە کوردەکانیان گوتووە دەبێ ببنە هاولاتی تورکیا،ئەوسا بەبێ چەندوچون لەگەڵ کوردەکانی تورکیا یەکسان دەبن. دە رۆژ مۆڵەتیان پێداون بیری لێبکەنەوە. کوردەکان زۆر خراپ دەڕواننە ئەم پێشنیارەی تورکیا و وای بەباش دەزانن یان بێنە ناو خاکی ئێمە یاسەر بەخانی ماکۆ بن. بەلام لە هەموو بارێکەوە ئەم کردەوەیەی تورکیا کە خاکی ئێرانی داگیرکردووە یاسایی نییە و بۆتە هۆی نیگەرانی خانی ماکۆ و داوای لە من و هاوڕێ دوبسۆن کرد بالۆیزەکانمان لەم کردەوە دڕندانەی تورکیا ئاگادار بکەینەوە. ئێستا تورکەکان لە باکووری کوردستان خەریکی ئامادەکردنی لەشکری حەوتەمی سوارەی عەشایرن کە بنکەی لە بایەزیدە و سەرکردایەتییەکەی لە قەرەکلیسە. من باوەڕناکەم تورکەکان ئەم لەشکرە دژی شێخ مەحموود بەکاربێنن،چونکە دەزانن کوردەکان دژی دەوەستن. جگە لەوە خۆیان دەڵێن کە ئەم لەشکرە

دیسپلینی نییە و مەشقی پیٚ نەکراوە تا لە شەڕدا وەك هیٚزیٚکی چالاك کەڵکی لیٚ وەربگیریٚ. گوایە ئامادەکردنی ئەم لەشکرە عەشایرە بۆ ئەوەیە هەندیٚ کەسی لیٚهاتوو و زیرەکیان لیٚ هەڵبژیٚرن تا ئەفسەری عەشایریان لیٚ دروست بکەن. بەڵام نابیٚ باوەڕ بە تورکان بکریٚت چونکە هۆیەکی تر لە پشت کردەوەکەیانە. من پیٚم وایە ئەوان پیٚشبینی ئەو ڕووداوانەی ئیٚستایان کردووە و دەترسن کوردە چەکدارەکان هەر ئاوا لە گوندەکانی خۆیان بهیٚڵنەوە، دەیانەویٚ ئەو عەشیرەتە چەکدارنە تیٚکەڵی سوپای خۆیان بکەن. من پیٚم وایە ئەم هەنگاوە تارادەیەك کوردەکان ئیفلیج دەکا لەبەر ئەوەی دەیانکەنە گروپی بچووك و دابەشیان دەکەن بەسەر سوپایی تورکیادا، لیٚکیان دادەبڕن تا هەرگیز نەتوانن پیٚکەوە دژی دەوڵەت ڕاپەڕن یا بەشداری ڕاپەڕین بکەن. ئەگەر هاتوو دژی دەوڵەت ڕاپەڕین ڕاپەڕینەکەیان بچووك بچووك و بیٚ ڕیٚکخستن دەبیٚ. چەند مانگ لەمەو بەر لە ناوچەی ڕەواندوز بەرنامەیەکی ئاوایان داڕشت. بەڵام لەو بارەیەوە کە تورکەکان کەرتی وەهایان ناردبیٚتە شەڕ دژی شیٚخ مەحموود، من شتیٚکم نەبیستووە. بەم پیٚیە مەبەستی تورکەکان لە ناوچەی بایەزید لەو هەنگاوانەی لەمبارەوە ناویانە دەکریٚ بڵیٚین پیٚشگیری بووە. لیٚرە وابڵاوە کە لە ئەنقەرەوە لەشکریٚك بە سەرۆکایەتی خالید پاشا بۆ ئیٚرە نیٚردراوە، وادیارە هەر ئەو لەشکرەیە کە ماوەیەك لەمەو بەر پەرلمانی تورکیا بڕیاری دروست کردنی دابوو، زەحمەتە ئەم هیٚزە لە بایەزید بمیٚنیٚتەوە لەوانەیە هەندیٚ کەرتی تر لیٚرە دابنیٚن و هیٚزەکە بنیٚرن بۆ وان کە بارەگای سەرکردایەتی جەنگی دووردەستی لیٚیە و فەرماندەکەشی نەعیم جواد بەگە. فەرماندەی بەرەی میزۆپۆتامیا ئۆزدۆ پاشایە و دەڵیٚن ئەویش لە شاری وانە. نازانم بارەگاشی لەویٚیە یا لە دیاربەکرە. جگە لەوە فەرماندەی کەرتی حەڤدەی سوارەش لە پاش قەڵا و گوندەکانی دەوروبەرە.

چالاکی سوپای تورك لە ناوچەی ڕەواندز ئەوە بوو لە سەرەتای کانوونی دووەم شاری ڕەواندزیان گرتووە، بەڵام ئینگلیزەکان بەزەبری بۆمبارانی فرۆکە لەویٚ وەدەریان نان. تا ماوەیەك لەمەو بەر تورکەکان هیوایان بە عەشیرەتە کوردەکانی سلیٚمانی و کەرکوك هەر مابوو، کاریٚکی یەکجار زۆریشیان لە ناودا کردن و دەوریشیان هەبوو. بەڵام تورکەکان لەبەر ئەو ڕەفتارە خراپەی باسمان کرد بەرانبەر بە کوردی شکاك و هەندیٚ شویٚنی تر، لای کوردان دزیٚو بوونە، ئەمەش کوردەکانی خستە ناوباوەشی ئینگلیز و شیٚخ مەحموود. ئیٚستا تورکەکان دەستیان داوەتە فیٚڵیٚکی نویٚ، شیٚخ سنووسی عەرەبیان ڕاستکردۆتەوە کە لەناو عەرەبەکاندا ناوبانگی هەیە، لەمیٚژە لە ئەنقەرە دەرچووە

و بەرێز و مێوانداریەکی زۆرەوە لە دیاربەکر پێشوازیان لێکرد، ئیتر دەبێ شێخ ئەو ئەرکەی تورکان پێیان سپاردووە جێبەجێ بکات.

مەبەستی تورك لەم هەنگاوە زۆر ساکار و ژیرانەیە. شێخ سنووسی لەبەر ئەو رۆڵە گەورەی لەناو عەرەباندا هەیەتی بێشك دەتوانێ بۆ بەرژەوەندی تورکان دژی مەلیك فەیسەڵی عێراق دەست بەکاربێ. بەم چەشنە ئەگەر ئەم هەنگاوەی تورکەکان سەرکەوتووبێت هەندێ کەندوکۆسپ لە لایەن عەشیرەتەکانی عەرەبەوە بۆ ئینگلیز دروست دەبێت. ئەگەر عەشیرەتەکانی عەرەب دژی ئینگلیز راپەڕن بە قازانجی تورکەکان دەبێت وئینگلیز هێندە بایەخ بە شێخ مەحموود نادا و رووداوەکاتە عەرەبەکان. بە بۆچوونی من نابێ هیوامان زۆر بەم هەنگاوەی تورکان بێت. ئاشکرایە بەبێ دەردەسەر ئینگلیزەکان بە بۆمب و فرۆکە دەرقەتی عەشایەری راپەڕیوی ناوچەکە دێن، بەڵام لە بەرانبەردا تورکەکان چ دەتوانن بکەن؟. رووداوەکانی رەواندز نیشاندەری ئەو راستەیەن. بەڵام هەر چۆنێك بێ راپەڕینی عەرەبەکان بایەخی خۆی دەبێت و ئاشکرایە تورکەکانیش کەڵکی لێ وەردەگرن.

بەپێی زانیاری فارسەکان ژمارەی سوپای تورك لەمیزۆپۆتامیا (١٢) هەزارە و فەرماندەی گشتی ئەو هێزە ئۆزدو پاشایە، فەرماندەی تۆپخانەیان کەمال بەگ و فەرماندەی کەرتی (١٧)یان زەینی بەگە.

هەرچۆنێك بێت لەم ماوەیەدا بۆ ماوەیەکی کەم رەواندزیان گرت،دەنا چالاکی سوپایی ئەو تۆ نەکراوە، تورکەکان پتر خەریکی خۆ ئامادەکردنن بۆ بەهار و ناردنی لەشکر بۆ کوردستان[1].

## هەنگاوەکانی تورکیا لە فارس

هەوڵ و تەقەلای تورکان دژی کوردەکانی فارس لەو هەولانە کەمتر نییە کە دژی کوردەکانی تورکیا و میزوپۆتامیا دەیدەن، لەم بارەوە ئەوان بۆ دوو مەبەستی سەرەکی هەوڵ دەدەن:

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٦٢-١٦٥.

١- دەیانەوێ فەرماندەی هێزەکانی فارس بە خەباتی هاوبەش دژی شێخ مەحموود بەرەو لای خۆیان راکێشن، یا لانی کەم دۆستایەتی خۆیان لەگەڵ ئێران راگرن، یا بەرامبەر شێخ مەحموود بێ لایەن بن.

٢- بەبەڵێن دان بە کاربەدەستانی ئێران خۆی لە هێرشی کوردەکانی فارس و مەسیحییەکان (ئاشوورییەکان)ی ناوچەی ورمێ بپارێزێت. لەمانگی کانوونی دووەمەوە جموجوڵی لەشکری تورك لە فارس زۆرتر بووە سەرەتا لەرووی چەك وتەقەمەنیەوە بوو، بەڵام ئێستا شێوەیەکی ئاشکرایی بەخۆوە گرتووە و مەبەستی سیاسیان هەیە. لە مانگی تشرینی دووەم (٥٠) سوار لەگەڵ دوو ئەفسەر کە لە گوندی دەبر لە (٢٠) کیلۆمەتری پاش قەڵا جێگربووبوون، بۆ پەیوەندی کردن هاتنە شاری دیلمان، هاوکات فارسەکانیش خەریکی ناسین و سیخوڕی بوون لە ناوچەکە، کە مەبەستی یەکەمیان هەنگاوی دژی کورد و پاشان دژی مەسیحییەکان بوو.

لەناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمدا یەکێك لە یوزباشەکان (فەرمانـدەی پێشوی سەربازگەی بایەزید بەناوی ئیحسان بەگ) هاتە دیلمان بۆ لای کەلب عەلی خانی نەخجەوان، فەرماندەی ناوەندی لەشکری ئێران گوایە بۆ دابینکردنی نان بۆ هێزەکانی تورکیاهاتووە. دیلمان چوار نانەواخانەی رووسی لێیە نان بۆ سوپای فارس دروست دەکەن. داخوازی تورکەکان جێبەجێکرا و یوزباشی بە رازی بوون گەڕاوە. ماوەیەك لەمەوبەریش هەشت کەس لە سوپای تورك کە باریان بۆ ئێرە هێنا بوو گەڕانەوە. جگە لەوە فەرماندەی هەنگی دووەمی تورکیا بەناوی ویسال بەگ بۆ چوار رۆژ بە میوانی هاتە دیلمان. چەند کەرتی سوپای تورکیا لەناو خاکی ئێرانن کە لە شارەکانی شنۆ و قەڵای زێوەن. لە ١٢ی کانوونی یەکەم والی رەواندز میر عەلی کازم بەگ بە (٢٠) ئەفسەرەوە هاتە ورمێ و کابرایەکی خەڵکی فارسیان لەگەڵ بوو بە ناوی (حاجی میرزا یوسف)، دەڵێین کابرایەکی دەوڵەمەند و زانایە، زۆر لە تورکیا ژیاوە و یەکێکە لە لایەنگرە گەورەکانی تورکیا.

تێکڕای ئەم پێشوازیکردنەی تورکان لەلایەن فەرماندەی فارسەوە لە ورمێ بەناوی (ژەنەراڵ ئەلدەولە) بەرێوەچووە. وتووێژەکان لەسەر دوو پرس بوون:

١ـ تورکەکان داوایان لە فەرماندەی سوپای ئێران کرد بە هیچ شێوەیەك باوەڕ بە کوردەکان نەکەن و داوایان لە کاربەدەستانی فارس کردووە ئاگایان لە جموجۆڵیان بێت نەوەك بەرەیەکی یەکگرتوو لەگەڵ

شێخ مەحموود پێك بێنن. وتوویانە دەترسن ئینگلیزەکان هێزێکی زەبروەشێن لـە پـشتەوەی بـەرەی لەشکری تورك رێك بخەن.

٢ـ تورکەکان دەسەلاتدارانی فارسیان لەو مەترسیە گەورەیـە ئاگادارکردۆتـەوە کـە بـۆ هـەر دوو ولاتی موسلمانی لە ئارادایە، واتە مەسیحییە هەلهاتووەکان کـە لـە ورمـێ و سـەلماس مولگـەیان داناوە. تورکەکان ئاماژەیان بەوە کردووە کە هەولدانی ئینگلیزەکان بـۆ ئاشـتکردنەوەی دوو دوژمـن واتە نەسـتورییەکان (ئاشـوورییەکان) لەگـەل کوردەکـانی شـێخ مـەحموود سـەرکەوتوو بـووە. بـە کاربەدەستانی فارسیان راگەیاندووە گومانی تێـدا نیـە ئینگلیزەکـان لـە کـاتی پێویـستدا زۆر بـە ئاسانی کەلك لەو هەلهاتووانە وەردەگرن و دەیانگێڕنەوە بۆ شوێنی خۆیان، کە دەبێتە مەترسـییەکی گەورە لە پشتەوەی لەشکرەکانی تورك و تێکهەلچوونێکی نوێ کە دانیشتوانی فـارس تێیـدا دەبنـە قوربانی.

سەرەڕای هەموو ئەمانە (نـازم بـەگ) لـە لایـەن فەرمانـدەی هێزەکـانی تورکیـاوە داوای کـردووە هەلهاتووەکان (مەسیحییەکان) لە ورمێ دەربکەن، وتوویە ئەگەر دەولەتی فارس ئـەم شـتە نـەکات تورکیا ناچارە بۆ خۆی لە رێگای ترەوە ئەم ئەرکـە بـەجێی بگـەیەنێت. ئـەم راگەیاندنـەی نوێنـەری تورکیا فەرماندەی بریکاری هێزەکانی فارسی نیگـەران کـردووە، کـە تورکیـا نیـازی وایـە هەنـدێ هەنگاوی دژی فارس هەلبگرێت هەر بۆیـە دەستووریـشی بـە (مەمـەد عـەلی خـان) فەرمانـدەی سەربازگەی ورمێ داوە کە دوای پروپاگەنـدەی تورکـەکان بکـەوێت، هـەروەها پێـی وتـووە ئەگـەر تورکەکان دژی هێمنایەتی ناوچەکە هەنگاو هەلگرن بە زووترین کات پێشییان پێبگـرە، دوای (١٦) رۆژ مانەوەی نازم بەگ لە ورمێ لەگەل ئەفسەرەکانی رۆیشت بۆ شنۆ کەلـەو دەمـەدا ئـۆزدۆ پاشـا لەوێ بوو. بەلام لە ورمێ حاجی یوسـف میرزایـان کـە لەگـەل خـۆ هێنـابوو، هێـشتویانەتەوە بـۆ پڕوپاگەندە. تێزەکانی پروپاگەندەکە بەم چەشنەی خوارەوەیە:

١- ئێوە نابێ ئەو ئازار و مەینەتەی مەسیحییەکان لە رابردوودا بەسەریان هێناون لە بیربکەن.

٢- ئەوان بەرەبەرە بە ئەسپایی دەگەرێنـەوە، بـەلام پاشـان کـە جێگیربـوون و خۆیـان بـە هێزکـرد دوژمنایەتی خۆیان بەرانبەر موسلمانەکان دەستپێدەکەنەوە.

٣- بۆ مەسیحییەکان (واتە دوژمنەکانتان)، زەحمەت نییە، هەرکات بیانەوێ چەك لە ئینگلیزەکان وەردەگرن.

٤- ئەمریکایەکانیش پشتوانیان دەکەن و هیچ یارمەتییەکی ئێوە نادەن (کۆمیتەی یارمەتی ئەمریکا-ئەڵمانیا تەنیا بۆ مەسیحییەکانە).

٥- ئێوە دەتوانن پێش بەو بەڵایەی چاوەڕێتانە، بگرن. بۆ ئەمەش دەبێ بە زووترین کات بێزاری خۆتان دەربڕن. ئێستا هەل و مەرج لەبارە بۆ دەربڕینی ئەو پرۆتیستە، چونکە دۆستەکانتان لەوانە (تورکیا) پشتیوانیتان دەکەن.

بەڵام مەمەد عەلی، حاجی یوسف میرزای گرت و لە ترسی ئاگادار بوونی تورکان بە نهێنی ناردی بۆ تەورێز، پێوستە بزانین چاوپێکەوتنی داهاتووی کاربەدەستانی فارس و تورك کەی دەبێت.

لە(١٧)ی تشرینی دووەم هێزی باکوور-ڕۆژئاوای سوپای فارس لە تەورێز بە سەرۆکایەتی عەبدولاخان ڕۆیشتووە بۆ کۆنە شار بۆ چاوپێکەوتنی ویسال بەگ فەرماندەی لەشکری دووەمی تورکیا. لەم دیدارەدا لەسەر هاوکاری نزیکی نێوان هەردوو دەوڵەت پێکهاتن و جیاوازی ڕا و کێشەیان نەبووە، وەك دۆست لە یەکتر جیابوونەتەوە. لە (٢٥)ی تشرینی دووەم عەبدولاخان لە (ورمێ)وە داوای لە فەرماندەی هێزەکانی تورکیا ئۆرزدۆمیر پاشا لە بەرەی میزپۆتامیا کردووە بچێتە شنۆ و لەوێ چاویان بە یەکتر بکەوێت. ئەم چاوپێکەوتنە لە دیدارەکانی پێشوو پێشنیار کراوە. (٢٦)ی تشرینی دووەم فەرماندەی لەشکری ئێرانی دەچێتە شنۆ و لە لایەن ئۆرزدۆ پاشاوە پێشوازی و میوانداری لێ دەکرێت، وتووێژەکان لەسەر کێشەی کورد بووە، ئۆرزدۆ پاشا داوای کردووە هرچۆنێك بێ نابێ ڕێگە بدرێ کوردەکانی سۆماو برادۆست و سابلاخ پەیوەندی بە شێخ مەحموودەوە بکەن. پاشا سوێندی خواردووە و بەڵێنی بە فەرماندەی لەشکری ئێران داوە ئەگەر تورکیا سمکۆ بگرێت دەست بەجێ تەسلیمی دەوڵەتی فارسی دەکاتەوە، دووەم باسی وتووێژەکەیان لەسەر ئاشوورییەکان بووە، سێیەم لەسەر چۆنیەتی پەیوەندی تەکنیکی نێوان دوو هێزی تورك و فارس دواون.

بەگوێرەی ئەو دەنگوباسانەی بڵاوبوونەتەوە،بە پێی پەیمانێك کە لە نێوان تورکیا و فارس ئیمزاکراوە، دەبێ مەسیحییە هەڵهاتووەکان لە ناوچە سەر سنوورییەکانی تورکیا دەربکرێن. هەروەها

کاربەدەست و سەربازانی تورك دەتوانن بە ئازادی بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێش وەخت و نووسینی نامەی رەسمی یان نارەسمی، بجولێنەوە، ئەمانە ئەو فاکتەرانەن کە ئەگەر تورکەکان جێبەجێشیان نەکردبێت بە ئاسانی توانای بەجێگەیاندنیان هەیە. نابێ لەم بارەوە گومان لە بێ لایەنی ئێران بکرێت بەتایبەتی ئێستا دوای داڕووخانی کابینەی قەوام. ئەوەی پەیوەندی بە پاراستنی پشتەوەی بەرەی تورکانەوە هەبوو مەترسی کورد و ئاشوورییەکان بوو، دەکرێ بڵێین لەم بارەوە ئیتر هیچ مەترسیەك نامێنێت. بە کۆسپ خستنە سەر رێگای گەڕانەوەی هەڵاتووەکان لە لایەن کاربەدەستانی فارس،بە ناردنیان بۆ تەورێز و پروپاگەندەی تورك لە دژیان، باوەڕناکەم ئاشوورییەکان دژی تورك راپەڕن، ناچاریان دەکەن تەنیا بیر لەوە بکەنەوە چۆن گیانی خۆیان بپارێزن. جێگربوونی کەرتەکانی سوپای تورك لە چەند ناوچەی سەر بە دەوڵەتی فارس لەسەر سنووری تورکیا دەرفەت دەدا بە تورکان لە کاروباری کوردەکانی فارس ئاگاداربن و دەست بەجێ بە زۆری چەك پێش بە هەر چەشنە جموجۆڵێکیان بگرن.

هەروەك ئاشکرایە تورکەکان لەم چەند مانگەی دواییدا کارێکی یەکجار گەورەیان کردووە، چاوەڕێی هاتنی هێزەکانی خۆیان دەکەن بۆ پشتەوەی بەرە تا بە یارمەتی چەك پشتیان پتەوبکەن و بۆ بەهار دەسبەکاری چالاکی خۆیان بن(1).

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٦٢-١٦٨.

## دەستنووسی پیرس بۆلیتۆن ژمارە (٢) شوباتی ١٩٢٣

### کوردەکانی ماکۆ:

ڕووداوەکانی مانگی کانوونی دووەم لەناو کوردەکانی جەلالی و میلان درێژەی ئەو ڕووداوانەی مانگی کانوونی‌یەکەمن، تەنیا جیاوازی ئەوەیە بەهۆی گوشاری دەوڵەتی فارس لەسەر سەرداری ماکۆ و دەست تێوەردانی زیاتری ئەجینداکانی دەوڵەتی ناوەندی لە کاروباری خان، ڕووداوەکان خێراتر دەچنە پێشەوە. جگە لەوە لەکانوونی دووەم بە تێشکانی سوپای تاران لە دژی کوردان ئەو ڕووداوانە لەباری ڕێکخستن و چالاکییەوە زیاتر پەرەیان سەند.

بە یەکگرتنی عەشیرەتەکانی کورد لە کانوونی یەکەمی ساڵی ڕابردوو وەك جەلالی و میلانی و خالیکانلۆ و مەسیرکانلۆ و بەلیخانلۆ، چالاکی هاوبەشی کوردان لە یەك بەرەدا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر و بەهێز تر دەبێت. خالید ئاغا سەرۆکی هۆزی خالیکانلۆ کە لە مانگی ڕابردوو لەگەڵ تاهیر ئاغا سەرۆکی هۆزی مەسیرکانلۆ ئاشت بوونەوە و نزیك بوونەوە یان لەگەڵ هۆزی بەلیخکانلۆ (سەرۆکەکەیان تازو ئاغایە) هەروەها هاوکاری (لیزگی ئاغا) برای خالید ئاغا و خانی ماکۆ لەم ئاشبوونەوە گشتییە سەرکەوتووانە کۆتایی هات. ئەوەش بڵێین پێشان (لیزگی ئاغا) و (خانی ماکۆ) لەسەر ئەوەی (لیزگی ئاغا) کۆنسوڵی ڕووسیای ئاگادارکردبوو کە خانی ماکۆ لەگەڵ ئەڵمانیا پەیوەندی هەیە، دوژمنایەتی هەبوو. لیزگی ئاغا داوای لە کاربەدەستانی (نەخجەوان) کرد بوو بێنە ناو خاکی ئێمە و لەوێ بۆ هەمیشە بژین و داوای زەویشی کردبوو لەناوچەی (شاە رۆرسکی)، تا بەهاریّ بنەو بارگەی بەرێتە ئەویّ. ئەم داواکارییەی لیزگی ئاغا جێبەجیّ دەکرێت و هەندیّ زەوی و زاری لەناوچەی (ئارازدەیان) پێیدەدەن و ئێستا خەریکی هێنانی ئاژەڵدارییە. دەیەویّ بۆ بەهار کۆچ بکات بۆ ئەوەی بەم چەشنە لیزگی ئاغا کە ئەم هاوینە لەوتووێژکردن لەگەڵ سمکۆ خۆی کێشایەوە، بەڵێنی بە حاجی ئاغاداوە چیتر دوژمنایەتی حاجی عوسمان (کە ناوبراو بە دەستووری سەردار کوژراوە) نەکات، بەهاتنی بۆ ناوچەی (نەخجەوان) دەیەویّ خۆی لەو ڕووداوانە بدزێتەوە.

..... سەرۆکی هۆزی (مامیکانلۆ) بەناوی (قەرەبیرچای) لە ناوچەی سەلماس دەگیرێت و دەینێرن بۆ تەورێز و لەویّ هەڵیدەواسن. خانی ماکۆ تەواوی سەرۆك هۆز و خێڵەکانی کورد لە ناوەڕاستی کانوونی

دووەم بانگ دەکاتە ماکۆ و پێیان رادەگەیەنێت کە پێویستە یەکبگرن، دەیانترسێنێت و دەڵێ لەوانەیە دەوڵەتی تاران هێرشمان بکاتە سەر. لەبەر ئەوە داوای لێکردبوون پێکەوە نامەیەك بۆ کاربەدەستانی تاران بنووسن و بڵێن و ئەگەر دەوڵەتی ناوەندی چەکیان بکات دەچنە تورکیا یا رووسیا.

لە هەمانکاتیشدا خانی ماکۆ ئامۆژگاریان دەکا پارەیەك بۆ لەشکری ئێران کۆبکەنەوە تا بەم چەشنە نیازپاکی خۆیان بەرامبەر دەوڵەتی فارس نیشان بدەن، لە ئەنجامی ئەم هەنگاوانەدا سەردار جێی خۆی لەناویاندا پتەوتر دەکا و کوردەکانش بەڵێن دەدەن لە خەبات دژی دەوڵەتی تاران پێکەوە لەگەڵ سەردار بن.تێکڕای ئەم هەنگاوانەی دوایی وچالاکی سەردار لەناو کوردەکان، کاربەدەستانی تاران ناچار دەکا بە ئامۆژگاری و ڕێنوێنی کۆنسوڵی ئێمە هەندێ هەنگاو بە مەبەستی پێشگرتن لە ئاڵۆزی ناوچەکە هەڵگرن. سەرەتای مانگی شوبات بروسکەیەکی فەرماندەی لەشکری فارس عەبدولڵاخان، گەیشتۆتە دەست سەردار و داوا دەکات بەزووترین کات (٢٥) کەس لە کوڕە ئاغاکانی عەشیرەتی میلان و (٢٥) لە عەشیرەتی جەلالی بنێرێتە تەورێز بۆ بەڕێ کردن و هاوڕێی فەرمانداەی لەشکری فارس بۆ (ئەردەوێل). سەردار بەڵێنیدا لەماوەی دوو هەفتەدا پەنجا کورد لەوانە کۆیکاتەوە و بیانرێتە تەورێز (بەمەرجێك نیعمەتولڵا خان واز لە گرتنی کوردەکانی میلان بێنێت) فەرماندەی لەشکری فارسیش پەسەندی کردووە. سەردار بۆ کۆکردنەوەی ئەو کوردانە کوڕەکەی خۆی (قوری خان) دەنێرێتە لای عەشیرەتی جەلالی. بەپێی هەندێ دەنگوباس عەشیرەتی جەلالی ئامادە نین کوڕەکانی خۆیان بکەنە (بارمتە) و چاوەڕێی وەڵامی عەشیرەتی میلان دەکەن. رژێمی تاران دەیەوێ کوردەکان دژی خانی ماکۆ هانبدات و پیلانەکانی خانی ماکۆ بە هۆی ئەوانەوە تێکبدات[1].

## دەوڵەتی فارس کوردەکانی عەبدۆیی هێناوەتە ژێر دەستی خۆی

، لە ٢٠ی کانوونی دووەم لە برادۆست کوردەکانی عەبدۆ کۆبوونەتەوە و دوو کوردیان بەناوی (بەحری بەگ) و (شێخ موراد) هەڵبژاردووە، تا لەسەر ئەوەی بچنە ریزی سوپای ئێران، وتووێژ لەگەڵ فەرماندەی لەشکری فارس بکەن. بە دەستووری تاران فەرماندەی لەشکر دەبێ وەریان بگرێت[1].

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٦٩-١٧١.

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٧٠.

## شەڕی کاربەدەستانی سوپای تاران لەگەڵ عەشیرەتی سەنجابی

ڕەشید سولتان سەرۆکی عەشیرەتی کەلخانی لەسەر بانگەوازی ئەمیر لەشکر چووەتە هەمەدان. ئەمیر لەشکر دەیەوێ داوای لێ بکا یا ناچاری بکا لە شورای عەشایرەکان بێتە دەرێ. بەپێی ئەو زانیاریانەی هەیە، ڕەشید سولتان لەو سیاسەتەی کاربەدەستانی لەشکری تاران سەبارەت بە خۆی و عەشیرەتی (سەنجابی)نیگەرانە. بەڕێوەبەری سیاسەتی ڕاستەوخۆی کاربەدەستانی فارس لە ناو عەشایرە کوردەکاندا ئەمیر مەخوسە (سەرۆکی عەشیرەتی کەلهوڕ، ناوبراو بە دەستووری ئەمیر لەشکر مامی خۆی کوشت).

لە ١٠ تا ١٦ی شوبات ئەمیر مەخسوس کۆبۆنەوەیەکی لەگەڵ عەشایری جافر سولتان وەڵەدبەگی، جوانرۆیی، مل کۆهی و سەرکردەکانیان کردووە, پێشنیاری پێ کردوون بچنە ڕیزی شورای عەشایرەکان. بەڵێنی پارە و دیاری زۆری پێداون، لەو کۆبوونەوەیەدا دژی سەنجابی و سەردار ڕەشید قسەکراوە و عەشایرەکانیش پشتیوانی خۆیان بۆ کاربەدەستانی سوپای تاران دەربڕیووە و بە قورئان سوێند دەخۆن لەگەڵ ئەمیر لەشکر بن،بەم شێوەیە کۆبوونەوەکە کۆتایی هاتووە. ئەو عەشایرانەی سەرەوە دژی سەنجابی و سەردار ڕەشید بوون لەبەر ئەوەی زیانی ئەو (٢٦) گوندەی جوانڕۆییەکان کە بەهاری ڕابردوو بەدەست سەنجابیەکانی سوتێنرابوو، قەرەبوو نەکراوەتەوە، سەردار ڕەشید لەو باوەڕەدایە کە شورای عەشایرەکان کە بەدەستی سوپای تاران دروستکراوە وەك تیغێکە لە نێوان ئەو و سەنجابیەکان و دەبێتە هۆی بەگژیەکدا چوونیان.

سەردار ڕەشید داوای لە کۆنسوڵی ئێمە لە کرماشان کردووە یارمەتی دراو و تەقەمەنی بدات (داخوازییەکەی سەردار ڕەشید ڕەتکرایەوە).

لەبەر هەندێ هۆ ئاشکرایە کە دەسەڵاتدارانی لەشکری تاران دەیانەوێ یەکێتی سەردار ڕەشید و سەنجابی کە بەدەستووری ئینگلیزەکان کاردەکەن تێکبدەن.

یەکێتی عەشایرەکانی لە بارێکی دژواردا دەژین لەبەر ئەوەی تەنیا لەم یەکێتییە سەردار ڕەشید و سەنجابیەکان و چەند عەشیرەیەکی تری بچووك ماوە، فەرمانداری کرماشان لە لایەن ئەمیر لەشکرەوە دەستووری پێ گەیشتووە کەدەس لە کاروباری عەشیرەتەکان نەدات. دیموکراتەکان ناتوانن پێش بە کاربەدەستە نیزامییەکان بگرن[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٧١-١٧٢.

# بزووتنەوەی شێخ مەحموود

## پەرەسەندنی بزووتنەوەی شێخ مەحموود

مانگی کانوونی یەکەم و دووەم رووداوەکانی کوردستان زیاتر پەرەیان سەند کە ئەمە ئاگادارکردنەوەیە بۆ دەوڵەتانی تورکیا و فارس کەدەبێ چی بکەن. ئەم رووداوانە لە باری چالاکی سوپاییەوە لاواز بوون، بەڵام بۆکوردەکانی فارس زۆر گرینگ بوون، بەگشتی بزووتنەوەی سیاسی کورد لە سەرتاسەری کوردستان رێکخستنی پتری بەخۆوە دیوە و بۆتە مەترسییەك بۆ سەر ئەو دەوڵەتانەی کوردیان تێدایە.

## چالاکی پرۆپاگەندەی شێخ مەحموود

شێخ مەحموود بە یارمەتی ئینگلیزەکان لە مانگی شوباتدا بۆ راکێشانی کوردەکانی تورکیا و فارس زۆر چالاکانە جولاْیەوە. تورکەکانیش ئەم هەلەیان قۆستەوە و هێزەکانی خۆیان لە کوردستانی تورکیا کۆکردەوە و لەگەڵ کاربەدەستانی فارس کەوتنە وتووێژ بۆ ئەوەی پشتەوەی بەرەی ستراتیجی خۆیان لە دەڤەری (سەلماس) و (ورمێ) بە چالاکی هاوبەشی سەربازی دژی کوردەکان پتەو بکەن. شێخ مەحموود راکێشانی کوردەکانی تورکیا و فارس بە یارمەتی سمکۆ جێبەجێ دەکا کە لە گوندی (باردوك) لە کوردستانی تورکیایە (ئەم گوندە دەکەوێتە سەر سنوری تورکیا لەگەڵ مەحاڵ سۆمایە). هەروەها بە یارمەتی سەید تەها کە هاتۆتە قەزای شەمدینان گوایە شێخ مەحموود دێتە (حاجی ئۆمەران) نزیکی شنۆ و سەردەشت و بانە و لەوێ چاویان بە یەکدەکەوێت. ناوچەی چالاکی هیچ کام لەوانە لەناو کوردەکاندا بۆ ئێمە روون نییە. بەڵام وێدەچێ ناوچەی شێخ مەحموود باکووری میزۆپۆتامیا و سنە و سەقزە، شوێنی چالاکی سمکۆ و سەید تەها بە دەستووری شێخ مەحموود ناوچەکانی ئازەربایجانی فارس و عەشایرەکانی ناوچەی (وان)ە. شێخ مەحموود لەناوچەی ژێر چالاکی خۆیدا پشتی بە سەرۆك عەشیرەتەکانی موسڵ و رەواندز بەستووە، وەك عەبدوڵڵا بەگ سەرۆکی عەشیرەتی کۆچەری، حاجی نەورۆز ئەفەندی و حاجی موسا بەگ کە لە ناوچەی رەواندزن. لەناو خاکی ئێراندا لەناو کوردەکانی

سەردەشت و سەقز و سنە چالاكی هەیە (دەبێ ئەوەش بگوترێت: پار بەهاریێ هەندێك لە عەشیرەتەكانی ناوچەی سەقز چالاكانە هاوكاریسمكۆیان كرد).

لە ئەنجامی چالاكی شێخ مەحموود لەناو كوردەكانی فارس فەرماندەی هێزەكانی فارس دەست بەجیێ لە نیوەی یەكەمی كانوونی یەكەمی ساڵی پاردا بۆ سەركوت كردنی كوردەكانی ئەو دەڤەرە كەوتەرێ. لە مەحاڵی لاهیجان سەرۆكی عەشیرەتی (مەنگوڕ) و (بلباس) واتە هەمزاغا و حەسەناغا لە ناو كوردەكاندا چالاكن (هاوینی ساڵی رابردوو و چالاكانە بەشداری جولانەوەی سمكۆیان كرد) ئێستاش هەروا بەهۆی سمكۆوە بەردەوامن.

شێخ مەحموود بەمەبەستی یەكخستن، ئەجینداكانی خۆی ناردووە بۆ كەركووك و هەولێرو موسڵ و ناوچەكانی تر، بەلام كوردەكانی كوردستانی فارس، داوای سەربەخۆیی دەكەن و نایانەوێ لەگەڵ ئینگلیز و عارەبان لەو بارەوە بدوێن. بەگوێرەی هەواڵەكان، تەواوی ئەجیندا و كاربەدەستانی شێخ مەحموودیان لە كوردستانی فارس دەركردووە و گەڕاونەتەوە سلێمانی.لەناو عەشیرەتە كوردەكانی فارسدا تەنیا مەحموود خان لایەنگری سمكۆ و شێخە.

## نەخشەو كاردانەوەی شێخ مەحموود لەبەرانبەرخیانەتی ئینگلیزەكان

سەرەڕای ئەو هەموو چالاكییە بەربلاو و سەركەوتوانە شێخ مەحموود و لایەنگرەكانی، وادەردەكەوێ لەناو داورودەستەی شێخ مەحمووددا شلەژاوی هەبێ. كشانەوەی عەشیرەتە كوردەكانی كوردستانی فارس كە نایانەوێ لە ژێر ئالای ئینگلیزەكان خەبات بكەن، چالاكی سوپایی هاوبەشی تورك و فارس بوو بە هۆی ئەوەی شێخ مەحموود نەتوانێ سەركەوتن مسۆگەر بكات. هەوڵی شێخ بۆ راگرتن و هێشتنەوەی خۆی وەك سەرۆكی نەتەوایەتی كورد بەردەوامە. لە (١٠)ی شوباتی (١٩٢٣)دا كوردێك (خۆی بە سكرتێری شێخ مەحموود دانا) نامەی شێخ مەحموودی هێنا بۆ كۆنسوڵخانەی ئێمە لە تەورێز و دایەدەست هاوڕێ (گەروخۆڤ). بۆ سەربەخۆیی گەلی كورد و رزگاربوون لە ژێر دەستی ئینگلیز شێخ داوای یارمەتی لە دەوڵەتی رووسیادەكا.

لە بەرانبەر یارمەتی دراوی و تەقەمەنی رووسیا، شێخ مەحموود بەڵێنی وەفاداری خۆی بۆ رووسیا رادەگەیەنێت. کوردەکە نامەی سمکۆشی پێبوو بۆ فەرماندەی لەشکری هێزەکانی فارس،داوا دەکات بگەڕێتەوە و بەڵێن دەدا وەفاداری دەوڵەتی ئێران بێت بە مەرجێك عەشیرەتی عەبدۆیی بۆ بگەڕێنێتەوە.

لە(١٥)ی شوبات نوێنەری شێخ گەڕایەوە بۆ سلێمانی، ئاشکرایە کە باوەڕمان بە نوێنەری شێخ نەکرد. بەڵام هاتنەکەی بۆ ئێرە نیشانەی ئەوەیە کە شێخ دەیەوێ (لە دەرەوە) یارمەتی وەربگرێت و بەم چەشنە یارمەتییەکەی ئینگلیز بشارێتەوە.[1]

## نامەی لیزگی ئاغا بۆ هاوڕێ دوبسۆن

**بەقوربانت بم**

**یەکەم:** هیوادارم کە تەندروستیتان باش بێت و هیچ خەم و پەژارەیەکتان نەبێت.

**دووەم:** بە بەرێزتان رادەگەیەنم کە دەمەوێ لە رۆشتنمدا بۆ ناو خاکی رووسیا پێشم لێنەگیرێت. بەڵام بەرێزتان راتان گەیاندبوو کە دەبێ من خۆم بێمە ماکۆ. زۆر حەزدەکەم بێم ولەسەر چەند پرسێك لەگەڵتان بدوێم. بەڵام لەبەر ئەوەی دوژمن لەسەر رێگای هاتوچۆیە ناتوانم بێم، بۆ جاری دووەم تکایە بۆ کاربەدەستانی (نەخجەوان) و (نەورەشبنسکی) بنووسن کە کابرایەکی وا بۆ کاروباری خۆی دەیەوێ بێتە ئەوێ کەس پێشی پێ نەگرێت، بنووسن لیزگی ئاغا خێڵ و هۆز و پلەوپایەی هەیە و پێویستە یارمەتی بدەن. لەم بارەوە چەند نهێنیشم بە (مەمە رەزا ئاغا) وتووە پێتان رابگەیەنێت[2].

**ئیمزا و مۆری**

**لیزگی ئاغا**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٧٣-١٧٦.

(2) هەمان سەرچاوە ل ١٧٦.

# له راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت له بایەزید

## هاوڕێ مالتسۆڤ

**١٩٢٣/٣/٢٢**

له مانگی کانوونی دووەم و شوباتەوه تێکهەڵچوون له کوردستان هەروا بەردەوامه. دوای ئەوەی ئینگلیز تورکیان له ڕەواندز دەرکرد هیچ چالاکی سوپایی گرنگ له لایەن تورك و شێخ مەحموودەوه ئەنجام نەدراوه. تورك به ئاگاداری و یارمەتی دەوڵەتی فارس خۆیان بۆ هێرشی بەهار ئاماده دەکەن. کوردەکان هەروا بەردەوامن له چالاکی سیاسی له تەواوی کوردستان، دەیانەوێ هەموو کوردستانی تورکیا و فارس بخەنه ژێر دەستی خۆیان و کاروباریان تائێستا هەر بەپێی نەخشه دەچێته پێش. تەواوی ناوچەی (وان تا دەگاته دۆڵی ئاباگا) دەتوانین بڵێین لەگەڵ شێخ مەحموود دان، ئێمه زانیاری تەواومان هەیه ئەو کوردانەی تا ئێستا بێ لایەن بوون به تایبەت له ناوچەی بایەزید و ئاباگا بەرەبەره دەچنه ریزی شێخ مەحمود. سمکۆ و سەید تەها دەوری سەرەکی لەم چالاکیانەدا دەبینن. سمکۆ لای سەید تەها له گوندی بارودۆخه (باردۆك) و شێخ مەحموودیش له کانی ماران له باکوور و ڕۆژئاوای سلێمانییه. هەروەك پێشتر ئاگادارمان کردنەوه سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچه موسڵ و ڕەواندز وەك سەرۆك هۆزی کۆچەری عەبدوڵلا بەگ، حاجی نەورۆز ئەفەندی و حاجی موسا بەگ و له کوردستانی فارسیش عەشیرەتەکانی سەردەشت و بانه و سەقز و سنه و.... لەگەڵ شێخ مەحموودن.

سمکۆش لەناوچەی وان و ناو عەشیرەتەکانی میلان به سەرۆکایەتی مەحەمەد سادق بەگ لەگەڵ سەید تەها لەناوچەکانی ماکۆ تا سابڵاخ کوردەکان ڕێك دەخەن. له ناوچەی ورمێ و تەرگەوەڕ، لەناو خێڵەکانی هەرکی به سەرکردایەتی حاجی ئاغا،له سەلماس به سەرۆکایەتی عومەر ئاغا، بەگشتی له زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی تورکیا و فارس، کوردان خەریکی جموجوڵن، بۆ تورکان زۆر زەحمەتەجارێکی تر لەو دەڤەره دەسەڵات بەدەستەوه بگرنەوه.

گەرچی زۆر هەوڵدەدەن دووبارە کوردستان بخەنەوە ژێر دەستی خۆیـان، بـەڵام تـا ئێـستا هـیچ هەنگاوێکیان سەرکەوتوو نەبووە.

«کاتی خۆی کە کۆمیتەی کوردی لە ئەرزەرۆم بڕیاریدا یارمەتی لە ئینگلیزەکان وەرنـەگرێت و دەستوورێکی وەهاشی بە سمکۆ دابوو. سمکۆ ئەم دەسـتوورەی بـە مـەرج وەرگـرت، بـەڵام لـە بارودۆخی ئەو دەمەدا ئەم مەرجانە جێبەجێ نەکران. چونکە شێخ مەحموود بە ئارەزوو یـا بـێ ئارەزووی خۆی پشتی بە یارمـەتی ئینلگیزەکـان بەسـت. سمکـۆش کـە بـە دەسـتووری شـێخ مەحموود دەجوولایەوە هەڵوێستی خۆی گۆڕی، لەبەر ئەوە کوردەکان ئێستا بە هـیچ شـێوەیەك ناتوانن دەسبەرداری یارمەتی ئینگلیزەکان بن. وەرنەگرتنی یارمەتی ئینلگیـز بـۆ کـورد لـەم کاتەدا بە مانای تێکشان و لەناوچوونی بزووتنەوەکەیانە.

بەم چەشنە پەیوەنـدی کوردەکـان بـە ئینگلیـزەوە لەبـەر رەوتـی رووداوەکـان پەرەدەستێنێ. ئینگلیزەکانیش زۆر زەحمەتە دەست لـە کوردسـتان بـەردەن کـە بـۆ دروسـتکردنەکەی هێـز و کەرەستەیەکی زۆریان تەرخانکردووە. پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تورکیا بەشداری ئینگلیزەکانـە لـە رێککەوتنی بزووتنەوەکە، بەڵام من پێم وایە ئینگلیزەکان ئەم شـتەناکەن، واتـە ئینگلیزەکـان کوردیان بە ڕواڵەت لەم پرۆسەیە بەشدارکردووە، نەك بە فەرمی.

لەبـەر ئـەوە نـابێ چـاوەڕێی ئـەوە بکرێـت کوردەکـان خۆبـەخۆ لـە ئینگلیـز دووربکەنـەوە (ئینگلیزەکان بە زۆریش بێ نایەڵن) یاخود بڵێین هێزی دەرەکی پاڵ بە ئینگلیزەکانەوە بـنێ واز لە کوردەکان بێنێت. کوردەکان بەبێ یارمەتی ئینلگیز زۆر زەحمەتە سەرکەوتن مسۆگەر بکەن. لەبەر ئەوە دەبێ دان بەوەدا بنێن کـە ئێمـە لـە بەرامبـەر مەترسییەکی جـدی دایـن، واتـە دروستکردنی «کوردستانێکی سەربەخۆ» کە بەتەواوی لە ژێر کاریگەری ئینلگیزدا دەبێت. با ئەم دەوڵەتەش زۆر بچووك و لـە بـاری سیاسـییەوە گـرنگ نـەبێت، بـەڵام هـەر چـۆنێك بـێ ئنیگلیزەکان لەوێ دەبن و مەترسییەکی زۆری بۆ ئێمە بەدواوە دەبێت.

بۆیە لە راپۆرتەکانی پێشوو نووسیبووم پێویستە ئێمە چالاکانە لە بزووتنەوەی کورددا بەشـدار بین، بە هەڵوێستی تەماشاچی بوونمان کوردەکان دەخەینە باوەشی ئینگلیز کە زۆر زەحمەتە هیچ قازانجێکی بۆ ئێمە تێدابێت.

له مانگی شوباتدا لەبەر هەندێ ئیش و کار رۆیشتمە ماکۆ و لەگەڵ هاوڕێ دوبسۆن لەسەر کوردستان بە گشتی و بەتایبەتی لەسەر کێشەی کورد بیروڕامان ئاڵۆگۆر کرد. ئێمە هەردووکمان گەیشتینە ئەو باوڕەی بۆچوونەکانمان وەك یەکە. هاوڕێ دوبسۆنیش لەو باوەڕەدابوو پێویستە دەستەبەجێ بەشداری بزووتنەوەی کورد بکەن و دواخستنی ئەم کارە لەوانەیە بۆ ئێمە لە داهاتوودا زیانێك بێ و قەرەبوو کردنەوەی زۆر زەحمەت بێت. نوێنەری ئێمە لە تورکیا هاوڕێ ئارالۆڤ ئەویش هەمان بۆچوونی هەیە، چونکە نامەی ئەوم پێ گەیشتووە کە بۆچوونەکانی منی بە تەواوی پەسەندە. بەڵام سەرم لەو بروسکەیەی مۆسکۆ سوڕماوە کە تێدا دەڵێت مۆسکۆ لە بەشداربوونی چالاکانە لە کێشەی کورددا خۆی دەپارێزێت و پێشنیاری تاکتیکی چاولێکردن یان تەماشاکردنی کێشەی کورد دەکات. هەر چۆنێك بێت بڕیاردراوە (بریارێکی نیگەتیڤانەیە).کە من ئەم شتانە باس دەکەم پێموایە ئەرکی سەرشانمە بیروڕای خۆم و هاوڕێ دۆسبۆن دەربڕم، چونکە راستەوخۆ لە کوردستان کار دەکەین و لە نزیکەوە شارەزای ناوچەکە و پیلانەکانین[1].

---

(1) هەما سەرچاوە ل ١٧٩-١٨٢.

## نامەی کونسوڵی سۆڤیەت لە فارس- هاوڕێ تومانوڤ

**ژمارە ٦٦/٠**

**٢٣ی مارتی ١٩٢٣**

هاوڕێی بەڕێز

لە ماوەی چەند ڕۆژ بە ڕێگاوە بوون و ڕۆیشتنم بۆ شاری (قارس) دەرفەتێکیان پێدام کە بیرەوەری و گەشتەکەم بنووسم و هەوڵ دەدەم لە باتی ڕاپۆرت لەم نامەیە بۆتانی بنێرم.

١٥ی مارت چاوم بەکەمال بەگ کوڕی بەدرخان کەوت، ناوبراو ئێستا لە شەقامی گۆدۆویچ ژمارە ١٣ دەژیت. سەردانم کرد لەماڵ نەبوو، وارێکەوت لەگەڵ ژنەکەی کە ئەڵمانیە و بە زمانی رووسی خراپ نادوێت بکەومە قسە. لە وتوێژەکاندا بۆم دەرکەوت ئەو ژنە لە من زیاتر ئاگاداری کاروباری مێردەکەیەتی و هەوڵ دەدا ئەو شتە لە من بشارێتەوە. دوای دە خولەك کەمال بەگ هاتەوە و دوای ئاشنابوون نامەی هاوڕێ (شاخۆڤسکی)م پێدا کە زۆر پێ گەشایەوە. پاش خوێندنەوەی نامەکە سەری سوڕمابوو کە شاخۆڤسکی لە ئەنقەرەوە بۆی ناردووە و وتی کە لە ئابی ساڵی پارەوە ئەمە یەکەم هەواڵە پێم دەگات. من زۆر هەوڵمدا لەسەر ئەم نامەیە درێژە بە قسەکانمان نەدەم. وتم لە نێوان من و شاخۆڤسکی دۆستایەتییەکی نزیك و کۆن هەیە، ئەم وتەیەی من بوو بەهۆی ئەوەی کەمال بەگ بە ئاشکراو کراوە لەگەڵم بدوێ.

من لە لای ئێوە هیچ دەستورێکم پێ نەدراوە. بەم چاوپێکەوتنە تەنیا دەمویست بۆچوونی ئەو لەسەر بزووتنەوەی کورد لەم قۆناغەدا و دەوری ڕاستەقینەی کەسایەتی وی لەناو عەشیرەتە کوردەکاندا بزانم، هەروەها لە هەژاری و کوڵەمەرگی کەمال بەگ لەباری ماددییەوە تێبگەم (هەژاری و بێدەسەڵاتی کەمال بەگم لە یەکێك لە پیاوەکانی خۆمانەوە پێگەشت). لە وتووێژەکاندا بۆم دەرکەوت ئەو تەنیا بە پشتیوانی رووسیای سۆڤیەتی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دەوێ، وتی ئەگەر بە ڕاستی رووسیای سۆڤیەتی دەیەوێ ئاوڕێ لە کوردان بداتەوە،من ئامادەم. ناوبراو پرۆگرامێکی هەیە لەگەڵ ڕێبەرەکانی تری کورد کاری لەسەر دەکەن و ئامادەی دەکەن و ئاراستەی دەوڵەتی رووسیای سۆڤیەتی دەکەن.

کەمال بەگ ئەرکی دروستکردنی کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی لە ژێر رکێفی تورکیا، خستە ئەستۆی خۆی. ناوبراو چەند خاڵێکی پرۆگرامی ئەم ئۆتۆنۆمییەی باسکرد، بەلام ئەم خاڵانە زۆر ساکاربوون و ئێستا تاچاوپێکەوتن باسیان ناکەم.

باسی باشی هاوڕێ شاخۆڤسکی کرد و تەنانەت وتی وەك برای خۆشی دەوێ، باسی خزمەت و خۆشەویستی خۆی بە «ئیمپراتۆریەتی رووسیای» کرد کە لە رابردوو خزمەتێکی یەکجار زۆری بە رووسیاکردووە و دەیەوێ لەم بارەوە ئەگەر پێویست بێت هەر بەردەوام بێت تاکو دەوری لەناو کوردەکانی بۆتان و عەشیرەتەکانی تر لاوازنەبووە. بەچاوێکی فرمێسکاوییەوە باسی پانکراتۆڤ و ئیزەرتیس (نوێنەری دەزگای ئاسایش و سیخوری رووسیای سۆڤیەتی لە قەفقاز)ی کرد کە چۆن وەك منداڵ لەگەڵی دەدوێن و بەڵێنی پاسەوانیان بۆ ماڵەکەی پێداوە و.... هاوکاتیش گوشاریان خستۆتە سەر کە پیلانی داهاتووی خۆیان لەسەر کێشەی کورد بداتێ. گەرچی هێندە گوێ ناداتە ئەم شتە بچووکانە بەلام بەلایەوە جێی شەرمن و بەداخەوەیە کە نوێنەرانی دەوڵەتی رووسیای سۆڤیەتی لەسەر ئەم شتە بچووکانە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و لە هەمانکاتیشدا بە جدی خۆ لە چارەسەکردنی کێشەی کورد ناگەیەنن و بە سووکی تەماشای دەکەن. ئەوانە نەك تەنیا لەم بارەیەو هیچ نازانن، بەڵکو دیارە کێشەی کورد بەلایانەوە گرینگ نییە و خۆی تێ ناگەیەنن. هەر بۆیە کەمالیش وەڵامی هەموو پرسیارەکانیان ناداتەوە.

من هێندێك کەمالم هێمن کردەوە و داوام لێکرد لە رێگای کەسانی ترەوە پەیوندیم پێوبکات. پتەوکردنی ئەم پەیوەندیانە بۆ داهاتوو لەگەڵ کەمال بەگ بەستراوەتەوە بەوەی لەسەرەوە چ دەستوورێکم پێ دەدرێ[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٨٣-١٨٤.

# له راپۆرتی كونسوڵی سۆڤیەت له ماكۆ

## مارتی ١٩٢٣

له وتووێژی هاوڕێ دوسبۆن لەگەڵ سەرداری ماكۆ له ١٥و١٦ی مارتدا،خانی ماكۆ وتی كوردەكان ناتوانن لەگەڵ فارس و توركان پێكبێن، باشترە بەرەو لای ئینگلیز یان رووسیای سۆڤیەتی برۆن نەك لەگەڵ تاران و ئەنقەرە وتوویژ بكەن. قەناعەتیشی بە هاوڕێ دۆبسۆن كردبوو كە دروستكردنی كوردستانێكی سەربەخۆ كە كوردستانی توركیا و فارس یان بە تەنیا كوردوستانی توركیا بگرێتەوە، شوێنەواری خراپی بۆ فارس و رووسیا بەدواوە دەبێت. لەبەر دەوری ئینگلیز له باشووری كوردستانی توركیا دوور نییە سیاسەتی ئێمەش له مەڕ پێوەندی لەگەڵ توركیا گۆڕانی بەسەردا بێت. سەردار باسی ئەوەشی كرد كە رووسیا دەتوانێت لەناو كوردەكان چالاكی بنوێنێت، لەوانەیە سنوورەكانی كوردستان لەو سنووری ئێستای ئێمە لەگەڵ فارس و توركیا، بەرینتر بكرێت، (واتە بە شێكیش له رووسیا بگرێتەوە،وەرگێر).

له كۆتاییدا سەردار بەڵێنی بە هاوڕێ دوبسۆندا كە هاوكاری گێڕانی دەوری رووسیای سۆڤیەتی دەكات لەناو كوردەكان، تەنانەت بەهێزە چەكدارەكەشی ئامادەیە سنوورەكان له نەخجەوانەوە تا ئیروان بپارێزێت. بەمەرجێك ئێمە ژیرانە كاربكەینە سەر دەوڵەتی فارس دەست له كاروباری خانی ماكۆ نەدات، ناوبراو وتی لەم بارەوە ئامادەیە لەگەڵ دەوڵەتی تاران بۆ بەرژەوەندی هەردوولا مەرجی دوو لایەنەی هەبێت، داوای لێكردم لەم بارەوە هاوڕێ دوبسون له تاران ئاگادار بكەمەوە.

«گەلاڵەی ئەم پەیمانە» كە لە لایەن سەردارەوە دیكتەكراوە هەر لە سەردەمی دەوڵەتی قەیسەرییەوە بە هۆی ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ رووسیا هەیبووە بناغەی دانراوە و ئەمرۆ بە شێوەیەكی دیبلۆماسی وەك بەڵگەیەك خۆی دەنوێنێت، ناوەرۆكی پەیمانەكە دیارە: بەهێزكردنی دەوڵەتی فارس لە لایەن ئێمەوە بۆ دەست تێوەردان لە كاروباری خانی ماكۆ پاڵ بە خانی ماكۆوە دەنێت بە دوای هاوپەیمانێكی نوێدا بگەڕێت كەسایەتی خانییەتی خۆی بهێڵێتەوە و لە لاوازی و بەرهەڵستكاری بێتەدەر و چالاكانەتر بەرامبەر نەیارەكانی راوەستێت. سەردار دەیەوێ

خۆی لە جیلی کۆندا بشارێتەوە و بەروالەت سەر بە دەولەتی تاران بێت و تەنیا کەم و کوڕییەکانی دەستنیشان بکات، دەیەوێ واخۆی نیشان بدات کە ناچارە لەگەڵ ئینگلیزەکان پەیوەندی ببەستێت، کە مانای ئەوەیە سەردار دەیەوێت لە تاکتیکی ئاسایی وازبێنێت تا بۆ پتر پاراستنی خۆی لایەنێکی تر مسۆگەر بکات. ناوبراو بە لەبەر چاوگرتنی دەوری ئێمە و نزیکی جوگرافی رووسیا لە خانی ماکۆ و سەردار،هەولدەدات لەگەڵ ئێمە پێك بێت نەك لەگەڵ ئینگلیزەکان.

سەرەڕای ئەو شتانەی باسکرا، خانی ماکۆ ئێمەی وەك هاوپەیمانی خۆی هەڵبژاردووە. لەوە دەترسێت کوردستانی سەربەخۆ بە هۆی ئینگلیزو ئەتاتۆرك دابمەزرێت. لەبەر ئەوەی ناوبراو دوژمنایەتی لەگەڵ عەشیرەتەکانی ویلایەتی وان (حەیدەرانلو)دا هەیە، دەترسێ وای لێ بێت لە لایەن کەمالیستەکانەوە بکەوێتە بەر هەڕەشە و مەترسی.

بەم چەشنە رەوتی رووداوەکانی کوردستان و گوشاری دەولەتی فارس ترسی خستۆتە دلی سەردارکە لە لایەن کوردەکانەوە سەرەوژێر بکرێ یا ناچاربێ تەسلیمی دەولەتی تاران یان گوێرایەڵی بێت. بۆیە ناچارە پەنابباتە بەر رووسیای سۆڤیەتی و داوا دەکات پەیمانی لەگەڵ ببەستێت، چونکە پەیمان بەستنی لەگەڵ ئێمە زۆر بە قازانجی حوکمداری ماکۆ و ئێمەیە. دەتوانین رێگەی ستراتیجی ماکۆ-خۆی لە نزیك دەشتی نەخجەوان بپارێزین و بۆ دوور راگرتنی سنووری کوردستان لە سنووری رووسیا، کەلکی لێ وەربگیرێت.دەبێ دەولەتی ئێمە سوود لەو فاکتەرانە وەربگرێت کە پاڵ بەخانی ماکۆوە دەنێن بەرەو لای ئێمە بێت،، بەلام نەك بۆ بەهێزکردنی مەبەستی جوداخوازی خانی ماکۆ[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٨٥-١٨٦.

# ئارام کردنەوە (تەسلیم بوونی) کوردەکانی عەبدۆیی

سەرەتای کانوونی دووەم لە برادۆست زۆربەی پیاوەکانی عەشیرەتی عەبدۆیی بە سەرۆکایەتی سمکۆ کۆبوونەتەوە و دەستەیەکی نوێنەرایەتیان پێکهێناوە لە پیاو ماقوڵانی خۆیان بۆ وتووێژ لەگەڵ فەرماندەی سەر لەشکری فارس و وەزیری جەنگ سەبارەت بەرێککەوتن وگوێرایەڵی خۆیان بۆ دەوڵەتی ناوەندی. کوردەکان بەڵێنیان داوە بە قورئان سوێندبخۆن بە شا وەفادار بن و دژی سمکۆ و هاوکارەکانی بوەستن. نوێنەرەکانیان، بەحری بەگ و شێخ موراد داوایان لە فەرماندەی لەشکری ئێران کردووە وەك سەرباز لە ریزەکانی سوپای ئێران بۆ خزمەتکردن وەریان بگرن و بەڵێنیان داوە وەفاداربن. ١/٢٤ وەزیری جەنگی فارس وەڵامی لێبووردنی عەشیرەتی عەبدۆیی دایەوە و بەڵێنی وەرگرتنیانی لە ریزەکانی سوپای دەوڵەتی تاران راگەیاندووە (بەڵام بەچەکی خۆیانەوە). دەستووری پێویست دراوە بەفەرماندەی پادگانی ورمیّ کە جاریّ سیّ سەد نەفەر سواریان لیّ هەڵبژێرن. دەبیّ بزانین ئەم هەنگاوەی دەوڵەتی فارس لە دڵەوە نییە، مەبەست تەنیا ئەوەیە کوردە نائارامەکانی سەر سنوور لە رووداوەکانی تر دووربخاتەوە. ئەم بۆچوونە بە بڵاوبوونەوەی ئەو دەنگوباسانەی خوارەوە دەردەکەویّ:

١- چل وپێنج سواری کورد بە سەرۆکایەتی یەکێك لە سەرکردە عەشایرەکانی کورد بەناوی حەمزە ئاغا هاتوونە تەورێز، چاوەڕێی دەکریّ بۆ شەڕی شاهسوەنەکان بیاننرێتە ئەردەویڵ، هیوادارن لەو شەڕەدا حەمزە ئاغا و چەکدارەکانی لەناوبچن و لە کۆڵیان ببنەوە.

٢- لە رۆژی ٢٠ی کانوونی دووەم هێزێکی کوردە سوارەکان کە ژمارەیان دەگەیشتە ١٠٠ کەس بە سەرۆکایەتی ئەمیر ئەسەدی بەناوبانگ کوڕی حاجی ئێلخانی زادە دەرەبەگی عەشایری شەڕکەری دێبوکری، بەو نیازە دەنێرنە شەڕی شاهسوەنەکان تا لە ناوبچن[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٨٧.

# دەستە چەکدارە کۆمەڵاتییەکان

کاربەدەستانی سوپای ئێران لە دژایەتی کردنی شواری عەشایرەکان بەردەوامن بەتایبەتی دژی سەنجابییەکان. ٣ی مارت سەرکردەی عەشیرەتی کەلهوڕ کە هاتبووە کرماشان، بۆ ئەوەی لەدەست سوپاییەکان رزگاری بێ لەماڵی سەید حەسەنی کۆنەپەرست دەمێنێتەوە (کەچی ئەو یارمەتی نادات) ودەیگرن. کۆنەپەرستان پێشنیاریان بە دیموکراتەکان کردووە بەرەیەك دژی نیزامییەکانی ئێران پێکبێنن. دیموکراتەکانیش داوایان کردووە ئەوانەی ویستبوویان (مەوانیرملوك) بکوژن ئێستا گیراون ئازادبکرێن، کۆنەپەرستانیش لەو بارەوە بەڵێنیان پێداون.

٤ی مارت ئەمینی سەرۆکی سۆسیالیستەکان لەگەڵ موانیرالملوك سەرۆکی کۆنەپەرستەکان ئاشتبوونەوە، ئێستا دیموکرات و کۆنەپەرستەکان چالاکانە هەوڵ دەدەن پێکەوە دژی نیزامییەکان دەست بەکاربن. نیزامییەکان هەروا لەسەر سیاسەتی دەست بەسەر داگرتنی تەواوی دەسەڵاتی ناوچەکانی رۆژئاوا بەردەوامن. شورای عەشیرەتەکان بە سەرۆکایەتی سەنجابی نارێك و شلەژاوە.

٣ی مارت ئەمیر لەشکر، بەمەبەستی هێنانی رەشید سوڵتان سەرۆکی عەشیرەتی کەلهور بۆ ریزی ئەمیر مەخسوس، دەستووریدا دەسگیر بکرێ. ناوبراو بەو کارەی زانی و هەڵات بۆ میزۆپۆتامیاو چووە لای سەنجابی. لە ئەنجامدا نیزامییەکان توانیان شورایەکی نوێ لە عەشیرەتەکان پێك بهێنن و پەیمانێك بەم شێوەی خوارەوە مۆر بکەن:

«ئێمە کە لە خوارەوە واژۆمان کردووە بە شەرەفی ئایینی ئیسلام و شەرەفی عەشایەری و مرۆڤایەتیمان سوێند دەخوێن کە هیچ کاتێك لەگەڵ سەردار رەشیدی کوردستان ئاشت نەبینەوە: رەشید سوڵتانی کەلهور-کامیر سوڵتان لە عەشیرەتی گۆران-میرزا حەبیبوڵڵای دیبلی-هۆمایون (نوێنەری سەردار ئەجلال و ئەمیر موختار) عینایەت بەگ، جافر سوڵتان نوێنەری لهۆنی تەخت و دیزلی و رەزاو - زەرغامولسەڵتەنە گۆران، سالار نووسرەت، بەهرام بەگ، سەردار ئەکرەم شێخ عەلی بەگ-گۆران. سەردار مەنسور، نوسرەت لەشکر-گۆران، سالاری جەنگ - گۆران- سوڵتان ناوێك کە لە عەشیرەتی سەنجابیەکان دەرکراوە[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٨٧.

## شورای نوێی عەشیرەتەکان لە ژێرکارتێکردنی ئینگلیزەکاندایە

«ئیجتماعیون» چوار کۆبوونەوەیان هەبووە لـە یـەکی مـانگی مارتـەوە تـا (١٥)ی مـانگ، (٩٠٠) کەس بەشداریان کردووە، کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتیان بەم چەشنە هەڵبـژاردووە: قـەوام العلما-نوسرەت سوڵتان- کەزازی ئەمینی، میرزا عەلی خانی سەرتیپ، سـادق تـاتیر، مـیرزا جاتیر، سولێمان خان، شێخ عەلی حوسێن خـان معـادن، رێکخـستن و کۆمیـسیۆنی پـشکنین، ژمارەی ئەندامانیان دەگاتە (٥٠٠) کەس. کاریش بۆ رێکخـستنی ئەنجوومەنـەکان دەکرێـت، پارێزگار (ئوستاندار) لەم بارەوە یارمەتی یان دەدات،ئـەوانیش بروسـکەیەکیان بـەم چەشـنەی خوارەوە بۆ تاران ناردووە:

«بۆ وەزیری ناوخۆ، خوابتان پارێزێت، هـەروەك لـە رۆژنامەکانـدا سـەبارەت بـە ئەنجوومەنـە سەربەخۆکان لە بەرنامەی دەوڵتدا راگەیندرابوو، کێـشەی شـورای ئەنجوومەنـەکان ئـەمرۆ زۆر گرنگە لەباتی ئەو زیانانەی ئەو ئەنجوومەنانە لە رابردوودا لێیان کەوتووە، بەپێـچەوانەوە دام و دەزگاکانی دەوڵەتی بەتایبەتی ئەوانەی سەر بـە وەزارەتـی نـاوخۆن، جگـە لـەوە ئەنجوومـەنی کرماشان بە هاوکـاری چـالاکانەی ئێـوە، دەسـت بـەکاردەبن» نامانـەوێ بـە وردی لـەبارەی هەنگاوەکانیانەوە ئاگادارتان بکەینەوە و...... ١٩ی حوزەیران[1].

## رۆیشتنی گیگوی ئەرمەنی

لە تارانەوە فەرماندەی پێشووی ئاتریادی سوارەی ئەرمنییەکان کە یەکێك بـووە لـە داشـناکە کۆنەکان چۆتە کرماشان، وەك بەرپرسی یەکێك لە دەستەی کۆمیتەکان دانراوە[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٨٧-١٨٨.

(1) هەما ن شەرچاوە ل ١٨٩.

## پەیماننامەی شێخ مەحموود و تورکەکان لە بەڵگەنامەکانی سۆڤیەتیدا

### *بازنەی بەلشەویکی –کەمالی- شێخ مەحموودی*

### *کە چارەنووسی گەلی کوردی بەرەو کارەسات برد*

لەوەی کە شێخ مەحموود دژی ئینگلیزەکان جولایەوە و پاش گرتن و دوورخستنەوەی شێخ دیسانەوە هێنرایەوە بۆ کوردستان و دەسەلات پێ درایەوە و هەوڵ درا هەر چۆنێك بێت لەگەڵی پێك بێن، بەلام لەوەی کە شێخ پەیمانی لەگەڵ تورکەکان مۆرکرد لە روانگەی ئینگلیزەکانەوە تاوانێك نەبوو کە چاوپۆشی لێ بکرێت و ئەمە و جگە لە رابردووی شێخ مەحموود کە کاتی شەڕی جیهانی یەکەم هاوکاری تورکەکانی کرد کە نەتەنیا خەڵکی بۆ پشتیوانی تورك بانگ دەکرد بەڵکو خۆشی شان بەشانی سوپای تورك لەوانە لە شوعەیبە بەشداری شەڕی کرد ئەم پەیمانە لەلایەن شێخ مەحموودەوە دەست بە جێبەجێکردن دەکرێت جگە لەوە ئەم پەیمانە بە پەسندکردن و ئاگاداری یا رێنوێنی بەلشەویکەکان پێك دێت. کە هەم بەلشەویکەکان و هەم کەمالیەکان دوژمنی سەرسەختی ئینگلیزەکان بوون و بەهاوسەنگەری شێخ مەحموود کەوتوونە پیلانێکی هاوبەشی دژی ئینگلیز و بەرژەوەندییەکانی نەتەنیا لە کوردستان و عێراق و رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەڵکو لە ئاستی نێونەتەوەیشدا. کەواتە بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەم پیلانە گەورەیە بوو بە هۆی هێشتنەوەی کوردستان لە چوارچێوەی عێراق و رێککەوتن لەگەڵ تورکەکان و خۆ تێنەگەیاندن نەتەنیا لە باشوور و باکووری کوردستان بەڵکو کوردستانی بن دەست ئێران و فەرەنسا (سوریا). لەلایەکی ترەوە شێخ لە رێگەی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ کوردی رۆژهەلات (ئێران) و باکوور (تورکیا) کوردەکانی ئەوێ دژی بەریتانیا هان ئەدات، جگە پەیوەندییە گومان لێکراوەکانی لەگەڵ هەندێ تاقم و کەسی عەرەبی لە عێراق کە دژی بەریتانیا بوون. ئەوان ئەم دەوڵەتەی زیاتر شلگیرکرد کە چیتر خۆی لە قەرەی کێشەی کورد نەدات کە نە ئێران و نە عێراق و فەرەنسای هاوپەیمانیشی لە سوریا لەخۆی زویر دەکات و بەم چەشنە زەمینەش بۆ پێك هاتن لەگەڵ تورکەکان ئامادە دەکات و تورکەکانیش هەر ئەوەیان دەویست کە کورد لە هیچ بەشێکی نیشتمانەکەی نەگاتە مافی خۆی. ئاکامی ئەم هێنان و بردنە پووچەڵ کردنەوەی پەیمانی سیڤەر لە لۆزان و نەمانی مەلیکییەتی شێخ مەحموود و

کۆتایی هاتن بە شۆڕشی سمکۆ و هتد بوو. هەڵسەنگاندنی کردەوەکانی شێخ مەحموود چ بە پێوانەی بارودۆخەکەی ئەو سەردەمە بێت و چ بەپێی پێوانەکانی ئێستا بێت لە لۆژیك (مەنتیق) و تێگەیشتن و زانست و بەرپرسیارەتین وەنەبێت کاتی خۆشی ئاکامی پڕ لە کارەساتی ئەم هەڵسوکەوتەی شێخ بە خودی شێخ نەوترابێت دیارە من لێرە نامەوێ بە وردی لەسەر ئەم بابەتە لەم وتارەدا بدوێم مەبەستی من تەنیا بڵاوکردنەوەی ئەم بەڵگە بوو. ئەم بەڵگەیە و دەیان بەڵگەی تر بەم زووانە لە قەوارەی پەرتوکێکدا دەکەونە بەردەستی خوێنەر و لێکۆڵەری کورد کە پەیوەندییان بە هەموو پارچەکانی کوردستان و کەسایەتی و رێکخراو و پارتی سیاسی کورد، رووداوەکانی کوردستان گەمە و ململانێ وڵاتانی خاوەن بەرژەوەند و دەورگیرەوە هەیە.
گەرچی ئەم بەرهەمە دەبوایە پێش پێنج ساڵ بڵاوکرابایەوە تا پێداچوونەوەیەك بەسەر ئەو نووسینانەی کە تا ئێستا دەرخوارد کراون بکرێت و پاڵ پێوەنەر بن بۆ درێژەپێدان و لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر گەلێك بابەت. ئێمەی کورد تا ئێستا زۆر بۆمان ئاسان بووە هەمیشە هێزی دەرەکی تاوانبار بکەین (چ زل هێزی رۆژئاوایی و چ دەوڵەتانی هەرێم) کە نەیانهێشتووە گەلی کورد وەك گەلانی تر بگاتە مافی سەربەخۆیی بەڵام راستیەکەی ئەوەیە کە سەرکردەکانی کورد لە هەڵسەنگاندنی بارودۆخی نێونەتەوەیی و هەرێمی و پارسەنگی (تەوازونی) هێزەکانی و بەرژەوەندییەکانیان تێنەگەیشتوو یا لاوازبوون و نەیانتوانیووە لەگەڵ رووداوەکان و فاکتەری نرخی رۆژ مامەڵە بکەن. بەکورتی و بەکوردی ئاماژەیەك بە سیناریۆی رووداوەکانی پاش شەڕی جیهانی یەکەم دەکەم کە ئینگلیز و هاوپەیمانانی ئیمپڕاتۆریەتی لەرزۆکی عوسمانییان هەڵوەشاند و گەلێك دەوڵەتیان پێك هێنا کە سەرۆکەکانیان هەر لەلایەن ئەوانەوە بەتایبەتی بەریتانیا دانراون بو وێنە وڵاتانی عەرەبی (لە کوردستانیش شێخ مەحموودیان کرد بە مەلیك) هەر بە رێنوێنی و دەستووری ئەوان دەجولانەوە ملکەچی دەستوور و فەرمانەکانیان بوون بەرژەوەندی زلهێزەکانیان دەپاراست تا بوونە دەوڵەت و سەربەخۆییان بەدەست هێنا و لە بەرامبەر دەست درێژی و پیلانەکانی تورك و لایەنی تر بۆ گەڕاندنەوەی وڵاتەکەیان بۆ سەر خاکی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی (تورکیا) خۆیان پاراست کە بەبێ پشتیوانی ئەو هێز یا هێزانەی (دەوڵەت) کە هاتوون و نیشتمان و گەلەکەیان رزگارکردووە نەیانتوانی پارێزگاری لە خۆیان بکەن کەچی کوردی باشووری کوردستان واتە شێخ مەحموود دەچێت لەگەڵ داگیرکەری وڵاتەکەی، خۆی نزیك دەکاتەوە و چالاکی هاوبەشی لەشکەری دەکات و سەرئەنجام پەیمانی لەگەڵ دەبەستێت، ئەو دەوڵەتەن کە بەدرێژایی چەند سەدە کوردی چەوساندوەتەوە و

کوشتار و تالآنی کردووه و هیچ مافێکی پێ ڕەوا نەبینیووه و هێشتا هیچ مافێکی بە کوردەکانی خۆی نەداوه تا پشتیوانی لە بەشێکی کوردستان بکات و وەلایەتی موسڵ بە بەشێکی دانەبڕاوی ئیمپراتۆرییە رووخاوەکەی خۆی دەزانێت. و هێشتا ئەم دەوڵەتە نوێیە (دەوڵەتی کەمالییەکان) بە رەسمی نەناسراوه واتە نە لە ئاستی نێونەتەوەیی و بەتایبەت کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الأمم) و بگرە هیچ دەوڵەتێکیش هێشتا دانی پێدا نەناوه (رژێمی سۆڤیەتیش هەروا هێشتا بەرەسمی نەناسرابوو) واتە پەیمان بەستن لەگەڵ دەوڵەتێك یا دوو دەوڵەت کە هێشتا شەرعییەتیان نییە و لە ئاستی نێونەتەوەیش دەورێکی ئەوتۆیان نییە و هێزێکی ئەوتۆشییان نییە کە یارمەتی گەلانی تر بدەن، لە حاڵەتی یا وەستانی یا بەرگری لە خۆکردن دان و خوا خوایانە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بەرەسمی بیانناسێت و لەلایەکی تر ئەم پەیمانەی شێخ لەگەڵ کەمالییەکان یا بەلشەویکەکان (شێخ پێشنیاری) بەستنی پەیمانێکی ئەوتۆش بە بەلشەویکەکان کردبوو بەڵام بەلشەویکەکان ناوێرن و بە بیانووی ئەوەی پەیوەندییان لەگەڵ ئینگلیزەکان زۆر ئاڵۆز و گرژە) ناتوانن رەسمییەتێکی نێو نەتەوەییان هەبێت.

ئایا شێخ نەیدەتوانی وەکو فەیسەڵ لە عێراق و فەیسەڵەکانی تر لە وڵاتانی عەرەبی و بگرە وڵاتانی تری دونیا کە دەستەمووی کولۆنیالیستەکان بوون گوێڕایەڵیان بێت و بەشێوەیەك لە شێوەکان لەگەڵیان پێك بێت و لە بەرامبەر دابینکردنی کیانێك بۆ کورد بەرژەوەندییەکانیان بپارێزێت و دژیان بجولێتەوه کە جارێکی تر کوردستان یا بەشێکی کوردستان کە خۆی کرابوو بە مەلیك بەشێکی نەکەوێتەوه ژێر دەستی دەوڵەتی تازە دروستکراوی عێراق یا تورکیایەك کە هێشتا دەسەڵاتی خۆی سەقامگیر نەکردبوو و هەر لەسەر بیروڕای فراوانخوازی وڵاتەکەی بوو؟ تۆ بڵێی شێخ ئەو راستییە تاڵەی نەزانیبێت کە دەسەڵاتدارانی عەرەبی و تورکی و فارسی بە درێژایی مێژوو کە هیچ کێشەیەکیان چارەسەر نەکردووه و رێزیان لە یەکسانی و بەرامبەری و مافی نەتەوەیی و سیاسی و... بۆ هیچ گەلێکی جیا لە خۆیان بەرەسمی نەناسیوه چۆن بۆ کورد شتێك دەکەن و تەنانەت مافی کلتوریشی پێ بدەن.

ئینگلیزەکان مەترسییان هەر لەسەر کوردستانی باشوور نەبوو کە لەدەستیان بچێت یا ببێتە پێگەیەك بۆ نەیارەکانی بەڵکو لایان ئاشکرابوو کە تورکەکان ناهێڵن و نایانەوێ هیچ بە کورد بدەن تەنانەت ئەگەر ولایەتی موسڵیش بگەڕێتەوه یا بخرێتەوه سەر خاکی تورکیا و لە ئەنجامدا ئەم ناوچە ستراتیژە و دەوڵەمەندە دەبێتە پێگەیەك بۆ دەست درێژی بۆ سەر تەواوی رۆژهەڵاتی

ناوەڕاست یا لانی کەم بابەتی مامەڵەی بەلشەویك و کەمالییەکان لەگەڵ ئینگلیز و ڕۆژئـاوادا کە لە پەیمانی لۆزان ئەم سەودایە کرا.

تۆ بلێی شێخ و هاوبیرەکانی ئەو ڕاستییە تاڵەی تریان نەزانیبێت کە بەریتانیای بەهێز کـە لـە شەڕی جیهانی یەکەم سەربەرزانە ڕزگاری بـووە و مەترسـی لەسـەر نـەماوە و هێزێکـی زۆر و هاوپەیمانێکی زۆری لە ناوچەکەدا هەیە و سوپاکەی حەساوەتەوە و گێرەو کێشەیەکی ئـەوتۆش لە ناوچەکەدا نییە و لە عێراق و لە کوردستان پێگە و هێزی هەیـە لـە جـاران زیـاتر دەسـتی دەڕوات بوار نادات نە کەمالییەکان و نە بەلـشەویکەکان ناوچـەکە داگیربکـەن، شـێخ لەگـەڵ کەمالییەکان و بەلشەویکەکانیش پەیمانی هەمە لایەنەشی هەبێت جگە لەوە بـەریتانیا خـاوەن دەور و دەسەڵات لە هەرێمەکە و کوردستان بوو لە ئاستی نێونەتەوەیش ڕێکخراوی کۆمـەڵگای گەلان (عصبە الأمم) سەرکردایەتی دەکرد دیپلۆماسیەت و ئابووری و شەڕ و ئاشتی لە دونیادا لەدەست دابوو و هەر ئەم دەوڵەتە بوو کە بە پشتیوانی هاوپەیمانەکانی هەم کێشەی کوردی لـە بڕیاری دروست کردن و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانـەکانی سـیڤەر و لـۆزان و سـەرئەنجام مانـەوەی کوردستان لە چوارچێوەی عێراقیا نەمانەوەی و هتد بڕیاریدا، لەلایەکی ترەوە تۆ بلێی شـێخ و هاوبیرەکانی ئەوەیان لەبەرچـاو نـەگرتبێت کـە کەمالییـەکان و بەلـشەویکەکان لەگـەڵ شـێخ مەحموود خەریکی وتوویژ و پێك هاتنن. هەم چاپەمەنی و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دونیا لەسـەر ئەم کێشانە دەدوان، تەنانەت لە چەند چاوپێکەوتنی نوێنـەرانی شـێخ لەگـەڵ کەمالییـەکان و بەلشەویکەکان کە شێخ داوای یارمەتی لەو دوو دەوڵەتە دەکات (بـەپێی بـەڵێن و پەیمانەکـەی نێوانیان) بەڕاشکاوی بەلایەنی کوردی دەڵێن کە ئێمە لەبەر وتوویژەکانمان لەگەڵ ئینگلیز جارێ نـاتوانین و پێیـان دەڵـێن کـە چـاوەڕێی ئـەنجامی کۆبوونـەوەکانی لەنـدەن و لـۆزان دەکـەن و بەلشەویکەکانیش سەرئەنجام پێیان دەڵـێن کـە لەبـەر بـارودۆخی نێونەتـەوەیی نـاتوانن هـیچ یارمەتییەکیان بوون (بەڵگەش لەم بارەوە زۆرە کە لە بەرهـەمی نـاوبراودا بڵاودەبنـەوە) واتـە گەمەکردن یان ئەگەر ناوێکی تری لێبنێین بە بەڵێنی هەم کەمالییەکان و هەم بەلـشەویکەکان دیاربوو مەبەستیان هاندانی شێخ و کورد بوو دژی بـەریتانیا بـۆ بەرژەوەندییـە گڵاوەکانیـان. مەبەستم ئەوەیە شێخ هێشتا بواری ئەوەی مابوو بەرەسمی و بە کردەوە و تەنانەت ڕاگەیاندنیش هەم وازیان لێبێنێت و هەم دان بە هەڵەکەی خۆیدا بنێت بۆ ئەوەی خۆی و گەلەکەی لـە دیلـی ڕزگار بکات و بانگهێشتی سوپای بەریتانی بۆ کوردستان کرابایا کە لەگـەڵ هێـزی چـەکداری

کورد بۆ وەدەرنانی چەتەکانی ئوزدەمیر لە کوردستان هەنگاوی هەڵگرتبا یا شێخ بە پێچەوانەی فەیسەڵ و سەرکردەکانی تری وەك وەڵاتانی عەرەبی هەم دژی سوپای بەریتانیا شەڕی دەکرد و هەم خوازیاری دەرکردنی سوپای بەریتانیا لە کوردستان دەبێت. نازانم شێخ بە کام هێز و توانای خۆی دەیتوانی بەبێ یارمەتیدانی بەریتانیا بەرامبەر بە پیلانی کەمالییەکان و ئێران مەلیکایەتی خۆی رابگرێت. کێ ئامادەبوو یارمەتی دراویی و ئابووری و لەشکری و دیبلۆماسی و... بدات؟ و ئەگەر ئەم دەوڵەتەی کوردستان راگەیندرابا لە وڵاتێکی وەکو بەریتانیا بەولاوە کێ هەبوو هەوڵی بۆ بدا و لە رێکخراوی کۆمەڵە یەکگرتووەکان بەرەسمی بناسرێت چ هێزێکی تر دەیتوانی بەم کارە هەڵسێت، سۆڤیەت و کەمالییەکان هێشتا خۆیان بەرەسمی نەناسراو بوون و هیچ دەورێکیان لە سیاسەتی جیهانی دانەبوو.

خاڵێکی تر کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین ئاسەواری ئەم سیاسەتەی شێخ بوو کە کۆمەڵگای کوردەواری بەتایبەتی رێزی نیشتمان پەروەر و ئازادیخوازانی کورد و سەرئەنجام کۆمەڵگای کوردەواری کردە دوو بەشەوە تەنانەت بنەماڵەکەی خودی شێخیشی گرتەوە جگە لەوە کاردانەوەی ئەم سیاسەتە لە بەشەکانی تری کوردستان بێ ئاسەوارانە بوو کە بەگشتی دەستەیەکیان لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیا و دەستەکەی تریان دژی سیاسەتی بەریتانیا بوون کە ئەویش بە سەرکردایەتی شێخ و هاوبیرەکانی بوو کە لە گۆڕەپانی رووداوەکاندا چالاك و بەرچاو بوون و دەوریان دەگێڕا، کەسانێکیش وەك شێخ حیسامەددینی باغەکون کە خاوەن دەور و دەنگ دەبێت لە بانگەواز و پەیامەکانیدا داوا لە شێخ مەحموود و خەڵك دەکات کە دژی ئینگلیزی بێ دین و ناموسوڵمان و لەگەڵ هاودینەکانی خۆیان واتە تورکیا بن. ئەم هەڵوێستەی شێخ حیسامەددین ئایا لەسەر داخوازی تورکەکان یا شێخ مەحموود یا لەرووی بیروباوەڕی خۆیەوە بوویێت دەوری کاریگەر و نێگەتیڤانەی خۆی بینیووە، یا هەڵوێستی نیشتمانپەروەرێکی ئازا و ناسراوی کوردی رۆژهەلات مەحموود خانی دزلی کە بە بۆنەی زیارەتی گۆڕی کاك ئەحمەدی شێخ بە چەکدارەکانی خۆیەوە دیت و سولەیمانی بۆ شێخ مەحموود دەگرێتەوە و ئینگلیزەکان دەردەپەڕێنێت ئەمانە و گەلێك هۆی تر شێخ مەحموودی لەخۆبایی کرد و وای دەزانی کە ئینگلیزەکان ناچار دەکات تەسلیمی مەرجەکانی بن یا بەبێ، یارمەتی ئینگلیز بگاتە مەرامی خۆی. ئینگلیز نایەوێ نەتەنیا لە کوردستانی باشوور بەڵکو لە کوردستانی باکووریش نەیار یا شێخ مەحموودێکی تری هەبێت و تووشی یاخیبوونێکی تر

ببێتەوە. بێ باوەڕی بە کوردان لای زیاتر دەبوو. خۆ جاری یەکەمیش نەبوو کە چاوپۆشیان لە شێخ کردبوو بەڵام شێخ هەر لەسەر ڕێبازەکەی خۆی بەردەوام بوو ڕۆژبەرۆژ لە گۆڕەپانی سیاسی دوور دەخرایەوە لەگەڵ ئەویشدا کێشەی کورد لە ئاستی نێونەتەوەیی و بگرە عێراقیش پشتگوێ دەخرا ناوچەی ژێر دەسەڵاتی تەسك کرایەوە و سەرئەنجام گەڕانەوەی شێخ لە هیند و دووبارە بە دەسەڵات گەیاندنی وەك مەلیکی کوردستان دیارە لەلایەن شێخەوە بە ترسان یا پاشەگزە یا بە لاوازی ئینگلیزەکان لە قەڵەم دراوە ئەگینا بۆ ئاڵوگۆڕێك لە سیاسەتی خۆیدا ناکات و بە پێچەوانە لەسەر هەڵوێستی خۆی هەر شلگێرتر دەبێت و کار دەگەیەنێتە دوژمنایەتیەکی ئاشکراتر و سەرئەنجام بەستنی پەیمان لەگەڵ کەمالییەکان و کەین و بەینەکانی لەگەڵ سۆڤیەت کە ئیتر بواری بۆ هیچ پێکهاتنێکی لەگەڵ ئینگلیزەکان نەهێشتەوە، تەنانەت ئینگلیزەکان لەوە دەترسن کە ئەمجارەش شێخ وەك رابردوو فریویان بدا و هەر کە پێگەی خۆی بەهێز کرد پشتیان تێ بکات. کوردەکانی باکووریش هەندێکیان لەگەڵ کەمال و بەلشەویکەکانن و خوازیاری گەڕاندنەوەی وەلایەتی موسڵ بۆ باوەشی نیشتمان و لە پەیوەندی نزیك لەگەڵ شێخ مەحموودان و خوازیاری چارەسەری کێشەی کوردن لە چوارچێوەی تورکیادا.

گومان لەوەدا نییە کە هەڵوێستی شێخ و ڕووداوەکانی باشووری کوردستان زەمینە خۆش کەر و هۆی پێکهاتنی ئینگلیز و تورکن لە لۆزان و هێشتنەوەی کوردستانی باشوور لە چوارچێوەی عێراق بوو، کە کارەساتی بۆ کورد لە هەموو بەشەکانی بەدواوە بوو. لەو باوەڕەدام کە کورد خاوەن کیانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو لە باشوور و باکوور بوو و لانی کەم دوو گیانی دەبوو وەك وڵاتانی تری عەرەبی کە چەند دەوڵەتێکیان بۆ دروست کردن. خۆ هەڵقورتاندنی کەمالییەکان لە کێشەی باشووری کوردستان ئامرازێکی گوشاربوو بۆ وەرگرتنی ئیمتیاز لە ئینگلیزەکان لەلایەك و بەرگری لە هێنانەدی کێشەی کوردستانی باکوور و سەرئەنجام بۆ ئەوەی کورد لە هیچ پارچەیەکی وڵاتەکەی مافێك وەرنەگرێت سبەینێ کاریگەری لەسەر بەشەکانی تری کوردستان دابنێت.

پرسیارێکی تر کە لەم بارەوە پێویستە بکرێت ئەوەیە بۆچی تورك لە ناوچە و هەرێمەکانی تر کە پاش شەڕی جیهانی لە دەستی دابوون نەیتوانی ئاژاوە بنێتەوە یا لانی کەم لە سوریا کێشە بۆ فەرەنسەویەکان دروست بکات؟ چ هێز یا تاقم و کەسایەتییەکی عەرەب لەگەڵ تورك کەوتنە وتوویژ و پەیمان بەستن و بانگەشەکردنی سوپای تورك؟ یا داوای بەڕەسمی ناسینی دەوڵەتەکەی

خۆی له داگیرکەری دوێنێ ولاتەکەی خۆی بکەن؟ نە هەستی ئایینی هاوبەش و نە هەستی نیشتمانیان کە تا دوێنێ لە چوارچێوەی نیشتمانێکی یەکگرتووی عوسمانی دابوو پالی پێوەنەنان بەلکو بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتمانییان هێندە زال بوو کە ئامادەبوون لەژێر پشتیوانی یا ئینتیدابی زلهێزەناموسولمانەکانی وەك ئینگلیز و فەرەنسا دابن و هیچ زەمینە و بروبیانوێکیشیان بۆ دەست تێوەردانی تورك لە ولاتەکەیان دروست نەکرد کەچی لە کوردستان بە پێچەوانە بوو.

جێی داخ و کەسەرە کاتێك کە نوێنەری شێخ لە مانگی دووی ١٩٢٣ سەردانی کونسولخانەی سۆڤیەت لە تەورێز دەکات و دیسانەوە بە نووسین و بەدەمی داوای پشتگیری و یارمەتی رووسیای سۆڤیەت بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی دەکات کونسولی سۆڤیەت بەبێ دەستووری سەفیری سۆڤیەت لە تاران (سەفیریش لە مۆسکۆوە دەستووری وەرگرتووە) بەڕاشکاوی و بەبێ هیچ رەوشتێکی دیپلۆماتیانە دەلێت ئێمە ناتوانین لەگەل سەربەخۆیی کوردستان بین لەبەر ئەوەی هەبوونی دەولەتێکی ئەوتۆ دژی بەرژەوەندییەکانی ئێمە کەلکی لێوەردەگیردرێت. دەبوایا هەر لەو کاتەوە نەتەنیا شێخ هەموو پەیوەندییەکانی خۆی لەگەل بەلشەویکەکان پچڕاندبای و ئەم هەلوێستە ناپاکەیشی لە قاودابای و هیچ هیوایەکیش بە هاوپەیمانەکەی واتە تورکیای کەمالی نەمابایا بەخۆیدا چووبایەوە.

ئەم هەلوێستە راشکاوەی بەلشەویکەکان لە بەلگەکانی تر کە بۆ نوێنەرانی دیبلۆماسیان لە ولاتانی داگیرکەری کوردستان ناردویانە دەنگی داوەتەوە کە بەبێ ئەم بەلگانە (دەستوورانە) دروشمی سەربەخۆیی کوردستان دروشمێکە و ئیمپریالیزم خستوویەتیە سەر زاری ئاغا و شێخ و دەرەبەگەکانی کورد و کوردستانی سەربەخۆ هەر لەژێر پشتیوانی ئینگلیزەکان دەبێت و پێك دێت و ئێمە دەستمان نایگاتێ لەبەر ئەوەی کوردستان هاوسنووری قەفقازی ئێمەیە دەبێتە پێگەی لەشکەری و پردە بازی ئیمپریالیزم بۆ سەر قەفقازمان کەچی شێخیان هاندا ئەگەر لە ئیمپریالیزمی ئینگلیز دابڕێت ئێمە ئامادەی یارمەتیدانی دەبین.

پێش پەیوەندی گرتنی شێخ بە بەلشەویك و کەمالییەکانەوەو لەکاتی ئەم پەیوەندییانە و بگرە دواتریش شێخ ئاگاداری ئەو پیلانە گلاوانەی تورکەکان بوو دژی سمکۆ و ئازادیخوازانی کوردی باکوور کە لێرەدا پێویست بە ئاماژەکردنیان نییە، مەبەستم ئەوەیە هیچ نیشانەیەکی کە نیازی باشی تورك نەبووە تا ببێتە هاندەرێك بۆ نزیك بوونەوەی شێخ لە تورکەکان. ئێران و تورکیاش

لەو سەردەمەدا هاوکاری یەکتریان دەکرد. ئێران داوای تەنگ پێهەڵچنین و لێدانی سمکۆ دەکات (کە تورکەکان جێبەجێ دەکەن) و تورکیش داوا لە ئێران دەکات کە بوار بدات لە رێگای ئێرانەوە سوپای خۆی بنێرێتە باشووری کوردستان (کە ئێرانیش ئەم داخوازییەی تورک پەسەند دەکات) ئەمانە وێنەیەکی بچووك و زیندوون.

لە بەڵگەکانی سۆڤیەتیدا هاتووە کە ئوزدەمیر پاشای چەرکەس (شەفیق میسری) بە کوردستانی باشووردا گەشتوگوزار دەکات و لە راپۆرتێکدا کە لەناو کوردەکاندا بڵاوی کردۆتەوە دەڵێ: لەشکرێکی پەنجا هەزار نەفەری سۆڤیەت هاتووە بۆ یارمەتیدانی شێخ مەحموود دژی ئینگلیز و تورکیا، سۆڤیەت خوازیار و پشتیوانی سەربەخۆیی کوردستانن و نامە و پەیامەکانی خۆی و کەمال بۆ لای کەسایەتییە خاوەن دەورەکان وەك سەرۆك هۆز و شێخ و ئاغاکانی کورد دەنێرێت. بە هەبوونی ئوزدەمیر و چەتەکانی لە کوردستان و ئاژاوەنانەوەیان زۆرجار ئینگلیزەکان ناچار دەبن ناوچە و گوندە کوردنشینەکان بۆمباران بکەن و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بێ تاوان ببنە قوربانی. و پاش هەوڵدانێکی زۆری سەید تەها و چەکدارە ئاسوورییەکان و بۆمبارانی فرۆکەکانی ئینگلیز، ئۆزدەمیر و چەتەکانی ناچار دەکەن کە پاشەکشە بکەن.

لە بەڵگەکاندا هەروەها باس لە تەتەری شێخ بۆ لای سۆڤیەتیەکان و بۆ لای خۆی مستەفا کەمال لە ئەنکارا دەکرێت. تەتەری شێخ بە نوێنەری سۆڤیەت دەڵێت حیجاز و فەلەستین و عێراق بە یارمەتی ئینگلیز و سوریا بە یارمەتی فەرەنسا گەیشتنە مەبەستی خۆیان کەچی ئێمە پێنج ساڵە چاوەڕێ یارمەتی دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆ ئازادی نیشتمان و نەتەوەکەمان. دیارە شێخ لەمێژبووە ئەم پەیوەندییەی هەبووە و راپۆرت نووسی سۆڤیەت دەکەین دەڵێ: ئینگلیزەکان ئاگاداری ئەم پەیوەندییانەی شێخن بە ئێمەوەیە. ئەم پەیوەندییە دووروودرێژەی شێخ بە سۆڤیەتیەکانەوە جێی سەرسوڕمانە جگە لەوەی شێخ بە نووسینی نامە بۆ دەوڵەتان بە رێگای باڵوێزخانەکانیانەوە لە تاران و لە قاودانی تاوانەکانی ئینگلیز لە باشووری کوردستان هەنگاوێکی تری شێخ بوو کە ئینگلیزەکانی زیاتر دژی خۆی و گەلەکەی هاندا. هێنان یا بانگەشەی ئەفسەرانی تورك بۆ سولەیمانی بۆ راوێژکاری و پیلانگێران و گەیاندنی چەند کەمینەی چەك لەلایەن تورکەکانەوە بۆ شێخ نەك هەر شتێك نەبوو ئینگلیزەکان و فەیسەڵ (مەلیکی عێراق) هەستی پێ نەکەن، بەڵکو زیاتر ئەو دوانە لە یەك نزیك کردەوە کە مەترسی

شێخ و تورك بۆ سەر هەردووكیان هەیە، سەرئەنجام كێشەی كورد و كوردستان لەلایەن ئینگلیزەوە درایە دەست گوێڕایەڵی خۆیان واتە مەلیك فەیسەڵە.

ئەوەی كە لەسەرەوە باس كرایەو واتایە نییە كە پاساو یا پاكانە بێت بۆ ئینگلیز و هاوپەیمانەكانی و ڕێكخراوی كۆمەڵەی گەلان (عصبة الامم) و كۆمەڵگای نێونەتەوەیی و دواتریش ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و بەتایبەتی ئەوروپا و ئەمەریكا، كە بە درێژایی سەدەی بیستەم شاهیدی كارەساتەكانی كوردبوون و بەرامبەری بێ دەنگ و بگرە یاریدەدەری ڕژێمە داگیركەرەكانی كوردستان باش بوون و تەنانەت نەیانتوانی یا نەیانویست بەهۆی ئەو پەیوەندییانەی كە لەگەڵ ڕژێمە داگیركەرەكانی كوردستان هەیانبووە پشتگیری كارەساتە یەك لە دوای یەكەكانی كورد بكەن و لە چوارچێوەی مافی مرۆڤ مافی یەكسانی و كولتووری ئەم گەلە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتانەدا مسۆگەر بكەن بەتایبەتی بەریتانیا و فەرەنسا كە دوو دەوڵەتی نوێیان واتە عێراق و سوریا دروست كرد و دوو پارچەی كوردستانیان خستە چوارچێوەی ئەم دوو دەوڵەتە و بەرپرسیاری ئەم هەمو تاوانەیشن كە ئەو ڕژێمانە بەرامبەر بە كورد كردوویانە. دەیانتوانی كوردستانێكی بەبێ شێخ مەحموود و هاوبیرەكانی دروست بكەن و بگرە ئەگەریش بە كوشتنی شێخ و هاوبیرەكانی تەواو بووایا. ڕاستە شێخ بەگوێرەی پێویست مامەڵەی لەگەڵ نەكردن ئایا لەڕووی بێ ئەزموونی یا فریودانی دەرەكی یا هەر هۆیەكی تر بووبێت، ڕەوا نەبوو گەلی كورد باجی ئەو دژایەتییەی نێوان شێخ و بەریتانیا بدات و چارەنووسی گەلی كورد ببێتە قوربانی بەرژەوەندی یا مشتومڕی ئەم و ئەو. دەكرا شێخێكی تر یا كەسایەتیەكی تر لەباتی شێخ مەحموود دابنرێت، كە وێنەیان لە كوردستان زۆر بوو و لایەنگر و گوێڕاڵی سیاسەتەكەیان بوون، دەكرا شێخ دەسبەسەر یا دوورخرابایەوە. دەكرا دیسانەوە دانووساندنی لەگەڵ كرابایا بەتایبەتی پاش ئەوەی پەیوەندییەكانی لەگەڵ كەمالییەكان و بەلشەویكەكان بەبێ ئەنجام كۆتاییان هات و لای ئینگلیزەكانیش ئەم ئەنجامانە ئاشكرابوون. ئیمڕۆ نە تەنیا گەلی كورد باجی ئەو سیاسەتەی ئەوان بەڵكو هاوپەیمانانیش بەتایبەتی ئینگلیز لە عێراق بە كوژرانی سەربازەكانی و بە یارمەتیدانی تر باجی هەڵەكانی ڕابردووی خۆی دەدەنەوە.

# پەیماننامەی شێخ مەحموود و تورکەکان لە ئارشیفی سۆڤیەتیدا

دوبسون(*) ئەرکادی باریسۆڤیچ کۆنسوڵی یەکیەتی سۆڤیەت لە شاری ورمێ لە راپۆرتێکدا لە ۱۹۲۳/۱۰/۲۸ ژمارە ۷۳ی نهێنی سەبارەت بە رووداوەکانی ۹/۱۵ تا ۱۹۲۳/۱۰/۱۵ پاش چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەحمەد تەقی دەنووسێت: بەپێی وتەی ئەحمەد تەقی ماوەیەك لەمەوبەر لە نێوان شێخ مەحموود و تورکەکان لە رواندز.

دە خاڵی مۆرکراوە کە هەشت خاڵیان بۆ دروستبوون باس دەکات. دوو خاڵەکەی تر ئایا نهێنی بوو یا بە ئەنقەست باسیان ناکات، روون نییە بەپێی هەندێ سەرچاوەی تر ئەم پەیمانە دوانزە خاڵ بووە و لە هەندێ بەڵگەی تر ئاماژە بە چەند خاڵ یا ناوەڕۆکی پەیمانەکە دەکرێت کە ئێمە لێرە خاڵەکانی ئەم بەڵگەیە دەگوازینەوە کە دوبسۆن لە دەمی ئەحمەد تەقیەوە نووسیویەتی گومان لەوەدا نییە کە کۆپییە یا نووسخەی تەواوی ئەم رێککەوتنە لە ئارشیڤەکانی تورکیا و سۆڤیەت پارێزراوە و نوێنەرانی تورك لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سۆڤیەتییەکان دەقی ئەم پەیمانەیان پێداون هەوڵی زۆرمدا کە دەقە تەواوەکەی بدۆزمەوە بەڵام بە دەستم نەکەوت، بەلامەوە زۆر گرنگ بوو کە جگە لەوەی خاڵەکانی تر بزانم، مێژوو یا رۆژی مۆرکردن و بەشدارانی ئەم کۆبوونەوە و ئەوانەی کە ئەم پەیمانەیان مۆرکردووە بزانرێت (هەم لایەنی کوردی و هەم لایەنی تورکی). بە گوێرەی دوبسۆن لە زمانی ئەحمەد تەقییەوە ئەم پەیمانە پاش ئەوە مۆر دەکرێت کە شێخ مەحموود نوێنەرانی خۆی دەنێرێتە رەواندوز بۆ لای ئوزدەمیر. ئایا ئوزدەمیر سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی تورك بووە؟ یا بەتەنیا خۆی لەلایەن کەمالەوە دەستەڵاتی پێدراوە پەیمانەکە ببەستێت؟ یاخود لە تورکیاوە کەسێکی تر هاتووە بۆ رەواندوز ئایا ئەم پەیمانە مۆر یا ناوی مستەفا کەمال (ئاتاتورك) یا سەرۆکی حکومەت یا پارلەمان یا وەزیرێکی تورکی یا شێخ مەحموودی پێوەیە؟ دیار نییە.

---

(*) دوبسون. ئە. ب کونسوڵی سۆڤیەت لە شارەکانی ماکو و ورمێ و تەورێز و مەشهەد لە نێوان ساڵی ۱۹۲۱-۱۹۲۸ بووە.

## دەقی وەرگێڕاوی پەیمانەکە بەپێی بەڵگەکە:

١- دەوڵەتی تورکیا بەڵێنی سەربەخۆیی کوردستانی باشوور و دەست تێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی دەدات، بەڵام بەبێ ئەوەی مافی پەیوەندی گرتنی بە وڵاتانی ترەوە هەبێت.

٢- دەوڵەتی تورکیا شێخ مەحموود بەرزەنجی وەك حاكمی باشووری كوردستان دەناسێت و مافی ئەوەشی هەبێت لە سولێمانی مەجلیسی خۆی هەبێت.

٣- سنووری باشووری کوردستان لە باکوور لەگەڵ قەزای شەمدینان و لە باشوور جەبەل حەمرین و لە رۆژهەڵات تا سنووری ئێران و لە رۆژئاوا تا رووباری دیجلەیە.

٤- دەوڵەتی باشووری کوردستان مافی ئەوەی هەیە کە لەشکری خۆی هەبێت.

٥- باشووری کوردستان بەرپرسە (ئەرکی سەرشانیەتی — دەبی) لەوەی کە ئەگەر هاتوو تورکیا تووشی شەڕبوو یارمەتی لەشکری تورکیا بدات.

٦- تورکیا مافی ئەوەی هەیە کە بە پەسەندکردنی (موافەقەی) باشووری کوردستان هێزی لەشکری خۆی بە خاکی کوردستاندا بگوازێتەوە (تێپەڕێنێت یا بەڕێ بکات).

٧- دەوڵەتی تورکیا دەتوانێت یارمەتی ماددی و مەعنەوی کوردستانی باشوور بدات.

٨- حکومەتی باشووری کوردستان بۆخۆی بڕیار دەدات کە هێزە سنوور پارێزەرەکانی لە ناوچەکاندا جێگیر بکات(*).

لە خاڵی یەکەمدا کە دەوڵەتی تورکیا بەڵێنی سەربەخۆیی بە باشووری کوردستان ئەدات و لە کاروباری ناوخۆی ئەم دەوڵەتە کوردییە دەست تێوەرنادات، بەڵام بەبێ ئەوەی مافی پەیوەندی گرتنی بە وڵاتانی ترەوە هەبێت.

---

(*) ئارشیفی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری رووسیای فیدراتیڤی.

- فوندی بەشی روژهەڵاتی ناوەڕاست.

- کارتونی 106.

- ئوپیسی 6A.

- ل 4.

دەست تێوەردانی تورك لە کاروباری ناوخۆی باشووری کوردستان تەنیا شتێکی پرۆتۆکۆڵی بووە ئەگینا سەرچاوەکان هەموویان لەوە دەدوێن کە دەوری تورکەکان لە هی شێخ و ئینگلیزەکان لە کوردستان زیاتر بووە، گشت پیلانەکانی ئۆزدەمیر و پڕوپاگەندەی تورکەکان وێنەیەکیانە لەوەی کە دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ بێت بەڵام مافی پەیوەندی گرتنی بە وڵاتانی ترەوە نەبێت واتە هەر لە ماددەی یەکدا دەست و پێ ئەم سەربەخۆییە بەستراوە. لە مێژووی هیچ وڵاتێکی سەربەخۆ نەبووە مافی پەیوەندی گرتنی دەرەوەی نەبووبێت، تەنانەت لە خاڵی دووهەم کە خەڵات کراوین مافمان هەیە مەجلیس یا پارلەمانمان هەبێت نەوتراوە ئەم پەیمانە بخرێتە دەنگدانەوە و پەسەند بکرێت، لە خاڵی چوارەمیش کە دەڵێ: لەشکری خۆمان هەبێت ئەمەش پێم وایە بۆ ئەوەیە تا لەکاتی شەڕ و چالاکی تورکیا. یارمەتی لەشکری تورکیا بدەن.

هەروەك لە خاڵی پێنجەمدا هاتووە ئەی ئەگەر هاتوو تورك دژی دوژمنێکی خۆی لە عێراق و هەرێمەکە یا هەر شوێنێکی تر، یا دەست درێژی بکاتە سەر وڵاتێك دەبێ کوردیش بەبێ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی خۆی ببێتە قوربانی پیلانەکانی تورکیا و وڵات و گەلانی تر بکاتە دوژمنی خۆی. گەرچی لێرە لەوانەیە هەر شەڕی دژی ئینگلیزەکان بووبێت. خاڵی وا لە سەدەکانی ناوەندیشدا نێوان دەوڵەتان نەبەستراوە، بەڵکو وا باوە پەیمانێکی ئەوتۆ کاتێك دەبەسترێت کە ئەگەر لایەنێکیان هێرشی کرایە سەری ئەویتر یارمەتی بدات.

لەم خاڵەدا لە بەرامبەریش ئەوە نەهاتووە کە ئەگەر ئەم دەوڵەتە سەربەخۆیەی باشووری کوردستان وەك تورکیا تووشی شەڕ بێت دەبێ تورکیا یارمەتی لەشکری پێبدات لە ماددەی شەشەم مافی بەرامبەریش بە کورد نەدراوە جگە لەوە پێش و پاش بەستنی ئەم پەیمانە سوپای تورك تەنانەت نە بە رەزامەندی و نە بە ئاگاداری لایەنی کوردی هەم هێزی ناردووەتە کوردستان و هەم لە کوردستانیش جێگیری کردووە، کە لەم بارەیشەوە بەڵگە زۆرە، ئەی ئەگەر هاتوو سوپای تورك کە بە کوردستاندا تێپەڕبووە یا جێگیر بووە و مەترسی بخاتە سەر وڵاتێکی تر یا بەرێی کوردستاندا هێرش بکاتە سەر وڵاتێکی تر و تووشی شکست و راونان بێت و، خۆ کوردستان دەبێتە گۆڕەپانی شەڕ و تووشی زیانی گیانی و ماڵ وێرانی و... دەبێت، گەرچی تورکەکان لەو کاتەدا نەیاندەتوانی لە سنوورەکانیانەوە لەلای موسڵ و دهۆك و زاخۆ و شوێنەکانی ترەوە هێرش بکەن و هێزی خۆیان بنێرن (چونکە ئینگلیزەکان سنوورەکانیان گرتبوو). بە کوردستانی ئێراندا

هێزیان دەناردە کوردستانی باشوور و مەبەستیان ئەوەبوو کە لایەنی یاسایی بۆ ئەم کردەوانەی خۆیان بۆ داهاتووش دابین بکەن. و پرسیار دێتە پێش کەی تورکیا لە ناردنی هێزی خۆی رەزامەندی باشووری کوردستانی وەرگرتووە؟ کە دەبێ بە دەنگدان بێت لەو مەجلیسەی کە تورکەکان بڕیاریان دابوو لە سولەیمانی هەبێت.

لە ماددەی حەوتەم کە تورکیا دەتوانێت یارمەتی ماددی و مەعنەوی باشووری کوردستان بدات. وشەی یارمەتی هەم ماددی و هەم مەعنەوی دەکات و پێ نادرێت با لەوە گەڕێین کە تورکیای ئەو سەردەمە هەژار و نەدار بوو ئەی یارمەتییە مەعنەوییەکەی کە دەبوایا لە لۆزان و کۆرۆنواس و چالاکییە دیبلۆماسییەکان لە کورد کرابا یا بۆ مافی کورد و بەرەسمی ناسینی ئەم حکومەتەی باشووری کوردستان کە خۆی بەرەسمی ناسیوویەتی بۆ نەیکرد، کەمالییەکان هێندە رەگەز پەرست و داخ لە دڵ بوون تەنانەت وشەی کورد و کوردستانیشیان بەزاردا نەدەهێنا و گەورەترین مەرجیشیان لەگەڵ هاوپەیمانان بەتایبەتی ئینگلیز ئەوەبوو کە هیچ مافێك بە کورد نەدرێت و کێشەی کورد ببێتە کێشەی ناوخۆی ئەم وڵاتانە و چالاکییە هاوبەشەکانیشیان لەگەڵ پەیمانەکانیان ئێران و عێراق شاهیدی ئەم راستییەن.

خاڵی هەشتەمیش لە پەیمانێك سەربەخۆیی دراوە بە وڵاتێك ئیتر دەبێ لە کاروباری ناوخۆی خۆیدا سەرپشك بێت لە کۆی پۆستی سەربازی یا پارێزەری دابنێت پێویستی بە نووسینی ئەم ماددەیە نەدەکرد. بەڵام وادیارە ئەم خاڵە بە خاڵی سێهەمەوە پابەندە کە کورد هانبدات بۆ دەرکردنی سوپای ئینگلیز تا جەبەل حەمرین نیشتمانەکەی رزگار بکات، دوو خاڵ یا چوار خاڵەکەی تر کە دیارە ئەحمەد تەقی یا لایەنی تر باسیان لێوە نەکردووە یا خاڵی نهێنی بوون یاخود ئاگای لێ نەبووە یا لەبەر هەر هۆیەکی تر بووە بە پێویستی نەزانیووە باسیان بکات، بەڵام من پێم وایە ئەم دوو یا چوار خاڵە نادیارە زیاتر پەیوەندی بە کاروباری لەشکری و ئەمنی (ئاسایش)یەوە هەبووە وەك پێگەیاندنی کادر و ناردنی پسپۆڕی راوێژکاری سەربازی و سیاسی بۆ کۆنترۆڵکردنی دامودەزگاکانی باشووری کوردستان کە بەداخەوە هەروەك وترا سەرچاوەی ترم دەست نەکەوت کە ئەم خاڵانەی تیابێت و بێ گومان دەبێ لە ئارشیڤەکانی ئینگلیزدا هەبێت بەڵام گومان لەوەدا نییە خاڵەکانی تر لە چوارچێوەی مەبەست و بەرژەوەندییەکانی تورك بووە.

ئاشكرایه لەو سەردەمەدا كە توركەكان لەگەڵ ئینگلیزدا لە شەڕ و گێرە و كێشەدا دەبن جگە لەوەی توانییان نێوان شێخ و ئینگلیزەكان ئاڵۆزتر بكەن توانییان ژمارەیەك كوردیش هەم كوردی باكوور و هەم باشووریش لە مەجلیسی توركیا و لۆزان بۆ دەربڕینی پشتیوانی كردنیان بەدەم و بە تۆمار نووسین بۆ گەڕانەوەی ولایەتی موسڵ بۆ سەر خاكی توركیا، بۆ لای خۆی رابكێشێت.

لەلایەكی تر پرسیار دێتە پێش بۆ ئەم پەیمانە لە رەواندوز مۆردەكرێت نە لە ئەنكارا و نە لە سولێمانی یا لە مۆسكۆ؟ (لەبەر ئەوە بەلشەویكەكان دەوری سەرەكییان لە نزیك كردنەوەی شێخ و كەمالییەكان هەبوو لە تەواوی پەیوەندییەكانیان ئاگاداربوون). بۆ مەجلیسی توركیا ئەم پەیمانە ناخاتە دەنگدانەوە بۆ پەسەندكردنی؟ سەرەڕای ئەوەی كە جارێك وەفدێكی نوێنەرانی شێخ لە ئەنكارا داوا لە كەمال دەكەن كە بۆ دڵنیایی كردنی كوردان ئەم پەیمانە بخرێتە دەنگدانەوە، بەلام كەمال لە وەلامدا پێیان ئەلێت پەلە مەكەن.

بە كورتی پەیمانەكە خاڵێكی ئابووری و بازرگانی و كەلتووری و هتد.. تیا نییە. پەیمانێكی داسەپێندراو نابەرامبەر و لە بەرژەوەندی تورك و كاریگەرترین چالاكی توركەكان بوو بۆ رێككەوتنیان لەگەڵ بەریتانیا و سڕینەوەی كورد لە ئاستی نێو نەتەوەیی و هەرێمی.

كورد ئیمڕۆ دەتوانێت لە بەشی یەكەمی خاڵی یەك و لە خاڵی سێ ئەم پەیمانە كە لەلایەن توركیای كەمالییەوە سەربەخۆیی كوردستانی دانی پێ نراوە و سنووری كوردستان كە تا جەبەل حەمرینە لە پڕوپاگەندەكانی خۆی دژی پیلانگێڕان و ئاژاوەنانەوەی هەر ئەم دەوڵەتە (بەتایبەتی لە كەركوك كە دەڵێن كوردستان نییە) كەڵك وەربگرن.

هەروەها دەكەن بۆ پوچەڵ كردنەوەی سیاسەتی ئیمڕۆیان كەڵك وەربگرێت لەو سەرژمێریانەی سەردەمی عوسمانی و پاش شەڕی جیهانی یەكەم كە ئاڕاستەی كۆڕ و كۆمەڵی نێونەتەوەییان كراوە.

ئەم پەیمانە بۆ كورد كارەسات هێنەرە كراوە چونكە چارەنووسی گەلی كوردی نەتەنیا لە باشووری كوردستان بەڵكو بەشەكانی تری كوردستانیشی بە ئاقارێكی ترا برد، ئەویش دوای چەند ساڵ دوژمنایەتی شێخ مەحموود لەگەڵ ئینگلیزەكان و كەین و بەینی لەگەڵ توركەكان. دەبا شێخ ئەم پەیمانەی یا چەشنی ئەم پەیمانەی لەگەڵ بەریتانیای بەستبایا خۆ ئینگلیزەكان كەمتر لەوەیان

دەویست کە تورك لەم پەیمانەدا بەسەر شێخدا سەپاندنیان. ئەو ئینگلیزەی کە گەورەترین زلهێـزی دونیابوو لەو سەردەمە و دەوری یەکەمی لە دارشتنی سیاسەتی جیهانی و شەڕ و ئاشتی لە دونیا و بەگشتی کێشە چارەنووس سازەکاندا هەبوو، دەوڵەتێك کە ئیمپراتۆریەتی عوسمـانیی داگیرکـرد واتـە باشـووری کوردسـتان و شـێخ مـەحموودیش کـردە مـەلیکی و بـە کـردەوە حکومـەتێکی سەربەخۆی کوردی لەژێر ئینتیدابی خۆی پێك هێنا و لە بەرامبەر هێرش و هەڕەشە و دەستدرێژی تورك و فارس پاراستی و چاوەڕێ دەکرا شان بە شانی حکومەت یـا دەوڵـەتی عـەرەبی عێراقـی سـەربەخۆییەکەی رابگەیەنـدرێت وەکـو عێراقـی عـەرەبی و ئـوردن و وڵاتـانی تـر کـە هێـشتا سەربەخۆییان رانەگەیەنرابوو، هێشتا کۆمەڵگای گەلان ئەم دەوڵەتانەی بەڕەسمی نەناسیبوو، وەکو کوردستانی باشوور هێشتا سنوورەکانیان دیاری نەکرابوو و هتد...

شێخ لەگەڵ کەمالییەکان کە هێشتا حکومەتەکەی ئەوانیش لەلایەن هیچ دەوڵەتێکـەوە بـەڕەسمی نەناسرابوو هێشتا خـۆی نـەگرتبوو دەورو قورسـایەکی لـە هەرێمەکـە و دونیـادا نـەبوو، لەچـاو بەریتانیا توانایەکی نەبوو، پەیمان دەبەستێت، تورکەکان بۆچی چەند ساڵ پێشتر یـا زووتـر (واتـە بەڕەسمی ناسینی سەربەخۆیی باشووری کوردستانیان) ئەم نیتز پاکییەیان رانەگەیاند یا ئەم مافەی بە کوردەکانی خۆی (کوردی باکوور) رەوا نەدەبینی. خۆ شێخ دەیزانی تورکەکان (کەمالییـەکان) هەر باسی گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ باوەشی نیشتمان واتـە تورکیـا دەکـەن لـە راگەیاندنـە رەسمی و نارەسمییەکانیانـدا و گێـرە و کێـشەی تـورك لەگـەڵ بـەریتانیا و عێـراق و رێکخـراوی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم) لەسەر کێشەی ویلایەتی موسڵ بـوو واتـە تورکـەکان نـاوی کوردستان و سەربەخۆیی کوردستان یا مافی کـورد و ئەوانـەیان قـەت نـەهێنابوو و بـە ئاشـکرا رانەگەیاندبوو، چـونکە لـە رەوانـدوز بـە نهێنـی ئـەویش بـە سـەرکردایەتی ئـوزدەمیر دان بـە سەربەخۆیی کوردستان و دادەهێندرێت کە سبەینێ تورك دەیتـوانی ناشـەرعی بـوونی پەیمانەکـە رابگەیەنن ئەم پەیمانە دیارە پێش پەیمانی لۆزان دارێژراوە و وتووێژی لەسەر کراوە تەنانەت مۆریش کراوە کە بێ گومان دەستبەجێ ئەم پەیمانە لەلایەن ئینگلیزەکانـەوە پـێ دەزانرێـت و بـەبێ ئـەم پەیمانەیش بە ئاشکرا شێخ و کەمالییەکان چەند سێ لە یەك سەنگەردا دژی بەریتانیا چـالاکییان دەنواند. کە واتە هەر ئەم پەیمانە نەبوو ئینگلیزە پاڵ پێوەنێت واز بەندەکانی پـەیمانی سـیڤەر بـۆ باکوور و کێشەی کورد لە باشووری کوردستان بێنێت. ئەوە بـوو بڕیـاری هێـشتنەوەی باشـووری

کوردستان لە چوارچێوەی عێراقی عەرەبی و هەڵوەشاندنەوە یا لابردنی پەیمانی سیڤەری لە لۆزانی بەدواوە بوو.

ئەم پەیمانە تەنیا مەترسی و هەڕەشەی هاوبەندی شێخ و کەمالییەکان لە عێراق بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا نەبوو، بەڵکو لە تەواوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو کە دەست و پیلانی بەلشەویکەکانیشی تێدابووە (لە جێگایەکی تر بە وردی باسی پەیوەندییەکانی سۆڤیەت و شێخ دەکەین). شێخ کوردی رۆژهەلات و باکووریشی دژی بەریتانیا هاندابوو. وەك تێوەگلاندنی نیشتمانپەروەر و خاوەن دەور و ئازایەکی وەکو مەحموود خانی دزلی و بەشداری کردنی لە شەڕەکانی شێخ دژی بەریتانیا. ئۆزدەمیر کە یەکێك لەو کەسانە بووە کە پەیمانەکەی مۆرکردووە چ پێش و چ پاش پەیمانەکە بە چەتە چەکدارەکانییەوە لە ناوچەیەکی پان و بەرینی کوردستانی باشوور (لە قەڵادزێ و رەواندوز و بگرە کوێسنجاق) دەبێت خاوەن دەسەڵات و بۆ پەیامەکانی کەمال و خۆی وەك (خەباتگێری مەزن لە پێناوی ئیسلامدا) ناو بۆ سەرۆك هۆز و شێخ و کەسایەتییەکانی کورد دەنێرێت و تێیدا دەڵێت ناوچەی موسڵ هەمیشە سەر بە تورکیا بووە و دەبێ بمێنێتەوە و خەڵکەکەی دەیەوێ لە چوارچێوەی تورکیا بمێنێتەوە. و شێخ بەرامبەری هیچ هەڵوێستێك ناگرێت و بگرە دوای ئەو پەیمانەش کە خۆی مۆری کردووە و رەفتاریشی پێ ناکات.

لە راپۆرتێکی تر کە ئەحمەد تەقی لە گەڕانەوەیدا لە ئانکارا بەرەو سولێمانی لەورێ کە سەردانی دویسۆن کونسوڵی سۆڤیەتی دەکات هاتووە:

ئەحمەد کە لەلایەن شێخەوە نێردراوە بۆ وەرگرتنی ئەو یارمەتییەی بەڵێن دراوە (یا بەپێی پەیمانەکە) لە دەوڵەتی تورکیا و پەسەندکردنی پەیمانەکەی نێوان شێخ و تورك لەلایەن مەجلیسی تورکیا و کێشەکانی تر، چاوی بەسەرانی تورکیا دەکەوێت، لە بێ ئەنجامی سەفەرەکەی خۆی بۆ دویسۆن دەدوێت. لە چاوپێکەوتنی شاند و تەتەر و نوێنەرانی شێخیش لەگەڵ سۆڤیەتییەکان بە مەبەستی وەرگرتنی یارمەتی لە سۆڤیەت، زۆر بە ناکامی و بەدەست بەتاڵی دەگەڕێتەوە، بەڕاشکاویش بێ بەڵێنی و پەیمان شکێنی سۆڤیەتییەکانیش بۆ کۆنسوڵەکانی سۆڤیەت دەردەبڕی کە لە چەند بەڵگەیەکی تردا هاتووە.

# بزووتنەوەی شێخ مەحموود

..........هەر لە پەرەسەندن دایە، هەم لە کوردستانی فارس و هەم لە کوردستانی تورکیا.
کوردەکانی فارس بەرەنگاری دەستوورەکانی دەوڵەتی تاران دەبنەوە و کەمالیستەکانیش خەریکن پەیوەندی لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد دەبەستن، بەتایبەتی لە ویلایەتی وان، کاروباری شێخ مەحموود لەسایەی سمکۆ و سەید تەهاوە سەرکەوتوانە دەچێتە پێش.

نوری بەگ یەکێکە لە سەرۆکەکانی عەشیرەتی بەگزادە کە لە شۆڕشی سمکۆدا بەشداری کردووە وئێستا لەگەڵ شێخ مەحموودە. چەکدارەکانی لە کۆتایی مانگی شوباتدا سێ قەزاقیان کوشت، ئەویش دوای ئەوەی کەلەب عەلی خانی نەخجەوانی فەرماندەی هێزەکانی تاران لە سەلماس هاتبۆ ورمێ.

کەلەب عەلی خان دەستووریدا چەند گوندی کوردان کاول بکەن و نوری بەگیش بگرن. ئەوەبوو هێنایەنە ورمێ و بڕیارە لە سێدارەی بدەن. هەواڵگرەکان بۆ جاری دووەم جموجۆڵی عومەر ئاغای ئیلخانییان لەناو کوردەکانی سەڵماس و پەیوەندی ناوبراویان لەگەڵ سمکۆ بەدی کردووە، سمکۆ بە نامە ئاگاداری دەکاتەوە کە کوردەکان لە کرماشانەوە تا ماکۆ بۆ راپەڕین ئامادەن. بەپێی گوتەی هەواڵنێرەکانی ئێمە نامەیەك کەوتۆتە دەست فەرماندەی هێزەکانی فارس و ئەویش داوای لە عومەر ئاغا کردووە کە لەگەڵ چەکدارەکانی بێتە تەورێز بۆ دیاریکردنی ئیش و کاری داهاتوو. بەڵام عومەر ئاغا کوڕەکەی و خزمێکی خۆی لەگەڵ دەستەیەکی چەکدار دەنێرێتە تەورێز و داوا دەکات پەنجا رۆژ دەرفەتی بدەن تا کاروبارەکەی خۆی رێك بخات. لە کوردستانی تورکیا چالاکی شێخ مەحموود سەرکەوتوویە و لە چوارچێوەی ناوچەی وان دەرچووە و کشاوەتە ویلایەتەکانی بەتلیس و ئەرزەڕۆم. سەرەڕای پەیوەندی پتەو لەگەڵ عەشیرەتەکانی حەیدەرانلۆ و میلانی، جێپێی خۆشی کردۆتەوە لەناو کوردەکانی عەشیرەتی ئادامانلۆ کە لە قەزای ئەرجیش و بایەزیدی سەر بە ولایەتی ئەرزەڕومن. لە ویلایەتی بەتلیسیش پەیوەندیان بەهێز کردووە لەگەڵ عەشیرەتی گەورەی حەسەنلۆ کە لە قەزاکانی بۆ لانیخ و مەلازگیر و موش دەژین. یەکێك لە گەورەکانی ئەم عەشیرەتە خالید بەگە کە پێشان لەناو سوپای تورکیا بووە و لەکاتی شەڕ لەگەڵ ئێمە و لە ساڵی (١٩١٨)یش لەناو سوپای تورکیا دژی رووسیا شەڕی کردووە. کوردەکانی فارس هەموویان پەیوەندیان لەگەڵ سمکۆدا هەیە. خالید بەگ بەهۆی

پەیوەندی کردنی بەسمکۆوە لای تورکەکان ئاشکرا دەبیٚ و رادەکاتە بۆتان-جەزیر (ناوچەیەکی کوێستانییە لە باشووری دیاربەکر و وان لەسەر سنوری میزوپۆتامیا)، لەوێشەوە پەیوەندی بە شێخ مەحموودەوە دەکا و پەیوەندی بەعەشیرەتەکەی خۆشیەوە هەیە[1].

## هەنگاوەکانی تورکیا و فارس

فەرماندەی هێزەکانی ئێران چالاکانە دەستی کردووە بە بارمتەگرتن لەناو کوردە بێگانەکان، بەمەبەستی دوورخستنەوەیان لەسنوورەکان دەستەی چەکداریان لێهەڵدەبژێرێت. دەوڵەتی فارس هەر بەوەشەوە ناوەستیٚ، بەپێی هەواڵی ئەجینداکانی ئێمە، خەریکی ناردنی هێزی سوپایە بۆ ناوچەی سابلاخ کە ژمارەیان ٩ تا ١٢ هەزار کەس دەبێت.

لە کوردستانی تورکیاش دەکریٚ بڵێن دەوڵەتی تورك بەمەبەستی بەرگریکردن لە خۆی لەسەر جموجۆڵی لەشکری هەر بەردەوامە. بانگەواز و رێکخستنی خەڵك بۆ خزمەتی سەربازی لەناوچەکانی وان و ئەرزەڕۆم دەستی پێکردووە، هەرپیاوێك لە تەمەنی ١٨ تا ٤٥ساڵی بە کەڵکی سەربازی بیٚ، دەبیٚ سەربازی بکا، ئەو چوار پێیانەی بۆ گواستنەوەی بار و کەرەستە بە کاردێن لە خەڵکەکە دەستێنرێن. بەڵام بە نزیکبوونەوەی بەهار رۆژبەرۆژ زیاتر هەست بە پەرەسەندنی بزووتنەوەی کورد و چاوەڕوانی قۆناغێکی نویٚ لە کوردستان دەکرێت:

ئەمەش وا لە کەمالیستەکان دەکا لەگەڵ کوردەکان بکەونە وتوویٚژ، بەڵام ئەمجارە نەك بۆ ئەوەی دژی کوردەکانی میزپۆتامیا یا ئینگلیز بەکاریان بێنێن، بەڵکو بە مەبەستی رێککەوتنێکی سیاسی لەگەڵ کوردان. لەمبارەوە رووداوی گرنگ لە کوردستانی تورکیا، ئێستا کە مانگی شوباتە، رۆیشتنی کوڕی حوسێن پاشا و حەسەن بەگە بۆ ئەنقەرە، بە نیازی وتووێژکردن. (حوسێن پاشا سەرکردەی گەورەی عەشیرەتی حەیدەرانلۆیە کە لە قەزای ئارجیش و عادل جیواسن لە ویلایەتی وان و هەندێکیشیان لە قەزای دوتاخن سەر بە ویلایەتی ئەرزەڕۆم. حەسەن بەگ کوڕی حەمە صادق بەگە ئەویش سەرکردەی گەورەی حەیدەرانلییەکانی ئابگینەیە لە قەزای بەرکری ).

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٨٩.

مەبەستی ئەم ڕۆیشتنە بە قسەی خودی سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد، وتووێژە لەسەر لێبووردنی سمکۆ و تەنانەت دووپاتکردنەوەی ئەو پەیوەندیانەی لە ساڵانی بسیتدا هەبوون، واتە کاتێك کە جاوید بەگ لەکوردستانی فارس، بەمەبەستی بەرەنگاری پیلانی ئاشووریەکان بەسەرۆکایەتی ئینگلیز، بە یارمەتی و چەکی سمکۆ فەرماندەی لەشکری دووی تورکیا بوو. بە گوێرەی قسەی هاوڕێ دوبسۆن هاتنیان بۆ ئەم مەبەستە کارێکی باشە ئەگەر: سەرکردەکانی عەشیرەتی حەیدەرانلۆ کە بۆ وتووێژ بانگکراونەتە ئەنقەرە ببنە نێوبژیوانی دەوڵەتی ئەنقەرە و ئەو سەرکردە کوردانەی دژی ئینگلیزن. لەبەر ئەم باردۆخەی کوردستان و لەبەر ئەوەی نێوبژیکەران لەو عەشیرەت و شێخانەن کە لە رابردوودا لەگەڵ سمکۆدا بوون و دژی دەوڵەتی تورکیا شەڕیان کردووە،تورکان دووبارە لەکوردستانی فارس سمکۆ چەکدار ناکەنەوە. گومان لەوەدا نییە کە تورکانی کەمالیست دەیانەوێ ساڵانی هەشتای سەدەی رابردوو دووپات بکەنەوە، واتە بکەونە وتووێژ لەگەڵ کوردەکان بۆ چارەسەکردنێکی نوێی سیاسی کوردستان کە پەیوەندی هەردوولا پتەو بکات. لە سەرەتای شوبات تورك نوێنەرێك دەنێرنە لای شێخ فەتاح ئەفەندی (ژن برای شێخ مەحموود) کە لە رابردوودا وەك پشکێنەر (مفتش)لای تورکان کاری کردووە. زۆری پێ نەچوو پاش ڕۆیشتنی فەتاح ئەفەندی، شێخ مەحموود سمکۆی ناردە لای تورکان، ئەوانیش پێشوازییەکی گەرمیان لێکرد،سمکۆ کە گەڕایەوە پتر لانی تورکانی گرت[1].

## هەنگاوی ئینگلیزەکان

ئینگلیزەکان توانیان پیاوانی دەوروبەری شێخ مەحموود بکڕن یا باوەڕپێکراوانی خۆیان دابنێن. وەك شێخ قادر (برای شێخ مەحموود)، شێخ قادر کوڕی شێخ ساڵح، شێخ عەبدولکەریم و موستەفا پاشا سلێمان. ئەوانە ئینگلیزیان لە پەیوەندییەکانی شێخ مەحموود و تورکیا ئاگادار دەکردەوە. ئینگلیزەکانیش داوایان لە شێخ مەحموود کرد بە یەکجاری دژی تورکیا شەڕ رابگەیەنێت یا بێتە بەغدا بۆ وەرگرتنی دەستوور و ڕێنوێنی. ئاشکرایە هاتنی نوێنەری سوپای

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٩١.

ئینگلیز لە کەرکووکەوە بۆ سلێمانی بە مەبەستی پەیوەندی بەستن و کارتێکردن لەو کەسایەتیانەی دەوربەری شێخ مەحموود بوو.

ئەم هاتنە بۆ شێخ مەحموود شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. لە ٢١ و ٢٢ی شوباتدا کۆبوونەوەیەك لە سلێمانی پێکدێت کە تێیدا نوێنەرانی لەشکری ئینلگیز و شێخ مەحموود و چەند ناسراوێکی تری بارەگای مەلیکایەتی شێخ بەشدار دەبن. لەم کۆبوونەوەدا ئینگلیزەکان ئەم داخوازیانەی خوارەوە لە شێخ مەحموود دەکەن:

١- خەزێنەی تەواوی چەند دەوڵەمەندێکی شاری سلێمانی بداتە دەست دەوڵەتی ئینگلیز و بە بروسکە لە جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارە نوێنەری ئینلگیز لە کەرکووك ئاگاداربکرێتەوە.
٢- تەسلیم کردنی قۆرخانە بە قۆرخانداری شاری سلێمانی.
٣- شێخ مەحموود بەزووترین کات بێتە کەرکووك.
٤- بەزووترین کات چەند پیاوێکی بەناوبانگ دیاری بکرێن و بنێردرێن بۆ بەغدا بۆ لای کۆمیساری ئینگلیز (وا دەردەکەوێ بە بارمتە بیانگرن).
٥- پێشکەش کردنی راپۆرتی شێخ مەحموود وەك سەرۆکی دەوڵەت سەبارەت بە ئیش و کاری دەوڵەتەکەی و تەسلیم کردنی هەموو دارایی و داهاتی مالی و گومرگ بە ئینگلیز.
٦- تەسلیم کردنی شاری سلێمانی بەهێزەکانی ئینگلیز.

تێبینیی/ (ئەم خالآنەی کە ئینگلیزەکان ئاراستەی شێخ مەحموودیان کردووە لەوانەیە تەواو نەبن چونکە زارەکی لە بەشداربووانی ئەم کۆبوونەوەیە وەرگیراوە.

لەم کۆبوونەوەیەدا شێخ مەحموود واخۆی نیشان داوە کە تەواوی مەرج و داخوازییەکانی ئینگلیز جێبەجێ دەکات. ئەم داواکاریانە وەك مۆڵەت دراون و دەبێ لە ماوەی پێنج رۆژدا جێبەجێ بکرێن، پاش پێنج رۆژ ئەگەر جێبەجێ نەکرێن سلێمانی بۆمباران دەکرێت.

دەنگوباسی کۆبوونەوە بەزوویی بلآوبۆوە. دوای گەیشتنی ئەم هەواڵانە لایەنگرانی تورکیا بە سەرۆکایەتی نازم پاشا چوونە سلێمانی. دوای هاتنی ئەم دەستەیە شێخ مەحموود ئامادە نەبوو مەرجەکانی ئینگلیز جێبەجێ بکات. کە کاتی جێبەجێ کردنی داواکارییەکان بەسەرچوو، ٢٨ی شوبات چەند فڕۆکەی جەنگی ئینگلیز لە ئاسمانی سلێمانی و هەڵەبجە دەردەکەون و بەیاننامە فڕێ دەدەنە خوارەوە کە ئۆلیتماتۆمی کۆبوونەوەکەی تێدا بوو بۆ شێخ مەحموود و بۆ عەشیرەتی جاف.

ئەم عەشیرەتە ژمارەیەکی زۆر عەشیرەتی بچووکی یەکخستوەو لەناوچەکانی سەر سنووری فارس و میزوپۆتامیا و ئازربایجانی فارس دەژین. ئینگلیزەکان لەم بەیاننامەیەدا داوایان لە دانیشتوان کردووە بەشداری چارەنووسی رەشی شێخ مەحموود نەکەن و دەڵێن شێخ مەحموود دژی دەوڵەتی بەریتانیا راوەستاوە و کەس نابێت یارمەتی بدات ئەگینا بە ئاگری ئەو دەسوتێن. فڕینی فڕۆکەی شەڕ و بڵاوکردنەوەی بانگەواز و ئاگادارکردنەوەی ئینگلیزەکان بۆتە هۆی پەرشوبڵاوی و شڵەژاوی خەڵکی سلێمانی. نوێنەرانی خەڵك داوایان لە شێخ مەحموود کردووە بۆ بەرگری کردن لە کوشتار و زەرەو زیانی دانیشتوان هەنگاو بنێت. شێخ مەحموود بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ هاوکارە نزیکەکانی کۆدەبێتەوەو بڕیار دەدەن شێخ قادر (برای شێخ مەحموود) بنێرنە کەرکوك بۆ لای ئینگلیزەکان، بەڵکو نەرمیان بکات و لەو نیازەی هەیانە ساردیان بکاتەوە و پەیوەندیان لەگەڵ دامەزرێنێتەوە. ۲۷ی شوبات شێخ قادر دەچێ بۆ کەرکوك لەو ماوەیەی کە شێخ قادر لەوێ نابێ شێخ مەحموود زۆر نیگەران دەبێ، چونکە پەیوەندی نێوان ئەو دوو برایە هێندە باش نابێ و شێخ مەحموود دەیزانی براکەی پەنامەکی پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە هەیە.

## هەڵاتنی شێخ مەحموود

لە شەوی ۳/۲ی مانگی مارت، شێخ قادر، ئەنجامی وتوویژەکانی خۆی لەگەڵ ئینگلیزەکان لە کەرکووکەوە بە تەلەفۆن بە شێخ مەحموود رادەگەیەنێت: ئینگلیزەکان هەر لەسەر جێبەجێ کردنی مەرجەکانی خۆیانن و تەنیا ئەوە نەبێت کە شێخ قادر توانیویەتی لە ئینگلیزەکان بەڵێن وەرگیرێت کە سلێمانی بۆمباران نەکەن ئەویش بەو مەرجەی تەقە لە فڕۆکەکانیان نەکرێت. شێخ مەحموود بە بیستنی ئەم هەواڵە دەستی بە گواستنەوەی ماڵ و سامانە بە نرخەکانی کرد شەویش هەر خەریکی ئەو کارە دەبێت. تەنانەت تەقەمەنیەکانیش بۆ دەرەوەی شار دەگوازێتەوە، دوای ئەوە شێخ مەحموود و بەشێك لە دانیشتیوان دەچنە چیاو لە کاتژمێر (۱۰)ی بەیانی ۳ی مارت هەشت فڕۆکەی ئینگلیزی چەند بۆمبێك فڕێدەدەنە ناو سلێمانی، ژمارەیەك ماڵ وێران دەکەن و ژن و منداڵێکی زۆریش کە لەوێ مابوونەوە دەکوژرێن، لە شەوی ٤ی مارت شێخ مەحموود دیسان دێتەوە ناو شار و ئەو شتومەکەی لەوێ ماوە دەیگوازێتەوە بۆ دەرەوەی شار و لەگەڵ پێنج سەد سواردا دەچێتە سورداش (سورداش کەوتۆتە دووری هەشت فرسەخی سلێمانی و بەرەو پشدەر لە شوێنێکی زۆرباشە و پەیوەندی بە رەواندزەوە هەیە). نازم

پاشا لەگەڵ ئەوانی تر کە لە کەرکوکەوە هاتبوون لەگەڵی دەڕۆن (سمکۆ) سمایلاغا (دەستبەجێ پاش ڕاگەیاندنی ئولتیماتۆمەکەی ئینگلیز، لە لایەن شێخ مەحموودەوە لەگەڵ هەندێ شتومەك و کەرەسەری بەنرخ دەنێردرێت بۆ پشدەر و وابزانم ئێستاش هەر لەوێیە. شێخ مەحموود چەند شتومەکی بە قیمەتی لەگەڵ خۆدابردووە کە بە تەواوی نەزانراوە، بەڵام دەڵێن: پێش چۆڵکردنی سلێمانی لە کاتی حوکمداریەتی مەحموود، ئینگلیزەکان بەهای پێنج سەد هەزار روپیە شتیان لە سلێمانی پێداوە. جگە لەو مالیاتەی کە لە سلێمانی و هەڵەبجە و شارەزوو و شار و شوێنەکانی تر هەروەها مالیاتی توتن چییەکان کە بۆ هەر بارێك لە دوو تا نۆ لیرە (کە لە کاتی حوکمداریەتییەکەیدا پانزە هەزار باریان گواستۆتەوە)، وەرگیراوە. بەپێی دەنگوباسێك کە هەیە شێخ مەحموود دوو سەد بار شتی بەنرخی گواستۆتەوە، جگە لەو چەك و تەقەمەنییەی ئینگلیزەکان پێیان دابوو. بەپێی هەندێ دەنگوباس لە سلێمانی، ئینگلیزەکان دەیانەوێ شێخ قادری برای لە جێی وی دابنێن شێخ قادر لایەنگر و ناوبانگی لەناو دانشتواندا نییە، بە گوێرەی هەواڵی لایەنگرانی ئینگلیز گوایە ئینگلیزەکان زۆر بەداخ و پەشیمانن کە ئەو شتە لە سلێمانی روویداوە و دەیانەوێ وەکو رابردوو پەیوەندی بە شێخ مەحموودەوە بکەنەوە[1].

## دەوری شێخ حیسامەددین و پەیوەندی ئینگلیز- عەرەب لە کاتی چوونی شێخ بۆ لای تورکەکان

لە رۆیشتنەکەی شێخ مەحموود بۆ لای تورکەکان شێخ حسامەددین دەورێکی زۆری هەبووە ئەم کابرایە ریبەری ئاینی کوردە سونییەکانە تەواوی کوردستان دەیناسن و لەناو موسڵمانەکانی هیندیش تارادەیەك بەناوبانگ بوو. ناوبراو بە رەگەز (ئێرانیە) و لە باغەکۆنی سەر سنووری ئێران دەژی موڵك ومالی لە میزوپۆتامیایە، لایەنگرێکی تۆخی تورکانە و لە نامەکانیدا شێخ مەحمودی بەوە تاوانبارکردووە کەهاوکاری کافرانە دژی موسڵمانان و لەمبارەوە کاری کردۆتەسەر شێخ مەحموود.

(1) هەما سەرچاوە ل ١٩٣-١٩٤.

یەکێك لە هۆیە سەرەکییەکانی ڕۆیشتنی شێخ مەحموود بۆ لای تورکەکان پێم وایە دەبێ لە پێوەندییەکانی نێوان ئینگلیز و عەرەبدا بدۆزرێتەوە. ئاشکرایە ئەو ناوەندەی ئینگلیزەکان دەیانەوێ دژی تورك بەکاری بێنن ناوەندی عەرەبە موسڵمانەکانە، لەبەر ئەوەی کوردستان دراوسێی عارەبانە و ناوەندی سوپایی و بەڕێوەبردنی ئینگلیزەکان، کوردستانی خستۆتە دەست بەغدا، کوردەکان هەستیان کردووەکە هەژموون دراوەتە دەست عەرەبە موسڵمانەکان نەك ئەوان، کەسایەتی باڵای بەڕێوەبردن ئەمیر فەیسەڵی عەرەبە و تێکرای ناوچەکانی تریان خستۆتە ژێر دەستی بەغدا، دەسەڵاتی سیاسی و سوپایی و دەزگای بەڕێوەبردن لە دەست ئینگلیزان دایە، پاشان عەرەب ئینجا کورد.

## دەنگوباسی بەهێزکردنی شێخ لەلای تورکەکان

بەپێی ئەو هەواڵانەی کە راستی و ناڕاستی یان تاقی نەکراوەتەوە تورکەکان چوار هەزار سەرباز و چوار تۆپیان داوە بە شێخ مەحموود.

## باردۆخی سلێمانی

هەنوکە لە سلێمانی هیچ دەسەڵاتێك نییە، هێزەکانی ئینگلیزیش بە چل تا پەنجا فڕۆکەوە کە جاروبار بەسەر کوردستاندا دەسوڕێنەوە، نە لە سلێمانی و نە لە کەرکوك هیچ هێزێکیان نییە. لەم بارودۆخەدا گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ لای ئینگلیزەکان چاوەڕوان ناکرێت چونکە هیچ ڕێگایەکیان نەهێشتۆتەوە[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٩٥-١٩٦.

# وەرگێڕاوی نامەی شێخ مەحموود
# کە بۆ کۆنسۆڵی رووسیای سۆڤیەتی لە تەورێز نێردراوە

*لەسەر پاکەتی نامەکە نوسراوە: ناوەندی کوردستانی باشوور، سلێمانی، ٢٠ی کانوونی دووەم ١٩٢٣*

**بۆ: بەرێز کۆنسۆڵی سۆڤیەت لە تەورێز**
**پایتەختی کوردستان-شاری سلێمانی**
**بارەگای مەلیك**

**٢٠ی کانوونی دووەم ١٩٢٣**

**بۆ بەرێز کۆنسۆڵی دەوڵەتی رووسیای سۆڤیەتی لە ئازەربایجان**

سڵاوێکی گەرم بۆ بەرێزتان

لەساڵی ١٩١٧ کاتێك کە دەنگی ئازادی راستەقینە و رزگاری مرۆڤ لە ژێر چەپۆکی زۆرداران و ستەمکاران لەرێی رۆژنامەکانتانەوە گەیشتە گوێی جیهانیان،چەوساوانی دنیا هەزاران سڵاو و سوپاسیان نارد بۆ گەلی رووسیا، بۆ ئازادی و راپەڕین، بەو هیوایەی مافی خۆیان بە دەستبێنن. لە ساڵی١٩١٩ واتە چوار ساڵ لەمەوبەر کاتێك لە ناوەندی سلێمانی گەلی چەوساوەی کورد داوای مافی سروشتی خۆی کرد رووبەڕووی ئاگری چەکی نوێنەرانی خۆێنمژی ئینگلیز بۆوە و لە ئەنجامدا خەڵکێکی زۆربوونە قوربانی و شەهیدکران.

لە چارە رەشی کوردان ئەو دەمە بارودۆخی ناو رووسیا ئاڵۆزبوو و دەرفەتی ئەوەیان نەدا ئاگاداری حاڵی گەلانی چەوساوەی دەرەوە بێت. ئەم بارودۆخە تا سەرکەوتنی نیازچاکی گەلی بەشەرەفی رووسیا هەربەردەوام بوو. بەڵام لە سایەی خواوە گەلی رووسیا رزگاری بوو و گەورەیی و بەهێزییەکەی دەرکەوت. بەم چەشنە مەبەستی گەلی کوردتان ئاراستە دەکەم: تەواوی گەلی کورد لە باشووری کوردستان ئامادەیە سەر بە دەوڵەتی رووسیا بێت و یارمەتی و قوربانی بۆ بدات و بە گیان و کردەوە ئامادەی جێبەجێ کردنی هەر دەستوورێکین کە پێمان

بدرێت. بۆ بەجێ گەیاندنی ئەم ئەرکە پێویستە بە مافی نەتەوایەتی خۆی بگات، بۆ روونکردنەوەی پەیوەندییەکان و بارودۆخی گشتی و زیادترکردنی هێزەکان و ترساندنی دوژمنان و باوەڕی هەردوولا، پێویستیمان بە هەندێك تۆپ و فڕۆکە و رەشاش و چەك و تەقەمەنی هەیە. شتەکانی تر بە دووروودرێژی بەزار لە لایەن قوماندار رەشید ئەفەندی و سکرتێری تایبەتی عارف ئەفەندییەوە ئاراستە دەکرێت. زیادتر کاتتان ناگرم.

ئمیزا[1]
مەحموود
مەلیکی حوکمداری کوردستان

## ئاڵوگۆڕی نامەکانی شێخ مەحموود و سمکۆ

لە رێی رۆژنامەی (رۆژی کوردستان)ەوە کە لە باشووری کوردستان دەردەچێت (ژمارە ٧ی رۆژی ١٤ی جەمادی ئەلئەولی ١٣٤١ واتە کانوونی یەکەمی١٩٢٢) بە دەستمان گەیتشووە بەم جۆرەیە،

**نامەی یەکەم:**

بە رەسمی و بەپەلە بۆ حوکمداری سلێمانی لەم کاتەدا چارەنوسی گەلی کورد لە دەستی ئێوەدایە و بەبێ مۆڵەتی ئێوە ئێمە ناتوانین هیچ بکەین. داواتان لێدەکەین هەموو هەوڵی خۆتان بۆ ئازادکردنی نیشتمانەکەمان وەکاربخەن.

**١٤ی کانوونی یەکەمساڵی ١٣٣٨ سمکۆ.**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٩٦.

نامەی دووەم:

## هەولێر (قارەمانی کوردستان ئیسماعیل ئاغا)

ئێوە لە ئازار و بێبەشی گەلی کورد ئاگادارن و ئێستا من لە قۆناغێکی بەرپرسیاردام وەك یەکەم کەس بە خۆبەخت کردن بۆ گەیشتن بە مافی گەلی کورد خزمەت دەکەم. بۆ روونکردنەوەی هەوڵدانی من بۆ خەباتێکی هاوبەش لە پێناو گەیشتن بەئامانج پێویستمان بە قارەمانی نیشتمان پەرەستی وەك ئێوە هەیە و هیوام پێتانە. بەڵام هاتنە ریزی خەباتێکی وەها بەبێ هێز و یارمەتی مەترسییەکی گەورە دەخاتە سەر گەلی کورد. تائێستا گەلی کورد ئەو مافەی پێ نەدراوە بەرانبەر بە دوژمنان بەرگری لە خۆی بکات.

ئەو مافەی ئێمە داوای دەکەین،هەر بەڵێن و وادەیە، بە بیانووی جۆراوجۆرتائێستا پێمان نەدراوە.

لەم سێ مانگەی دواییدا دەوڵەتی بەریتانیا لە سەدایەکی بەڵێنی ئەو هاوکاریانەی پێی داوین، جێبەجێ نەکردووە تا گەلی کوردی پێ ئومێدەوار بکەم و لە داهاتوودا پێی بەختەوەربن. من خەبات بۆ مافی گەل دەکەم و نامەوێ خوێنی موسڵمانێك برژێت و لەم بارەوە خۆم دەپارێزم. ئەگەر بە نەرمی و ئاشتیانە مافەکەمان پێ بدرێت، ئامادەی هەموو چەشنە لە خۆبوردن و خۆبەخت کردنین بۆ بەر پەرچدانەوەو سزادانی دوژمنەکانمان (بە شێوەیەکی تر بەڵێن دەدەم کە بێ لایەنیش بم، بەڵام هەر بە دەوڵەتی بەریتانیا وەفادار دەبم و ئامادەم بە تەواوی پێوەی ببەسترێمەوە). ئەگەر پێویست بە وتووێژی تر دەکات داواتان لێ دەکەم بێن بۆ ئێرە بۆ لام. جارێکی تر رێزم هەیە بۆتان

**مەحموود**

نامەی سێیەم:

## بروسکە بۆ حومکداری سلێمانی

جگە لە دەوڵەتی ئینلگیز کەس مافی خۆمان پێنادات و ئینگلیزیش لەباتی ئەو یارمەتییەی دەیدات بە ئێمە چاوەڕێیە خزمەتی پێبکەین، بێگومان ئێمە ئەو مافە بە دەست دێنین ئەگەر ئێوە تەنیا مەیل و دەستبەکار بوونتان هەبێت. بە یارمەتی خوا لێرە منیش دەست بەکاردەبم بەبێ ئەوەی

خوێنی موسڵمانێك برژێت. هەرچۆنێك بێت بە مافی خۆمان دەگەین. من بە پێویستی دەزانم بە ڕێگای دۆست و یەکیەتی هێزەکانمانەوە دوژمن لەناو خۆمان دەرکەین و پاشان مافی خۆمان لە دەوڵەتی بەریتانیا و عەرەب بستێنین.

**سمکۆ**

**١٤ی کانوونی یەکەم ساڵی ١٣٢٨**

**نامەی چوارەم:**

**هەولێر- پاڵەوانی کوردستان سمایلاغا**

بەڵی ڕاستە دەبێ بۆ هەموو کارێکی باش و ڕێکوپێك ئامادە بێت و لەبەرامبەر هەموو میهرەبانییەکدا دەبێ سوپاس بکرێت، بەڵام میهرەبانی بەرامبەر بە هەر ناڕەواییەك مانای خۆبەخت کردنە لە پێناوی بەرژەوەندی بێگانە. من جگە لە دەوڵەتی بەریتانیا کەسێکی تر ناناسم مافی هەبوونمان پێ بدات و بتوانین چاوەڕێی بەختەوەری داهاتوومان بین.

بەڵام بەرەوای دەزانم دژی ئەوانەی مافی گەلان ناناسن ڕاپەڕین، کە دەبوایە بە میهرەبانییەوە پێمان بدەن، بەبێ ئەقڵیشی دەزانم بەبێ هۆ شەڕ بکرێت. ئەگەر دەوڵەتی بەریتانیا دان بەگەل و مافی ئێمەدابنێ و ئەو یارمەتیە ماددییەی لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە نەیارەکانمان بەڵێنی پێداوین جێبەجێی بکات، گومانی تێدانییە تێکرای گەلی کورد بەرەنگاری دوژمنانی نیشتیمانەکەی دەبێتەوە. ئێستا من دەزانم کێ دوژمنی وڵاتەکەمانە کێ مافمان پێدەدا و کێ پێمان نادا.

ئەکەر نەزانین بۆچی شەربکەین و بۆ کێ خوێنی خۆمان بڕێژین، ناگەینە مافی خۆمان. ئەگەر خۆشمان بەم کارە هەڵنەستین یەك کورد بۆ یارمەتیدان دوامان ناکەوێت و ئەگەر لێمان بپرسن ئێمە بۆ کێ شەڕ دەکەین و خوێنی خەڵك دەڕژێنین وەڵامێکمان نابێت.

بۆیە پێموایە ئەگەر لەماڵی خۆمان دانیشین، بێ لایەن و گوێڕایەڵی دەوڵەت بین، زۆر لەوە باشترە خەباتێکی نهێنی بکەین.

**مەحموود**

نامەی پێنجەم:

**رەسمی و بەپەلە، ١٤ی کانوونی ئەوەل، حوکمداری سلێمانی**

دەستتان ماچ دەکەم ئەگەر خزمەتێکم لەدەست بێت خۆم بە بەختەوەر دەزانم. سمایل ئاغا راپۆرتەکانی کردووە.

**سەید تەها**

نامەی شەشەم:

**هەولێر برای بەڕێزم، جێی شانازیم سەید تەها**

سوپاسێکی بێ پایانتان دەکەم بەرامبەر میهرەبانی و ئاگاداریتان سەبارەت بە من. لەسەر دەستوورەکەتان وەڵامم داوەتەوە. من کوردم و ژیان بە کوردی بەختەوەرییە. ئەوە هەستی نەتەوایەتییە و ئاواتی هەموو قارەمانێکی کوردە.

**مەحموود**[1].

**تێبینی وەرگێڕ:**

(هیوادارم دەقی ئەم نامانەم بە دەستبکەوێت، چونکە وەرگێڕاوە رووسییەکانیان گەلێك پەڕپووتن).

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٩٧-١٩٨.

# راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم

# پاڤلۆڤسکی

**١٩٢٣/٤/٨**

دەوڵەتی تورکیا تائێستا نەیویستوە دان بە هۆی راستەقینەی رووداوەکانی ئەم دوو ساڵەی دوایی کوردستان دابنێت. راپەڕینی کۆمەڵانی گەلی کوردی بەبێ بیروباوەڕ و کورت و هاندانی سەرکردەو عەشایەری کۆنەپەرست و تاریکی کوردی لە قەڵەم دەدەن. بەڵام ئەمڕۆ دەسەڵاتدارانی تورك تێ گەیشتوون کۆمەڵانی نەخوێندەواری کورد بە دڵ و بە گیان راپەڕیوون. تورکەکان بەجدی لە شۆڕشی سمکۆ نەگەیشتوون، ئێستاش درەنگە و بەربەرەکانی کردن بە میتۆدی کۆن بێ کەڵکە.

دەوڵەتی تورکیا خائینانە و ناپیاوانە (بەشێوەیەکی تر نەیدەتوانی دەست بەکاربێت) لە ساڵی رابردوو دەستە چەکدارەکانی سمکۆی شکاند و لەناوی بردن، وای دەزانی گەلی کورد بەم کردەوەیە بۆماوەیەکی زۆر، ئارام دەگرێت. بەڵام نەیزانی یاخود نەیدەویست لە رەگ و ریشەی کێشەکە تێ بگا. لەم ساڵانەی دوایی دەرسی باشی وەرگرتووە و تێ گەیشتووە کە تەواوی سەرکردە کوردەکان بەتایبەتی خالید بەگ و هاورێ سمکۆ و تەیمور ئاغا و ئەوانی تر( بە منیان وت) ئارام کردنەوە و ئاشتبوونەوەی ئەو شۆڕشگێڕانەی بۆ رزگاری گەلەکەیان خەبات دەکەن تەنیا کاتێك دێتە دی کە ئەو شتەی داوای دەکەن پێیان بدرێت، ئەگینا خۆیان دەیستێنن.

لە راسیتدا کوردەکان ئەو شتەی خوازیاری بوون و لە پێناویدا خەباتیان دەکرد، دەوڵەتی تورك ئامادە نەبوو بیانداتێ بۆ خۆیان وەریانگرت، بەڵام زەحمەتە بزانرێت تاچ رادەیەك ئازادی بۆ کوردستان دەستەبەر دەکرێ و سەربەخۆی کوردستان دەگاتە کوێ. کوردەکان کە یارمەتی لە ئینگلیزەکان وەردەگرن و کەوتوونە ژێر دەستی ئەو دڕندانە، لە داهاتوودا دەبینن بەم کردەوەیان لەناو ئاگردا کەوتوونەتە ناو چاڵ، بەڵام تا گەلی کورد دەژیت و خەبات دەکات بۆ بەدیهێنانی ئاواتی لە مێژینەی خۆی، بۆ رزگاری و یەکگرتنەوەی کوردستان، هەست بە قورسایی و زوڵمی ئینگلیزەکان ناکات و گلەیی و رەخنەشیان لێ ناگرێ، بەپێچەوانەوە پشتیوانی و یارمەتی بۆ دەوڵەتی خۆیان پەیدادەکەن و لەناو کوردەکانی تورکیا کە هێشتا بەرەو لای نەچوون، پڕوپاگەندە دەکەن.

له سەرەتایی مانگی مارتەوە تورکەکان بەبیانووی شەڕ دژی ئینگلیز دەیانەوێ دوانزە لەشکر دژی کوردەکان لە ناوچەی دیاربەکر ئامادە و کۆبکەنەوە، بەم هێزانەیان گوتووە بۆ شەڕ لەگەڵ ئینگلیزەکان کۆیان نەکردوونەتەوە، بەڵکو بۆ لەناوبردنی کوردستانی سەربەخۆیە واتە کوردستانی باشوور. لە راستیدا ئەم لەشکرانەی دژی ئەم بانگەوازە ئامادەکراون، رایانگەیاندووە ئامادەن دژی ئینگلیزەکان شەڕبکەن نەك دژی برا کوردە ئازادەکانیان. لەبەر ئەوە بێ لایەن دەمێننەوە. ئاشکرایە تورك لەم بێ لایەنییە دەگەن و دەزانن لایەنگری دەوڵەتی کوردین و ئەگەر بە زۆر ناچاریان بکەن دژی برا کوردەکانیان شەڕبکەن لە یەکەم تێکهەڵچووندا دەچنە ریزی بەرەی کوردەکان، جگە لەوە ئەوەندەیان هێز لە کوردستان نییە بتوانن ئەم کارە بکەن. خالید بەگ کە فەرماندەی ئەم هێزانەیە (لە عەشیرەتی جەبرانلییە) بە ئاشکرا پێیگوتم: دەوڵەتی تورکیا تا ئەو دەمەی بانگی نەکردوون یا نەی ناردوون بۆ شەڕی دژی کورد، دەتوانێ حساب لەسەر بێ لایەنی ئەم لەشکرانە بکاو جێی متمانەی ئێمە بێت.

تورکەکان لەبەر ئامادەنەبوونی ئەم لەشکرە کوردانە وەدوای گرتنی خالید بەگ و ئەفسەرەکانی تری ئەرزەرۆم کەوتوون،گوایە بۆ راپەڕینی دژی تورك هانیان دەدەن و مەبەستیان یەکگرتنە لەگەڵ دەوڵەتی کوردی. چونکە نەیانهێشتووە ئەم لەشکرانە بەپیر بانگەوازی تورکانەوە بچن، بەگەورەترین تاوانباریان لەقەڵەم دەدەن. هۆیەکی تری راوەدونانی خالید بەگ ئەوەیە: سەرۆکی شارەوانی موش راپۆرتی لەسەر کۆمیتەی کورد بۆ ئەنقەرە نووسیوە کە تەنیا ئەو لە هەبوونی ئاگادار بووە. بەلاَم هیچ شتێکی تری لەسەر مەبەست و چالاکی کۆمیتەی ناوبراو نەیزانیبوو. ئەوە بوو فەرمانیاندا دوای خالید بەگ و هاورێکانی بکەون.

هەستی کوردایەتی کوردەکانی تورکیا بەرانبەر دەوڵەتی کوردی سلێمانی هێند زۆرە کە خالید بەگ پێیگوتم: لەگەڵ ئەوەشدا عەشیرەتەکەی باوەڕی تەواویان پێی هەیە و خۆشیان دەوێ، دەترسێت کە ئەم باوەڕ و خۆشەویستیە لە دەستبدات ئەگەر چیتر بەرامبەر دەوڵەتی کوردی کەمتەرخەم و بێ لایەن بمێنێتەوە.

خالید بەگ لەو باوەڕدایە کە زۆربەی ئەم رێبەرانەی ئێستای کورد وەك سەرۆکی دەوڵەتی کوردی شێخ مەحموود و سمکۆ و شەمسەدینۆف و......، کە کوردستانیان جیاکردۆتەوە هێشتا نەك هەر خۆیان بە ئینگلیز نەفرۆشتووە، بەڵکو خەباتێکگێڕی راستەقینە و پاکن کە بۆ ئازادی کوردستان یارمەتییان لە ئینگلیز وەرگرتووە. بەم دواییانە ئەم وتەیە زۆرجار دەیڵێتەوە. پێشان دەیگوت جیاوازی سەرەکی ئەو

لەگەڵ سەرکردە کوردەکان ئەوەیە(ناوبراو هەمیشە بەناوی کۆمیتەی کوردییەوە قسەدەکات) بە یارمەتی وەرگرتن لە ئینگلیزەکان رازی نییە. بەلام ئێستا لە قسەکانیدا وەك بلێی پاکانە بۆ سەرکردەکانی کورد دەکات و دەلێ رێگایەکی تر نییە.

پێموایە ئەم تەسلیم بوونە یا دۆڕاندنی خالید بەگ، لەبەر ئەو نامانەیە کە لە سەرکردە کوردەکانی سلێمانییەوە بۆی هاتووە و پێکەوە رێککەوتوون. منیش ویستم بزانم، لە خالید بەگم پرسی ئایا بە راستی جگە لە ئینگلیز رێگایەکی تر نەبوو کوردەکان یارمەتی لێوەرگرن. لە وەلامدا وتی: (وشە بە وشە وەك خۆی دەیگێڕمەوە)[1].

## وەرگێڕاوی پرێس بیلۆتین ژمارە (٤) ساڵی نیسانی ١٩٢٣

دەسەلاتدارانی لەشکری ئێران داوای مالیاتیان لە عەشیرەتی سەنجابی (ئەم عەشیرەتە ئێستا لە میزوپۆتامیان) کردووە. داوای مالیاتی ئاژەڵ و زەوی و زاری چوار ساڵیان لێکردوون. داوایان کردووە دوو سەد چەکداری سوارەی عەشیرەتی گۆران لە ریزی سوپای ئێراندا خزمەت بکەن. داوای گەڕانەوەی ئەو عەشیرەتەی گۆرانیان کردووە کە چوونەتە ریزی عەشیرەتی سەنجابی و پشتیان لێکداوە.

(٢٨)ی نیسانی ١٩٢٣ هێزەکانی دەولەتی فارس کە ژمارەیان چوار سەد کەس و بە سەرۆکایەتی ئەمیر لەشکر و بە هاوکاری ئەو عەشیرەتانەی کە لایەنگری ئینگلیزبوون بە مەبەستی لەناو بردن هێرشیان کردۆتە سەر یەکێك لە گەورەترین خانەکانی کوردستان واتە سەردار رەشید خان.

لە رۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٢٣ سەید تەها بە هاوکاری ئاشوورییەکان هێزەکانی تورکیایان لە رەواندز شکاند و رەواندزیان ئازاد کرد. ئۆزدەمیر پاشا بەخۆی و پاشماوەی هێزە تێکشکاوەکەی چۆتە ناو خاکی فارس (ئێران)[2].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٩٨-١٩٩.

Q 0132 (2)

**شاری سلێمانی، یانزەی جەمادی ئەول، ساڵی ١٣٤١ی عەرەبی**

**(وەرگێڕاو لە کوردییەوە)**

## نامەی سمکۆ بۆ فەرماندەی هەموو هێزەکانی فارس لە ئازەربایجان

### عەرزی حاڵ (داواکاری)

### بەناوی خوا

بەرێز، من سمکۆ عەرزوحاڵی خۆم ئاڕاستەی ئێوە وەك موسڵمانێکی ڕاستەقینەی فەرماندەی قشونی هێزەکانی دەوڵەتی فارس هومایۆن شا دەکەم. ئێوەی بەرێز بەباشی ئاگادارن کە من و هۆزەکەم تووشی چ کوێرەوەری و تاڵان کردنێك بووین تەنانەت ئێشتاش نازانم بنەماڵەکەم لە کوێیە و ماڵ و سامانەکەم چی بەسەر هاتووە. بنەماڵەکەم ئێستا لە بارودۆخێکی دژواردا لە ژێردەستی جەندرمەکانی تورکیان، خوا دەزانێت ئێستا چۆن لەگەڵیان دەجولێنەوە. من بۆ خۆم بە ڕەحمی خوا بەشێوەیەکی عەجیب توانیم لە دەستیان خۆم رزگاربکەم و بچمە سلێمانی لای حەزرەتی شێخ مەحموود کە تا ئەم کاتەش وەك موهاجیر لە ژێر پشتیوانی و ئاگاداری شێخ مەحمودم و پەنایان داوم. بنەماڵە و نیشتمان و دەوڵەت و شارەکەم بۆمن هەمیشە گرنگ بوون، من هیچ کاتێك خۆم بە تاوانبار نەزانیوە، چونکە ویژدانم هەمیشە بەرانبەر بە دەوڵەت پاك بووە لەمبارەشەوە من بەڵگە و دیکۆمێنتی زۆرم هەیە. من زۆر بە هەڵە چووم، باوەڕم بەو کەسانە کرد کە منیان والیّ کرد.دەستووری وەلیعەهدیشم هەیە کە بۆ من نوسراوە. لە سەردەمی فیلیپۆڤ، من بە تەواوی ئامادەبووم و سوێندیشم بە قورئان خواردبوو کە بەپاکی خزمەت بکەم، بەڵام دەوڵەت بۆ خۆی دەست پێشخەر و شاهیدە کە کێ ئەم بارودۆخەی خولّقاند و کارەکەی گەیاندە ئەو رادەیە، بەڵگەیشم لەو بارەوە هەیە و دەتوانم نیشانی بدەم، ئەگەر نەمتوانی ئامادەم سەرم دابنێم.

ئەوکاتەی ئەرمەنی و ئاشورییەکانی سەڵماس و ورمێیان دژی من هاندا چیم بۆ مابۆوە. بۆ دەسەڵاتتان دا بە عومەر خان و یارمەتی خۆی و هۆزەکەیتاندا، لە کاتێکدا ناوبراو ئەو ماوەیەی کە لای من بوو گەلێك شتی کرد، ئێستا دەوڵەت تەنیا بە دوای من کەوتووە و هەوڵی لەناو بردنم دەدا.

ئێستاش من داوای گەڕانەوە بۆ وڵات بۆ ئەو شوێنە واتە چاریق دەکەم ئەم جێیەی کە جێگای باوباپیرانمە و دەمەوێ خەریکی کشتوکاڵ و وەرزێری خۆم بم. خزمەت بە وڵات و بە شا بکەم. داوای دەکەم لەو ڕۆژە ڕەشانەدا کە تێی کەوتووم داخوازییەکەم پەسەند بکەن، سوێند بە قورئان دەخۆم وەفاداری خۆم لەمبارەوە بەجێ بگەیەنم و کوڕەکەیشم لەگەڵ براکەم دوو سەد کەس قازاق لە هۆزەکەم وەك بارمتە لاتان بهێڵمەوە و تەنیا داواتان لێدەکەم کە:

١- بوارم بدەن بگەڕێمەوە چاریق.

٢- سەرکردایەتی هۆزەکەی خۆمم واتە (هۆزی عەبدۆیی)م پێبدەنەوە تاخزمەتی نیشتمان بکەم و بە فەرمانی شا سەرۆکایەتی هۆزەکەم بۆ بگەڕێننەوە و داوای مسۆگەری و پاراستنی ژیانم دەکەم وەك سەرۆك هۆز و خێڵەکانی تری کوردستان، خان زادە، بەگزادە یان وەك عومەر خان، ئەگەر بە پێچەوانە جووڵامەوە دەوڵەت دەتوانێت براو کوڕو بارمتەکانی ترم لە تاران بکوژێت.

دەتوانم تەواوی ئەو بەڵگە و دیکۆمێنتانە نیشان بدەم.

هیوام لەمبارەوە بە خواو پاشان شا و ئێوە هەیە وەك فەرمانـدەی قشونی ئێران لە ئازربایجان[1].

**سمکۆ عەبدۆیی**

سمکۆی بێ کەس و بێ دەرەتان ئەم نامەیە هەروەك خۆی دەنووسێت کە بنەماڵەکەی لە لایەن تورکەوە بەدیل دەگیرێن و جگە لە ئێران تورکیش بە دواییدا دەگەڕێن لە ناوی بەرن، بەتایبەتی لە کوردستانی باشوور چەتەکانی ئۆزدەمیر بەدوایەوەن. پاش ئەوەی ئینگلیزەکان هیچ بەڵێن و یارمەتی پێ نادەن وتەنانەت نابنە گەرەنتی یان نیوەنجی کردنی نێوان سمکۆ و شای ئێران تا ژیانی بپارێزن. ئاشوری و ئەرمەنە چەکدارەکانی ناو سوپای ئینگلیزیش لە عێراق بەنیازی کوشتنی سمکۆن. سمکۆ دەبینێ شێخ مەحموود بەتەواوی لەگەڵ ئینگلیزەکان تێکیداوە و دەستی لەناو دەستی تورك دایە، بەپێچەوانەی خواست و ویستی سمکۆ و سەید تەها و مستەفا پاشا

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٠٦-٢٠٧.

یامولکی و.... شێخ واز لە دژایەتی کردنی ئینگلیز نـاهێنێ و پـشت بـە بەلـشەویکەکان و تورکان دەبەستێ. مانەوەی سمکۆش لە کوردستانی باشوور و لە ژێر کارتێکردن یان دەسـەڵاتی شێخ و هاتووچۆی ئۆزدەمیر و چەتەکانی و شەڕکردن لەگەڵ ئینگلیـز ئـەنجامێکی تێـدا بـەدی ناکات، بۆیە ئەم نامەیە دەنووسێت بۆ کاربەدەستانی ئێران. سەرەڕای ئەمەیش کاربەدەسـتانی فارس هەر باوەڕی پێناکەن و داوا دەکـەن بـچێ بـۆ تـاران یـا تـەورێز. قەزاقـەکانی ژەنـەڕاڵ فیلیپۆڤی رووسیش، کە لە بەڵگەکانی تردا هاتووە، لەگەڵ کاربەدەستانی تـری ئێـران پێکـەوە دەورێکی بەربلاویان لە دەرپەڕاندن و سکشتدانی سمکۆدا بینیوە، سمکـۆ ناچـار دەبـێ بـۆ نـاو خاکی کوردستانی تورکیا پاشەکشە بکات و لەوێش جەندرمەکانی تورك گەمارۆیی دەدەن، کە لە بەڵگەنامەکانی تردا ئاماژەی پێکراوە.

**د. ئەفراسیاو هەورامی**

# لە ڕاپۆرتی کۆنسۆڵی سۆڤیەت لە بایەزید - هاوڕێ مالتسوف

١٩٢٣/٥/١

## بزووتنەوەی کورد

لەبەر هەندێ هۆ لەم چەند مانگەی دواییدا زانیاری باوەڕ پێکراومان لەسەر بزووتنەوەی کورد زۆر کەمبووەتەوە. وەك زۆر جار لە ڕابردوودا نووسیومە، سەرچاوەی گرنگی ئێمە لە فارس، ناوچەکانی سەر سنووری بایەزیدە. پەیوەندی گرتن لەگەڵ ئەم سەرچاوانە ناڕاستەوخۆ لە ڕێگای کۆنسۆڵەکانمانەوە بووە لە ماکۆ. لەبەر وریابوونەوە و شك و گومانی تورکان بۆمان نالوێ پەیوەندی ڕاستەوخۆیان پێوە بکەین.

دوای ڕۆیشتنی هاوڕێ دوبسۆن لە ماکۆ ئەم پەیوەندیانە بە تەواوی پچڕاون، لەبەر ئەوەی جێگری هاوڕێ دوبسۆن نەیتوانی ئەم پەیوەندییانە ڕاگرێت، بۆیە تەنیا من هەندێ شتی پچڕپچڕو و ناتەواوم هەیە کە زۆر زەحمەتە بە خوێندنەوەیان ئەنجامێك بەدەست بێت.

هەڵەکە زۆربەی هەڵەی نوێنەری دەوڵەتی ئێمەیە لێرە کە دەڵێ شتێکی زیادەیە و پێویست ناکات کۆنسۆڵەکان لە بارودۆخی سیاسی ئەم بوارە، ئاگاداربکەینەوە. چەند ڕۆژ لەمەوبەر بروسکەیەکم پێگەشتووە کە ڕستەیەکی بێ بایەخی لەمبارەیەوە تێدایە دەڵێ: کەمبوونەوەی جموجۆڵی کوردەکان، لەوانەیە لەبەر ڕێکەوتنی ئینگلیز و تورکیا بێت. من هیچ شتێکم تائێستا پێنەگەیشتووە و ئاگادار نەکردنەوەی کۆنسۆڵەکان لەمبارەوە، ئیش و کاریان زۆر دژوار دەکات و دەبێتەهۆی ئەوەی لە ڕووداوەکان تێنەگەن. ئەو هەواڵانەی بە من گەشتوون وا دەگەیەنن کە بە ڕاستی حەماسی کوردەکان دابەزیووە. سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان دەڵێن، شێخ مەحموود خەریکە دەوری خۆی لە کوردستانی تورکیا لە دەست دەدات، چونکە ئەم دەورەی ئەو بەهۆی شێخەکانەوە بووە. کوردەکانی وان و بەتلیس دەڵێن جموجۆڵ و چالاکی پایز و زستانیان نەماوە کە بە ئاماژەیەکی شێخ مەحموود دەست بەکاربن، ئەمڕۆ ئەوان زیاتر چاوەڕێی ڕوون بوونەوەی بارودۆخەکەن. لە هەمانکاتدا ژمارەیەك شێخ بەپێی گەڵاڵەی ئەو پەیمانەی کە لە نێوان یەکیەتی سۆڤیەت و کۆمیتەی کوردی ئەرزڕوم هەیە و بۆ من نێردراوە، دەیانەوێ لە

لەگەڵ رووسیا کاربکەن، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە بۆ کورد هەروا ئاسایی نییە لە خەباتیدا بۆ سەربەخۆیی کوردستان یارمەتی ئینگلیز وەربگرێ. بۆ سەلماندنی ئەمەش من لە رابردوودا باروذۆخەکەم شیکردەوە و گەلاڵەم کرد بوو کە: «کوردەکان بۆیە دەڕۆنەلای ئینگلیز چونکە لە هیچ شوێنێکی تر پشتیوانیان نییە. ئەگەر بێت و ئەو پشتیوانییە لە لایەن ئێمەوە بێت شك لەوەدانییە کە لە ئینگلیزەکان دوور دەکەونەوە. بەم چەشنە هیچ شتێك مەحاڵ نییە ئەگەر کوردەکانی بەتلیس و وان دەستوورێکی نوێیان لە کۆمیتەی کوردییەوە پێبگات (کۆمیتەی کوردی دەورێکی زۆری لە نێویاندا هەیە) هەڵوێستیان بەرامبەر ئەو پەیمانەی نێوان مەحموودو ئینگلیزەکان دەگۆڕدرێت. دووریش نییە مەحموود بۆ خۆی لەمەڕ ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ ئینگلز هەیەتی هەندێك گۆڕانی بەسەر دابێت.

کەمتەرخەمی و ناڕێکی لە کارەکەدا زۆرە، بۆ نموونە لە رستەی بروسکەیەکی تری نوێنەری سۆڤیەت هاتووە: ئینگلیزەکان لە سلێمانی دەستیان بە خوێن رشتن کردووە. من هیچ ئاگاداریەکم لەسەر ئەم فاکتە نییە و ئەم رستە ناڕوونە وا لە من دەکات کەوا تێبگەم مەحموود لە ئینگلیزەکان جیابۆتەوە.

لەبەر نەبوونی دەنگوباسی رێکوپێك (تۆکمە) دەکرێ بڵێین هاوسەنگەری ئینگلیز و کوردەکان درزی تێکەوتووە، ئەندازەی ئەم درزە چەندە؟ زەحمەتەی ئێستا بزانرێ.

لە لایەکی ترە ئەگەر کوردەکان بە چاوێکی تر تەماشای یارمەتی ئینگلیزەکان بکەن هەڵوێستیان لەسەر بیروڕای سەربەخۆیی بۆ کوردستان ناگۆڕن. ئەو هەواڵانەی کە دەگەن هەندێکیان دەڵێن ئیش و کاری کوردەکان بە نهێنی هەر بەردەوامە و لە یەکەم هەوڵدا دەست بەکاردەبن. دەبێ ئەوەش بگوترێت یەککگرتنی عەشیرەتەکان نەك لە رووی سیاسییەوە، بەڵکو لەباری نەتەوایەتی و بیروباوەڕدا هەر بەردەوامە. ئێستا ئەم کارە بۆ یەککگرتن لە ناوچەکانی وان و بەتلیس و ئەرزەرۆم و بایەزید لە کوردستانی تورکیا بەرێوەدەچێت، لەگەڵ یەککگرتنی عەشیرەتەکانی حەیدەرانلو و میلان. ئێستا پرۆپاگەندەیەکی زۆر هەیە لەناو عەشیرەتەکانی ئادەمانلی کە لە قەزای ئارجیشم و بایەزید دەژین. لەناوچەی بەتلیس ئەم پروپاگەندەیە عەشیرەتی حەسنانلۆی گرتۆتەوە و سەرکەوتوانەش لەناو جەلالییەکانی ناوچەی بایەزید بەرێوەدەچێت. سەرکەوتنی ئەم چالاکیانە بۆ یەککخستنی کوردەکان ئەو فاکتە نیشان دەدەن کە

کوردەکانی تورکیا و فارس لە ناوچەکانی بایەزید و ماکۆ سەدان ساڵە دوژمنی سەرسەختی یەکتربوون. بەڵام ئێستا هەموو رۆژێك پێکەوە پەیوەندی و ئاخافتنیان هەیە. چیتر دەنگوباسی تێکهەڵچوونیان نییە کە پێشتر هەموو رۆژێك دەقەوما. لەناو کوردەکانی ماکۆشدا دوژمنایەتی نەماوە.

لەم کاتەدا کە یەکگرتنی کوردەکانی تورکیا لە پەرەسەندندایە کوردەکانی فارس وەختاوەخت چەك بە دەست رادەپەڕن و دەوڵەتی ئێران وا لێدەکەن دژیان دەست بەکاربێت. بۆ نموونە لە ناوەڕاستی مانگی مارتدا کوردەکانی سابڵاخ راپەڕین و دەوڵەتی فارس سەرکوتی کردن.

دەوڵەتی فارس ئێستا خەریکی چەککردنی کوردەکانی قەرەداغ و شاهۆیە. بەڵام بەپێی ئەو هەواڵانەی گەیشتوون، لە ماکۆ تا سابڵاخ کوردەکان خەریکی چەکدارکردنی خۆیانن و تاك و تەرا وەك ماکۆ رەشاشیان دەسکەوتووە.

دەوڵەتی فارس هەوڵی داوە ناهێڵێت ئەو رۆژنامە کوردییانەی لە سلێمانی دەردەچن بگاتە ناو کوردستانی ئێران. کەچی بە پێچەوانەوە، کوردەکان لەباتی ئەوەی لێك دابڕێن پتر یەکدەگرن. پێویستە بگوترێت، لەم دواییانەدا هاوپەیمانێکی نوێ بۆ بزووتنەوەی کورد لە ناوچەی سابڵاخ پەیدابوو کە ئەویش نوری بەگە سەرۆك عەشیرەتی بەگزادە.

سەبارەت بە تورکان دەبێ بڵێین هەر خەریکی ناردنی هێزن بەرەو موسڵ و ئەو جێگەیەی ئاگری کردۆتەوە لە باشووری کوردستان. بەپێی ئەو هەواڵانەی هەمانە تورکەکان ئێستا لە (وان) یەك لەشکریان هەیە و لە باشقەڵاش پەنجا سەرباز. بڕیارە بەم زووانە فەوجێك بگاتە بایەزید کە فەرماندەکەی (چان ئیس میزمی) بەناوبانگە. کۆنسۆڵی پێشووی تورکیا لە ماکۆ تاهیر بەگ بۆ خۆی هاتۆتە بایەزید، گوایە فەوجەکەی دەبێ بەم زووانە بگاتە ئەوێ. لەشکری ئاوا گەورەی تورکیا لە باکووری کوردستاندا نییە، تورکان هێزی خۆیان لە بەری میزۆپۆتامیا مۆڵداوە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە کوردەکانی باکوور ناتوانن بێ کوردستانی باشوور راپەڕن.

بەپێی هەواڵی هەواڵگرەکان، رەواندز هەر لە دەست ئینگلیزان دایە و بەرەی موسڵ بەهێز دەکەن، بەم دواییانە چەند فڕۆکەی جەنگی تریان لەگەڵ پەنجا هەزار تفەنگ هێناوە بۆ ئەو دەڤەرە.

سمكۆ تائێستا دیار نییە و لەبەر ئەوەی لەیەك جێگادا نامێنێتەوە كەس نازانێ لە كوێیە، بۆیە زۆرجار دەنگوباسەكان لەسەر سمكۆ پێچەوانەی یەكترن. دوایین هەواڵ كە لەم بارەوە گەیشتووە دەڵێ سمكۆ لە رەواندزە، بەڵام هێشتا راستی ئەم هەواڵە نەزانراوە لە لایەكی تر دەنگۆیە، لەگەڵ دەوڵەتی توركیا لەسەر بەخشینی سمكۆ، وتوویژ دەكرێ، گوایا حوسێن پاشا بۆ ئەم مەبەستە چۆتە ئەنقەرە.

دەڵێن ئەحمەد ئاغای برای سمكۆ لە راپەڕینی كوردەكانی سابلاخدا بەشداربووە. ئێستا كەس نازانێ ئەویش لە كوێیە. بەپێی دوایین بروسكە لە ئەنقەرەوە، زاوای شێخ مەحموود لەسەر داوای دەوڵەتی توركیا هاتووەتە ئەوێ. دەوڵەتی توركیا پێشنیاری كردووە پشتیوانی شێخ مەحموود بكاو یارمەتی بدات، بەو مەرجەی واز لە پروپاگەندە لە باكووری كوردستان بێنێ. ئەم جموجۆڵەی توركەكان بێ شك بە مەبەستی لێك دابڕینی پارچەكانی كوردستانە. زۆر دوور نییە تورك پشتیوانی ئەو هەوڵەی شێخ مەحموود بكەن بۆ ئەوەی كوردستانی فارسیش بخاتە ژێر دەستی خۆی. ئەم بۆچوونە كەمتر جێی باوەڕە چونكە سەربەخۆیی ناوچە سنوورییەكانی كوردستانی فارس مەترسییەكە و كێشە بۆ كوردستانەكەی ئەوان درووست دەكا. وا پێدەچێ ئەوان ئەو بارودۆخە ئاوا راگرن، واتە ناوچەیەكی بچووك لە دەوروبەری سلێمانی بۆ مەحموود بهێڵنەوە. لە هەردوو حاڵەتدا توركەكان پشوودانێكی كاتی دەستەبەر دەكەن، كە بۆ پتەوكردنی دەسەڵاتی خۆیان لە كوردستانی توركیا و بەهێزكردنی لەشكرەكەیان لەناوچەكە كەڵكی لێوەردەگرن.

بەڵام دەبێ بگوترێت كە پاشەكشێی ئاوا، بێشك مەترسی گەورەی بەدواوەیە. ئاشكرایە توركەكان بەو ئەنجامە گەیشتوون كە دەبێ میتۆدەكانی خەباتی پێشوویان دژی بزووتنەوەی كورد بگۆڕن، لە هەموو كەس باشتر ئاگاداری بزووتنەوەی كوردن، دەزانن بەم بارودۆخەی ئەمڕۆی توركیا و بۆیان گران تەواو دەبێ. پێدەچێت شێخ مەحموود ئامادەبێ پێشنیارەكانی تورك پەسەند بكا،چونكە ئێستا ئەوەندە بەهێز نییە دژیان راوەستێ. ئەگەر ئەم پەیمانە بۆ توركان پشوودانێك بێ، بۆ شێخ مەحموود دووقاتە.

مەحموود ئەگەر مەرجەكانی توركیاش پەسەند بكا مانای ئەوە نییە واز لە ئیش و كاری خۆی لەناو كوردەكانی توركیا دێنێ. من زۆر هەستم بەو یەكگرتنەی كوردان كردووە و رەگ و

ریشەی زۆر قوڵە. نە سنوورەکان نە پۆستەکانی گومرگ و.... ناتوانن پێش بە پەیوەندی کوردەکان بگرن.ئەوەی کوردان بناسێ باوەڕی بەم وتەیە هەیە. کەواتە مەحموود بۆیە کەڵك لەم پشوودانە وەردەگرێ تا کوردەکان یەك بخات و ئەو کاتە پەیمانەکە بۆخۆی هەڵدەوەشێتەوە. بەڵام پێش ئەوەی بۆ یەکگرتنی هەموو کوردستان دەست بەکاربن، شێخ مەحموود و سەرکردەکانی کورد بێگومان بەدوای پشتیوان یان پاڵپشتدا دەگەڕێن. ئەم پاڵپشتە تەنیا دەتوانێت ئینگلیز یا رووسیای سۆڤیەتی بێت. لەکاتی ئامادەکردن و ئاشکرابوونی راپەڕیندا دەردەکەوێ کێ لەگەڵیانە و پشتیان دەگرێت. لەم قۆناغەدا (ئەگەرچی راپەڕینەکە لە پارەوە دەستی پێکردووە) ئاشکرادەبێ کە ئایا ئێمە هەر بەو (دۆستایەتییە) کاتی و خەیاڵییەی تورکیاوە دەنووسێین، کە تائێستا لە زیانی ماددی و عەردی و سوکایەتی پێکردن بەولاوە هیچ سوودێکی بۆ ئێمە نەبووە، یا پشتیوانی گەلێکی تازە پێگەیشتوو دەکەین کە دەیەوێ لە ژێر ئاڵای کۆمارێکی سۆشیالیستیدا خەبات بۆ ئازادی خۆی بکا[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٠٩-٢١٢.

## راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم - هاوڕێ پاڤلۆڤسکی

**١٩٢٣/٥/١١**

**هاتنی یوسف زیا نوێنەری مەجلیسی تورکیا بۆ بەتلیس** (لەسەر ئەم میوانە نهێنیە و کێشەی کورد بەوردی ئاگادارتان دەکەم) ناوبراو لە ٤ی مارت هاتە ئەرزەڕۆم و ١٠ی مارت دەچێتە بەتلیس.

### کێشەی کورد لە روانگەی تورکانەوە

بەپێی ئەو هەواڵانەی لەملا و لەولاو پێمان گەیشتوون، دەوڵەتی تورك چارەسەری کێشەی کوردی بە زەبری هێز وەلاناوە و هەوڵ دەدا لەگەڵ سەرکردەکانی کوردی سلێمانی رێك بکەوێت.

سکرتێری کۆنسوڵی تورکیا لە ماکۆ (کاپیتان نەزمی ئیبراهیم بەگ) کە پێنج رۆژ لەمەو بەر هاتووەتە ئێرە، سەبارەت بە کێشەی کورد (لە ناوچەکەی خۆی) بەم چەشنە دوا: « بۆ تورکیا خەراپە کوردستان لە ژێر رکێفی ئینگلیز یا رووسیا بێت. ئەنقەرە ئەم شتەی لەبەر چاوە بۆیە دەبێ بە پیر کوردەکانەوە بچێت تاکو پێش بە پشتیوانی  یا دەوری وڵاتانی تر لە کوردستان بگرێت».

بەپێی هەواڵەکانی ئەم دواییە کە هێشتا لە محەك نەدراون دەڵێن تورکیا دیسانەوە لە سەروقامیش لەگەڵ سمکۆ خەریکی وتووێژە و دەیەوێ بۆ لای خۆی رابکێشێت. وێدەچێ راست بێت.

لە بوڵتنی هەواڵەکانی مانگی مارت (کە نهێنییە)، لە ستادی ئەو بەرانەی پەیوەندیان بە کوردستانەوە هەیە چیتر دژایەتی و هەڵویستی توند بەرانبەر بە دەوڵەتی کورد بەتایبەت بەرانبەر بە سمکۆ بەرچاو ناکەوێت. (پێشان وانەبوو) ئێستا هەموو تاوانەکانی کوردستان دەخەنە ئەستۆی ئینگلیز.

چەند رستەیەکی نووسراوی ئەو بوڵتنە دەهێنمەوە:

١- بۆ چارەسەکردنی کێشەی کورد، ئینگلیزەکان بۆ بەرژوەندی خۆیان لەهەموو دەڤەری موسڵ شوێنێکیان نەهێشتووەتەوە دەوریان تێدا نەبێ.

٢- لە سلێمانی بەرێنوێنی ئینگلیزەکان دەوڵەتی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود دامەزراوە.

٣- ئینگلیزەکان هەوڵ دەدەن ئەم دەوڵەتە بەهێز و پتەوبکەن.

٤- سەرۆکی دەوڵەتی کوردی دەستی بە دەرکردنی رۆژنامەیەك کردووە بە زمانی کوردی بەناوی (رۆژی کوردستان).

٥- ئینگلیزەکان سمکۆیان خستوەتە ژێر دەستی شێخ مەحموود (زۆر بە زەحمەت).

٦- ئینگلیزەکان نوێنەری بەناوبانگی کوردیان بەناوی سەید تەها لە بەغداوە ناردۆتە لای شێخ مەحموود تا لە ژێر کۆنترۆڵیان دابێ.

٧- ئەو ئەفسەرانەی پێشووی تورکیا (چ عەرەب و چ کورد) کە خزمەتی ئینگلیزیان دەکرد ئەمرۆ خراونەتە ژێر دەستی شێخ مەحموود و خەریکی خزمەتن.

**ئەندامانی دەوڵەت:**

١- سەرۆك، شێخ مەحموود.

٢- فەرماندەی گشتی، جەودەت شێخ عەبدولقادر.

٣- وەزیری ناوخۆ، شێخ موحەمەد غەریب.

٤- وەزیری دارایی، عەبدولکەریم عەلەکە.

٥- وەزیری پەروەردە، میر لیوا موستەفا.

٦- وەزیری گومرگ، ئەحمەد بەگ فەتاح.

٧- وەزیری پۆلیس، ئەحمەد بەرزنجی.

٨- وەزیری فەرمانبەری (ئاوەدانی) دەوڵەت، میر لیوا سدیق پاشا.

شێخ مەحموود و سەید تەها دەستەیەکیان ڕێکخستووە بە مەبەستی تۆڵە سەندنەوە لە دەوڵەتی فارس، فارسەکانیش دژی ئەوە هەنگاو هەڵدەگرن.

سمکۆ پێش ئەوەی رابکا دەوڵەت پێشنیار دەکا بگەڕێتەوە تورکیا، بەڵام سمکۆ دەترسێت و ئامادە نابێ ئەم پێشنیارە پەسەندبکات. لە رۆژنامەی رۆژی کوردستان (٦)ی تشرینی یەکەم ڕێکخستنی سەرکردایەتی سوپای دەوڵەتی کوردی بەم چەشنە راگەیندراوە:

١- عەلی ئاغا

٢- رەفعەت بەگ

٣- ئەفسەری ستادی

ناوەندی یوزباشی تەوفیق وەهبی بەگ و ئاجودانی گەورە شێخ ئەمیر ئەفەندی زادە. تاهیر ئەفەندی کراوە بە سکرتێری دەوڵەت. ئینگلیزەکان بەپەلە خەریکی مەشق پێکردنی دانیشتوانی موسڵن و چەکداریان دەکەن.

هەر راپەڕینێکی دژی ئینگلیز (چ لە لایەن عەرب و چ لە لایەن کوردەکانەوە) بێ بە زەبیانە، بەهێزی سوپایی سەرکوت دەکرێت.

لای کورد و عەرەب ئاشکرایە، شێخ مەحموود ئینگلیز دایناوە و لە ژێر کارتێکردنی ئەوانە. ئەو خوێنەی کورد دەیڕێژێت سەربەخۆیی و ئازادی کوردستان ناهێنێتەدی تەنیا کوردستان دەخاتە ژێر دەستی ئینگلیزەکان.

پەیوەندی نێوان شێخ مەحموود و فەیسەڵ تێکچووە. ئەمەش بە دەسکیسی ئینگلیزە، لەم بارەوە لە باشووری سنوورەکانی کوردستان چەند تێکهەڵچوونی بچووك روویداوە. لەم رۆژانەدا ئینگلیزەکان خەریکی ڕێکخستنی کۆنفراسی کوردەکانن. ئەمەیە بارودۆخی کوردستان (بەپێی زانیاریەکانی ستادی بەرەی رۆژهەڵاتی تورکیا). وادیارە دەوڵەتی تورکیا لە کێشەی کورد نائومێد بووە و پێیوایە بە رێگایەکی گونجاو و ئاشتیانە دەتوانێ خۆی رزگار بکات[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢١٣-٢١٥.

## هەڵوێستی ئەرزەڕۆمی کوردستان*

لەم ماوەیەدا تەنیا لە (٧)ی مانگی ئایار توانیومە چاوم بە خالید بەگ بکەوێت. خالید بەگ لەگەڵ نوێنەری پارلمانی تورکیا یوسف زیا بەگ لە ئەنقەرەوە بە ڕێگای تیفلیس-بەتلیسدا هاتوون. هەفتەیەك بەر لە هاتنی بۆ ئەرزەڕۆم لە لایەن هاوڕێ لڤۆڤیچ بروسکەیەکم بەم شێوەیە پێ گەیشت «... وشەکان ناخوێندرێنەوە.. یوسف زیا دوێنێ ڕۆیشتووە... » بروسکەکەی هاوڕێ لڤۆڤیچ وادەگەیەنێت کە دەبێ من لە ڕێگای ئەنقەرەوە ئاگاداری هەموو شتێك کرابم، کەچی بەداخەوە وا نەبوو. تەنیا لە بروسکەی هاوڕێ تۆمانۆڤ تێگەیشتووم کە زیا بەگ چ ئیشێکی بە من هەیە.لە سێیەم ڕۆژدا چاوم بە زیا بەگ کەوت ئەویش دوای ئەوەی خالید بەگی ناردبوو وتبووی دەبێ باوەڕی تەواو بەم نوێنەرەی پەرلمان بکرێت. داوای کردبوو هەر سێکیان وەربگرم واتە خالید بەگ و یوسف زیا و وەرگێڕەکەیان ئیسماعیل بەگ.**زیا بەگ بە کورتی** باسیکرد، **بەناوی کۆمیتەی کوردی** ئەستەمبوڵ **کە** لەگەڵ هاوڕێیان ئارالۆڤ و شاخۆڤسکی لەسەر یارمەتی دانی کوردان دواوە. گوایا هاوڕێ شاخۆڤسکی بەڵێنی پەنجا هەزار لیرەی بۆ خەرجی سەرەتایی و پاشان چل هەزار تفەنگ و پارەی تری پێ داوە، دەبوایە پەنجا هەزار لیرەکەی لە تیفلیس وەرگرتبا، بەڵام لەبەر ئەوەی کۆنسوڵی سۆڤیەتی لە تیفلیس هاوڕێ لڤۆڤیچ لەم بارەوە هیچ دەستوورێکی پێنەدراوە، بۆ داوایەکی ئاوا دەبێ پرس بەسەرەوە بکا. بۆ ئەوەی تورکەکان سەبارەت بە مانەوە و دواکەوتنی نەکەونە شك، بە باشتری زانی بڕوات و چاوڕێی وەڵام نەکات. ناوبراو بە منی وت کە ڕازییە بە پێی دەستووری کۆمیتەی کوردی ئەستەمبوڵ نوێنەرایەتی خۆی لە وتووێژەکان لەگەڵ نوێنەری سۆڤیەت بداتە سەرۆکی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم خالید بەگ، بۆ خۆی دەچێتە بەتلیس بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکێك کە ئەنجامەکەی پەیوەندی بە وەڵامی رووسیاوە هەیە.

**ناوبراو بۆیە هاتە لام تا:** ١- نوێنەرایەتی خۆی بداتە خالید بەگ. ٢- باشترە من تەواوی شتەکان بگەیەنمە مۆسکۆ و لەم بارەیەوە بە روونی وەڵام بە بەڵێ یا نەخێر وەربگرمەوە.

---

* مەبەست کۆمیتەی ئەرزەرۆمی کوردستانی باکوورە.

هەڵسوکەتی کوردەکان لە داهاتوودا بەم شتە بەستراوەتەوە، داوای کرد وەڵامەکە زیاتر لە (١٥) رۆژ درێژە نەکێشێت، ئەگەرنا دواکەوتنی بە مانای پەسەندنەکردنی داواکەیە.

دەرکەوتنی یوسف زیا بەگ لەسەر ئەم شانۆیە بۆ من شتێکی چاوەڕوان نەکراوبوو، وای لێکردم هەست وگریمانەم لەسەر دەوری راستەقینەی ناوبراو ببزوێ. ئەگەر بە راستی یوسف زیا لەگەڵ نوێنەرانی ئێمە پێك هاتووە و ناردوویانە بۆ پارە بۆ تفلیس، پاشان بۆ ئیش و کار لە رێگای ئەرزەڕۆمەوە نێردراوە بۆ بەتلیس، ئەوا بێگومان نوێنەری سۆڤیەت بایەخی ئەرزەڕۆمی لە کێشەی کورددا زانیوە، بە زیادی زانیوە لە رێگای ئەرزەڕۆمەوە ئاگادارم بکاتەوە. دەرفەتدانی وا مانای ئەوەیە فەرمانبەرانی خۆمان لە ئەنقەرە کە بە (کێشەی کوردەوە) خەریکن و لەوێ دانیشتوون بە باشی بیردەکەنەوە. وای لێهاتووە کە پێویستە بگوترێت هاتنی زیا بەگ وەك نێردراوێکی نهێنی، سیخورێکی ژیر و چالاکی دەوڵەتی تورکیایە.

ئەگەر کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم و کۆنسوڵی ئێمە فریویان بدەن، لەوانەیە رووسیا بتوانێ لەگەڵیان پیلانی ئۆپۆزسیۆنەکان هەڵوەشێنێتەوە. پیلانێکی زۆر ئەحمەقانە نییە، گومان دەکرێت ئۆپۆزسیۆن و خالید بەگیش بە پارێزەوە لەگەڵیان دابن. زیا بەگیان واپێناساندم کە دژی کەمالیستەکانە.

**هەڵوێستی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم لای من بەم چەشنەبوو:**

وا بۆ شەش مانگ دەچێ رووسیا وەڵامی داواکارییەکەی کۆمیتەی نەداوەتەوە، لەم کاتەدا هەڵوێستی نادیار و لە رۆژکی دەوڵەتی سلێمانی سەبارەت بە لێك نزیك بوونەوەی تورکیا و ئینگلیز، لام روون نییە، لە سەرتاسەری تورکیاش بەهێزبوونی ئۆپۆزسیۆن بەدی دەکرێ.پرۆپاگەندەی کۆمیتەی کوردی هەر لەسەر ئۆپۆزسیۆنە کە هەڵوێستیان بەرامبەر مافی چارەنووسی کوردستان مام ناوندییە.

بۆیە کۆمیتەی کوردی بەهاتنی کابرایەك لە ژێر ناوی نەجاتی ئۆپۆزسیۆنەکان دەستی بە رەپێش خستنی خالید بەگ کرد بۆ نوێنەرایەتی لە هەڵبژاردنی پەرلمانی تورکیا.

ئەو (بەرھەلستکارە) رایگەیاند لە نێوان ئەوان و کوردەکان جیاوازییەك نییە. بەڵام ھاتنی زیا بەگ لەگەڵ ڕەزا کازمی سەبارەت بە ڕێککەوتنامە لەگەڵ رووسیا، کۆمیتەی گەڕاندەوە بۆ بارودۆخی مانگی مارت. ئەویش نەك بۆ ماوەیەکی درێژ بەڵکو بۆ پانزە ڕۆژ.

زیا بەگ ئاماژەی بەوە کرد ئەگەر رووسیا لە ماوەی دیاریکراودا وەڵامیان نەداوەتەوە یاخود ئامادە نەبێت داخوازییەکانیان جێبەجێ بکات،کوردەکان «دەرگایەکی» تریان دیاریکردووە سەری پێدادەکەن. ئەگەر ناوبراو مەبەستی رواڵەت سازی نەبێ،پێموایە ئەم «دەرگایە» پارەی پەرلمانی تورکیایە. ئەگەر لەماوەی ئەم پانزە ڕۆژەشدا رووسیا داواکارییەکەیان جێبەجێ نەکا،دەست بە پرۆپاگەندەی پێش ھەڵبژاردن دەکەن. لام وایە ئەمە ھەڵوێستی کۆمیتەی ئەرزەرۆمە، ئەگەر یوسف زیا بەگ سیخوڕی دینی ئاڵی دوو روو نەبێ ئەوە ھەڵوێستی کۆمیتەی کوردی ئەستەمبوڵیش ھەروایە.

ھەر چۆنێك بێت ھەوڵ دەدەم کەسایەتی زیابەگ روون بکەمەوە و بیناسم. سەبارەت بەخەڵکی تورکیاش ئەوەیە: تا لەلایەکەوە تەنگەتاو نەبن چاوەڕێی ھیچ راپەڕینێکیان لێناکرێت[1].

---

(1) ھەمان سەرچاوە ل ٢١٦-٢١٨.

## راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە بایەزید

## هاوڕێ مالتسۆف

۱۹۲۳/٥/۲۹

### بزووتنەوەی کورد

لە راپۆرتی پێشوودا نووسیبووم لەناو کورداندا هەندێ دڵ ساردی و نائومێد بوون لە ئینگلیزەکان، بەدی دەکرێت. لەوانەیە نەیانەوێ لە ژێر سەرکردایەتی ئینگلیزەکاندا کار بکەن. لەوەتەی ئینگلیز و تورك کەوتوونە مامەڵەی سیاسی گۆڕانکاری لەهەڵسوکەوتیاندا دەبینرێ. گەرچی بەپێی ئەو راپۆرتانەی لە باشووری کوردستانەوە دەگەن،هێشتا ئەو ناوچەیە وەك رابردوو پڕە لە ئەجینداکانی ئینگلیز و ماوەیەکی زۆریشە ئینگلیزو تورك لە جێی خۆیان بێ جموجوڵ وەستاون و لە هیچ لایەك چالاکی بەدی ناکرێ. دیارە هۆیەکەی دەست پێکردنەوەی کاروباری کۆنفراسی لۆزانە و چاوەڕێ دەکەن بە رێگای دیبلۆماسی کێشەی موسڵ و کوردستان، چارەسەربکەن. هەر وەك وتم ئەم ئارام بوونەوەیە پێش بە زیادکردنی سیخورەکانی ئینگلیز ناگرێ وهەر بەردەوامن، بەپێی ئەو راپۆرتەی لە (وان)ەوە هاتوو رۆژ نییە تورك سوکایەتی بە ئەجینداکانی ئینگلیز نەکەن.

لەبەر نەبوونی زانیاری لەسەر بارودۆخی سیاسی نێونەتەوەیی، نازانم ئینگلیزەکان ئێستا چ رێبازێکیان گرتۆ تەبەر، تەنیا دەتوانم بەپێی ئەو هەواڵانەی لێرە بەدەستمان دەگات بۆچوونی خۆم دەربڕم. بەپێی ئەو هەواڵانە، بزووتنەوەی کورد پێی ناوەتە قۆناغی پەرەسەندنی خۆی. ئێمە ئێستا ناتوانین وەك زستان چاوەڕێی راپەڕینی کوردان بین،چونکە: یەکەم ئینگلیزەکان وەك جاران لەسەر ئەم کێشەیە پێداناگرن. دووهەم لەناو کوردەکانیشدا دووبەرەکی بەرچاودەکەوێت، لەسەر ئەوەی ئایا لە ژێر ئالای ئینگلیزەکان دەست بەکاربن یاخود چاوەڕێی هەلومەرجێکی لەبارتر بکەن تا بەبێ یارمەتی ئینگلیزەکان بتوانن ئەرکی خۆیان جێ بەجێ بکەن.

دەکرێ بڵێین: بە گشتی کەش و هەوای جیابوونەوە لە تورکیا لەناو کوردەکان هەر بەردەوامە کەچی بە پێچەوانەوە زۆرجار هەڵەکانیان دەبێتە هۆی تێك هەڵچوون و تورکەکانیش بەبێ زەحمەت سەرکوتیان دەکەن و بزووتنەوەکە بێ هێز دەبێت.

تێکهەڵچوون کاتێك روودەدا کە تورکان خەریکی سەربازگیری یا چەکدارکردنی کوردەکان بن. یەکێك لەوتێك هەڵچوونانە ئاسەوارێکی خراپی بۆ کوردان بە دواوە بوو، وەك رۆن بەسەر ئاگردا بکەیت، ئەویش ئەو ئاگرەی لە کوردستان کراوەتەوە. لە رۆژانی یەکەمی مانگی نیسان (لەنێوان دیاربەکر و بەتلیس) تورکەکان دەیانویست لەناوچەی سیلوان لەناو کوردەکان سەربازبگرن. بوو بەهۆی نارەزایەکی زۆر و بەرهەڵستکاری کوردەکان، ئینجا تورکەکان بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کوردەکانیان گەمارۆداو ناچاریان کردن تەسلیم بن، ژمارەیان دوانزە هەزار نەفەر دەبوون، لەناو کوردە گیراوەکاندا ١٥ شێخ کە شێخەکانی دەرسیم، دیاربەکر و دوانزە ئاباگایان تێدایە. ئەوانە بۆ هەموو لەوێ کۆبوونەتەوە؟ لای من روون نییە، دوورنییە بۆ کۆنگرە یا شتێکی لەم بابەتە،کۆبووبنەوە. بەبێ هۆ زەحمەتە شێخەکانی ئابگین رێگایەکی وادوور ببڕن. بەپێی هەواڵێکی تر گوایا سمکۆ لەگەڵ چوار سەدسوار کە نێردرابوونە باش قەلا، بەدەستی تورکەکان گیراون.

شەوکەت بەگ نوێنەری پەرلمانی تورکیا ئەم هەواڵە بەراست دادەنێ. ناوبراو وتی سمکۆ رویشتووە بۆ ئەنقەرە تا داوای لێبوردن لە دەوڵەتی تورك بکات، دوورنییە بۆ خۆی نەچوویێت و بە زۆر ناردبیتیان. دەنگۆیە کە شێخ مەحموودیش لەگەڵ سمکۆ گیراوە، گوایا بۆ چاو پێکەوتنی سمکۆ و وکۆبوونەوە، هاتۆتە رەواندز.

بەڵام من باوەڕم ناکەم شێخ مەحموود هێندە ساکار بێ بڕوا بۆ شوێنێك تورکی لێبێ. دوورنییە تورکەکان شێخ مەحموود ناوێکیان گرتبێت نەك شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان.

ئەگەر کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردی بتوانێ کوردان لە ئینگلیز دابڕێت، هەڵویستی ئێمە بەرامبەر بزووتنەوەی کورد لە داهاتوویەکی نزیکدا دەردەکەوێت.دەڵێین لە داهاتوودا چونکە هێشتا بەڵگەی ئەوتۆمان بەدەستەوە نییە.

دیارە تورکان پێگەیان لە باشووری کوردستان پتەوە و لەبەرەی پشتەوەش بەهێزن، دەنا نەیاندەتوانی ئاوا بێرەحمانە بجوولێنەوە و پانزە هەزار نەفەر کورد لەگەڵ ٤٥ شێخ بەدیل بگرن. ئەم توانایە دەگەڕێتەوە بۆ: یەکەم سوپاکەیان لەوێ زۆرە، تائەو جێگەیەی من ئاگادارم دوو لەشکریان لە خەتی سیلوان و رەواندز جێگیربوونە و توپخانەیەکی گەورەشیان لەگەڵە. جگە لەم دوو لەشکرە هێزی تر لەوێ هەن کە نازانم تورکەکان رێگەیان داون ئازادانە بجولێنەوە، دەستبەکاربن و زۆرگوێ

نەدەنە کوردەکان. بێ دەنگی ئینگلیزەکان بێگومان بۆتە هۆی دڵنیایی تورکەکان و ئێستا دەرفەتیان پێدەدەن دژی کوردەکان بجەنگن و لاوازیان بکەن.

بەرەی ئینگلیزەکان(٦٠) فەرسەخ لە رەواندز دوورە، بەڵام لە هەندێ جێگەدا سێ سەعات لەبەرەی تورکیا نزیك دەبێتەوە.

ئەگەر گیرانی سمکۆ راست بێت، هەر چۆنێك بێ (من باسی شێخ مەحموود ناکەم) سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ تورك. لەراستیدا تا ئەو جێگایەی من سمکۆ بناسم دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم ئەگەر تورك بشیبەخشن و ئازاد بێت،دەست لە کاری خۆی هەڵناگرێت. زۆر زەحمەتە تورکەکان بە عەفوکراویش بهێڵن بگەڕێتەوە کوردستان چونکە لە هەموو کەس باشتر دەیناسن. پێموایە هەوڵ دەدەن لە شوێنکی دووردەست بیشارنەوە تا دەرفەتی گەڕانەوی بۆ کوردستان نەبێ، ئەوان بەدەستی خۆیان پریشك فڕێنادەنە ناو ئەنباری باروت. بۆ بزووتنەوەی کورد لە دەستدانی سمکۆ (ئەگەر راست بێت) زیانێکی قەرەبوو نەکراوەیە. ئەم سەکردە بلیمەت و لێهاتووە لە هەموو کەس پتر بزووتنەوەی کوردی چالاك کردووە. بەڵام سمکۆ، چەندجار مردووە ئەوەندەش زیندووبۆتەوە.جێی باوەڕنییە تورك گرتبێتیان، بەلامەوە سەیر نییە ئەمجارەش هەواڵی گیرانی سمکۆ وەك هەواڵکانی پێشوو سەبارەت بە مردنی، درۆ دەرچێت(1).

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢١٢-٢٢١.

## کوردەکانی ماکۆ (ئایاری١٩٢٣)

چالاکییەکانی سمکۆ و سەید تەها لەناو کوردەکانی ماکۆدا، لەبەر زۆری سوپای ئێران لەناوچە سەر سنوورییەکان زۆر دژواربووە، چونکە پێیان گوتوون بە تایبەتی ئاگاداری جموجۆڵی سمکۆ و سەید تەها بن و بێ بەزەییانە لەگەڵیان بجوڵێنەوە و پێش بە سەرهەڵدانی هەر بزووتنەوەیەکی کورد بگرن.

بەڵام بەرهەمێکی بەرچاوی پێوەدیار نییە. بە پێی ئەو هەواڵانەی لە (خویە)وە گەیشتوون کە ناوەندێکی سەربازییە، ڕۆیشتنی کەلەب عەلی خان بۆ ورمێ لە کۆتایی (شوبات) بەمەبەستی ئەوە بوو لەو ناوچەیە، خۆئامادەکردنی کوردەکان بۆ ڕاپەڕین، ئاشکرا بکات، بەپێی پلانێك کوردەکان دەیانەوێت بەنهێنی هێرش بکەنە سەر سەربازگەی ورمێ و هەموویان لەناو بەرن. بەڵام بەهۆی هەواڵی یەکێك لە سیخوڕەکانی دەوڵەت، نیازی کوردەکان ئاشکرا دەبێت و کەلەب عەلی خانیش بۆ پێشگیری لەم پیلانە هەنگاوی پێویست هەڵدەگرێ و بە وردی لێکۆڵینەوە و هەواڵی پێویستی لەم بارەوە کۆدەکاتەوە. سەرەنجام سەرکردەکانی ئەم پلانە هەموویان دەگیرێن و ڕەوانەی ورمێیان دەکەن و لەوێش لە سێدارەیان دەدەن. کوردەکانی ماکۆ لە مانگی مارتدا چالاکیان نەنواند، بەپێچەوانەوە لەگەڵ هەندێك گوشاری فەرماندەی هێزەکانی فارس مودارایان کرد کە داوای بارمتە یا دیلی لێدەکردن. سەرەنجام میلانییەکان ناچار بوون دە کەسیان بەبارمتە بدەنێ و جەلالییەکانیش ماوەیەکی زۆر ئامادەنەبوون بچنە ژێر بار. بەڵام دوای سەردانی سوڵتان حەسەن خان (کە دوو ڕۆژ لای خالیدی ئاغا مابووەوە) ئەوانیش چوار کەسیان پێدان کە لە عەشیرەتی خۆیان نەبوون، بەڵکو لە بەلیخانلوەکان بوون لەگەڵ ئەم چوار کەسە کوردە بیست و پێنج عەجەمیش کە قولی خانی شوجاعولدەولە پێیدابوون، لە ناوەندی مارتدا نێردران بۆ ئەردەویل بۆ لای فەرماندەی لەشکر عەبدوڵڵا خان.

## ورمێ: تێپەڕبوونی دەستە چەکدارەکانی تورك بەناو خاکی فارسدا

دەستە چەکدارەکانی تورك کە ژمارەیان حەوت سەد سەرباز و پاشماوەی ئەو هێزەی تورکیا بوون کە لە ناوچەی ڕەواندز بە دەست سەید تەها تێکشکێنران، دێنە شنۆ و لەوێ چەکەکانی خۆیان تەسلیمی فەرماندەی پادگانی ناوچەی سەڵماس کەلەب عەلی خان دەکەن و لە ژێر پارێزگاری قەزاقەکانی فارس بەرەو دیلمان و لەوێشەوە بەرەو باش قەڵا بۆ ناو خاکی تورکیا وەڕێ دەکەون. ڕۆژی ٣ی نیسانیش هێزێك بە سەرۆکایەتی ئۆزدەمیر پاشا بەرەو ورمێ بەڕێ کەوتووە.

## ناردنی سوپا بۆ ناوچەکانی شنۆ و لاجان

ناردنی ئەو هێزەی تاران بۆ ئەو ناوچانە لەبەر ڕووداوەکانی ڕەواندز بوو. فەرماندەی لەشکری فارس عەبدوڵڵا خان بەپەلە دەوری (خوی) و سابڵاغی داوەتەوە تاگەیشتووەتە ئێرە(1).

## وتووێژ لەگەڵ سمکۆ

٢٧ی نیسان قائیمقامی ورمێ حاجی ستیوەت لە قوتورەوە گەڕاوەتەوە ورمێ، لە قوتور ناوبراو لەگەڵ کەلەب عەلی خان دوو ڕۆژ لەگەڵ سمکۆ سەبارەت بە گەڕانەوەی بۆ ئێران وتووێژیان کردووە. بەڵام وتووێژەکان بێ ئەنجام بوون.

سمکۆ داوای کردووە بگەڕێتەوە بۆ چاریق قەڵای، بەڵام فارسەکان پێشنیاری دەرەوەی کوردستانیان پێکردووە،لەهەمانکاتدا سمکۆ لەگەڵ تورکەکان سەبارەت بەگەڕانەوەی سەروەت وسامانەکەی و خسرەوی کوڕی خەریکی وتووێژە. تورکەکان ئامادەن، بەمەرجێك سمکۆ خۆی بێتە وان. سمکۆش ئامادە نییە، ئێستا لای خەزورییەتی (عوسمان بەگ) لە قەزای مەشحوری.

ئەمیر لەشکر، سەردار ڕەشیدی شکاندووە، لە ڕەوانسەر لەماڵەکەیدا بارەگای خۆی داناوە، دوو هەزار سەربازی لەگەڵ عەشیرەتی کەڵهوڕ و کولیایی ناردەسەر سەردار ڕەشید و بەبێ تەقەقە

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٢٢.

گوندەکەی گرت، بەهەڕەشەی تیرباران دەستیکرد بە تالآن و رووتکردنەوی خەڵك. لە یەکێك لە لە خانەدانەکان بەناوی بەهرام ئەمیر سی هەزار تمەنی وەرگرتووە.

سەربازەکانی جووتیاران رووت دەکەن. دوای تێکشکانی سەردار رەشید، لەکاتی گەڕانەوەی سنجابیەکان بۆ هاوینە هەوارەکانی میزۆپۆتامیا ئەمیر لەشکر ئەوانیشی تالآن وسەرکوتکرد. ئەو عەشایرانەی لەگەڵی بوون ئەوانیشی فێری تالآن وبڕۆ کرد،هەر ئەوان یانزە گوندی سەنجابییەکانیان سووتاند. هاوکارەکەی ئەمیر لەشکر واتا ئەمیر مەخسوس پێنج سەد بنەماڵەی سەنجابییەکانی وەك دەسکەوتی شەڕ خستە ژێرکۆنترۆڵی خۆی.کەڵهوڕی و هێزەکانی سەربازی بەناوی "پێداویستی" مالیاتێکی زۆریان خستۆتە سەر شانی گوندەکانی عەشیرەتی سەنجابی. ئەمیر لەشکر داوای لە سەردار مەقتەدیرگەورەی سەنجابیەکان کرد بێتە لای بۆ ستادی سەحرایی. ئەویش لەگەڵ سەد و پەنجا سوار دەچێتە لای، بەڵام ئەمیر لەشکر لەوێ چەکیان دەکاو دەیانگرێ ئینجا ناوبراو ناچار دەکا نامە بۆ براکەی سالار زەفەر بنووسێت کە بێت بۆ لای، سالار زەفەر دێت و دەست بەجێ ئەویش دەگرن.

تالآن و سەرکوتکردنی عەشیرەتەکان لە لایەن سەربازانی دەوڵەتی فارس وا لەخەڵکەکە دەکا لەدژیان یەکبگرن. لەبەر ئەوە سەردار رەشید تا٨ی‌نیسان توانیویەتی لە چیایەکانی شاهۆ هێزێکی چوار هەزار سواری کۆبکاتەوە. لە کوردستانی تورکیاش عەشیرەتەکانی کورد (مەبەست لە کوردستانی تورکیا کوردستانی ئیمڕۆی عێراقە) هەڵوێستی دژ بە دەسەڵاتی ئێرانیان وەرگرتووە، تائێستا پێنج سەرۆك عەشیرەتی هەورامان ئامادەیی خۆیان دەربڕیوە بچنە ریزی هێزەکانی سەردار رەشید، ئەمیر لەشکریش بەرەو شار پاشەکشەی کردووە[1].

## بزووتنەوی سەید تەها

سەید تەها بەرەو قەزای شەمزینان رۆیشتووە، نەرونەوچەی گرتووە.لەبەر ئەوە سوپاییانی تورك هاتوونەتە قەزای دیگیوەرو دیزە. سەید تەها پێنج فەرسەخ لە باکووری رەواندز دوورە. لەگەڵ

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٢٢-٢٢٣.

فەرماندەی هێزەکانی ئینگلیز لە ڕەواندز لەسەر یارمەتی وەرگرتن بۆ گرتنەوەی دووبارەی شەمزینان خەریکی وتووێژە.

## پێشڕەوی هێزی چەکداری تورك بۆ نەرو ونەوچە

لە ١٣ی مانگی نیسان هێزێکی چەکداری پێنج هەزار کەسی تورك لە قەزای گەوەڕ بەرەو قەزای شەمزینان پێشڕەویان کرد و نەرونەوچەیان گرت. تورکەکان برای سەید تەها شێخ موسایان لەو ناوچەدا کردۆتە قائیمقام.

## هێزەکانی ئینگلیز لە ڕەواندز

بەپێی ستادی سوپای فارس، هێزەکانی ئینگلیز بەم چەشنەی خوارەوەیە:

١- ٢٥٠٠ سەرباز.

٢- ٢ تۆپ.

٣- ٨ رەشاش.

٤- ٣ فڕۆکە.

جگە لەهێزی کورد و ئاشووری(2).

---

(2) هەمان سەرچاوە ل ٢٢٤.

## نهێنی ژماره ٢٣٧

# راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم

# پاڤلوڤسکی

١٩٢٣/٦/١٠

### کێشەی کورد

کەسایەتی یوسف بەگ و دەوری لە کێشەی کورددا، سەرەتا لای من زۆر جێگای گومان و دوو دڵی بوو. تا لەبارەی ناوبراو لە ئەنقەرە پرسیارم کردوو وەڵامەکەم وەرگرتەوە، وادەرکەوت کە ئەو زانیارییانەی بە من دراون و لە راپۆرتەکەی ١١ی نیساندا لەسەر زیا بەگ نوسیبوومن، راستن. زیا بەگ پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێیان ئارالۆف و شاخۆڤسکی هەبووە بە قسەی زیا ئەم هاوڕێیانە بەتایبەتی شاخوڤسکی وتوویەتی لە مۆسکۆوە دەسەڵاتی تەواوی پێدراوە لەگەڵ کۆمیتەی کوردی ئەستەمبوڵ وتووێژ بکات. ناوبراو بەڵێنی یارمەتی بە (زیا بەگ) داوە: سەرەتا پەنجا هەزار لیرە پاشان چل هەزار تفەنگ و پارەی تریش. زیا ئاماژەیەکی بەوەکرد لەگەڵ ئەو یارمەیتەی سەرەوە پێشنیاری چوار تا پێنج هەزار لیرەشیان بۆ خۆی کردووە کە ناوبراو پەسندی نەکردووە وتوویە من بۆ خۆم پێویستم بە پارە نییە تەنیا بۆ ئەو کەسایەتیانەم دەوێ کە دەور دەبینن، ئەویش لەو یارمەتییەی بەڵێنی پێدراوە، ئێستا دەبینێت درۆیان لەگەڵ کردووە. (یەکەمجار دەیوست پەنجا هەزار لیرەی لە ئەستەمبوڵ پێبدەن و ناردبوویان بۆ ئەوێ کە وەریگرێت، بەڵام هیچی پێنەدرابوو)بۆ جاریدووەم لە تفلیس لەگەڵ سەرۆکی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم داوای لێکردم (کۆمیتەکانی ئەرزەڕۆم و ئەستەمبوڵ لە رێکخراوی کۆمیتەی ئەستامبوڵدا یەکیان گرتووە) بۆی روون بکەمەوە ئایا بەڵێنی وتووێژ و یارمەتی لە لایەن نوێنەری دەوڵەتی سۆڤیەتەوە-شاخۆڤسکی- لەگەڵ نوێنەری کوردەکان هەبووە یان نا؟ تکایە لە رێگای منەوە بەتەواوی روونی بکەنەوە. بۆ ئەم مەبەستە داوایان لێکردم لە ئەنقەرە و مۆسکۆ بپرسم چاوەڕێ ئەم یارمەتییە بکەن یان نا؟ وتیشیان وەڵامی نێگەتیڤ مانای پوچەڵی ئەو وتووێژانەیە کە

لەگەڵ ئارالۆڤ و شاخۆڤسکی کردوویانە و دیارە بە ئەنقەست و گاڵتە پێکردن بووە، تەنانەت بێ حورمەتییە بەو کەسانەی بیروڕای «کوردستانێکی سەربەخۆ» و هەوڵدان بۆ گەیشتن بەو ئامانجەیان لا پیرۆزترین ئەرکە.

لە وەڵامی پرسیارەکەی من لە مۆسکۆ سەبارەت بە کەسایەتی یوسف زیا و دەوری لە کێشەی کورددا کە ئایا بە راستی ئەو یارمەتییەی بەڵێن بە کۆمیتەی کوردی دراوە راستە یان هەر ئەوەیە کە یوسف زیا باسی دەکات؟ بە بروسکە وەڵامیان دامەوە کە ئێمە دەتوانین تەنیا پێنج هەزار لیرە بە خودی (زیا) بدەین. لە راپۆرتەکەدا نووسیبووم زیا بەگ بایەخ بە یارمەتی وکەسایەتی خۆی نادات. وەڵام نەدرایەوە.

بەم چەشنە تا ئێستا تێنەگەیشتم بەڵێنی کام یارمەتی بە یوسف زیا دراوە.

بەپێی ئەو وتانە سەبارەت بە کێشەی کورد وادیارە بەڵێنی ئەو یارمەتییەی هاوڕێ ئارالۆف و شاخوڤسکی بە بزووتنەوەی کورد (زیا بەگ) یان داوە تەنیا ناوەڕۆکێکی ئەکادیمی هەبووە. پاشان دەرکەوت، وتووێژێکی ئەکادمیانەبووە. بە وتەی (زیا بەگ)ئەو پەنجا هەزار لیرە و چل هەزار تفەنگە ئەگەر راستیش بێت ئەو ئیش و کارە جیدیەی لە کوردستان پێ راناپەڕێ. لەبەر ئەوە نابێ وا بیربکرێتەوە کوردەکان ئەوەندە یارمەتییەیان بەسە. لە وتەکانی (یوسف زیا بەگ)دا دەرکەوت ئەم یارمەتییە لای ئەوان وەك سەرەتایەکە. لە لایەکی ترەوە تەنیا مەرج یا هۆیەك کەوا کوردەکان دایان ناوە (بە قسەی خودی زیا) ئەوەیە: دوژمنی رووسیا دوژمنی کوردانیشە، واتە شتێکی کتوپڕ نییە (هەروا پەنامان بۆ رووسیا هێنابێت).

**ئەنجامی پێکنەهاتنی وتووێژێکی وەها بەم چەشنەیە:**

زیا وتووێژ لەگەڵ هاوڕێیان ئارالۆڤ و شاخۆڤسکی بە مەبدەئی دانانێ، بەڵکو بە لایەوە سوکایەتیە بە خۆی و بە کۆمیتەی کوردی کە ئەوی کردۆتە نوێنەر بۆ وتووێژ لەگەڵ رووسیا. یوسف زیا هەر لە تیفلیس هەستی کردبوو ئەو بەڵێنانە درۆن. کاتێك لیرە من ویستم پێنج هەزار لیرە بدەم بە خۆی، وادیاربوو بە تەواوی لێمان بێ ئومێد بووە، تەنانەت گوێی نەدایە وتەکانی تر و رۆیشت.

## کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردی

لەو دەمەوە کە یوسف زیا هاتۆتە ئێرە ئەوان بە تەواوی سەرکردایەتی هەڵسوکەوتی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم دەکەن، خالید بەگ تا ئێستا زۆر سەبری گرتبوو، (۷) مانگ چاوەڕێی وەڵامی مۆسکۆی کرد لەمەڕ پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ لە ژێر حیمایەی رووسیای سۆڤیەتی. بەهاتنی زیا و سەرنەگرتنی وتووێژەکانی لەگەڵ ئێمە خالد بەگیش بریارێدا چیتر هیچ داوایەك نەکا و بەیەکجاری پەیوەندییەکانی لەگەڵمان ببڕێت. سەرەڕای وەڵامی ئەنقەرە بۆ (زیا) من زۆر هەوڵمدا پەیوەندیمان نەپچڕێ.

لەمەڕ ئەو شتانەی باسکرا، خالید بەگ بە تەواوی لەسەر پەیوەندی هەمیشەیی لەگەڵ یوسف زیا پێکهاتوون. واتە پەیوەندی نێوان دوو کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم وئەستەمبوڵ. بڕیاریان داوە ئیسماعیل بەگ (کە پێشتر بۆ پەیوەندی گرتن وەك وەرگێر لەگەڵ من کەڵکیان وەردەگرت) بنێرن بۆ (ترابزون) تا لە نزیکەوە پەیوەندی ئەو دوو کۆمیتەیە رێکبخا.

دەبێ زۆر بە وردی رێبازی ئەو دوو کەسایەتییە بەوەفایەی ئێمە و ژمارەیەك لە ئەندامانی ئەو کۆمیتانەی دۆستی ئێمەن و ئێستا نێردراون بۆ شارەکانی تر لە پێش چاو بگرین و پەیوەندیان پێوەبکەین. من ئێستا زانیاری باشم لەسەر کێشەی کورد نییەو لە کاتی خۆیدا پێم ناگات. بۆ نموونە مانگی رابردوو من دەنگوباسی ناراستم لەسەر بزووتنەوەی کورد بۆ هاتووە. تەنیا ئەوەندە دەزانم خالید بەگ سەرەڕای ئەوەی تورکەکان بە دوایەوەن بیگرن سێ کادیری (پەیوەندیکەر)ی ئەویان لەگەڵ ئێمە گرتووە،کەچی پەیوەندی لەگەڵ کوردستاندا هەر بەردەوامە. هەموو رۆژێك کوردەکان بەتایبەتی جووتیارەکان لە ناوچەکانی کوردستانەوە دێن بۆ لای بۆ ئەرزەڕۆم و لەگەڵ هەموویان بەجیاجیا وتووێژ دەکات.

دەربڕینی راوبۆچوون سەبارەت بەبارودۆخی کوردستان چ باکوور و چ باشوور زۆر زەحمەتە. رەواندز کە لەم دواییانەدا بۆ ئاڵوگۆڕی بروسکە و دەنگوباسی نێوان کۆنسوڵەکان و ئەنقەرە بە کەڵك بوو، لەسەرەتای مانگی مارتەوە لە لایەن کوردەکانەوە گیراوە.

بەپێی ئەو بروسکەیەی کە لە ۱۸ی مانگی مارتدا بە ئەنقەرە گەیشتووە هێزەکانی تورکیا کە لە رەواندز نزیکەی پێنج سەد کەس بوون، بەشێکیان کوژراوە و بەشێکی تریان بە دیل گیراون.

سمکۆ سەرکردایەتی ئەم شەڕەی کردووە، بەپێیی ئەم زانیاریانەی مـن، دوای ئەمە ڕەواندز نەکەوتۆتەوە دەست تورکان. چاوەڕێ دەکرێ بەهارێ جموجوڵیتورکان دەست پێبکـا، بەشـێکی لەشکری نۆ و تیپی پیادەی ٧٢ی ئەرزەرۆم دەستووریان پێیدراوە کە بڕۆن بۆ بەرەی ڕۆژهەڵات. دیارەجێبەجێ کردنی هەرچی زورتری ئەو دەستوورە پتر لەبەر گیرانی ڕەواندزە کە سـێ مـانگ لەمەو بەر لە لایەن کوردەکانەوە گیراوە[1].

## پەیمانی ئینگلیز- فارس

## سەبارەت بە خەباتی هاوبەشیان دژی عەشایرەکانی کورد

### حوزەیرانی ١٩٢٣

١٤ی مانگی حوزەیران ١٥ی فڕۆکەی ئینگلیز بەبیانووی دەسگیر کردن و سەرکوت کردنی شێخ مەحموود کە لە لای عەشایری دزلییە، ئەم گوندەیان بۆمبـاران کـرد. دزلی سـەد فرسـەخ لـە سنەوە دوورە. هێزەکانی سەردار ڕەشید و هاوپەیمانەکانیشی لەوێن. لە پەیمانی نێوان ئینگلیز و دەوڵەتی فارس هێزەکانی تاران لەگەڵ هێزی ئینگلیزدا بەشداری شەڕ بوون و هێزێکی دەوڵەتی فارس بە سەرۆکایەتی گیگۆ (کە ئەرمەنییە) بە دوو تـۆپ بەشـداری شـەڕی کـردووە و چـوار گوندیشیان سووتاندوە[2].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٢٥-٢٢٧.

(2) هەمان سەرچاوە ٢٢٣.

**ڕۆژنامەی ئیزڤیستیا ١٩٢٣/٧/١٢**

## زوڵم و زۆری ئینگلیز لە کوردستان

کۆمسیاری گەل بۆ کاروباری دەرەوە (وەزارەتی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت)ی لە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٢٣ کۆپی ئەم تلگرافەی خوارەوەی پێگەیشتووە کە لە ١٥ی مانگی حوزەیرانی ١٩٢٣ نووسراوە.

**سەرۆك وەزیرانی فارس**

وێنەیەکی بۆ نوێنەرانی ئەمەریکا، تورکیا، ئیتاڵیا، رووسیا، فەڕەنسا. لە جەنگی جیهانییەوە ئێمە دانیشتوانی باشووری کوردستان بەردەوام داوای ناساندنی مافی نەتەوەیی خۆمان لە ئینگلیزەکان کردووە.

بەڵام لەشکر و فڕۆکەکانی ئینگلیز وڵاتەکەمان وێران دەکەن و خەڵك دەکوژن. ئینگلیزەکان مافی ئەوەمان پێنادەن دەنگی ناڕەزایەتی و شکایەتی خۆمان بەرزبکەینەوە. لە (١٩٢٢)وەوە ئینگلیزەکان بە یارمەتی هێزی سوپایی هەموو هەوڵێکی خۆیان وەگەڕخستووە باشووری کوردستان بخەنە سەر عەرەبستان. ( تێکستی دوایی بروسکەکە ناخوێندرێتەوە)

دوای چۆڵکردن و رووت کردنەوەی کوردستان، ئینگلیزەکان دان بە هیچ مافێکی کلتووری کورددا نانێن. بە هەستی مرۆڤ دۆستی داوا دەکەین دەستەیەکی بێ لایەن بنێرن تا لە نزیکەوە زوڵم و زۆرو وێرانکاری ئینگلیزەکان ببینن.

حوکمداری باشووری کوردستان مەحموود -شارداری سلێمانی سەید کەریم- بە ناوی بەگزادەکانەوە، بابان بەگی بانی رەزا سەرۆك عەشیرەتی هەمەوەند، عەبدولکریم سەرۆکی سەیدەکانی قەرەداغ. سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر حاجی رەسوڵ، عەلی ئاغا زادە، مەحموود ئاغا، رەسوڵ ئاغا زادە، ئەحمەد ئەمین بەگزادە، ئەحمەد موڕەخەس لە باشووری کوردستان، دەستەی نوێنەرایەتی رەواندز حیسامەددین ئەحمەد محێدین، ناودارانی سلێمانی ئەحمەد پاشازادە، عەبدولڕەحمان موفتی زادە، مەحمەد سادق بەرزنجی، سەید حوسێن، رەسوڵ زادە، سەید نوری سەرۆکی عەشیرەتی مەندومی، فەتاح سەرۆك عەشیرەتی ئیسماعیل حەسەن، جێگری سەرۆکی رانیە عەبدوڵڵا[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٣٢.

# نامەی نوێنەری دەوڵەتی سۆڤیەت

# لە ئەنقەرە بۆ کۆنسوڵی سۆڤیەت لە قارس

١٩٢٣/٧/١٩

بۆ ئاگاداریتان ئەو زانیاریانەی سەبارەت بە بارودۆخی باشووری کوردستان لامان هەیە پێتان ڕادەگەیەنین.

لە ئەنجامی وتووێژەکانی دەستەی نوێنەرایەتی شێخ مەحموود کە هاتۆتە ئەنقەرە یەکێك لە ئەندامانی ئەو دەستەیە بەناوی ڕەفیق گەڕاوەتەوە کوردستان.

کۆمیسۆنێکی ئەفسەری تورکی بۆ لێکۆڵینەوەی کێشەکان لە جێی ئەو نێردراوە بۆ کوردستان. بێ شك شێخ مەحموود بەرەو سیاسەتی تورکیا دەڕوات. بەڵام سەرچاوەیەك هەیە کە بناغەی ڕاستی ئەم هەواڵە دەگەیەنێت و دەبێ لە پێش چاوبگیرێت، ئەویش ڕۆژنامەیەکی ئینگلیزە کە دەڵێ شێخ مەحموود لە سەرکەوتن نائومێد بووە و ڕایگەیاندووە تەسلیم بێت و ئینگلیزیش ئامادەیی خۆی دەربڕیووە کە لێی ببورێ، بەڵام بەو مەرجەی بە یەکجاری وازبێنێ و بۆ هەمیشە بێتە بەغدا. دیارە لەبەر ئەو هەنگاوانەی هێزەکانی ئینگلیزە دژی ڕەواندز، ڕێگای شەڕ پێش هێرشی هێزەکانی عەرەب لە لایەن تورکەکانەوە پاككرایەوە. شێخ مەحموود کە پلە و پایەیێکی نەمابوو لە سایەی زێڕ و پارەی ئینگلیزەکانەوە ناوی دەرکرد. پاشان هەموو لێی دورکەوتنەوە و ناچاربوو ڕابکاو دواتر لەگەڵ ئینگلیزەکان کەوتە وتووێژ. ئەنجامی وتووێژەکان دیارنییە، سەید تەها کراوە بە فەرمانداری ڕەواندز، پێدەچێ سمکۆش لەگەڵ تورکەکان پەیوەندی بەستبێ، بەڵام جارێ ڕوون نییە.شێخ مەحموود وەدووی پشتیوانی ڕووسیای سۆڤیەتی کەوتووە و داوای یارمەتی لێدەکات. بەپێی ئەو هەواڵانەی گەیشتوون دەکرێ بڵێن پێگەی ئینگلیزەکان لەناوچەی موسڵ پتەوە، دوور نییە لە کۆنفرانسی لۆزان لەسەر کێشەی کورد لەگەڵ تورکەکان تووشی گیرو گرفت ببن. بەڵام ئاگامان لە بارودۆخی کوردستانی باشوور نییە.

لەبەر ئەوەی نوێنەرایەتی دەوڵەتی سۆڤیەتی لە کاتی خۆییدا سەبارەت بەو کەسانەی هاتوونە لاتان ئێوەی ئاگادار نەکردۆتەوە لە پاراستنی ڕەمزەکانمان دڵنیا نەبووین و پێمان وانەبوو بتوانین لەمبارەوە پەیوەندیتان پێوە بکەین. دووپاتی دەکەینەوە: پێویستە بە وردی ئاگاداری ڕووداوەکانی کوردستان بین و جارێ خۆمان لە دەست تێوەردانی چالاکانە لە کێشەی کورد بپارێزین[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٢٣.

## راپۆرتی کۆنسوڵی ئەرزەڕۆم- هاوڕێ پاڤلۆڤسکی

١٩٢٣/٧/٢٦

### کێشەی کورد

بزووتنەوەی (سەربەخۆیی بۆ کوردستان)کە لە کاتی دامەزراندنی دەوڵەتی کەمالەوە سەری هەڵداوە لە زمانی کوردەکانی ئێرە بەم چەشنەی خوارەوەیە:

لە ساڵی ١٩١٨ کاتێك لە ئەنادۆڵ بزووتنەوەی شۆڕشگێری دەستی پێکرد بەشێك لە شۆڕشگێرانی کورد بە مەرجی دان پیانانی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان چوونە ریزی ئەم بزووتنەوەیە، بەڵام دوای ئەوەی ئەم بزووتنەوە شۆڕشگێڕیە لە تورکیا شێوازێکی دیکتاتۆری میلیتاری کەمالی بە خۆوە گرت، کوردەکان بۆ چارەسەری کێشەی کورد هیوایان بەو دەوڵەتە نەما. بۆیە لە کۆنگرەی ئەرزەڕۆم کە سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد و رۆشنبیران تێیدا بەشداربوون، بڕیاردرا هاوکاری ئەو شۆڕشگێرە تورکانە بکرێت کە لە کەمال جیابوونەتەوە، لە تورکیا هەوڵی کودەتا بدرێ بە مەبەستی هێنانەدی سیستەمێکی دیموکراتی راستەقینە واتە حوکومەتی گەل.

ئۆپۆزیسیۆنیش هەریەك بە نۆرە خۆی بەڵێنی سەربەخۆیان بە کوردستان دا. کۆمیتەی کوردی کە پاش کۆنگرەی ئەرزەڕۆم دامەزرا هەمیشە و لە نزیکەوە پەیوەندی قوڵی بە ئۆپۆزیسیۆنەوە هەبووە. ئەم پەیوەندییە لە رێگای نوێنەری خۆیەوە بووەبە ناوی خالید بەگی جەبرانلی کە لە هەمانکاتدا سەرۆکی عەشیرەتی جەبرانلییە و تا ئێستاش ئەندامی کۆمیتەی ئەستەمبوڵە و لە بەرهەڵستکارانی کەمالە. پەیوەندی خالید بەگ بەم گرووپەوە لە رێگای نوێنەری بەتلیس لە پەرلمانی تورکیا یوسف زیا بەگ بووە کە کوردە و بەڕێوەبەری گرووپی دووەمە. بەم چەشنە کۆمیتەی کوردی کە تەواوی کوردستانی تورکیای لەگەڵدا بوو هەمیشە لایەنی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری تورکیایان گرتووە و پشتیوانی بوون.

شەڕی یۆنان-تورکیا بوو بە هۆی دووبەرەکی لەناو سەرکردەکانی کورد. لە کاتی ئەم شەڕەدا بۆچوونی کوردەکانی فارس ئەوە بوو: ئێستا باشترین هەلە بۆ (سەربەخۆیی کوردستان) چونکە

دەوڵەتی فارس ئەمڕۆ زۆر لاوازە و ناتوانێ ئەم بزووتنەوەیە لەناوبەرێ. هەموویان بڕیار دەدەن لە کوردستانی فارسەوە دەست پێ بکەن و تەواوی عەشیرەتەکانی کورد یەك بخەن و بەم جۆرە هێزێکی گەورە پێکبهێنن و بەزووترین کات لە کوردستانی فارس را بەرەو کوردستانی تورکیا بپەڕنەوە، دەوڵەتی تورکیاش کە خەریکی شەڕی یۆنانە ناچار دەبێت، لەو سنوورەی کە کوردەکان دەیانەوێ، دان بەسەربەخۆیی کوردستاندا بنێت.

کوردەکانی تورکیا بە سەرۆکایەتی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم لەمبارەوە کەمتر پێداگربوون و دەیانووت ئێستا کاتی ئەم راپەڕینە نییە. راڕایی و نایەکلایی لە بڕیاری کۆمیتە لەبەر سیاسەتی ئەو دەمەی فەرماندەی بەرەی رۆژهەڵاتی تورکیا کازم قەرە بەکر بوو کە وەك جێگیری نوێنەری کەمال بوو لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات. ( دەوری راستەقینەی سیاسەتی قەرەبەکر لە کێشەی کورد و سەرنەکەوتنی بزووتنەوەی سمکۆ، لە راپۆرتی ١٧٥ ساڵی ١٩٢٢ بەوردی بۆمنووسیون نامەوێ دووپاتی بکەمەوە).

سوورنەبوونی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم لە لایەکی تر لەبەر کاریگەری گرووپی دووەم بوو کە ئەگەرچی لە گروپی یەکەم دیموکراتی ترو ئازادی خوازترە و بەهانای بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردەوە دەچێ، بەڵام لەگەڵ ئازادی کوردستان نەبوو، چونکە هەڵوێستێکی گونجاو و رێکوپێك و گرینگی لەسەر بەرەی شەڕی رۆژئاوایی ئەنادۆڵ هەبوو. جیاوازی نێوان سەرکردەکانی کوردستانی باکوور و باشوور بە هۆی هەڵوێستی سمکۆ بوو، چونکە لەگەڵ رێبەرانی کوردستانی باشوور رێککەوتبوو، کوردی باشووریش راپەڕینی سمکۆیان پەسەندکردبوو و بە گرنگیان دەزانی. بەڵام سمکۆ و هاوبیرەکانی پێشبینی ئەوەیان کرد بوو کە ئازادکردنی کوردستانی فارس،کوردەکانی تورکیا ناچار دەکاهەڵویستی پۆزێتیڤ بگرنە بەر ئەم بۆچوونەش بنەمایەکی هەبوو. ئەمەش بەوەڕا دیارە کە خودی ئەندامانی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم دەڵێن: جیاوازی بیروڕامان نابێتە هۆی لێکدابڕان یا لە بیرچوونەوەی ئەو خاڵە کەهەردووکمان بۆ ئامانجێکی پیرۆز تێدەکوشین.،جیاوازی بیروڕامان لە ئەرکی گشتیماندا دەور نابینێت. کۆمیتە لەگەڵ بۆچوونی سمکۆ نەبوو بە گومانەوە سەیری تاکتیکەکانی تری سمکۆیان دەکرد و رەخنەیان لە ڕاو بۆچوونەکانی دەگرت. بە نووسینی نامە بۆ سمکۆ خۆیان لە سەرنەکەوتنی ئەو پلانەی بە بەرپرس نازانن. بەپێی ئەو هەواڵانەی لەسەر نیازی سمکۆ گەیشتووە، کۆمیتەی ئەرزەڕۆم

هەلوێستی نێگەتیڤانەی خۆی لەمبارەیەوە بەرامبەر سمکۆ دەربڕیووە و دەست نیشانی ئەوەی کردووە کە راپەڕین و دەست بەکاربوونی سمکۆ لە کاتی خۆیدا نییە،چونکە بەرهەلستکارانی (ئۆپۆزیسیۆنی) دەولەتی تورکیا بەرەو بەهێزبوون دەچن، بۆیە نابێ کارێکی ئەوتۆ بکرێت شك و دوو دلّی لە سەرکەوتنیدا هەبێت یا پێش رووداوەکان بکەوین و پەلەی لێبکرێت. لە هەمان کاتدا خالید بەگ لە کۆتایی نامەکەیدا بۆ سمکۆ دەلّێ: کۆمیتە تەنیا بیروڕای خۆی دەردەبڕێت و مەبەستی ئەوە نییە بەسەرتاندا بیسەپێنێت و پلانی سمکۆش بەشتێکی یۆتۆپیای (خەیالّی) نازانن و بۆ سەربەخۆیی کوردستان پشتیوانی هەموو سەرەتاکانی سەرکەوتن دەکات.

بەهاری سالّی رابردوو سمکۆ دەستی بەجێبەجێ کردنی پلانی ناوبراو کرد، بەلاّم لەبەر ئەو هۆیانەی کە لە راپۆرتی (١٧٥)دا نووسیبووم، شکستی تەواوی هێنا و کردەوەی خائینانەی تورکیا (واتە قەرەبەکر) سمکۆی نائومێد کرد و ناچار بوو رابکاتە سلێمانی. لەگەلّ شێخە بەناوبانگەکانی کوردی باشووری کوردستان کەین و بەینی هەیە بەو مەبەستەی کەلّك لە یارمەتی ئینلگیزەکان وەربگرێت کە هەمیشە بەسەریاندا سەپاندووە.سمکۆ داوای یارمەتی لە ئینگلیز دەکات و نامە بۆ تەواوی رێبەرانی کوردستانی تورکیا دەنووسێت و تیایاندا پاکانە دەکا و هەنگاوەکانی خۆی بەراست لەقەلّەم دەدا.

لە ناوەڕاستی هاوینی سالّی ١٩٢٢ بۆ جاری دووەم سمکۆ هێرش دەکاتە سەر دەولّەتی فارس. بەلاّم ئەمجارە بەیارمەتی ئینگلیز. (ئەندامانی کۆمیتەی کوردی هەبوونی پەیمانی نێوان سمکۆ و ئینگلیزەکانی لە یەکەم هێرش سمکۆ بۆ ناو خاکی فارس، بە درۆ خستەوە).

تا زستان دەولّەتی نوێی کوردی بە یارمەتی ئینگلیزەکان توانی لە ناوچەکانی موسلّ و سەردەشت و سابلاّخ و ناوچەی لورستان و باشووری کرماشان تا ناوچەی رەواندز و شاری رەواندز پەرەبسێنێت (رەواندز تەنیا لە مانگی مارتی ١٩٢٣ لە لایەن تورکەکانەوە گیراوە).

کۆمیتەی کوردی کە ئەو سەرکەوتنەی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ی بینی،بە نهێنی زۆربەی سەرکردەکانی عەشیرەتی ئەرزەڕۆم و باکووری کوردستانی کۆکردەوە تا هەلّوێستی خۆیان بەرامبەر بە دەولّەتی شێخ مەحموود روون بکەنەوە. ئەوەبوو، بڕیاردرا ئەو بنەمایەی کوردستانی ئازادی لەسەر دارێژراوە دەبێ پتەو و پشتیوانی بکرێت (لەگەلّ ئەوەشدا دەبێ هەر چۆنێك بێ دەولّەتی سلێمانی ناچاربکرێ سیاسەتی روو لە ئینگلیزی خۆی بگورێت).

بۆیە لە نامەی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆمدا بۆ دەوڵەتی سلێمانی بە جیدی داوا لە شێخ مەحموود دەکەن،بۆ هەمیشە واز لە یارمەتی ئەوروپا بەتایبەتی بەریتانیا بهێنێت، چونکە هیچ کاتێك بە یارمەتی ئەوان کوردستانی ئازاد دروست نابێت و رزگاربوون لە ژێر دەستی ئینگلیزەکان زۆر زەحمەت ترە لەرزگار بوون لە ژێر دەستی تورکیا. هاوکات لەگەڵ ئەو دەستورەیکۆمیتەی کوردی بۆ دەوڵەتی کوردی (ئینگلیز) بڕیار دەدات داوای یارمەتی لە دەوڵەتی مەزنی رووسیای سۆڤیەتی دراوسێی بکرێت و دەوڵەتی کوردی سلێمانی و کۆمیتەی کوردی ئەستەمبۆڵیش لەم بارەوە ئاگادار دەکاتەوە. کۆمیتەی کوردی لەو بڕیارەی دوایی خۆیدا پشت ئەستوور بوو بە: سەرکەوتن لە بەرەی یۆنان، جێ پێی کەمالیستەکان پتەوتر دەکاو بە دوای ئەویشدا سەرکەوتنی خێراو دەسەلات بە دەستەوەگرتنی بەرهەڵستکاران مسۆگەر دەبێ.
لە کۆبوونەوەی ناوبراودا کەسایەتی وەك حوسێن پاشا بەگ بەشداربوون کە لەسەر پرۆژەی سەربەخۆیی کوردستان لە ژێر حیمایەی رووسیادا، کاریان کردبوو. ئەم پڕەژەیە لە (١٣) خاڵ پێکهاتبوو و درابوو بە کۆنسوڵەکان و هاوکاتیش نێردرابوو بۆ مۆسکۆ و ئەنقەرە. هەنگاوەکانی تری کۆمیتەی کوردی بەسترابۆوە بە کێشەی تورکیا کە چۆن لە کۆنفراسی لۆزان چارەسەردەکرێت و چۆن رووسیا هەڵویست لەسەر داخوازی کۆمیتەی کوردی وەردەگرێت. ئەگەر رووسیا داخوازییەکانیان جێبەجێ بکا یا وەڵامی پۆزێتیڤ بێت ئەوا کۆمیتە دوای رێکخستن و خۆ ئامادەکردن دەسبەکاری راپەڕین دەبێت. ئەگەریش رووسیا لە یارمەتیدان خۆی ببوێرێ تەنیا دەرگایەك کە کوردەکان دەیبینن ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ سیاسەتی پێشووی خۆیان واتە لایەنگری ئۆپۆزیسیۆنی تورکیاو هەوڵدان پێکەوە بۆ کودەتا دژی کەمال. لە کۆبوونەوەیان لەگەڵ ئێمە و داواکارییەکانیان، کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کورد هەوڵ دەدا پشگیری هەست و کردەوەی شۆڕشێگرانەی کوردەکانی تورکیا بکاو ئاگاداریان کاتەوە کە راپەڕینی جیا جیا و سەربەخۆی ناوچە یا عەشیرەتەکان دەبێتە هۆی تێکشکان و لە ناوچوونیان لەلایەك، لەلایەکی تر هێزی بزووتنەوەی کورد بۆ کاتی پێویست لاوازدەکات. لەگەڵ ئەمانەشدا هەنگاوی ئەوتۆ هەڵگیراوە کە هەڵسوکەوتی هێندێك لە سەر کردەکانی کورد سەر لە دەوڵەتی تورکیا بشێوێنن و گومڕای بکەن. بۆ نموونە دوای کۆبوونەوەی ئەرزەڕۆم حوسێن پاشا دەچێتە ئەنقەرە تا وەفاداری خۆی بۆ دەوڵەتی تورکیا رابگەیەنێت. حوسێن پاشا زۆر سەرکەوتوانە دەجوڵێتەوە پێش گەڕانەوەی لە ئەنقەرە دەوڵەتی تورکیا دەستووری پێدەدات کە چۆنیەتی کوشتنی یەکێك

لەناودارەکانی کورد واتە یوسف زیا بەگ رێکبخات. ئاشکرایە کە حوسێن بەگ بەئەرکی سەرشانی خۆی زانی کۆمیتەی کوردی و خودی زیا بەگ لەمبارەوە ئاگاداربکاتەوە. سەرکردەیەکی تری کورد خەڵکی (خویتە) دەستووری پێدەدرێت کە بروسکەیەك بۆ دەوڵەتی تورکیا لە ئەنقەرە بنێرێت تیایدا ئامادەیی خۆی بۆ شەڕکردن لەگەڵ دەوڵەتی کورد رابگەیەنێت.

ئاشکرایە هەڵوێستی ئاوای سەرکردەکانی کورد وادەگەیەنێ کە ئەوان لەگەڵ دەوڵەتی کوردی سلێمانی نین ولەئاکامدا هوشیاری دەوڵەتی تورکیا و فەرماندەکانی سڕدەکا. وریایی لە بەرێوەبردنی کاروبارەکان و نهێنکاری سەرکردەکانی کورد و کۆمیتەی ئەرزەڕۆم لەوەدا دەردەکەوێ: تا مانگی شوباتی ئەمساڵ تورکیا لە هەبوونی کۆمیتەکە و پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی کوردی سلێمانی ئاگادار نەبوو، ئەویش بە هۆی بەرپرسی شاری مووش خالید بەگ بە گشتی نەك بە وردی، ئاگادار کرا. هۆی ئاشکرا بوونی کۆمیتەی کوردی لە ئەرزەڕۆم، ئەو فەرمانەی ئەنقەرە بوو بۆ فەرمانداری ئەرزەڕۆم کە هۆشیارانە بە دوای هەموو ئەفسەرە کوردەکاندا بگەڕێت و بیانگرێ بەتایبەتی خالید بەگ. ئەنجامی ئەو راوەدوونانە گرتنی سێ کوردی (پەیوەندیکار)ی کۆمیتە بوو، بەڵام نەیان توانی تاوانباریان بکەن چونکە هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبوو،هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نهێنیەکانی کۆمیتەیان زارەکی، کەمتر بە نووسراو ئاڵوگۆڕ دەکرد. سەرەڕای راوەدوونان، کۆمیتە لەگەڵ دەوڵەتی کوردی سلێمانی و تەواوی سەرکردەی عەشیرەتەکانی تورکیا بەردەوام پەیوەندی هەبوو. بۆ نموونە، بۆراپەڕین کۆمیتەی کوردی لەکانوونی یەکەمی ساڵی پار دەستووری دابوو بەهەر شێوەو نرخێك بێ دەبێ عەشایرەکان چەك و تەقەمەنی بکڕن و بەهاتنی بەهار و کرانەوەی رێگاکان ئەم دەستوورە لەکاتی گونجاودا لە ئەرزەڕۆم جێبەجێ بکرێت. داخوازی چەك ئەوەندە زۆرە کە دراتاش و ئاسنگەرەکان هەموویان خەریکی نۆژەن کرنەوەی تفەنگ و دەمانچە کۆنەکانن. گواستنەوەی چەکەکان لە شارەوە بەشێوە و رێگای جۆراوجۆر و کەم کەم دەگوازرێنەوە بۆ گوندەکان، لەوێشەوە بە کۆمەڵ دەبرێن بۆ ناوەندی کوردستان.

دەگەڕێمەوە سەر باسی وتووێژی کۆمیتەی کوردی لەگەڵ رووسیا، دەبێ بگوترێت: هەڵوێستی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم هەم لە لایەن دەوڵەتی کوردییەوە هەم لە لایەن کۆمیتەی

ئەستەنبۆڵەوە بەتەواوی پێشوازی لێکرا. بەتایبەتی دوای ئەوەی دەستەی نوێنەرایەتی تورکیا لە کۆنفرانسی لۆزان رایگەیاند کە لەگەڵ ئینگلیزەکان پێکهاتوون. کوردەکان پێشبینیی ئەوەیان کرد بوو کە رێککەوتنی تورکیا و ئینگلیز هەڕەشەیە بۆ سەر هەموو ئایدیاکانی رزگار بوونیان، لەبەر ئەوە بە پێویستیان زانی پشتیوانی رووسیا بە دەست بێنن. وا دیارە هەر کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردی بەتەنیا داوای یارمەتی لە دەوڵەتی رووسیا ناکا، بەڵکو کۆمیتەی ئەستەنبوڵ و دەوڵەتی سلێمانیش لە شوباتی ئەمساڵ داوای یارمەتییان لە دەوڵەتی رووسیا کردووە. بەم چەشنە بایەخێکی زۆر بەم پەیوەندیانە دەدرێت.

گەرچی دەوڵەتی کوردی سلێمانی دەستووری کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی بەرەو هاولایەنی رووسیا بە رووداوێکی گرنگ دەزانی،کەچی سەرەتا بوو بەهۆی دووبەرەکی لەناو دەوڵەتی کوردی دا،بەڵام زۆر بەیان لەگەڵ ئەوەدا بوون بەرەو رووسیای سۆڤیەتی بڕۆن و داوای یارمەتی لێبکەن، بۆ ئەم مەبەستەش هاتوونەتە لای کۆنسوڵی ئێمە لە تەورێز. ئێستا بە وتەی ئەندامانی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم سمکۆ لەناو عەشایرەکانی مەرزەکی، شەمسەکی، شوکری لە کوردستانی تورکیا چالاکانە پروپاگەندە دەکات، بەپێی ئەو هەواڵانەی لە تەورێز بە کۆنسوڵی ئێمە گەیشتووە، ئەنجامێکی باشی لەسەر ئەم وتووێژ و پەیوەندیانە لە ناو عەشایرەکان، بەدەست هێناوە.

لە مانگی نیسانی پار، هەر دوو کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم و ئەستەنبوڵ یەکیان گرت. تا ئەو کاتە کۆمیتەی ئەستەنبوڵ لایەنگری لە ئینگلیزەکان دەکرد. یوسف زیا ئەندامی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم کە لە ئەرزەڕۆمەوە هاتۆتە بەتلیس چاوی بە خالید بەگ کەوتووە، رێککەوتوون و لەسەر پەیوەندی نێوانیان و پلانی داهاتوویان، نامەیەکی بۆ دەوڵەتی کوردی نووسیووە. داوی ئەمە لەبەر سەرکەوتنی وتووێژەکان لەگەڵ رووسیا، دەوری رێبەرایەتی دەکەوێتە دەستی کۆمیتەی ئەستەنبوڵ.

بەڵام سەبارەت بە کاریگەری و رەنگدانەوەی ئەم پەیوەندییە لەناو کۆمەڵانی خەڵکی کورد وەك پێشوو کۆمیتەی ئەرزەڕۆم دەوری سەرەکی دەبینێت. ئەم کۆمیتەیە یەکەم هەنگاوی هەڵگرت بۆ نزیك بوونەوەی کورد لە رووسیا و دوورکەوتنەوە و پچڕانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئینگلیزەکان.

بەلاّم شوێنی نیشتەجێی کۆمیتەکە لەلایەك ئەوە دەگەیەنێ کە لە داهاتوودا دەوری سەرەکی دەگێڕێ لە پەیوەندی نێوان کوردان و بەرهەڵستکارانی تورکیا، لە لایەکی تر لەبەرچاوی دەوڵەتی ئەنقەرە دەبێت.

لەبەر ئەوەی: لە وتووێژەکانی ئێمەو کورد، کوردەکان بەو ئەنجامە گەیشتوون کە رووسیا هەوڵ نادات کوردستان لە ژێر حیمایەی بێت. بەڵکو تەنیا دەیەوێ دراوسێیەکی بەوەفا و بە هێزی لە نزیك سنوورەکانی قەفقاز هەبێت. ئاشکرایە وتەو بەڵێنی یارمەتی رووسیا بۆ کوردان تەنیا لەو روانگەوە سەرچاوە دەگرێت کە دوژمنانی رووسیا دوژمنی کوردیشن.ئەمەش مانای ئەوە نییە رووسیا بەهانای کۆمیتەی ئەرزەرۆمی کوردیەوە چووە و بەڵێنی یارمەتی دانی کۆمیتەی ئەستەنبۆلی جێبەجێ کردووە. رووسەکان بەو ئەنجامە گەیشتوون دەوڵەتی ئێستای تورکیا پاش لۆزان دوای سیاسەتی سازشکارانەی ئانتانتەکان ( واتە وڵاتانی هاوپەیمانی دوژمن بە تورکا وەك ئینگلیز،فەرەنسا، یۆنان، ئیتالیا....) کەوتووە و چاوەڕێ دەکرێ دژایەتی رووسیای سۆڤیەتی بکات و رووسیاش لە ئەنجامدا دژی دەوەستێ.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەمانە هەمووی جێی سەرنجە کە:

١- بارودۆخێکی مەترسیدار بۆ کوردەکان دروستبووە.

٢- ناڕەزایی گشتی دانشتیوانی ناوچەکانی رۆژهەلاّت و سیاسەتی دەرەوەی سەر بە ئانتانی دەوڵەتی تورکیا و دەسەلاّتداری رەهای کەمال لە ناوەوەی ولاّت (بۆ نموونە سەرکوت کردنی ئۆپۆزیسیۆن لە کاتی هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلمانی تورکیا)،پاڵی بە کوردەکانی تورکیاوە ناوە بۆ سەربەخۆی کوردستانی تورکیا پەنا بۆ رووسیا بەرن و داوای حیمایەی لێ بکەن. سەرەڕای سەرنەکەوتنی تێکڕای لایەنگرانی دەوڵەتی ئێستای تورکیا لە هەڵبژاردندا، زۆربەی نوێنەرانی پەرلمانی پێشووی تورکیا لایەنگری ئۆپۆزیسیونەکانن کەوا دیارە جارێکی تر پێکەوە لەسەر پلانێکی هاوبەش بۆ دەستبەکاربوونی کۆدەتا لە تورکیا پێکدێن. ئەویش نەك وەك رابردوو بە خەباتی پەرلەمانی، بەڵکو کودەتای شورشگێڕانە. لە جێبەجێ کردنی پلانی نوێیدا، بەشداری دەوڵەتی سلێمانیش لە بەرچاوگیراوە. تا وابگەیەنێت ئەم پلانە لە لایەن دەوڵەتی کوردیشەوە پەسەندکراوە. حیساب بۆ پشتیوانی رووسیاش کراوە، بۆ ئەوەی لەم رووەوە لەگەڵ دەوڵەتی سلێمانیش بە تەواوی گفتوگۆ بکرێت، زیا بەگ لە رۆژی ١٩٢٣/٧/٢٠ لە ئەرزەرۆمەوە چۆتە

ئەنقەرە و دوای وتووێژ لەگەڵ ئێمە، ناوبراو دەیەوێ بە نهێنی بەبیانووی راوەدوونانی لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە، لەگەڵ دوو ئەندامی تری کۆمیتەی کوردی (ئیسماعیل حەقی و عەبدولرەحمان بەگ) بچێتە تیفلیس و لەوێ چاوەڕێی هاتنی دەستەی نوێنەرایەتی شێخ مەحموود بکەن. دوای وتووێژەکانیان لەگەڵ ئێمە لە ئەنقەرە ولەگەڵ نوێنەرانی شێخ مەحموود لە تیفلیس، زیا بەگ ئامادەیی خۆی دەربڕی کە بچێتە لۆزان و لەگەڵ دەستەی نوێنەرایەتی رووسیا پێکەوە بەناوی تەواوی کوردستان قسە بکات. ئەویش ئەگەر رووسیا بیەوێ و پێیخۆشبێت، کۆنفرانسی لۆزان کۆتایی پێنەهاتووە[1].

## زۆرداری ئینگلیزەکان لە کوردستان

تاران، ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣ لە کوردستانەوە ئەم بروسکەیەی خوارەوە گەیشتووە:

زوڵم و زۆری لەشکەرەکانی ئینگلیز رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێت، دانشتیوانی کوردستانی باشوور لە ژێر مەترسی بۆمبارانی فڕۆکەکان و سوپای ئینگلیز دان. نزیکەی دوو سەد بنەماڵە لە سلێمانی دەرکراون و دەیان کەس بە دیلگیراون و دەستەبەجێ نێردراون بۆ بەغدا و سەروەت و سامانیان زەوت کراوە. وڵات کاولکراوە، تکاتان لێ دەکەین تکای عەدالەت و مرۆڤ پارێزی لە دەست زۆردارەکان[2].

**مەحموود**

**فەرماندەی گشتی هێزی کوردستان**

**ئیزڤێستیا- ١٩٢٣/٧/٢٧**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٣٤-٢٣٨.

(2) هەمان سەرچاوە ل ٢٤٠.

سیاسەتی رووسیای قەیسەری و کۆنسۆڵەکانی لە ناوچە کوردنشینەکانی (ورمێ) سیاسەتی رووسیای قەیسەری ئەوە بووە زەوی و زاری خەڵکەکە بکڕن و کشتوکاڵی لێبکەن. رۆڵ و کردەوەی رووسەکان بەدڵی دەرەبەگەکانی کورد نەبووە. سیاسەتی رووسیای قەیسەری بوو بەهۆی ئەوەی کوردەکانی ورمێ تا شەڕی ١٩١٤ی لایەنگری تورکان بکەن و لە کاتی شەڕ هەڵسوکەوتی خراپ و بێ بەزەییانەی فەرەماندەکانی سوپای رووسیا کوردەکانی کردە دوژمن. بە وتەی ئەوان رووسیای سۆڤیەتی بەرامبەر بەو هەموو قوربانیانەی ناوچە موسڵمان نشینەکان داویانە تاوانبارە و هەر بەو سیاسەتە نا لەبارەی رووسیای قەیسەری رانەوەستاوە و.....

بۆیە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا کوردەکان لە رووسیا و تورکیا، تورکیایان هەڵبژارد و یارمەتیاندا. بەهۆی عەشیرەتە شەڕکەر و جەنگاوەرەکانی هەرکییەوە تورکیا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لە لایەکی تر لە دەڤەری موسڵ لە سەرەتای ١٩١٥لە ئەنجامی راکردنی کوردەکانی ناو سوپا کە بەرەی شەڕیان بەجێ هێشت، تورکیا تێشکا....

باوکی ئۆمەر ئاغای شوکاك و باوکی سمایل ئاغای شوکاك (سمکۆ) لەسەر رابەرایەتی عەشیرەتەکەیان شەڕ و ناکۆکیان لە ناودا بووە و بە دەست تێوەردانی رووسەکان بە قازانجی باوکی سمکۆ کۆتایی پێهاتووە. دەوڵەتی تاران پاش تێشکانی سمکۆ بە دەست هێزەکانی ئێران ئۆمەر خان خەڵات دەکا و نازناوی سالاری جەنگی پێدەبەخشێت.

لە ١٩١٣ باوکی سمایل ئاغا، ناچارا دەکەن رابکاتە تورکیا، تا مرد هەر لەوێ مایەوە.....

.... ئۆزدەمیر پاشا گەشتێك بەناوی کوردستانی عێراقدا دەکات تا کوردەکان و شێخ مەحموود دژی ئینگلیز هانبدات، پێیان دەڵێ لەشکری رووسیای سۆڤیەتی کە ژمارەیان دەگاتە پەنجا هەزار کەس هاتووە بۆ یارمەتیدانی شێخ مەحموود دژی ئینگلیز، ئەم وتانەی ئۆزدەمیر کە فڕیان بە سەر راستییەوە نابێ نە تەنیا خەڵکی ئەوێ بەڵکو کوردەکانی سابلاخیش باوەڕی پێدەکەن. ئۆزدەمیر پاشا بۆ ئەوەی خەڵك زیاتر باوەڕبکات وتوویەتی تورکیا و رووسیای سۆڤیەتی لەسەر سەربەخۆیی کوردستان پێکهاتوون. شێخیش باوەڕدەکات و زیاتر لە تورکان نزیك دەبێتەوە[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٤٥-٢٤٩.

## بۆ ئاگاداری هەمووان

بۆ دابینکردنی ئاسایشی گشتی، دەوڵەتی خاوەن شکۆ بەریتانیای مەزن دەیەوێ تەنیا مانۆڕێکی سوپایی ئەنجامبدات، نایەوێ تۆڵە لە کەس بستێنێتەوە، بەنیازە ئەو کەسانە لە موسڵ دەربکات کە ئاسایش و هێمنی ناوچەکە دەشێوێنن. لەبەر ئەوە، ئەو کەسانەی لەم ناوچەیەدا دەژین با بەهۆی ئەم مانۆڕە نەترسێن، تکایە کەس دژی سوپاکانی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن نەجولێتەوە و لە ئاژاوەو راپەڕینەکان بەشداری نەکات.

باشترە دانیشتوان ئارام لە ماڵی خۆیان دانیشن و دووربن لە رووداوەکان. چونکە دەوڵەتی بەریتانیا دەیەوێ ناوچەی موسڵ لەو سەرکێشانە پاك بکاتەوە. ئەوانەی خۆیان تەسلیم دەکەنەوە لێبوردنیان بۆ دەردەچێت و ئەوانەش کە تەسلیم نابنەوە بە دوژمن دەژمێردرێن[1].

سەید تەها

**٢٨ مارت ١٩٢٣، بەغدا**

## نامەی سمکۆ بۆ ئەمیر لەشکر-میرزا عەبدوڵاخان

لە رێگای سەرهەنگ عەلی خانەوە نێردراوە (رۆژی ٢٣ی ئایاری ١٩٢٣ بەرانبەر بە ساڵی ١٣٠٢ی ئێرانی «.... من لەسەر زاری سەدار عەزمی پارێزگاری ئازربایجان چەند جار داوام لە دەوڵەتی فارس کردووەو هیوادار بووم دەوڵەتی ئێران زۆربەی کاربەدەستانی ئەم ناوچەیە بگۆڕێت و چاوەڕێی جێبەجێ کردنی ئەم داخوازییە بووم. ئەم کاربەدەستە خائینانە منیان لە

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٦٣.

لای دەوڵەت بە ڕێگر لە قەڵەمداوە و بەرە بەرە ناچاریانکردووە هەنگاو بۆ لەناوبردنی من و هاوڕێکانم هەڵگرێ. لەبەر ئەوە من تائێستا ئامادەی خزمەت بە دەوڵەت نەبووم. لەمبارەوە نوێنەرانی دەوڵەتیشم ئاگادارکردۆتەوە، بەڵام ئەنجامەکە بەپێچەوانەوە بوو و تا قارەمانی فارسەکان واتە وەزیری شەڕ ڕەزاخانیان هەڵبژارد ئەویش لەشکری نارد بۆ ناوچەکە. لەبەر ئەوەی لە لایەن وەزیری جەنگەوە هەڕەشە و مەترسیم لەسەر بوو، بێ مەیلی خۆم ناچاربووم پەناگایەك لە وڵاتێکی تر و غەریبدا بۆ خۆم پەیدا بکەم تا بتوانم ویستی خۆم بە جەنابتان ڕابگەیەنم.

شوکر ئێستا دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵکەوت کە بەرێگای مرۆڤێکی وەك ئەمیر لەشکر کە ئازربایجانی لە دوژمنان پاککردەوە قسەی خۆم بکەم. من و هاوڕێکانم هەموویان هەر خەڵکی ئێرانین و بەڕەگەزیش هەر ئێرانین، بەڵام لە سایەی ئەو کاربەدەست و موچەخۆرە خایینانەی لای هەمووان ناسراون، ناچار کرام وڵات بەجێبهێڵم و لە وڵاتێکی بێگانەدا بمێنمەوە. ئێستا پاش مۆڵەت دان دەتوانم بگەڕێمەوە وڵاتی خۆمان. بەپێی ئەو بەڵگانەی لامن دەتوانم نیشانبدەم کاربەدەستانی دەوڵەت لەناوچەکەدا لە سەرەتاوە تا ئێستا چییان کردەوە. دەمەوێ بیسەلمێنم کە هیچ کاتێك من نەمویستووە خیانەت بکەم و سەرکێش بم، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەمیشە بیرم لە سەربەخۆیی نیشتمانەکەم کردۆتەوە و دەیکەم.

ئیمزا[1]

سمکۆ

## بروسکەی عەشایرەکانی کوردستان

## سەبارەت بە کردەوەکانی لەشکری دەوڵەتی تاران لە کوردستان

**"یەکشەممە، ١٥ی زەی لقەعدە، ساڵی ١٣٠٢، بەرانبەر ٣٠ی تەمووز ١٩٢٣"**

**لە کرماشانەوە بۆ تاران**

**بۆ: بەرێز سەرۆك وەزیران و شورای وەزیران**

ئێمەی خزمەتکار لە باوباپیرانەوە بگرە تا نەوەبەنەوە کە لە ناوچە گرنگەکانی سەر سنووری وڵاتەکەمان (کوردستان) دەژین، بە قارەمانییەتی و پاکی خزمەتی ئەم وڵاتەمان کردووە، بەبێ هیچ پاداشت و خەڵاتێك. ئێمە بەکردەوە وەك دیوارێکی ئاسنین لەسەر سنوور، وڵاتەکەمان پاراستووە و هەموو کوێرەوەرییەکانی شەڕمان بینیووە و تاقەتمان هێناوە، کە زیانێکی زۆری مرۆیی و مادیمان لێکەوت بەو هیوایەی داهاتوویەکی روون چاوەڕێمان بکات. ئێستاش بۆ پاراستنی سنوورەکان و سەربەخۆیی وڵاتەکەمان بۆ داهاتوو پێویستمان بە پشتگیری و یارمەتی دەوڵەت هەیە. ئەم بروسکەیەش لە لایەن هەموو سەرکردەو سەرۆك عەشایرەکانی کوردستانەوە بۆ ئێوە دەنێردرێت. بۆ دەبێ دەوڵەت تائێستا ئەم خزمەتەی لەبەر چاو نەبێت و لەبەر تاوانکاری چوار کاربەدەستی خائین، ئاژاوەگێر و موفتەخۆر، بایەخ بە وەفاداری و پاکی خزمەتی ئێمە نەدات. جەنابی خاوەن شکۆ، سەردار رەشید کە بنەماڵەکەیان زیاتر لە دوو هەزار ساڵە قارەمانانە خزمەتی ئەم وڵاتەدەکەن، ئەم بنەماڵە بەناوبانگەی کوردستان، رۆڵەکانی خۆی وەك ئەمانوڵاخان، خسرو خان و غوڵام شاخان لە پێناوی ئەم وڵاتەدا کردۆتە قوربانی، بە دڵ و بە گیان تا ئێستا خزمەتی ئەم خاکەیان کردووە و سەربەخۆیی ئێرانیان پاراستووە. ئەمڕۆ لە سایەی تاقمێکی بەرتیل خۆر و زۆردار، دەوڵەتی ناوەندی پشتی لەو بنەماڵەیە کردووە و گوێیان ناداتێ یا تاوانباریان دەکات. عەشایرەکان بەبێ تەقە و بە هێمنی و بەپێی دەستورەکانی دەوڵەت شاری شاه ئاباد و جوانرۆیان پاککردەوە و ئامادەیی خۆیان دەربڕی بە هاتنی فەرماندەی لەشکری رۆژئاوا (ئەحمەد ئاغا خان) ئەم شارانە تەسلیمی هێزەکانی دەوڵەت بکەن. تاوانی ئەم سەرکردە و سەرۆك عەشیرەتانە چی بووە جگە لەوەی کە

نەیانهێشتووە پیاوەکانیان تەقە لە سەربازەکانی دەوڵەت بکەن کە لە ژێر مەترسی چەککردن و لەناوچووندا بوون. ئەو زەرەروزیانەی لە عەشایرەکان کەوتووە دەگاتە یەك میلیۆن تمەن. تەواوی کاسبکار و جووتیار و وەرزێر و دانشتیوانی ناوچەکان کەوتنە بەر شالاوی ئاگر و شمشێری هێزەکانی دەوڵەت و سەروەت سامانیان هەمووی لەناوبرا، ئەوانەی کەم تا زۆر دەست رۆیشتوو بوون، رووت و رەجاڵ ماونەوە، هەتا ناتوانن بژیوی خۆیان وەچنگ بخەن. بۆیە پتر لە پێنج هەزار کەس لە دانشتیوانی ئەم ناوچانە لە منالی شیرەخۆرەوە بگرە تا پیرە کۆچەرەکان، بۆ وەدەستهێنانی پارویەك نان بۆ کارکردن دەچنە میزوپۆتامیا.

ئەگەر ئەوە پاداشتی خزمەتی پاك و چاکی ئێمەیە بەرانبەر بە نیشتمان، دەبێ تاوانی ئێمە لەم سنوورانە بەکردەوەیەکی پیرۆز بژمێردرێت.خزمەتی هیچ کام لە ئێمە بۆ نیشتمان لەگەڵ خزمەتی سەردار رەشید بەراورد ناکرێت و ئەگەر کەسێکی وەهاش هەبێت، ئەویش کەوتووەتەبەر مەترسی لەناوبردن و رووتکردنەوە.

کاتێك سەردار رەشید بەرانبەر بەو هەموو خزمەتەی کە سالانی دووروودرێژ بەم وڵاتەی کردووە، وەلامێکی وەهای وەرگرتەوە، بڕیاریدا ئەم وڵاتە بەجێبهێڵێت و بڕوات بۆ سلێمانی و میزوپۆتامیا. ئێمە رێگامان لێگرت و داوامان لێکرد کە لە وڵاتی خۆیدا بمێنێتەوە. هەڵسوکەوتی کاربەدەستانی خائین و بەرتیل خۆر لەگەڵ ئێمە هەموو سنوورێکی بەزاندووە. ئەوانە سوکایەتی بە داب و نەریتی عەشایری ئێمە دەکەن و وایان کردووە کە ئیتر تاقەت و سەبرمان نەماوە.ئەوسا ئێوە ئێمە بە خائین دامەنێن، ئەگەر ناچار بکرێین نیشتمانەکەمان کە هەزاران ساڵە تێیدا دەژین بەجێبهێڵین و بە ماڵ و منداڵەوە بڕۆینە سلێمانی یان میزۆپۆتامیا، یا بە چەك، شەرەف و ئابڕووی خۆمان بپارێزین لە دەسدرێژی ئەو کەسانەی سوکایەتی بە داب و نەریتمان دەکەن.

تکاتان لێدەکەین هاواری ئێمە بە شا بگەیەنن، تا بۆ پێش گرتن لە وێرانکردنی وڵاتەکەمان هەنگاو هەڵگرێت. تا ئێمەی دانیشتوانی ئەم ناوچانە کە هەزاران ساڵە هیچ کات بەو قینەو لە دڵەوە ناچار نەبووین وڵاتە خۆشەویشتەکەمان بەجێبهێڵین ولەم وڵاتە جیابینەوە.داوادەکەین دەستوور بەکاربەدەستانی و بەرێوەبەرانی ناوچەکە بدات بە یەکجاری واز لە زوڵم و زۆر و کاولکردن و لەناوبردنی وڵاتبێنن. سەرەڕای ئەوەی چەند ملیۆن تمەن زیان لە سەردار رەشید

کەوتووە، ئێمە داوامان لێکرد ناوچەکەی خۆی بەجێبهێڵێت تا لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتی ناوەندی تووشی رووبەڕووبوونەوە نەبێتەوە. سەردار رەشید کە سەرکردەیەکی پاك و بە دەسەلاتە، رێزی داب و نەریتی خۆی دەگرێت. بیروڕای خۆی لەمەڕ بەجێهێشتنی ولات گۆڕیووە و هیوای بە وتە و داواکارییەکەی ئێمەیە. پێمان گوتوە دەوڵەت بە زووترین کات لەم رووەوە هاوکاری و پشتیوانیمان دەکات. ئێمەی خزمەتکاری دانیشتوانی سەر سنوورەکانی ئێران، لە بارو دۆخێکی ئاوادا هەلناکەین.

ئێمەی دلسۆزی ئێوە و ئەم نیشتمانە، ئاگادارتان دەکەینەوە و داواشتان لێ دەکەین لەم حاڵ وگوزەرانەدا مۆڵەتمان بدەن ولاتی خۆشەویستمان بەجێبهێڵین، داوایش دەکەین لە ریزی خائین بە ولات و ئەو کەسانەمان دامەنێن کە ولاتی خۆیان خۆش ناوێت. ئێمە چی تر ناتوانین چاوەرێ بین چونکە ئەم زولم و زۆرە لە تاقەتی مرۆڤ دەرچووە.

چاوەڕێی وەلام و دەستووری یەکجاری و دوایین بڕیاردەکەین.

٢٥ کەس ئیمزیان کردووە کە لەناویاندا سەرکردە و سەرۆکی ئەم خێڵ و هۆز و عەشیرەتانە دەبینین: رەشید الملوك سەرکردەی تەواوی عەشیرەتی هەورامان، سەرۆکی عەشیرەتی کۆماسی، سەرکۆی بانە زاهیر سولتان سادق، شێخ ئیسماعیل، شێخ الاسلام هەورامان و..... لەگەڵ ئمیزای کارگوزار[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٦٥-٢٦٦.

## له راپۆرتی کۆنسۆلی سۆڤیەت هاوڕێ پاڤلۆڤسکی له ئەرزەڕۆم

**١٩٢٣/١/١١**

### کوردەکان

لەبەر بێ ئەنجامی وتووێژی کوردەکـان لەگـەڵ دەوڵـەتی رووسـیای سـۆڤیەتی، ناچـاربوون بـە یەکجاری پاڵ وە ئۆپۆزیسیۆنی تورکیا بدەن، لەگەڵ ئیتحادیستەکان کەوتوونەتە وتوویـژ و لـەم بارەوە چاوەڕوان دەکرێ خالید بەگ سەفەر بکا بۆ (ئەستەنبۆل).

### رۆژنامەی کورد- یەکەم ساڵی بڵاوکردنەوەی

**هەفتەی جارێك دەردەچێت، دوانزەی شەوالی ١٣٤٠ بەرامبەر ٩ی حوزەیرانی ١٩٢٢**

**(نرخی ساڵانەی لە فـارس پـەنجا قڕانـە و لـە دەرەوەی شەسـت قڕانـە و نرخـی هـەر ژمارەیەك دە شاهییە)، ((ئەو وتارانـە بڵاودەکاتـەوە کـە لـە بەرژەوەنـدی گـەلی کـورد دەنوسرێن))**

### کورد

**«مرۆڤ ئەوەی کە دمیەوێ تەنیا بە هەوڵدانی خۆی پێی دەگات»**

وتاری سمکۆ سەبارەت بە کۆمەڵگای کوردەواری، ئابووری و عەدالەت و چەوسـاوەیی لـە ژێـر دەستی زۆرداران:

ئایا دەزانن گەلی کورد لەلایەن بێگانانەوە چەند مافی پێشێلکراوە و وەبـەر شـاڵاوی راونـان و کوشتن کەوتووە؟ یان نا؟ کەواتە بەبێ چەند و چۆن دەبێ بزانن کـە گـەلی کـورد نـە سـەروەت وسامانی ماوە و نە گەل و نە مرۆڤایـەتی، نـە هێـز و نـە کەرامـەت. ئاشـورییەکان کـە لـە ئەرمەنییەکان زۆرپەستر بوون نامووس و کەرامەتیان بە کوردەوە نەهێشت. فارسـەکانیش کـە

هاو ئایین و برایانن، هەمیشە زولّم و زۆریان لێکردوون و لە هەموو هەلێك بۆ لەناوبردنی ئەم گەلە کەلّکیان وەرگرتووە. ئێوە شاهیدی زولّم زۆری دەولّەتی رووسیا بوون کە لە کاتی داگیرکردنی کوردستان بە بیانوی جیاوازی ئایینییەوە چی یان کرد؟. تەماشای ئەو برا دینیانەی کورد بکەن، کە نەك هەر هیچ هاوسۆزییەك لەگەلّ کورد ناکەن، بەلّکو لەو تراژیدیایەش بێدەنگن کە بە سەری هاتووە. کردەوە دزوێو پیسەکانی ئەوانیش کەتا ئێستا بەردەوامە هەموو سنوورێکیان بڕیوە کە زمان لە دەربڕینیان عاجزە.

ئێمەی کورد جگە لە یەکگرتن و یەکێتی هیچ ڕێگایەکی ترمان بۆ رزگاری لە دەست دوژمنان، نییە، هیچ ئامرازێکی تر بۆ ئەم گەلە بێبەش و بێ پشتیوانە نییە جگە لەوەی دەست لەناو دەستی یەك بنێن. ڕێگای رزگاریمان هەر ئەوەیە و هیچی تر.

من کوردم و ژیانم لە پێناوی رزگاری و بەختەوەری گەلەکەم بەخت کردوە و بەختی دەکەم. بەلاّم بەپێی ئەو پروپاگەندەی فارسەکان لەسەر من بلاّویان کردۆتەوە، کردەوەکانی منیان بە خراپکاری داناوە و بەخراپکاریش ناوم دەبەن. بەلاّم من چەتە و ڕێگر و خراپەکار نیم، من پارێزەری مافم. بەلاّم فارسەکان زۆردار و دزن، تائێستاش هەر خەریکی تالاّن کردنی ولاّتی کوردستانن و سوکایەتی بە کورد دەکەن و هەولّی لەناوبردنی هەموو دەستکەوت و کەرامەتی کورد دەدەن. تێکڕای ئەو کەسانەی دلّیان بۆ کورد دەسوتێت و گەلەکەی خۆیان خۆشدەوێت دەبێ دەست لەناو دەست نێن بۆ خزمەت و رزگاری گەلەکەیان لە دەست زۆردارانی فارس و بنبڕکردنیان و پشتگیری لە کورد بکەن. واتە ئەوانەی کە بنەمالّە و خانووبەرەکانمان لەناو دەبەن ئەوەی پەیوەندی بە ئێمەی کوردەوە هەیە ئەوەیە کە ئێمە ئامادەی مردن و خۆبەختکردن بین بۆ گەل و نیشتمانەکەمان.

سمکۆ

## لە هەواڵەکانی بەشی دەنگوباسی لەشکری بەرەی شەڕی ڕۆژهەڵات

**١٩٢٣/٥/١**

کوڕی بچووکی مەلیکی مەککە هاتۆتە موسڵ و تەواوی سەرۆك هۆز و عەشیرەتەکانی کورد و عەرەبی کۆکردۆتەوە،بەڵام ژمارەیەکی زۆر کەم ئامادە بوونە. ناوبراو مەبەستی ئەوەیە بەرەو ئینگلیز رایانکێشێ و بۆ بەرژەوەندی ئەوان پڕۆپاگەندە دەکات. ویستویە بەڵگەی دەسنووسیان لێوەربگرێ کە موسڵ و ناوچەکانی تر سەر بەو واتە سەر بە ئینگلیزەکانن. بەڵام خەڵك دژی ئەو پروپاگەندە هەڵوێست وەردەگرن، تەنانەت بەیان نامەیەکیش بڵاودەکەنەوە، وتویانە کە کوڕی مەلیك (ئەمیر زەید) خایەنی موسڵمانەکانە و دەیەوێ ئەم ناوچانە بە ئینگلیزەکان بفرۆشێت، ئەمیر زەیدیش بە ناچاری موسڵ بەجێدەهێڵێ[1].

دەگێڕنەوە گوایە پێشتر باوکی عومەر خان و باوکی سمکۆ هەردوو لەسەر ڕێبەرایەتی کردن لەشەڕ و کێشەدابوون، کە بەدەست تێوەردانی رووسەکان لە بەرژەوەندی باوکی سمکۆ تەواو دەبێ. بەڵام پاش شکستی سمکۆ لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە عومەر خان خەڵات دەکرێ و نازناوی سالاری جەنگی پێ دەدرێت[2].

## ڕۆژنامەی (استقلال) بەغدا ژمارە ١٣٢ لە ١٩٢٣/٥/٢١

دەنوسێت کە: شێخ مەحموود داوای لە دەوڵەتی عێراق کردووە خۆی و هێز و ئەوانەی سەر بەئەون ئامادەن گوێڕایەڵی دەوڵەت بن و دەوڵەتیش بەڵێنی داوە ئەگەر شێخ مەحموود بچێتە بەغدا ژیانی مسۆگەر دەکا.

لە ٢٨ی رەمەزان (٢٦ی نیسانی١٩٢٢) سوپایەکی دوو هەزار کەسی عەجەمان بە سەرۆکایەتی خالو قوربان (سالار مزەفەر) لە میاندواو ڕا هێرش دێنێتە سەر سابلاخ، هاوکات لەگەڵ هێرشی

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٠٨.

(2) هەمان سەرچاوە ل ٢٤٩.

هێزێکی تری شەشسەد کەسی بە سەرۆکایەتی نەسروڵڵا خان بۆ سەر سایینٚ قەلاّ و بۆکان. هێزە قارەمانەکانی ئێمە لەناوچەی سەقز بە سەرۆکایەتی سەید تەها ئەفەندی ئاگادار دەکرێنەوەو ئازایانە هەڵدەکوتنە سەریان و بە تەواوی تێکیان دەشکێنن.

لە ٢٦ی رەمەزانیش هێزەکانی دوژمن لە سابلاّخ بەری بەیانی لەگەڵ دەرکەوتنی خۆر گەمارۆ دەدرێن، دوای چوار کاتژمێر شەڕ، هێزەکانی دوژمن بە تەواوی تێکدەشکێنن و فەرماندەی هێزەکانیان واتە خالو قوربان و شازادە روحڵلاّ میرزا لە شەڕەکەدا بە خەنجەری کوردی قارەمان دەکوژرێن. ستیوارت سوڵتان بە دیل دەگیرێ و دوو تۆپ و حەوت رەشاش وەدەست لەشکرەکەی ئێمەی دەکەوێت. پاشماوەی هێزە تێکشکاوەکەی دوژمن بەرەو میاندوا و هەڵدێن و هێزەکانی ئێمەش دەکەونە دوویان، لە کاتی پەڕینەوەیان لە رووباری جەغەتو چەك و تفاقێکی زۆر دەکەوێتە دەست هێزەکانمان. لە ٣٠ی رەمەزانیش هێزە نەبەزەکانمان لەگەڵ هێزەکانی دوژمن دەکەونە شەڕ، لەئاکامدا فەرماندەکەیان (نەسڕولاّ خان) لەگەڵ چەند سوارێك هەڵدێن وکوردە پاڵەوانەکانیش پاشماوەی هێزەکە تەفرو تونا دەکەن. دەستکەوتمان تۆپێك و رەشاشێك بوو. بە دوو رۆژ شەڕ، هێزەکانی دوژمن بە یەکجاری تێکشکان. زیانەکانی ئێمە حەوت کوژراو و سیانزە بریندار بوون.

پیرۆزبایی و شانازی خۆمان ئاراستەی لەشکری سەرکەووتومان دەکەین و سلاّویان بۆ دەنێرین و ئەم شانازیانە کە ئەوانە بۆ ئێمە یان هێنا، دەبێ بەپیتی زێرین لە سەر لاپەڕەکانی مێژووی کوردستان بنوسرێن تا کورد بۆ هەمیشە شانازی بە رۆڵەکانی خۆیەوە بکات. هیوای چاك بوونەوە بۆ بریندارەکانی دەخوازین و هیواداریین خوای گەورە شەهیدەکانمان ببەخشێ کە لە پێناوی راستی و حەقدا شەهید بوون. رۆڵە و نەوەکانیان دەبێ بزانن کە تەواوی گەلی کورد ئەمەك باری قارەمانییەتی باوکانی ئەوانن، لەمەو دوا لە باتی باوکە شەهیدەکانیان تەواوی گەلی کورد چاودێر و ئاگاداریانە.

**موحەمەد جەمالەددین**

**چاریق**

**سەرنووسەری رۆژنامە: موحەمەد تورجانی، چاپخانەی غیرەت[1]**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٢٥٠-٢٥١.

## له راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەتی له ئەرزەڕۆم

**١٢ی کانوونی دووەم ١٩٢٤**

### کۆمیتەی کوردی

هەندێ ئەندامی کۆمیتەی کوردی و سەرکردەی ئەم کۆمیتەیە خالید بەگ هەمیشه پەیوەندیان بە منەوە هەبووە، بەڵام لەم دواییانەدا ئەم پەیوەندیانە لەبەر دووو هۆ پچڕاون: یەکەم لەبەر ئەوەی چاودێری گشتی پۆلیسی تورك بە تایبەتی لەسەر کۆنسوڵ خانەی ئێمە، هێند زۆرە هیچ چەشنە پەیوەندییەکمان لەگەڵ ناکرێت،هەم دە پرسن هەم روونکردنەوەیان لێماندەوێت. کۆمیتەی کوردیش بۆ خۆی ئەجینداى وریا و بەپارێزی هەیە،بۆ پەیوەندی کردن ئەو وردەکاریانە لەبەر چاودەگرن.

دووهەم: کۆمیتەی کوردی بە سەرۆکایەتی خالید بەگ بەپێی دەستووری هاوڕێ سورتیس پێی راگەیاندووە کە سەرەڕای ئەوەی کۆمیتەی کوردی چەند جار داوای یارمەتی و پەیوەندیان لە ئێمە کردووە تائێستا دەوڵەتی سۆڤییەت کەسێکی وای لە نوێنەرانی خۆی دیاری نەکردووە بینێرێ بۆ وتوویژ لەگەڵ کۆمیتەی کوردی. لە دوای ئەم راگەیاندنەی من بۆ خالید بەگ، ناوبراو لە وەڵامدا بەم چەشنە رایگەیاند: سەرەڕای بێ موبالاتی و وەلاخستنی داواکارییەکانی ئێمە لە دەوڵەتی رووسیای سۆڤیەتی (دەکرێ بڵێین کە داواکارییەکەمان کەبە تەشەبوس و ئیسرارەوە بووە رەتکراونەتەوە) بەڵام هەموو ئەندامانی کۆمیتە لەگەڵ دانشتیوانی باکووری کوردستان بەڵێن بە سۆڤیەت دەدەن کە هەمیشە لایەنگری سیاسەتی دەوڵەتی سۆڤیەت بن، تاکە شتێکیش کە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە رووسیا دەیەوێ یارمەتییە.

لە مرۆڤێك کە بە کوردستانی فارس و کوردستانی تورکیا داهاتبوو پرسیم پەیوەندی کورد بەروسیاوە و بۆچوونییان لەسەر رووسیا چۆنە؟ لە وەڵامدا وتی (وشە بە وشە دەیگێڕمەوە): «کە بە کوردستانی تورکیادا تێپەڕبووم، لە هەموو شوێنێك بەرەو رووی هەستی دڵسۆزی کوردەکان بەرامبەر بە رووسیا، دەبوومەوە، جارێکیان دژی رووسیای سۆڤیەتی قسەمکرد هەموویان بەبێ باوەڕی بێ دەنگ بوون، تەنیا یەکێکیان نەبێ کە رووسی باش دەزانی وتی: کە

ئەفسەرە تورکەکانیش دژی رووسیا قسەمان بۆ دەکەن. کوردەکان دەڵێن: دژایەتی رووسیا سیاسەتی تورکیایە بۆ ئەوەی کوردەکان نەبنە دۆستی رووسیا یان پێکەوە هاوکار نەبن.

کوردەکانی فارس، ناوچەی ماکۆ و خۆی، منیان وەك بەلشەفیکێك سەیر دەکرد و هەمیشە دەیانگوت: «بەلشەویك باشە» ئەوانیش خۆیان بە بەلشەفیك دەزانن و کوردەکانی ناوچەی کرماشان جاریٚ زۆرکەم لەبارەی رووسیای سۆڤیەتی، دەزانن، بەڵام وادیارە رووسیای قەیسەری بیرەوەری باشی بۆ بەجێهێشتوون، بۆیە مرۆڤی رووسی هەست بە لایەنگرانی دەکات[1].

**رەشنووسی پێرس بولیتۆن (کانوونی دووەمی ١٩٢٤)**

## هاتنی سەرکردەکانی کورد بۆ تەورێز

رۆژی شەشەمی کانوونی یەکەم ئۆمەر خان لەگەڵ سەد سەرکردەی کوردی هاتە تەورێز. فەرماندەی لەشکری تورك هەوڵدەدات کوردەکانی ناوچەی ماکۆ بەرەو لای خۆی راکێشێت و باوەڕیان پێبکات. ئێستا دەیان سەرکردە و ناسراوی کوردی لە ناوچەکانی ماکۆ و ورمێ و... لە تەورێزن.

فەرماندەی لەشکر بە گەرمی پێشوازی و بۆ خوانی ئێوارە داوەتیکردن و لە پێشەوە جێگای تایبەتی بۆ دیاری کردبوون. شوێنەکەیان باخ و قەزاقخانە بوو. مەبەستی گشتی ئەوەیە پیلانی تورك و نێردراوەکانیان بۆ کوردەکان روونبکاتەوە و لە تورکیا دایان بڕێت. بڕیارە لە کۆبوونەوەی داهاتووی سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد تیشك بخرێتە سەر پەیوەندی دوو قوڵی نێوان دەوڵەتی تاران و کوردان [2].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٣١٩.

(2) هەمان سەرچاوە ل ٣٢٠.

## هاتنی تەتەری شێخ مەحموود بۆ تەورێز

لە ١٢ی کانوونی یەکەم تەتەری نهێنی شێخ مەحموود بەم نامە رەمزیـە هاتـە کۆنـسۆڵخانە و ناوەڕۆکەکەی بەم چەشنەیە:

.... بە شانازیانەوە بـارودۆخی خۆمتـان پێـشکەش دەکـەم. تـەواوی ئـەو گەلانـەی کـە بـۆ سەربەخۆیی وڵاتەکەیان هەوڵیان داوە گەیشتوونەتە مەبەسـتی خۆیـان. حیجـاز و فەلەسـتین و عێراق بە یارمەتی ئینگلیز و سوریا بەیارمەتی فەڕەنسا دەوڵەتی خۆیان پێکهێنا.

منیش کە پەیوەندیم بە دەوڵەتێکی گەورەوە کردووە و پیاو و جەنگاوەرێکی زۆرم هەیە و پێنج ساڵیشە بەهیوای یارمەتی ئێوە لە بەربەرەکانێی دژی هێزی ئینگلیزدام و گەلەکەیـشم بـەپێی ئەو یارمەتییەی کە بەڵێنتاندا بوو لە پەشێوی دایە، چونکە نە پارەمان هەیە نە چەك، ناتوانین بەرامبەر بە دوژمنان رابوەستن و بەرگری لە خۆمان بکەین. ئەگەر بەڵێن بێ یارمەتیمان بـدەن و بەرپرسی مافی ئەم گەلە وەئەستۆ بگرن، دەبێ خالّی یەکەم یارمەتی سمکۆ بدەن. بەڵام هـۆی نەهاتنی (مورتوز)، هەڵسوکەوتی دوژمنانەی وەزیری جەنگی تـاران بـوو کـە بـو رەزامەنـدی ئینگلیز هێرشی کردە سەرمان. چاوەڕوانی بەڵێنی ئێوەین تـا ئێمـەش لـە گـەلانی تـر بـەجێ نەمێنین، هیوادارین ئەنجامەکەی بەم زووانە دەرکەوێت.....».

تێکستی ناوبراو وەرگێڕاوی دەقی نامەکەی شێخ مەحموودە، ئیمزا و مۆر و ئادرێسەکەی بەپێی شیفرەکە نهێنییە. ئەم شیفرە (نهێنی)یە هەر لە سەردەمی هاوڕێ گەروخۆفەوە کە تەتەرەکەی شێخ مەحموود هاتووە دیاریکراوە،هاوکات لەگەڵ ئەمە تەتەرەکەی شێخ مەحموود زارەکی ئەم شتانەی وت «شێخ داوا لە رووسیای سۆڤیەتی مەزن دەکات واقعبینانە بڕوانێتە ئـەم کێـشەیە ومامەڵەی لەگەڵ بکات. شێخ بۆخۆی لە سلێمانی دەژیت و لەشـکرێکی سـێ هـەزار نەفـەری رێکوپێکی هەیە. بۆ کـاتی پێویـست دەتوانێـت تـا دە هـەزار نەفـەر چـەکدار لـە عەشـایرە کوردەکانی خۆی کۆبکاتەوە. بانگەوازێکیشی بۆ عەشایرە عەرەبەکانی دانشتوی میزوپۆتامیـا دەرکردووە: هەولێر و کۆیە و کەرکوك و سالحییە (سـەلاحەدین) و ئەوانـە بـەڵێینان داوە کـە ئەگەر بێتوو شێخ دژی ئینگلیز راپەرێت تا دە هەزار نەفەر چەکداری دەدەنـێ. ئـەم سـەرکردە عەشایرانەی خوارەوە سەر بە شێخ مەحموودن:

١- حاجی رەسول سەرکردەی عەشایری پشدەر.
٢- حەمە ئاغا سەرکردەی عەشایری پشدەر.
٣- کەریم ئاغا سەرکردەی عەشیرەتی زەنگەنە.
٤- عەلی ئاغا سەرکردەی عەشیرەتی زەنگەنە.
٥- مەحموود خان سەرکردەی عەشایری هەورامان.

گەرچی سەرکردەکانی عەشایری پشدەر لەناوچەی ژێر دەسەلاتی ئینگلیزەکانن. «ئەو شارانەی خوارەوە لە ژێر دەسەلاتی شێخ مەحمووددان: پێنجوێن، هەڵەبجە، قەرەداغ....» «شێخ سێ جار نوێنەری خۆی ناردۆتە لای مستەفا کەمال و داوای یارمەتی کردووە. بەلام ناوبراو لە وەلام، وتوویەتی: ئێستا لەبەر ئالۆگۆڕی وتووێژی ئاشتی ناتوانێت یارمەتی بدات، بەلام لە داهاتوودا لەوانەیە بتوانێت یارمەتی بدات.

«شێخ داوای کرد بوو، کە نابێ باوەڕ بە (سەردار سپە) واتە (ڕەزاخان) بکرێت، چونکە پیاوی ئینگلیزە». شێخ پەیوەندی و بەردەوامی لەگەڵ سمکۆ هەیە.

«لە نزیك ڕەواندز چوار سەد سەربازی تورکی هەیە کە فەرماندەکەیان ئۆزدەمیر پاشایە».
«ئینگلیزەکان چوار ڕۆژەڕێ لە سلێمانی دوورن».

باوەڕکردن بەو هەواڵانەی تەتەرەکە باسی کردووە لەسەر شانی ناوبراو دەمێنێتەوە. ئەوەش بگوترێت ئەو ژمارانەی کە تەتەر سەبارەت بە عەسکەری تورك لە ڕەواندز گوتویەتی لەگەڵ هەواڵی (ئیپس کۆپ نیریس) وەك یەکە.نیریس دەڵێ هێزی تورك لەم ناوچەیەی کوردستان بە گشتی دەگاتە هەزار و پێنج سەد کەس.

١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣ بەپێی دەستووری هاوڕێ شۆمیاتسکی و هاوڕێ سلاڤۆتسکی بەزارەکی وەلامی شێخ درایەوە و دەڵێ: ئێمە هاوهەستی خەباتی شێخ مەحموودین بۆ سەربەخۆیی کوردەکان، بەلام بە لەبەر چاوگرتنی بارودۆخی نێونەتەوەیی هەموو یارمەتییەکی ڕاستەقینە لەم قۆناغەدا تەنیا پێگەی شێخ خراپ دەکات و لەوانەیە ئەنجامێکی پێچەوانەی هەبێت. کەواتە بۆ بەرژەوەندی هێندی کارو بارو نەبێ ئێستا ناتوانین یارمەتی ڕاستەقینەی بدەین.

لەپاڵ کێشەی نێوان عەشایرەکانی ناوچەی ماکۆ و خانی ماکۆ، کێشەی کوردیش بۆ سەرکردایەتی لەشکری تاران لەئارادایە. ئەم دوو کێشەیە ئەوەندە پێکەوەبەستراون کە دەسەڵات و کەسایەتی خان و دۆستایەتی لەگەڵ ژمارەیەك سەرۆك عەشایری کورد، بۆتە چەکێکی نادیار لە دەست فیێڵ بازێکی وەك (ئیقبال السەلتەنە). سەرداری ماکۆ بەر لە گیرانی بەپێی داخوازی کوردەکان دەجوڵایەوە و کەوتبۆ ژێر کاریگەری ئەوان، لەبەر ئەوە پێشبینی دەکرا گیرانی سەردار کاربکاتە سەر ڕێبەرەکانە عەشایری کورد و ئاژاوە بکەوێتە ناویان، واپێویست دەکا ڕێبەرە کوردەکان ئارام بکرێنەوە. لە راستیشدا هەروا بوو، عەبدوخان لە یەکەم سەردانی ماکۆ سەرۆك عەشایرەکانی کورد بانگ دەکاتە لای خۆی و بەناو عەشیرەتە کوردەکانی ناوچەکەشدا دەگەرێ و رایدەگەیەنێ کە عەشایرەکانی کورد چەك ناکرێن و کەس لەسەر گوناهەکانی پێشووی سزا نادرێ، بۆ نیشانەی نیاز پاکی تا سێ ساڵ مالیات لە کۆچەریەکان وەرناگیرێ و داب و نەریتی تۆڵە سەندنەوە دەگۆرێت، لەمەو لا هەرکەس بۆ هەر تاوانێك بەپێی یاسای نیزامی بە توندی سزا دەدرێ. چەند سەرکردەی کوردیش بە ناونیشانی بایەخ پێدانی تایبەتی، تفەنگ و فیشەکیان بەخەڵات پێدراوە،بۆ نموونە لیزگین ئاغا و.....

ئەم رەفتارانەی فەرماندەی لەشکری ئێرانی، تاڕادەیەك بوو بە هۆی ئارام کردنەوەی کوردەکان. ئینجا بۆ بەرز کردنەوەی دەور و کەسایەتی خۆی، هەنگاو دەنێ بۆ ئاشتکرنەوەی ئەو عەشایرانەی لێك دوژمنن. بۆ ئەم مەبەستە ئیلخانی سوڵتان، حەسەن خان لە ناوەندی تشرینی دووەم دەچنە لای «بەلخیکانەکان» و «خەلیکامەکان» بۆ کوژاندنەوەی ئاگری ئەو دوژمنایەتیەی کە لەسەر تاڵان و وێران کردنی هەوارگاکانی یەکتر دروست بووە. بەپێی راگەیاندنی ئیلخانی، گەشتەکەی سەرکەوتووبووە. بەڵام کوردەکان چارەسەری یەکجاری ئەم کێشەیان رانەگەیاندووە،چونکە ئەو زەروو و زیانانە (هی هەردوولا) هێشتا قەرەبوو نەکراونەتەوە. کوردەکان هەوڵ دەدەن بێ دەستێوەردانی فەرماندەی لەشکر ناکۆکیەکانیان چارەسەر بکەن و نیشانی بدەن کە پێویستیان بە یارمەتی دەرەکی نییە. دزی و تاڵان بەرەو نەمان دەچێ و کێشەی نێوانیان خەریکە چارەسەر دەکرێ.کوردەکان پێشوازی لەو ئاسایش و نەزمە دەکەن کە خەریکە باڵ بەسەر ناوچەکەدا دەکێشێ. بەڵام ئەم رێبازە سیاسیە زۆر ناخایەنێت و فەرماندەی لەشکری فارس بۆ کۆتایی تشرینی دووەم کۆنگرەی ڕێبەرانی کورد لە تەورێز رادەگەیەنێ. ئیلخانی سولتان و حەسەن خان دەچنە لای عەشیرەتە کوردەکان تا لەم

بارەوە راوێژ و ئامۆژگارییان بکەن و ئینجا وەڕێ کەون. ئاشکرایە کوردەکان ئەم هەنگاوانەی دەوڵەتی تارانیان زۆر بە دڵ نییەو لەسەر بیرەوەری تاڵی بەسەرهاتیخانی ماکۆ، بەو پەڕی بێ باوەڕی دەڕواننە ئەم پێشنیارە. بەڵام لەسەر ئامۆژگاری ئیلخانییەکان، هەندێ سەرکردەی عەشایر وەك تەزو ئاغا، ئەیوب ئاغا، مەمەد ئاغا لە عەشیرەتی بەلخیکی و ئوسمان داڤۆ لە عەشیرەتی بروکی و پاشان لە مەسیرکانلۆ (مەسر کەندی) و... رۆیشتوون بۆ تەورێز.

بەڵام خالید ئاغا سەرۆکی هەموو جەلالییەکان وەك لایەنگری سەردار هەر لە رۆژانی یەکەمەوە دەکەوێتە بەر رق وقینی فەرماندەی لەشکری دەوڵەت.

لە مانگی ئابی پار موئین ئەلسەلتەنە لە ئاوجیك ناوبراوی بە تاوانی ئەوەی پیاوەکانی حوشتریان دزیووە، بە مەبەستی وەرگرتنەوەی ئەو زەرەوزیانە،زیندانی دەکا. ئەوە بوو پاش بژارتنی ئەو زیانانە ئازاد دەکرێت. کە فەرماندەی لەشکر، سەرکردەی عەشایرە کوردەکانی بانگ کردە ماکۆ پتر بایەخی دا بە لیزگی ئاغا چونکە نەیاری خالید ئاغا بوو، عەبدوڵا خان فەرماندەی لەشکر بە نیشانەی سوپاس یەکەم کەس بوو بە تفەنگ و فیشەك خەڵاتی کرد. ئیاخانیش لە سەردانی ناوچەکە، یەکەم جار سەردانی لیزگی ئاغای کرد. بەڵام خالید ئاغا کە تا ئێستا بە سەرکردەی جەلالییەکان دەناسرا بە ئەنقەست پشتگوێ خرا. فەرماندەی لەشکر دەورو دەسەڵاتی ناوبراوی هێنایە سەر سفر، بۆیە هەموو ماڵ و منداڵی خۆی بە هێمنی کۆکردەوە و بەرەو تورکیا رۆیشت.

رۆشتنی خالیدئاغا بۆ تورکیا بایەخێکی زۆری بۆ کێشەی کورد هەیە، چونکە لەناو عەشایرە کوردەکاندا جێگای تایبەتی و بەرزی هەیە. بۆ ئەوەی ئەم کێشەیە لەگەڵ خالید ئاغا چارەسەر بکەن، ئیلخانی بە پەلەو بە تایبەتی، بەدەست و دیارییەوە(تفەنگ و فیشەك) پیاو دەنێرێتە لای خالید ئاغا و پێی دەڵێ بابگەڕێتەوە جێ و شوێنی خۆی، دەوڵەتی فارس ناچاری ناکا بڕوات بۆ تەورێز.

لە وەڵاما، خالید ئاغا دەڵێ، کە فەرماندەی لەشکر سەرۆکایەتی ئەو عەشیرەتەی لێ وەرگرتۆتەوە و لیزگی ئاغای کردۆتە گەورەی عەشیرەت و ئێستا نەگەورەیەو نە خەزنەشی لەوێ بەجێ هێشتووە، هەموو سەروەت و ماڵەکەی ئەو بەرانانەن کە لەگەڵ خۆی هێناونی، بۆیە لەسەر سنووریش بە ئاسانی دەرباز بووە هاتۆتە ناو خاکی تورکیا. بە قسەی خۆی گوایە باری

ژیانی لە نێو خاکی تورکیادا باشە و تورکەکان ئاگایان لێیەتی و چەکی ناوێت و ناگەڕێتەوە بۆ ناو فارس و وەدوای فەرماندەی لەشکر بکەوێ بە چارەنووسی سەرداری ماکۆ گرفتار بێت.

دوای ئەمە ئیلخانی سولتان حەسەن خان رایگەیاند کە کەس ناچارناکرێت بڕوات بۆ تەورێز، هەر کەس بۆ خۆی ئازادە لەم بارەوە بڕیار بدات، ئەوە بوو بەشێك لە سەرکردەی عەشیرەتەکان بڕیاریان دا بە ئارەزووی خۆیان بۆ بەشداری لەم کۆنگریە بڕۆن بۆ تەورێز، ژمارەی ئەو سەرکردە کوردانەی عەشایری جەلالی و میلان کە رۆشتوون بۆ تەورێز نزیکەی پەنجا کەس بوو.

کوردەکان چاوەڕوانی بڕیاری ئەم کۆنگرەیە دەکەن، چونکە بڕیاری کۆنگرە پەیوەندی راستەوخۆی بە هەڵسوکەت و ژیانیانەوە هەیە.

دەبێ ئەوەش بڵێین، فەرماندەی لەشکر هیچ بەڵێنێکی خۆی نەبردەسەر. ئەو بەڵێنەی کە لەسەر فەرامۆشکردن و لە بیرکردنی گوناهی کۆن درابوو تەنیا قسەی جوان بوو و هچی تر. رۆیشتنی ئیلخانی بۆ لای هۆزەکانی بەلیخییەکان و خالیکانییەکان دەکرێ بە لادانێك دابنرێ لەو بەڵێنانەی دراون، چونکە دوژمنایەتی نێوان ئەو دوو هێزە لەبەر باری خراپی ژیانیانە.

بەکارهێنانی راستەوخۆی شێوازی سەربازی وەك کێشەی عیسا حوسێن ئوغلی و فەتاح عەلی ئۆغلی (لە هۆزی بەلیخانییەکان) لەسەر دزینی سی ئەسپ پێنج ساڵ لەمەو بەر (یەکەم لە دووەمی دزیووە) پاشان کێشەی تاهیر حەسەن ئوغلی و شیراز خان لەسەر دزینی ئەسپ. کێشەی مەمەد ئوغلی و حەسەن خەلەفلی لەسەر سێ سەد لیرە، و کێشەی ئەسەدوڵا بەگ لەگەڵ کوردەکانی ئومەر ئوشاگی لە خێڵی بەلیخییەکان و گەلێك کێشەی تر.... سەر ئەنجام رسواکردنی هەشت کورد بەتۆمەتی دزی، لە پێش چاوی خەڵك. ئەمانە هەمووی ئەو مەترسییە دەگەیەنن کە فەرماندەی لەشکری فارس بە جدی خەریکی پیلان دانانە لەناو کوردەکان.

ئەگەر ئەم شتە درێژە بکێشێت، دەبێ هەموو شتێکیان بفرۆشن و تەنانەت ژن و منداڵەکانیشیان بە بارمتە دابنێن تا ئەو تالانانە قەرەبوو بکەنەوە کە لەم ساڵانەی دوایی کردوویانە.

بێ باوەڕی کوردەکان بە دەسەڵاتدارانی لەشکر لە ناوچەکەدا لەسەر کێشەیەکی گرینگی ترە: کێشەی سەربازگیری،لە ناوچەکەدا وا بڵاوبۆتەوە کە دەوڵەتی فارس دەیەوێ دەستەی چەکداری

قازاق له کورده‌کان دروست بکا. ئه‌م کێشه‌یه بۆ کوردان زۆر و ناخۆشه، له‌م دواییه‌دا سه‌رکرده‌کانی کورد له ماڵی ته‌زوو ئاغا کۆبوونه‌ته‌وه‌و بڕیاریان داوه ده‌سته‌ی قازاق دروست ناکه‌ن و ئاماده‌نین رۆڵه‌کانی خۆیان بنێرن، به‌ڵام وتوویانه ئه‌گه‌ر ده‌وڵه‌تی فارس بیه‌وێ ئاماده‌ین وه‌ك کورده‌کانی تورکیا حه‌میدییه‌یان پێبده‌ین.

به‌م پێیه ده‌بی بڵێین سیاسه‌تی ئێستای ده‌وڵه‌تی فارس ئه‌وه‌یه کورده‌کان له‌سه‌ر زه‌وی و زار سه‌قامگیر بکا خه‌ریکی کشتوکاڵ بن و ناچاریان بکات که واز له ژیانی کۆچه‌ری و سه‌رگه‌ردانی بێنن. ئه‌مه‌ش بۆته هۆی ئه‌وه‌ی پتر باوڕیان به ده‌وڵه‌تی فارس نه‌مێنێ. به‌م چه‌شنه هه‌وڵی کاربه‌ده‌ستانی ده‌وڵه‌ت بۆ ئه‌وه‌ی زه‌وی و زاربده‌ن به کورده‌کان و قوتابخانه بۆ منداڵه‌کانیان بکه‌نه‌وه و یا داوایان لێ بکات منداڵه‌کانیان بنێرنه قوتابخانه‌کانی ماکۆ، ناچاریان بکه‌ن و ئه‌مانه‌ته‌کانیان نه‌به‌ن بۆ یه‌یلاق و له‌قشلاق بیانهێڵنه‌وه(واته نه‌به‌ن بۆ کۆیستان و له گه‌رمه‌سێر بیانهێڵنه‌وه)، ئه‌مانه له لای کورده‌کان به ده‌ست تێوه‌ردان له ژیان و په‌لامار بۆ سه‌ر ئازادیان، داده‌نرێت. کورده‌کان پێیانوایه ئه‌گه‌ر واز له ژیانی کۆچه‌ری بێنن و له شوێنێکدا سه‌قامگیربن ده‌وڵه‌ت چیتر شه‌رمیان لێ ناکات و به هێمنی له‌گه‌ڵیان ناجولێته‌وه.

دانانی پێگه‌ی سه‌ر سنوور به سنووردار کردنی ئازادی یا رێگرتن له کۆچکردنیان داده‌نێن. به‌م چه‌شنه یاری کردنی فه‌رمانده‌ی له‌شکری تاران به کورده‌کان، که‌ش و هه‌وایه‌کی بێ باوه‌ڕییان خولقاندووه و گه‌یشتۆته راکردنی کورده‌کان بۆ ئه‌و دیوی سنوور. جگه له خالید ئاغا که رۆیشتووه بۆ تورکیا له‌م دواییانه هه‌ژده بنه‌ماڵه‌ی تر له جیندنکییه‌وه رۆیشتوون بۆ تورکیا.

## تورك و کورد

تورك نه‌ك هه‌ر پێش به راکردنی کورده‌کانی فارس بۆ ناو کوردستانی تورکیا ناگرن، به‌ڵکو پتر بواریان ده‌ده‌نێ بێن بۆ ناو تورکیا. پڕۆپاگه‌نده‌ی زۆر له‌ناو کورده‌کان ده‌کرێت بۆ رۆیشتنه تورکیا و ژیان و مانه‌وه‌یان. تورکه‌کان به‌دابه‌شکردنی زه‌وی و زار به‌سه‌ریاندا ده‌یانه‌وێ کاربکه‌نه سه‌ر کورده‌کانی ئه‌و دیو.

بەپێی هەندێك هەواڵ خالید ئاغا توانیویەتی بچێتە ئیگدیر و تورکەکان بەڵێنیان پێداوە لە گوندێکی نزیك ئیگدیر جێ و شوێنی پێبدەن. ناوبراو دەترسا تورکەکان تەسلیمی دەوڵەتی فارسی بکەنەوە لەمبارەوە لە کاربەدەستانی تورك لە ناوچەکەدا پرسیاری کردبوو، لە وەڵامدا پێی دەڵێن هیچ ترس و گومانێکی نەبێ و لە لای تورکان لە مەترسیدا نییە. پەنابەرێتی سمکۆیان بەنمونە بۆهێنابۆوە. سمکۆ گوێی نەدایە ئامۆژگاری تورکان ئەوە بوو شکاندیان و سامان و ژن و کوڕی لە دەستدا. بەڵام کە ژێردەستی تورکیای پەسەنکرد، لێبوردنیان بۆ دەرکردوو لە گوناهەکانی رابردووی خۆشبوون و پێنج گوندیان لە ناوچەی باش قەڵا پێدا، پارەیان پێدا، ژن و ماڵەکەیان بۆ گەڕاندەوە و ئێستالای تورکان پیاو چاکە. بە کورتی تورکان بۆ بە هێزکردنی تواناو و دەوری خۆیان لەناو کوردەکانی فارس و راکێشانیان لە هیچ هەوڵ و تەقەلایەك درێغی ناکەن.جگە لەوەش دەڵێن لە باری ئایینییەوە تورك و کورد یەکن و ژیان بۆ ئەوان لە ناو تورکیا باشترە وەك لە ناو عەجەمان و بە بەربلاویش خەڵك وەردەگرن. بەڵام لەناو کوردەکاندا خەڵکانێك هەن کە لایەنگری رووسیای سۆڤیەتی دەکەن. نە تورك و نە فارس لێیان رازی نین.بۆیە بەباشی دەزانن بۆ ژیانێکی ئارام بێنە یەکێتی سۆڤیەت. بۆ نموونە یەکێك لە سەرکردەکانی عەشایەری کوردی بەلیخەکانییەکان داوای لە کۆنسوڵخانەی ئێمە لە ماکۆ کردووە دەستور بە پۆستەکانی سەر سنووری رووسیا بدات ئەگەر هاتوو بۆ پەنابەری پەڕیوەی ناو خاکی سۆڤیەت بوون رێیان لێنەگرن. کوردێکی زۆر داوای ئاوایان لە کۆنسوڵخانەی ئێمە کردووە.

## پەیوەندی ناوخۆی عەشایری کورد

ئەو دوژمنایەتییەی لەناو سەرکردە و ناو خودی عەشیرەتەکان هەبوو، وەك دوژمنایەتی بەلیخانییەکان و خەلیکانەکان، ئێستا بەرچاو ناکەوێت. سەرۆك عەشیرەکانی کورد لەکاتی رۆیشتنیان بۆ کۆنگرەی تەورێز، دەستووریان بەهۆزەکانی خۆیان داوە نەزم و ئارامی خۆیان بپارێزن و بە گوێرەی پێویست بجولێنەوە،تادەگەڕێنەوە بە هیچ شێوەیەك بیانوو نەدەنە دەست فەرماندەکانی لەشکر دەست لە کاروباری ناوچەکە وەردەن. لە راستیدا کوردەکان لە کانوونی یەکەمدا ئاسایش و نەزمیان راگرتبوو و ناکۆکییەکانیان وەلانا بوو.دەیانەوێ بەپێی دەستووری سەرۆکەکانیان، ئاشتیانە چارەسەری کێشەکانیان بکەن.

## ورمێ- کوردەکانی ورمێ

کێشەی زەوی داری لە مەحاڵ و تەرگەوەڕ و دەشت و مەرگەوەڕ، وەك رابردوو کێشەیەکی سەرەکییە و دژایەتی بەگە کوردەکانی وەخۆ گرتووە، کە لە بەرژەوەندی فەرماندەی لەشکری هێزەکانی تاران و سەرئەنجام برایانی (مانا سیریانی)، دایە. مافی زەویندداری بۆ بەهێزکردنی دەوری ئێمە لەناو کوردەکانی ورمێ بە کەڵکە.

شایانی باسە کە زەویننداری ئێمە لەناوچەی ورمێ کەوتۆتە سەر ئاراستەی سیاسەتی کوردی. فەرماندەی لەشکری فارس کە بە چەککردنی کوردەکان لە سێ مانگی هاویندا گەیشتووەتە ئەو قەناعەتەی لەگەڵ کوردەکان پەیمان ببەستێت، ئەگەر باوەڕیشیان پێك نەبێت لانی کەم بێ لایەنی زۆربەی سەرکردە کوردەکانی سەر سنوور بە دەست دێنێت.

سیاسەتی تورك لەناو کوردەکانی سەر سنوور و ناو کوردەکانی فارس بۆتە هۆی ئەوەی دەست بە خۆپێشاندان نەکەن.

سیاسەتی کاربەدەستانی تارانیش لە ناوچەکەدا وەك ئەو سیاسەتەیە کە بەرانبەر شاهسەوندەکانی دراوسێمان گرتیانەبەر، واتە وازیان لە چەککردنی کوردەکان و مالیات وەرگرتن هێناوە. فەرماندەی لەشکری فارس لەمانگی تشرینی دووەم لەسەر ئەو هەوڵدانە بۆ لەناوبردنی زەویننداری برایانی (مانا سیریان) بەردەوام بوو، دەیەویست بەم چەشنە برایانی مانا سیریان بە وەرگرتنی پەنجا هەزار تمەن و پێنج گوند رازی بکات، واز لە زەویننداری لە سێ ناوچەی کوردنیشین بێنن. ئەگەر ئێمە دژی راوەستاین ئەوا مافی هاوڵاتی بوون لەو دوو کەسە کە خەڵکی رووسیان، واتە برایانی مانا سیریان (کارا پیتا و گیگۆر) وەردەگرێتەوە.بە دروستکردنی بەڵگەی ساختە دەیەوێ بیسەلمێنی ئەم زەوی و زارەی لە دەڤەری ئەواندایە هی کوردەکانەوکاتی خۆی ئیقبال الملوك بە ناشەرعی داگیری کردووە و داویەتی بە برایانی مانا سیریان. بۆ روونکردنەوەی پەیوەندی نێوان بەگە کوردەکان و زەوی زاری برایانی مانا سیریان پێویستە پێشەکی پەیوەندی نێوان خۆیان روونبکرێتەوە.

هۆزی سەیدانی (لە عەشیرەتی هەرکی) کە لە مەحالی مەر گەوەڕدا دەژین دەکرێنە دوو دەستە: دەستەی یەکەم بە سەرۆکایەتی کەریم خان و هی دووەم بە سەرۆکایەتی حوسێن ئاغا.

دەستەی کەریم خان ئەمانەن: کوڕەکانی واتە ئەحمەد خان، محەمەد حوسێن، میر سوڵتان و هەندێ لە خزمەکانی واتە ئافتاب سەید ئاغا، قادر ئاغا و باسو.

دەستەی حوسێن ئاغا: بەگەکانی ترن وەك: تەیمور ئاغا، بایز ئاغا، عەبدال ئاغا، عەرەب ئاغا، شێخ محەمەد و سەرئەنجام براکانی حوسێن ئاغا واتە رەشید و حاجوان، ئەم دوو دەستەیە لە مێژە دوژمنی یەکترن: دوای مردنی عەلی ئاغا باوکی حوسێن ئاغا کە سەرۆکی گشتی هۆزەکە بوو سەرکردایەتی هۆزەکە کەوتە دەست برای بچووکی عەلی ئاغا واتە کەریم خان. کەریم خان دژی کوڕەکانی برا گەورەکەی کە مردبوو راوەستا و مافی موڵکدارییەتی زەوی و زاری چەند گوندی لێ زەوتکردن. زەوی ئەو چەند گوندە تامردنی عەلی خان موڵکی گشتی هەردوو براکە بوو. لەبەر ئەمە دوژمنایەتی نێوان بەگەکانی مەرگەوەڕ بەرەبەرە زیادی دەکرد و دەبوو بە بیانووی هەمیشەیی بۆ بەگژ یەکداچوونیان. کەریم خان رایگەیاند دەیەوێ بە هانای دەوڵەتی فارسەوە بچێ و گوندێکیان بە هەرزان لەناوچەی مەرگەوەڕ لێ بکڕێت. لەبەر ئەوەی حوسێن ئاغا پارەی کڕینی گوندێکی وای نەبوو، خۆی ولایەنگرانیشی دەترسان کەریم خان هەرزانتر لە برایانی مانا سیریان گوندەکان بداتە کوردەکان،دژی مامی وەستا. بۆیە پەیوەندی نێوان ئەم دوو دەستەیە وا ئاڵۆزبووە، تەنانەت حوسێن ئاغا هەڕەشەی کردووە (ئەگەر کەریم ئەو گوندانەی بە کرێ دراون لێیان بکڕێت) بۆهەمیشە مەرگەوەڕ بەجێدێڵێ. کوردەکانی بەگزادەی دەشتێ (کەبەشێکیان لەتەرگەوەر دەژین) تائەم دواییانە کاریان نەبوو. لێرەدا دەکرێ بڵێن زیانێکی گەورە بەر پرستیژی میری پێشووی بەگزادەکان واتە نوری بەگ لەناو بەگەکانی تردا، کەوتووە. لەبەر ئەو ناکۆکیەی نێوان نوری بەگ و برازاکەی واتە نورکا، نوری بەگ ئامادەنەبوو موڵکایەتی دوو دانگی زەوی لە گوندی ئامبا بدات بەبرازاکەی، هۆیەکی تر (گوایە نوری بەگ تەماعی لە ژنی نورکا کردووە). بەڵام کە نوری بەگ لەگەڵ حاجی ئاغا و پیرۆت ئاغا (سەرۆکی هۆزی مانداى و عەشیرەتی هەرکی) بۆ کڕینی گووندی دەشتێ، پێکەوە دەست بەکاربوون خەڵکێکی زۆر بەتایبەت بەگە بێ دەسەڵاتەکان بە سەرکردایەتی تایەر بەگ کە توانیویەتی چواردە بەگ لەگەڵ خۆی یەك بخات، دژی راوەستان. لە لایەکی تر ئەمانە مەترسیان خستووەتەسەر حاجی ئاغا و نوری بەگ و پێیان گوتوون ئەگەر ئێوە ئەم مەحاڵە بکڕن ئێمە لێرە دەڕۆین و گوندەکان بە خاوەنەکانیانەوە دەسووتێنین و خوێنتان لە سەر زەوی باو باپیرانمان دەڕێژین. ئەم هەڕەشانە کاریان کردۆتە سەر نوری بەگ و لە کڕینی ئەو زەوییانە دڵسارد بۆتەوە.

پەیوەندی نێوان کوردەکان لەسەر ئەم بناغەیە پەرە دەگرێ، کێشەی زەوی و زاری برایانی مانـا سیریانیش لە ئالۆزبووندایە لە رۆژی ٢٠یتشرینی یەکەم بە بۆنەی زەماوەندی کچی نوری بەگ تەواوی سەرۆك عەشیرەتەکانی بەگزادە و ئاغاکانی هەرکی لە گوندی ئامبـا کۆدەبنـەوە و لـە کۆبوونەکەدا باسی کڕینی زەوی دێتە پێش، حـاجی ئاغـا لـە قـسەکاندا داوا لـە ئامـادبووان دەکات و دەڵێ دەوڵەتی تاران دەیەوی سێ مەحال بۆ کوردەکان بکڕێ، و لێیـان دەپرسـێ ئایـا بەگەکانی کورد ئامادەن بەشداری بکەن؟ زۆربەی بەگزادەکان و بەشێك لـە ئاغاکـانی هـەرکی (نەیارەکانی کەریم خان) ئەم پێشنیارەی حاجی ئاغا پەسەند ناکەن و رادەگەیـەنن کـە ئەگـەر هەموو سەرو ماڵیان بفرۆشن ناتوانن نیوە گوندێکی پێبکڕن، لەبەر بـێ پـارەیی نـاتوانن کـار لەسەر ئەو زەوی و زارە بکەن. زۆری پێناچێت فەرمانداری ورمێ لە ٦ی تشرینی دووەم حاجی ئاغا و کەریم خان و نوری بەگ و شێخ ئیسماعیل و تامبور ئاغـا بـانگ دەکاتـە لای خـۆی و پێشنیاریان پێدەکات بەزووترین کات پارە بۆ کڕینی گوندەکان کۆبکەنەوە. بەڵام نوری بـەگ و تامبور ئاغا دژی ئەو پێشنیارە دەوەستن و دەڵێن بەگزادەکان پارەی کڕینی دەشت و بەشێك لە تەرگەوەریان نییە. حاجی سەتوەت تورە دەبێت و هێرش دەکاتە سەر بـەگزادەکان و بڕیـار دەدا (ئەگەر لە ماوەی دوو رۆژدا پارەی پێویست ئامادە نەکەن)، سزایان بدات. بەگزادەکانی کـورد کە لە هەڕەشەی سەتوەت دەترسن هەمان رۆژ دەچن بـۆ سـەڵماس و لای فەرمانـدەی لەشـکر شکایەت لە حاجی سەتوەت دەکەن و پەنا بۆ ئومەر خان دەبـەن تـا بکەوێتـە نێـوان ئـەوان و فەرماندەی لەشکر. لە وتووێژ لەگەڵ عەبدوڵا خان (فەرماندەی لەشکر) کوردەکان تێدەگەیـەنێ کە پارەی پێویست بۆ کڕینی زەوی و زار کۆبکەنـەوە، چـونکە لـە بەرژەوەنـدی کـوردان دایـە (ئومەر خانیش وەك خۆی باوەڕ بە بەگە کوردەکان دێنێت کە زەوی و زارەکە بکڕن و ئامادەیی خۆیشی دەردەبڕێت کە لەم کڕینەدا بەشداری بکـات (ئـەوە بـوو کـە لـە رۆژی ١٠ی تـشرینی دووەمدا بەگزادەکان دەگەڕێنەوە بۆ ورمێ و تاکۆتایی مـانگ پارەکـەیان بـۆ کـۆ ناکرێتـەوە. فەرماندەی لەشکر حاجی سەتوەتی فەرماندار ئاگادار دەکاتەوە کە دەبێ لەم رووەوە بە پـارێز لەگەڵ کوردەکان بجوڵێنەوە.

لە هەمان کاتدا فاکتێك هەیە دەور دەبینێ لەناو بـەگزادە بـێ دەسـەڵاتەکانی کـورد. شەشـی تشرینی دووەمی ئەمساڵ چواردە بەگزادەی تەرگەوەری دەشتێ (خان عەبداڵ لە گوندی قوڵاتی، کامیل بەگ لە گوندی تولاکی، خورکو لە گوندی زەمان، تابور ئاغا لە گونـدی کـوڵێ، بـاقیر بەگ لە گوندی دەربەند، سەیدق خان بەگ لە گوندی دەزگیر، بەکر بەگ و ئەمین بەگ لە گوندی

شێخ مامچین و هتد...) لەماڵی گریگۆر مانا سیریان کە خەڵکی رووسیایە کۆدەبنەوە و بەڵێنی دۆستایەتی بە کۆنسوڵی ئێمە دەدەن و ڕاییدەگەیەنن کە ئامادەن گوندەکان لەم مەحالەدا بە کرێ هەڵگرنەوە، وەکالەتیشیان بە خان عەبداڵ داوە لەگەڵ برایانی مانا سیریان بکەوێتە وتووێژ تاسەر لە نوێ ئەو گوندانەی مەحاڵ بەکرێ بگرنەوە.

١٥ی تشرینی دووەم ئەم وتووێژانە سەرکەوتووانە دوایی دێت: بەپێی ئامۆژگاری هاوڕێ دوبسۆن برایانی مانا سیریان ئەو گوندە ئاوەدانانەی دەشتی مەحالیان بەکرێ دا بە یانزە بەگی کورد، کە بەپێی مەرج و بەرژەوەندی کوردەکان پەیمانەکە دەبەسترێت. کردەوەی بەگە کوردەکان بوو بە هۆی قین و تووڕەیی دەسەڵاتدارانی فارس و کەوتنە ئازاردانی کوردان و لە رۆژی ٢٠ی تشرینی دووەم خان عەبداڵ بەناوی یانزە بەگی کوردەوە کە پەیمانی لەگەڵ برایانی مانا سیریان بەستبوو لە لایەن دەسەڵاتدارانی فارسەوە دەستگیر دەکرێت، گوایە گرتنەکەی لەبەر نەدانی هەشتا تمەن قەرزی کابرایەکی خەڵکی فارس بووە. لە رۆژی ٦ی کانوونی یەکەم دوای وتووێژێکی دوورودرێژی خان عەبداڵ لەگەڵ کاربەدەستانی ناوچەی ورمێ، بۆ ئەوەی کارەکانی برایانی مانا سیریان داپۆشن خان عەبدوڵڵا بەدانەوەی بیست تمەن قەرز ئازاد دەکرێ. دەبێ لە ٢٠ی کانوونی یەکەمدا جارێکی تر لەسەر ئەو کێشەیە کۆنسوڵخانەی ئێمە داوا لە هاوڕێ دبسون بکات، لەسەر پێشێلکردنی مافی ئەو دوو هاوڵاتیەی رووسیا واتە برایانی مانا سیریان کاراپیت و گیوگور کارگێڕی دەوڵتی فارس ئاگادار بکاتەوە. ئەو هەواڵانەی کە لەسەرەوە سەبارەت بە کوردەکانی ورمێ لە مانگی کانوونی یەکەم باسکرا نیشان دەدەن:

١- سەرکردە کوردەکان ئەمبەرو ئەو بەردەکەن و دەیانەوێ زەوی و زاری سێ مەحال بخەنەژێر دەستی خۆیان یا بیانکڕن، بەبێ ئەوەی بەرژەوەندی ئەو بەگە بێ دەسەڵاتانە لەبەر چاوبگرن یا لەگەڵیان پێکبێن.

٢- پێویستە کارێکی وابکەن ژمارەی ئەو کوردانە کەم بکەنەوە کە بە هۆی ئێمە لەگەڵ برایانی مانا سیریان زەویەکانیان بە کرێ گرتووە.

٣- دژوارترین شت بۆ ئەوەیە بتوانین کاری برایانی مانا سیریان بە باشی جێبەجێ بکەین[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٣١٩-٣٣١.

# کوردستانی فارس (ئێران)

## کورتەی ڕووداوەکانی کوردستان

## لە ١٦ی تشرینی یەکەم تا ١ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٣

سەرکردە کوردەکانی باکوور دەیانەوێ پەیوەندیان لەگەڵ سمکۆ هاوڕێیانە بێ و پەرەی پێبدەن. ئێمە لە بۆلتنی پێشوودا نووسیبومان کە ئەنجامی شکستی سیاسەتی بەرەو ئینگلیز و تورکیا ڕۆیشتنی کوردەکان، بوو بە هۆی بەرەو پێش چوون و پەرەسەندنی گرووپی خالید بەگ لە سەرتاسەری کوردستان و وەك ناوەندێکی یەکگرتوو ڕێکوپێکی لێهات کە هێشتا سیاسەتی خۆی نەگۆڕیووە،بە واتایەکی تر بە یارمەتی رووسیای سۆڤیەتی دەیەوێ لەتورکیا ئازادی بۆ کوردان بە دەست بێنێ. خالید بەگ لە کوردستان زۆر بە ناوبانگە، کوردەکانی ناوچەی ورمێش زۆر بە ئاگادارییەوە دەڕواننە ڕووداوەکانی باکووری کوردستان بەتایبەت کۆمیتەی ئەرەزەڕۆم. کۆنسۆڵی ئێمەش لە ورمێ ئەندامێکی کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی بەناوی کەمال فەوزی بەگ خستوەتە ژێر چاودێری، کە ئێستا بەرەبەر هاتووچۆی لای سمکۆ لە گوندی قەرەتو دەکات و ناوبراو بەنهێنی هاتووەتە ورمێ بۆ پەیوەندی کردن بە کۆنسۆڵی ئێمە و نامەی سمکۆشی بۆ کۆنسۆڵ هێنابوو. ئەو سەرچاوانە دەڵێن: ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٢٣ سمکۆ بەنهێنی هاتۆتە ورمێ و سەردانی یەکێك لە بەگەکانی کردووە بە ناوی مەحموود بەگ و کەمال فەوزی بەگیش نامەیەکی بۆ کۆنسۆڵی ئێمە ناردووە کە ناوەڕۆکەکەی بەم چەشنەیە:

**بۆ: کۆنسۆڵی ڕووسیا لە ورمێ**

بەرێز بە شانازییەوە پێتان رادەگەیەنم:

١- من ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەیەکی نهێنی کوردم.

٢- سمکۆ منی لە ئەستەنبۆڵەوە بۆ ئێرە دەعوەت کردووە، نامەیەکی بە شیفرەوە بۆ نوسیوون و بەنهێنی منی نارده لاتان.

٣- ئەمشەو دێمە لاتان بۆ ئەوەی وتە گرنگەکانتان پێ بڵێم. تکایە بە پاسەوانی دەرگای کۆنسوڵخانەکەتان دەستوور بدەن مۆڵەتم بدات بێمە ژورێ و هیچ پرسیارێکم لێنەکات. سڵاو و رێزم هەیە بۆتان. کەمال فەوزی»

هەر ئەو رۆژە ئێوارەکەی کەمال فەوزی هاتە لامان. پێناسی ئەندامییەتی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی کوردی خۆی لەگەڵ ئەندامییەتی دەستەی پڕوپاگەندەی کۆمیتەی کوردی پێنیشاندایین.

لە کاتی وتووێژدا کەمال شتێکی سەرنج راکێشی دەربڕی. بە قسەی ناوبراو گروپی خالید بەگ هەمیشە پەیوەندییەکی نزیکی هەبووە لەگەڵ دەستەیەك سەرکردەی کورد لە ئەستەنبوڵ کە ئەوانیش بۆ سەربەخۆی کوردستان هەوڵ دەدەن، کە کەمال فەوزیش یەکێك لە ئەندامانی ئەو تاقمەیە. (کەمال فەوزی لە کاتی داگیرکردنی ئەستەنبۆڵدا لە لایەن هێزی ئانتانتەکان کۆمیساری کاروباری کوردان بووە لە دەوڵەتی سوڵتان مەحەمەد). بە وتەی کەمال ئەو سەرکردە کوردانەی ئەستەنبوڵ بە لایەنگری ئینگلیز دەستیان بە چالاکی کرد، بەڵام پاشان هەڵوێست و بۆچوونی کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆمیان گرتەبەر و گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە تەنیا بە یارمەتی رووسیای سۆڤیەتی کورد دەتوانێ بە ئامانجی خۆی بگات و ئەنجامێکی باشی هەبێ. لە کاتی هێرشی لەشکری کەمالیستەکان بۆ سەر ئەستەمبۆڵ بەشێکی زۆر لە ئەندامانی کۆمیتەی نهێنی کوردی شار بەجێ دێڵن و ژمارەیەکیان بەنهێنی دێنە ئەرزەڕۆم. کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردی بەهاتنی ئەوان بە هێزتر دەبێ و زیاتر پەرە دەگرێ، نە تەنیا نوێنەری کوردەکانی ویلایەتی ئەرزەڕۆم و بەشێك لە باکووری ویلایەتی وان و ویلایەتی بەتلیس و شاری موش، بەڵکو ئێستا داوای نوێنەرایەتی هەموو کوردەکانی باکووری کوردستان دەکا.

لەبە رئەوە بوو کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردی ناوی گۆڕا بە «کۆمیتەی ناوەندی کوردستان». لە هەمانکاتدا رێبازی کۆمیتە کە بەرامبەر بە کێشەی کورد روون دەکرێتەوە: ئەگەر لە رابردوودا کۆمیتەی ئەرزەڕۆم ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لە چوارچێوەی دەوڵەتی تورکیا وەك بەرنامەیەکی مینیمەم بۆ خۆی دانابوو، بەڵام ئێستا لە پارەوە کە تورکەکان بەکردەوە نیشانیاندا نایانەوێ هیچ داخوازییەکی نەتەوەیی کورد جێبەجێ بکەن، ناچار بووە دروشمی سەربەخۆیی کوردستان هەڵبگرێت.

بەپێی ئەم بارودۆخە کۆمیتە هەوڵ دەدات ئەم بڕیارانە بدات و هەنگاویان بۆ هەڵگرێت:
یەکخستنی تێکڕای سەرکردەکانی باکووری کوردستان و ئامادەکردنیان بۆ ڕاپەڕینێکی گشتی چەکدارانە. بەستنی پەیوەندی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت و وتوویژ لەسەر ئەو یارمەتییەی دەتوانێ بیدا بە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد، دواتر پەیوەندی لەگەڵ سەرکردەکانی باشووری کوردستان.
هەروەهایەکێك لە بڕیارەکانی کۆمیتە ئەوە دەبێت، ئەندامێکی خۆی بنێرێتە لای سمکۆ بۆ ئەوەی هەمیشە لەوێ ئیش و کار بکات.چونکە سمکۆ لەم ناوچەیەدا و لەناو کوردەکانی تورکیا، دەورو ناوبانگی هەیە، پێویستە کۆمیتە سمکۆشی هەبێت، تا ئەم ئەرکە بەجێ بگەیەنرێت و ئاسان تر وتوویژی لەگەڵ بکرێت. کۆمیتەی ناوەندی ئەرزەڕۆم سمکۆ وەك سەرۆکی سمبۆلیك هەڵدەبژێرێ، بەم پێیە سمکۆ بۆ سەرکردایەتی کردنی بزووتنەوەی کورد لە باکووری کوردستان بانگ هێشت دەکرێت. نوێنەری کۆمیتەش کەمال فەوزی بەگ کە لە لایەن سمکۆوە دیاریکرا بوو، لە سەرەتای کانوونی یەکەمی پارەوە لە ئەرزەڕۆمەوە وەڕێکەوتووە، دوای حەفتا ڕۆژ گەیشتۆتە گەرمەسێری کوردستان و لە مانگی تشرینی دووەمدا هاتۆتە لای ئیسماعیل ئاغا. کەمال فەوزی دووەم نێردراوی سمکۆیە لە ئەرزەڕۆمەوە. (یەکەمیان ئەحمەد تەقی ئاغا بوو) ئیسماعیل ئاغا پیشوازی لە ڕێبازی کۆمیتەی ناوەندی کوردستان کرد. بەڵام سمکۆ هاودەنگە لەگەڵ کۆمیتەی ناوەندی کوردستان و ئامادەیە بەشداری چالاکانە بکات لە ئامادەکردنی ڕاپەڕین.
لەبەر ئەوە پێویستە ئێمە هاوکاری کوردەکان بکەین. لەبەر ئەو ڕابردووەی سمایل ئاغا کە بە نۆرە لەگەڵ ئینگلیز و ڕووسیای قەیسەری و کەمالیستەکان پەیوەندی هەبووە و پشتی پێ بەستوون،گومانی تێدانییە، بۆ ڕاپەڕینێکی جدی ئێستای کوردەکان دژی تورکیا پێویستی بە پاڵپشت و یارمەتی دەوڵەتێکی زلهێزی بێگانە هەیە، کە لەم سەردەمەدا بە بۆچوونی ئەو ئەم دەوڵەتە ڕووسیایە. لەبیرمان نەچێ هەلومەرجی ئەمڕۆ وای لە سمکۆ کردووە لە تورکیا دووربکەوێتەوە و پەنا بۆ ئێمە بێنێت.دیارە کەمال ئەتاتۆرکیش هەر لە ئێستاوە دەیەوێ بەزووترین کات کۆتایی بە وتوویژەکانی بێنێ لەگەڵ کۆنسوڵی ڕووسیا لە ورمێ تا بتوانێت ئاسایشی خۆی لە بەری خاکی ئێران دابین بکا. بە واتەیەکی تر سمکۆ بە «کردەوە» دەیەوێ ڕێبازی کۆمیتەکەیان (دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ بە پشتیوانی ڕووسیا) لەگەڵ ئێمە باس بکات، تا بزانێ هەڵوێستی ڕووسیا چۆنە.

جگە لەوە کەمال فەوزی بەگ لە لایەن کۆمیتەی ئەرزەرۆمەوە راسپێردراوە، پەیوەندی لەنێوان سمکۆ و کۆنسۆڵە نزیکەکانی رووسیا دروست بکات. ئەوە بوو لە بیستی تشرینی دووەمدا بڕیاریدا بێتە ورمێ بۆ وتووێژ لەگەڵ کۆنسۆلی ئێمە. ئێوارەی ٢٨ی تشرینی دووەم هاتە کۆنسۆڵخانەی ورمێ و خۆی بە ئێمە ناساند.

کەمال شیفرەی نوێی سمکۆی لەگەڵ نامەیەکی سمکۆ، دا بە هاوڕێ دوبسۆن. ناوەرۆکی نامەکە بەم چەشنەیە: «سوپاسی بەڕێزتان دەکەم، بە شانازییەوە رادەگەیەنم. لەبەر ئەوەی من دوایین نامەم بە شیفرە لە لایەن نوێنەرەکەمەوە (موحەمەد ئەمین بەگ)پێگەیشتووە کە مانگ و نیوێك لەمەو بەر ناردبوومە لاتان، لەنامەکەدا داوا دەکات ئێوە ببینێت. لەبەر ئەوە کەمال فەوزی بەگم ناردە لای ئێوە کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییە و لەسەر داوای من هاتووە تابە وردی بۆتان باس بکات.

من بایەخێکی زۆر دەدەم بە گەورەیی و مەزنی دەوڵەتی سۆڤیەت کە بۆ رزگاری مرۆڤایەتی خزمەتێکی گەورەی خستۆتە ئەستۆ. یەکێك لە مەبەستە راگەیەنراوەکانی دەوڵەتی مەزنی بەڕێزتان ئەوەیە: دەیەوێ گەلانی چەوساوە ئازادبن. ئەگەر لە دونیادا گەلێکی مێرخاس هەبێت، سەربەخۆیی و شانازی خۆی هێشتا بە دەست نەهێنابێت، بەداخەوە گەلی کوردە، دراوسێی لە مێژینەی ئێوە کە بەراستی پێویستی بە یارمەتیتان هەیە، منیش یەکێك لەو گەلەم. من و کوردستان بە تەواوی لەو باوەڕەداین کە تەنیا دەوڵەتی مەزنی یەکیەتی سۆڤیەت، دەستی یارمەتی راستەقینە و هاورکاریمان بۆ درێژ دەکات و ئێمە دەخاتە ژێر رکێفی خۆی و لە باوەشمان دەگرێت. من لە ناخی دڵمەوە رادەگەیەنم کە ئامادەم هەموو دەستوورەکانی دەوڵەتی بەشەرەف و ئینسانی ئێوە جێبەجێ بکەم.

ئەو هاوکاریە مەزنەی ئێوە لەپێناوی مرۆڤایەتی پێمان دەکەن تا گەلی ئێمەی چارەڕشتر لە گەلە دێرینەکان،رزگاری بێت، دەبێتە هۆی ئەوەی گەلی کورد بۆ هەمیشە سوپاسی دەوڵەتی رووسیای سۆڤیەتی بکات و بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ ئەو بیروباوەڕە رابگەیەنێت کە جێگای پڕ لە شانازی خۆی لە مێژوودا کردۆتەوە. تکاتان لێدەکەم ئەمە نەتەنیا داخوازی من و ئەو ناوچانەی دەوربەری منە، بەڵکو ئاوات و ئارەزووی هەموو کوردستانە.

**بە سوپاسەوە رووستەم (سمکۆ).**

له هەمان چاوپێکەوتن لەگەڵ کەمال بەگ، ناوبراو وتی (دەکرێ بڵێم ئەمە دەقی وشە بە وشەی قسەکانی ئەوە) پێشان لە ماوەیەکی دوورتردا کۆمیتەی کوردی لەگەڵ هاوڕێ ئارالۆڤ کەوتبوونە وتووێژو پێی ڕاگەیاندبوو کە کۆمیتە دەیەوێ بە کەڵك وەرگرتن لەو هەلومەرجە نالە بارەی کەمالیستەکان بە هۆی شەڕ لەگەڵ یۆنانییەکان، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەست بەکاربێت. بەڵام نیازی کۆمیتەی کوردی بەهۆی بەڵێنی هاوڕێ ئارالۆڤەوە نەهاتەدی و کوردیش ئەو دەرفەتە لە بارەی لە دەستدا کە دەیتوانی بیقۆزێتەوە.

ئێستا بە هۆی تەواوبوونی کێشەی بەرەی ڕۆژهەڵات تورك خەریکن خۆیان لە کوردستان بە هێز و جێگیردەکەن و سیاسەتی کۆنی خۆیان دووبارە دەکەنەوە، بەڵام ڕەنگێکی دیکەی بە خۆوە گرتووە، دەیانەوێ بە مەبەستی پەرش و بڵاوکردنیان لەناو تورکاندا بەشێکی زۆر لە کوردەکانی ناوچەی وان و بەتلیس بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا بگوازنەوە. (ئەم قسانە کەمال بەگ بەرپرسیاریەتی). بە هۆی ئەم بارودۆخە بە مەبەستی خۆ هێشتنەوەی گەلی کورد، بە کۆمیتەی کوردی سەلماندووە بڕیارێ تەواو لەم بارەوە بدات، لەبەر ئەوە ئێستا خەریکی خۆ ئامادەکردنن تا بەهارێ ڕاپەڕن. کۆمیتەی کوردی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، واتە ڕزگارکردنی گەلی چارەڕەشی کورد، چاوی لە پشتیوانی و یارمەتی دەوڵەتی یەکیەتی سۆڤیەتە. ئەمانە هەموویان بەبێ هەڵچوون و گەورەکردن باسکران. لە کۆتاییدا ناوبراو وتی: «پێم بڵێن سەرئەنجام ڕووسیای سۆڤیەتی بەراستی یارمەتی کورد دەدات یان نا؟ ئەگەر بێتوو هاوکارییشمان نەکەن ئێمە درێژە بە خەباتی خۆمان هەر دەدەین ( با لە لایەن تورکەکانەوە تێك بشکێین و سەرکوت بکرێن، بەڵام ئێمە دەمرین وەك شێر، نە وەك مەڕ).

ئەو هەڵوێستەی کە هاوڕێ دوبسۆن بەرانبەر بە کەمال بەگ بەم چەشنە بوو:

کەمال بەگ مان لێدوور مەکەنەوە وەك ئەندامێکی کۆمیتەی کوردی کە لە ویلایەتی وان و لە ڕێگای سمکۆوە لە ناوچە سنوورییەکانی فارس کاردەکات و لە هەمانکاتشیدا سەبارەت بەو بەڵێنانەی کە وتوومانە مەیانترسێنە، چونکە ئەو بەڵێنانەمان پێ جێبەجێ ناکرێن، ئەو یارمەتییەش بەم زووانە نابێت. جگە لەوە هاوڕێ دوبسۆن لە وتووێژدا لەگەڵ کەمال هەوڵی داوە پەیوەندی لەگەڵیان هەبێت بۆ وەرگرتنی دەنگوباس، تا هەمیشە ئاگاداری کردەوە و هەڵسوکەوتەکانی کەمال بەگ و سمکۆ بن و ناراستەوخۆش ئاگایان لە ئەرزەڕۆم بێت.

له تەواوی وتەکانی کەمال فەوزی بەگ، شتێك ئاشکرایە، له مانگی تشرینی دووەم لـه چـاو مانگەکانی تر چالاکی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم زیاتر بووە و بێگومان ئەم چالاکییەش بۆ ڕێکخستن و یەکگرتنی تەواوی هێزەکانە لە باکووری کوردستان.

دیارە پەیوەندی دوو قوڵی تورك و سمایل ئاغا بەردەوامە. له تشرینی یەکەم هەڵسوکەوتی سمکۆ بەپێی داخوازی تورکەکان ئەوەیە: کەمالیستەکان دەیانەوێ کەڵك لەڕۆڵی سمکۆ وەربگرن و لـە ڕێگای ئەوەوە دژی جێگیربوونی ئاشوورییەکان لە ناوچەی ورمێ بوەستن و سمکۆ ناچـار دەکـرێ ببێتە داردەستی سیاسەتی تورکیا لە ناوچە سەر سنوورییەکانی فارس. جگە لەوە لـە مـانگی تشرینی دووەم تورکەکان توانیان جوولانـەوەی سمکـۆ کـۆنترۆڵ بکـەن و هانیـدەن هەسـتێ بـە کوشتنی مار شەمعون.

ڕژێمی تورکیا هەشت گوندی لە قەزای ئال بەگ داوە بە سمکـۆ (ئـەم گوندانـە هـی عەشـایری (مەرزیکی)ن بە سەرکردایەتی دەروێش بەگ. پێـشتر تورکـەکان بـە زۆر پێیـان چـۆڵ کـردن و ناردیاننە ناوچەکانی سەر سنووری فارس، ژمارەی ئـەو ماڵانـەی ڕاگـوازراون دەگاتـە سـەد و بیست ماڵ و بەتەمان بێنە ناوچەی ورمێ). تورکان خەسـرەوەی کـوڕی سمکۆشـیان بـەرداوە و گەڕاوەتەوە لای باوکی. کە لە٢٠ی تشرینی دووەم خسرەو لەگەڵ ١٠ ئەفـسەر و ١٠سـەربازی تورك بەرێکرا بۆ وان و لەوێشەوە بۆ گوندی قەرەتو کە سمکۆی لێیـە. بـەم چەشـنە تورکـەکان پەیوەندییان لەگەڵ سمکـۆ بـاش کـردووە، بـە سمکۆیـان وتـووە گەڕانـەوی ئاشـوورییەکان بـۆ شوێنەکانی خۆیان لە ناوچەی ورمێ دەسـتی ئینگلیزەکـانی تیایـە. بـۆ ئـەم مەبەسـتەش لـە ناوچەکانی سەر سنووری تورکیا پروپاگەندەیەکی زۆریان کردووە. بە گوێرەی ئەم پروپاگەندانەش ئاشوورییەکان دژی سمکۆ و کوردەکانن. هاو کـات لەگـەڵ ئـەم سیاسـەتەی تورکیـا خـەریکی بەگژیەکداکردنی موسڵمان و مەسیحییەکانن بۆ ئەمـەش فـاکتی زۆریـان بـە دەسـتەوەیە بـۆ نموونە: لە وتووێژ لەگەڵ کوردێکی ناوچەی ورمێ کە لە گوندی (ویزەی) گەورەوە هاتووە دەڵێ: فەرماندەی دەستەی چەکداری ئـەوێ بـەناوی خـەلیل ئەفەنـدی لەسـەر ئاشـوورییەکان دواوەو پێشنیاری سەربڕینی ئەو «گاورانەی» کردووە و بەڵێنی بە دەوڵەتی تورکیا داوە کە لە دەست پێکردنی ئەم ئەرکە پیرۆزە یارمەتی بدات.

ئەمەش دەرئەنجامی سیاسەتی تورکیایە: بە گوێرەی هەواڵی باوەڕپێکراو سمایل ئاغا ترسی لەو مەسیحیانە هەیە کە لەناوچەی ورمێ و سەلماس جێگیریان دەکەن. کاریگەری پروپاگەندەی تورکان لەسەر کورد، لە وتوویژی هاورێ دوبسۆن و کەمال فەوزی بەگیشدا دەرکەوتەوە.

کەمال بەگ بە کۆمەڵێك پرسیار لە هاورێ دۆیسۆن سەرنەکەوتوانە ویستوویەتی کێشەی ئاشوورییەکان داپۆشێت، بۆ نموونە دەڵێ: بۆ دەبێ ئەرمەنەکان کوردستان و زەوی و زاری ئێمە داگیربکەن؟ مەبەستیان لەم کارە چییە؟ پاشان بۆ ئەوەی هەڵوێستی ئێمەی لەم بارەوە بۆ دەرکەوێت وتی: «ئەگەر ئێوە دەستووربدەن سمکۆ ئامادەیە هێرشیان بکاتە سەر و لە کوردستان دەریان بکات». ئەم وتانەی کەمال فەوزی نیشاندەری ئەوەن کە ناوبراو بە تەواوی کەوتۆتە ژێر کارتێکردنی ئەو بارودۆخەی تورکەکان لەناوچە سەر سنوورییەکان دروستیان کردووە. جگە لەوە تورك و سمکۆ لەسەرکێشەی ئاشوورییەکان هاوکارن(ئاشکرایە کە تەنیا لەم بارەوە) ئەمەش لە هاتووچۆی گوندەکانی سەر سنووری فارس دەبینرێت.

**بەڕێوەبردنی نەوچە:**

سەعید عەبدوللا-کوری شێخ عەبدولقادر بە هاتنی بۆ (نەوچە) شێخ موسای لە سەر کار لابرد و بۆ خۆی دەسەلاتی گرتەدەست. ناوبراو کاروباری تەکیەی (شوێنی رێ و رەسمی ئاییینی شیخە کوردەکانە) خستەوەگەڕ و دادگای دروستکرد و سکالای خەڵکی لەمەڕ کردەوە نایاساییەکانی سەید تەها و شێخ موسا لە کاتی دەسەلاتداریان لە نەوچە وەردەگرێت و ئەو زەوی و زارەی کە سەید تەها و موسا دەستیان بەسەردا گرتبوو دەیانداتەوە خاوەنەکانیان. سەعید عەبدوللا گومرگی لەسەر ئەو توتنە داناوە کە دەیبەن بۆ فارس. تا هاتنی ئەوگومرکی توتن بۆ هەر چوار پوت دە تمەن یان دوو لیرەی زێر بوو. کە ئەو هات دوو جاری کەمکردەوە. لەسەر کێشەی توتن ناوبراو دەیەوێ لە رێگای خان عەبدوللاوە لەگەڵ برایانی مانا سیریان وتوویژ بکات و دەیەوێ وەك ساڵی پار توتنی نەوچە، هەرکی و گردیان مۆنۆپۆڵ بکات و لە بری ئەوە شەکر و نەوت و شتومەکی تر کە پێویستی دانیشتوانی ئەوێیە وەربگرێت. سەرەڕای ئەوەش سەید عەبدوللا لە قەیرانی مالیدایە[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٣٣١-٣٣٨.

## کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ ٢٣ی شوباتی ١٩٢٤

## لەسەر رۆشتنی کوردەکانی ماکۆ و ورمێ بۆ تورکیا لە ١٩٢٣

لە نیوەی یەکەمی شوباتی پار، نوێنەری سۆڤیەت لە بروسکەی ژمارە (١٥٨) باسی رۆیشتنی کوردەکانی فارس دەکا بۆ ناو خاکی تورکیا لەگەڵ ئەو هەنگاوە پێویستانەی پێش بە سیاسەتی تورکیا دەگرن لەناو کوردەکانی ئێرە. ئەم راپۆرتەش لەسەر ئەو رووداوانەیە کە کۆنسوڵی ئێمە بە درێژایی ساڵی ١٩٢٣ کۆی کردۆتەوە و کەلکی لە راپۆرتەکانی کۆنسوڵی ورمێ و ماکۆش وەرگرتووە،ئەمە کورتەکەیەتی:

کوردەکانی ماکۆ پێش ساڵی ١٩٢٣ش هەمیشە کۆچیان کردووە بۆ ناو خاکی تورکیا. بەپێچەوانەی ئەوە رەعیەتەکانی خانی ماکۆ سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە بەتایبەتی عەشیرەتی جەلالی و میلان. کوردەکانی ماکۆ لەو کوردە رەسەن و کۆچەریانەن کە تا ئەم دواییانەش کەس نەیتوانیوە دەست لە ژیانی ناو خۆیان وەربدات. هەر بۆیە خانی ماکۆ بە چاوێکی تر تەماشای ئەوانەی دەکرد. بۆ نموونە خانی ماکۆ مالیاتی کەمی (ساڵانە شەش تمەنی لە هەر بنەماڵەیەك) وەردەگرت و لە زۆر شتیش خۆش دەبوو.ئەم مالیاتە زۆر کەمترە لەماڵیاتی کوردەکانی تر بەتایبەتی کوردەکانی ناوچەی وان، بۆیە باری ژیانی کوردەکانی ماکۆ زۆرباشتر بوو.

کوردەکانی تورکیا دەبێ سەرباز بە دەوڵەتی تورك بدەن. کەچی کوردی ئەم ناوچانە تا ئێستاش دژی خزمەتی سەربازین لە ناو سوپای فارس. لە ناو کوردەکانی تورکیا بۆ نموونە لە نێوان جەلالی و میلانی دوژمنایەتی هەیە، خانی ماکۆ و دەوڵەتی تاران لەم دوو بەرەکیە کەڵك وەردەگرن.زۆر جار لاواز بوونی یەکێکیان دەبێتە هۆی کۆچکردنیان بۆ ناو خاکی تورکیا.هیچ کەس هەوڵی چارەسەرکردنی ئەم دوژمنایەتیەی نەداوە و تامردنی خانی ماکۆ هەر بەردەوام بووە. ئەو کوردانەی هەڵدێن بۆ نموونە ئەوانەی لە ١٩٢٣ هەڵاتوون بۆ تورکیا، لە کاتێکی لەباردا دەگەڕێنەوە جێ و شوێنی خۆیان.

کوردەکانی قزلباش و خالیکانلۆ کـە دێنـە لای بـۆرەلان (نێـوان ڕووبارەکـانی ئـاراس و قەرەسـوی تورکیا) چەکدارەکانی دەوڵەتی تورکیا دەچنە سەریان لە هەر سەرێك ئـاژەڵ و مـەڕ داوای دوو قـڕان ماڵیاتیان لێدەکەن و پێیـان دەڵـێن دەبـێ بـۆ پڕکردنـەوەی هێـزی خالیدییـە چـەکدار بـدەن. ئـەم داخوازیانەی بە دڵی کوردەکان نابێ و سەرکردەکانیان بریار دەدەن بە وتووێژ تورکـەکان تـا بـەهاری سەرگەرم بکەن و پاشان بڕۆن. کوردەکان بە مەبەستیان گەیشتن.

ڕووداوێکی ترتان بۆ باس بکەم، دوو پیرە پیاوی (پیاو ماقوڵ و ریش سپی) عەشیرەتی بـەلیخکانکو فاتو تەلیم خان و مەمەد شوور بلاخ لێیان دەبێتە شەڕ. دەستەی فاتو کە بە هێز دەبن لـەو شـەڕەدا دووانیان لێ دەکوژرێت، بەڵام دەستەی لاوازی مەمەد شوور بلاخ بە سی ماڵەوە دەچـێە نـاو خـاکی تورکیا، پاشان بە نێوبژی کوڕی سەرداری ماکۆ قولی خان ئەو دوو دەسـتەیە ئاشـدەبنەو و دەسـتەی شوور بلاخ بە خۆیان و مەڕ و ماڵاتیانەوە دەگەڕێنەوە. دەبینین رۆیشتنی لەو شێوەیەی کوردەکان بـۆ ناو تورکیا لە کۆنەوە باو بووە. لە ئابی ۱۹۲۳ پەنجا بنەماڵەی کوردی قزڵباشی ناوچەکە، کە لەگەڵ عەشیرەتەکانی تری کورد پێکهەڵناکەن بڕیـار دەدەن بڕۆنـە قـەفقاز، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش داوا لـە کۆنسۆڵی سۆڤیەت دەکەن لە ماکۆ کە دەوڵەتی ڕووسیا مۆڵەتیان بـداتێ. بـەڵام تفلـیس وەڵامیـان ناداتەوەو لەوێ دەمێننەوە.

لەمبارەوە ڕووداوێکی ترتان بۆ باسدەکەم: عەشیرەتی کوردی برۆکی کە دانشتووی ئـیرەوان بـوون لـە ۱۹۲۲ دەیانەوێ ناوچەی ویلایەتی وان جێ بهێڵێن و بگەڕێنەوە ناوچەی قەفقاز،چونکە پایزە هـەوار و هاوینە هەواریان لەم ناوچەیە دایە. بەڵام تورکان بۆ ڕاگرتنـی ئـەم عەشـیرەتە هەنـدێ جیاوکیـان پێدان (دەوڵەت هەنگاوی تایبەتی نا بۆباشترکردنی ژیانیان).. ئێمەش شتێکی ئەو تۆمان نـەکرد تـا ئەو کوردانە بگەڕێنەوە قەفقاز بۆ شوێنی پێشووی خۆیان.

کۆنسۆڵی سۆڤیەت لە ماکۆ نوێنەری سۆڤیەتی لە ۲۳ی حوزەیرانی ساڵی ڕابردوو ئاگـادار کردبـۆوە کە سێ سەد بنەماڵەی ئەم عەشیرەتە لەناوچەی وان و قەزای ئەرجیش و ناحیـەی ئارجیـك و تایمـار بەرەو سورمالنسکی قەفقاز کەوتوونە ڕێ و هاتوونەتە هاوینەهەواری سینیك تا بتوانن زستانێ بێنە قەفقاز. هەر ئەو ڕاپۆرتەی کۆنسۆڵ، نامەی کوردەکانی ئەو عەشـیرەتەی تێدایـە بـۆ کاربەدەسـتانی سۆڤیەت کە دەڵێ: «ئەگەر مۆڵەتیان پێنەدرێ بێنە قـەفقاز دەچـنە ژێـر بـاڵی سـەرداری مـاکۆ و ناگەڕێنەوە تورکیا». پاشان پەنجا بنەماڵەی ئەم عەشـیرەتە لـە کوتـایی تتـشرینی یەکەمـدا دێنـە

ماکۆ، سەرکردەکەیان عەبدوڵلا عومەر ئۆغلی پایز لە تورکیا رایکردو و هاتە ماکۆ، داوای لێکردین بچێت بۆ قەفقاز بەڵام تا کانوونی دووەم مۆڵەتی وەرنەگرت، ورمێ تائێستا لە چارەنووسی ئاگادار نییە. سەرەڕای هەڵسوکەوتی خراپی ئێمە لەگەڵ ئەم کوردانە کە نایانەوێ لە تورکیا بمێنینەوە، هەرچۆنێك بووە تائێستا دوو سەد بنەماڵەیان خۆی گەیاندۆتە ناوچەی نەخجەوان.

هاتنی ئەم کوردانە و گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکەیان بەو مانایە نییە تورکەکان لە گەڵیان خراپن یا لەگەڵ ئێمە نیازیان باش نییە یاخود باوەڕبکەین هۆی گەڕانەوەیان ئەوەیە کە «وەتەن شیرنە». بە پێچەوانەوە تورکەکان هەوڵێکی زۆریاندا ئەو کوردانە لە ویلایەتی وان راگرن و تەنانەت دەرفەتیان پێدان لە چوارچێوەی تورکیادا لە هەر جێگایەك پێیان خۆش بێ بمێننەوە. بەڵام ئەوانبە باشیان زانی لە قەفقاز و ناوچەی ماکۆ بمێننەوە، نەك لە تورکیا.

لە هەواڵنامەی نهێنی کۆنسوڵی ورمێ لە کانوونی یەکەمی ١٩٢٣دا هاتووە کە تورکەکان هەنگاوی زۆریان بۆ راگرتنی ئەم عەشیرەتە هەڵگرتووە (ئازادکردنیان لە سەربازی، نیوەبڕکردنی مالیاتی ئاژەڵ-ئازادکردنیان لە خزمەتی سوپای حەمیدیە) کەچی هیچ کام لەمانە دادی تورکیایان نەدا. بەکر ئاغاشیان (وەك سەرۆکی عەشیرەتی برۆکی) راسپاردبوو ناوی ئەو کەسانەی دەیانەوێ لە تورکیا رابکەن بنوسێت وبیدا بە دەوڵەت.

هۆی سەرنەکەوتنی تورکان ئەوە بوو عەشیرەتی برۆکیشیان لە ریزی ئەو کوردانە نووسیبوو کە دەبوو خزمەتی سەربازی بکەن. جگە لەوەش لەوەڕگای ناوچەی وان بۆ ئەو عەشیرەتە وەك لەوەڕگای (نەخجەوان و ئیرەوان) دەوڵەمەند نییە.هۆیەکی تر ئەوەیە کوردەکانی عەشیرەتی برۆکی وەك کوردی فارس و ئیرەوان نین بە گشتی خراپ لە تورك دەڕوانن.

هاتنی لەشکری دەوڵەتی ناوەندی بۆ ناوچەی ماکۆ، کوردەکانی ئەوێی خستۆتە پەشێوی. دەسەڵاتدارانی فارس دەزانن بە رەچاوکردنی سیاسەتی پێشوویان،واتە ئەگەر بەرانبەر کوردەکان بە توندی بجوڵێتەوە (رادەکەن بۆ تورکیا و بۆ قەفقاز) سەرکەوتوو نابێت، ناچار پەیوەندییان بە سەرکردەی ئەو عەشیرەتانەوە کرد کە لە بەهاری ١٩٢٣ بانگ کرابوون بۆ تەوریز. فەرماندەی لەشکری دەوڵەتی فارس لە بانگەوازێکدا کە ناوەڕۆکەکەی ئەم خاڵانەی خوارەوەن دەیەوێ دەسەڵاتی خۆی لە ناوچەکەدا راگرێت:

١- دانانی ئیلخانی دەوڵەتی لەناو کوردەکان کە دەبێ ئەرکی سەرەکی و سەرەتایی ئاشتکردنەوەی کوردەکان بێ.

٢- لابردنی مالیات لەسەر کۆچەرەکانی کورد بۆ سێ ساڵی داهاتوو.

٣- لێبوردن لە تاوان و تالانکاری پێشووی کوردەکان و کاربەدەستانی نیزامیش نابێ هیچ کەس سەغڵەت بکەن.

٤- دەبێ‌کرێی هاوینەهەوارەکان چارەسەر بکرێ و کوردەکان بۆ خۆیان نرخەکەی دیاری بکەن.

٥- نەهێشتنی تۆڵە سەندنەوە و قەدەغە کردنی هاتووچۆ بۆ ئەم دیو و ئەو دیوی سنوورەکان.

زۆربەی کوردەکانی ئەوێ پێشوازییان لەم هەنگاوانە کرد (جگە لە عەشیرەتی خەلیکۆف یا خەلیکانلی کە بە هۆی رێبەندان سەروەری پێشووی خۆیان لە دەست دەدەن). لە هەمان کاتدا کوردەکان دەترسن خزمەتی سەربازیان پێ بکەن. جێبەجێ کردنی ئەم خاڵانە بەتایبەتی هەڵسوکەتی ئیلخانی نیشان دەدات دەوڵەت تا چ رادەیەك وتەو کردەی وەك یەکە و پێش بە هەڵاتنی کوردەکان دەگرێت بۆ تورکیا. کوردەکانی ماکۆ و سەلماس تائێستا خزمەتی سەربازی دەوڵەتی فارسیان نەکردووە(جگە لە دەستەیەکی سەلماسی نەبێ بە سەرۆکایەتی عومەر ئاغا). کوردەکانی ئێرە لە کۆبوونەوەیەکدا بەڵێنیان داوە ئامادەبن وەك کوردی تورکیا چەك هەڵگرن و لەجیاتی خۆیان و سەرۆکەکانیشیان کوردبن (گەرچی لە تورکیا کوردەکانی گەوەر و شەمزینان ئامادەنەبوون چەك هەڵبگرن). هەرچۆنێك بێ تورکەکان نەیانتوانی کوردەکانی ناوچەکە بۆ لای خۆیان راکێشن. چونکە کوردانی ئێرە ئاگاداری بارودۆخی براکانیانن لەناوچەی وان، دەزانن دەسەڵاتدارانی تورك چۆن بێبەزەییانە لەگەڵیان دەجوڵێنەوە. بەم دواییانە تەنیا خالید ئاغا سەرۆکی تەواوی جەلالییەکان چووە بۆ تورکیا، ئەویش لەبەر ئەوەی لەگەڵ لیزگی ئاغا کێشەی هەیە. لیزگی ئاغا دەیەوێ خۆی ببێتە سەرۆك عەشیرەتی جەلالی. لیزگی ئاغا لە کۆتایی ١٩٢٢ لەگەڵ من سەبارەت بە چوونی خۆی و براکەی و لایەنگرانی بۆ ئەرمینیای سۆڤیەتی قسەی کرد. بەڵام رووداوەکانی دوایی بە قازانجی ناوبراو تەواو بوو، بە رووخانی خانی ماکۆ لە کۆتایی ١٩٢٣ دەسبەجێ لیزگی ئاغا بە هێز بوو. خالید ئاغا ئێستا دەیەوێ ئەو دەڤەرە بەجێ بێڵێ، چونکە لایەنگر و سەروەت وسامانی لیزگی ئاغا لەناو عەشیرەتی جەلالی لە هی ئەو کەمتر نییە.

## کوردەکانی ورمێ

ڕۆیشتنی کوردەکانی ئەم ناوچەیە، هۆکار و ژمارەی ئەو کوردانەی ئێرە کە ئاودیوی تورکیا دەبن، بەپێچەوانەی کوردەکانی ماکۆیە: کوردەکانی ماکۆ و عەشیرەتەکانیان هەموو پێکەوە دەژین، تەنیا عەشیرەتی میلان نەبێ کە هەندێ عەجەمیان لەناودایە، ئەگینا ئەوانتر کەسی بێگانەیان لە ناو نییە. بەڵام کوردەکانی ناوچەی ورمێ هێندە نەریتی عەشیرەتیان نەماوە و وەك کوردی ماکۆ لە عەشیرەتگەریدا سەقامگیر نین. گوندی وای هەیە نیوەی هەرکی و نیوەکەی تری شکاکن.

ژیانی کۆچەری کوردەکانی ورمێ کەمترە و زۆربەیان نیشتەجێن. لێرە خاوەندارێتی گوند و زەوی، جێگەی سیستمی عەشایەری گرتۆتەوە واتە لێرە خەریکە چین و توێژ دروست دەبێ وەك ئاغا و جووتیار و وەرزێر. کێشەی ئاغاکانی کورد لەم ناوچانە، لەسەر زەوی و زارە. ئەوە نیە هەرکام لاوازبێ ناچاربێت لەبەر لایەنەکەی تر هەڵبێت بۆ تورکیا، لێرە دیاردەی هەڵهاتن زۆرکەمە، چونکە زۆربەیان نیشتەجێن و مرۆڤی سەقامیگیریش زەحمەتە شوێنی خۆیبەجێبێڵێ، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی سەر سنووری تورکیا وەك تەرگەوەڕ و دەشت و مەڕگەوەر، لە وەڕگای سەر سەوز و دەوڵەمەنندیان لێیە. بەڕەو مافوری ئێرە بەناوبانگن. لە لایەکی تر لە کوێستانی کوردستانی میزوپۆتامیا نزیکە و خەڵکی ئەم ناوچانە هەمیشە کەلکیان لێوەرگرتووە و تا لای موسڵیش کۆچ دەکەن.

دوژمنایەتی کۆنی کوردەکان لێرە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی تورك هەروا دەوری هەیە، بۆیە کوردەکان پێیان باش نییە کۆچ بکەن بۆ ناو خاکی تورکیا یا هەڵبێن. دوای شۆڕشی شێخ عەبدوڵڵا لە ساڵانی ٨٠ی سەدەی رابردوو ژمارەیەك کوردی عەشیرەتی هەرکی واتە هۆزی سەیدان لەگەڵ سەرۆکەکەیان عەبدول عەزیز باوکی کەریم خان سەرۆکی ئێستای هۆزی سەیدان لێرە مانەوە و نەگەڕانەوە بۆ ڕەواندز کە شوێنی ژیانی زستانیان بوو. ئێستا لە ناوچەی مەڕگەوەر دەژین و چەند گوندیان لە ئیقبال ئەلدەولە بە کرێ گرت و پاشان هەندێك لەو گوندانەیان کڕی و هەندێکشیان بە زۆر داگیرکرد.

هۆزێکی تر بەناوی ماندان بە سەرکردایەتی پیرۆت ئاغا (بەشێکی ئەم هۆزە زستانان بۆ باکووری موسڵ کۆچ دەکەن) دوای سەیدان هاتوونەتە مەرگەوەر و لێرە نیشتەجێبوون و بڕیارە ئەوانەی تریان لە ناوچەی تەرگەوەر بمێننەوە. لە ساڵی ١٩١٩ حاجی ئاغا سەرۆکێکی تری هۆزی ماندان کەڵك لە نەبوونی ئاشوورییەکان لە ناوچەی مەحال (وەك پیرۆت ئاغا) وەردەگرێت و گوندی جەلوەکان (ئاشوورییەکان) واتە مادان و چەند گوندێکی تر لە مەحالی دەشت کە عەشیرەتی بەگزادەی لێیە،

داگیر دەکات. بەگزادەکانی دەشت وەك بۆ خۆیان دەڵێن، پێشان لە ناوچەی نەوچە (کوردستانی تورکیــا) ژیاون و چەند سەد ساڵ لەمەوبەر لەبەر ناکۆکی لەگەڵ دەسـەڵاتدارانی تـورك ئـەوێیان بەجێهێـشتووەو هاتوونەتە دەشت. ئـەوان پـێش عەشـیرەتی هـەرکی دەسـتیان دایـە کـشتوکاڵ کـردن. هـەرگیز وەك کوردەکانی تر نەچوونەتە ناو خاکی تورکیا. بەم پێیە دەتوانین بڵێین کوردەکانی ناوچەی ورمـێ لـە چـاو کوردی ناوچەی ماکۆ کەمتر هاتووچـۆی تورکیادەکـەن، کێـشەی ئـەوان تـەنیا لەسـەر زەوی و زار و گوندەکانە. لە ساڵانی ١٩١٢-١٩١٣ کاتێك ناکۆکی نێوان ئیسماعیل ئاغای کاردار و سمکـۆ لەسـەر دەسەڵاتداریەتی سەڵماس، بە بەزینی ئیسماعیل ئاغای کاردار کۆتایی پێهات، کاردار لەگەڵ چـەندین کەسی دیکە رایکردە تورکیا. لە ١٩١٣ بەگزادەی بنـار ئەسـکەندەر بـەگ بـە هـۆی نـاکۆکی لەگـەڵ جێگری کۆنسوڵی رووسیا (گول بێگۆم) ناچار دەبێت مەرگەوەر بەجێبێڵێ بەرەو تورکیا، بەڵام جگە لـە هێندیك نۆکەر کەس لەگەڵی ناچێ.

لە سەردەمی راپەڕینی سمکۆوە لەم ناوچەیە کێشەی نێوان خان و بەگەکانی کورد هەیە بـەڵام بەگـەکان بەپشتیوانی سمکۆ سەرکەوتن.کە سمکۆ شکستی هێنا دووبارە کێـشەی نێوانیـان دەسـتی پێکـردەوە و دەوڵەتی تارانیش کەوتە لایەنگری کردنی خانەکان، بـۆ نموونـە دەسـەڵاتدارانی تـاران پیـشتوانیان لـە برایانی مانا سیریان کرد و گوندی سێ مەحالیان بۆ لە کوردەکـان سـەندنەوە. ئـەوە بووپارەکـە حـاجی ئاغا سەرۆك عەشیرەتی هەرکی و نوری بەگ سەرۆك عەشیرەتی بـەگزادە هـەڵاتن بـۆ تورکیـا. حـاجی ئاغا عەشیرەتەکەی خۆی دەداتە دەست هۆزی ماندان و نوری بەگ، سامان و مەڕ و ماڵاتەکەی لەگـەڵ خۆی دەبات، پاشان لە کۆتایی مانگی ئەیلول بەگەکانی کورد یەك لە دوای یـەك ناوچـەکە بەجێـدێڵن. یەکێك لە بەگەکانی هەرکی ناوچەی مەرگەوەر بەناوی ئەسەد ئاغا لەگەڵ چوار مـاڵ و بـەگزادەی بنـار بەناوی عەبدوڵڵا بەگ و ئەسکەندەر بەگ دەچنە گوندی گیسیان. پاش ئەوە فەرماندەی لەشکری فـارس هەڵوێستی خۆی دەگۆڕێت و خاوەن زەوییـەکانی عەجـەم ناچـار دەکـات بـەنرخێکی هـەرزان زەوی و زارەکەی خۆیان بە کوردەکان بفرۆشن. بەم چەشنە فەرماندەی لەشکری فارس سیاسەتی خۆی بەرامبـەر کورد دەردەخا و لە بەرژەوەندی کوردەکان دەجولێتەوە، هەروەها واز لە چەککردن، مالیـات وەرگـرتن و وەگەڕخـستنی دادگـای تایبــەت بـۆ سـزادانی کوردەکـان، دێنێـت. ئـەم هەنگاوانـە وەلامـدەرەوەی بەرژەوەندییەکانی کوردە لە ناوچەی ورمێ. هەر بۆیە کوردەکانیش وازیان لە رۆیشتن بۆ تورکیا هێنـاوە. ئابەم شێوەیە فەرماندەی لەشکری فارس مافی موڵکایەتی زەوییەکانی ئێمەی (روسیا) لـە ناوچـەکانی دەشتە بیـل و مەرگـەوەر، دەشـت و تەرگـەوەڕ پێـشێلکرد. دەوری ئاژاوەگێڕانـەی تورکیاشـی لـەناو

کوردەکانی ورمێ لەناو برد. چاکبوونی پەیوەندی نێوان دەوڵەتی فارس و کوردەکان لە بەرژەوەندی ئێمە (روسیا) و زەویداری ئێمە دا نییە. ئاشکرایە دەبێ دژی ئەم هەنگاوانە بوەستین و لەجیاتی فەرماندەی لەشکری فارس ئێمە بۆ خۆمان کێشەی زەوی وزار لەگەڵ کورد چارەسەر بکەین.

من کۆتایی بەکێشەی رۆیشتنی کوردەکانی ناوچەی ورمێ بۆ تورکیا دێنم و گەیشتمە ئەم ئەنجامە: لە داهاتوویەکی نزیکدا رۆشتنی کوردەکان بۆ ناو تورکیا مەترسییەکی بۆ دەوڵەتی فارس نابێت. جگە لەوە ئەو پرسیارە دێتە پێش ئایا لە هەموو قۆناغێکدا پەیوەندی کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتانی فارس و تورك گیروگرفت بۆ ئێمە دروست دەکات؟ یا بە پێچەوانەوە پەیوندی ئێمە لەگەڵ کوردەکان نابێتە هۆی تێکچوونی پەیوەندیمان لەگەڵ تورك و فارس. سیاسەتی ئێمە لەناو کوردەکاندا ئەم مەترسی و دژایەتیانەی تیایە: چارەسەرکردنی کێشەی کورد وەك کێشەیەکی ناوخۆی یا ناو ماڵ لە چوارچێوەی دەوڵەتی تورك و فارس لە لایەك و لە لایەکی تر هەوڵدان بۆ یەکگرتنیان بە مەبەستی پاراستنی داب و نەریتی خۆیان لە بەرامبەر دەست درێژی تورکان، بە مانای یەکگرتنی تەواوی هێزەکانی کوردستانە، سەرئەنجام دەبێتە هۆی لەدایك بونی ئیدیای نەتەوەیی کوردان، ئەوسا دەکەونە ژێر کاریگەری سیاسەتی ئینگلیز، تورك یا فارس. ئەگەر بڕیارە ئێمە سیاسەتێکی چالاکمان لەناو کورداندا نەبێ و دەورمان هەر نێوبژی بێ،پێموایە هێشتا نەگەیشتوینەتە سیاسەتێکی تۆکمە بەرامبەر بەکێشەی کورد تا لەمبارەوە ئاسوودە بین و باوەڕمان بەخۆ هەبێت کە ئەرکی خۆمان سەبارەت بە کورد جێبەجێ کردووە. ئێمە کەمتر دەزانین خۆمان لە چوارچێوەی فیدراسیۆنی رووسیادا کوردمان هەیە و ژمارەیان تا جەنگی جیهانی یەکەم تەنیا لە (گوبێرنی ئەلی زابیت پولیت)ی پێشوو دەگەیشتە هەشتا هەزار کەس و چارەسەرکردنی کێشەکەیان دەبێتە نموونە یا سمبوڵ بۆ کوردەکانی هەموو کوردستان و دەبێتە هۆی ئەوەی کورد لە هەموو بەشەکانیدا سۆزو خۆشەویستی خۆیان بۆ ئێمە دەربڕن.کە چاو لە کوردەکانی ئەمبەری رووباری ئاراس (سۆڤیەت) دەکەن و دەست لە کوردستانی ئینگلیز واتە باشووری کوردستان هەڵدەگرن یا لێی هەڵدەگەڕێنەوە. دەبێتە پروپاگەندە یا ئاگاداریەك بۆ تورکیا کە ئۆتۆنۆمی بدا بە باکووری کوردستان.

ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی سۆڤیەت دەبێتە هۆی پتەوبوون و پاراستنی سنوورەکانی ئێمە لەسەر رووباری ئاراس. ئەمانە بنچینە و بناغەن کە دەبێ لە کاتی تاوتوێکردنی کێشەی کورد لەبەرچاو بگیرێن.

## ڕەشنووسی پێرس بولیتۆن –مانگی شوباتی ١٩٢٤

### ورمێ- عەشایرەکان

٣٠ی مانگی کانوونی دووەم سەرکردەی عەشایرەکانی کوردی ناوچەی ورمێ نوری بەگ، کەریم خان، حاجی ئاغا و سەمەد ئاغا بۆ چارەسەکردنی کێشەی زەوی لەگەڵ برایانی مانا سیریان ڕۆیشتوون بۆ تەورێز. سەرۆکی هۆزی عەبدۆیی ناوچەی سەڵماس میخین لە بارەگای ئەمیر لەشکر لە سەڵماس شکایەتی لە عومەر خان کردووە کە گوایە ویستوویەتی دەسەڵاتی بەسەر گوندەکانی ساڤراس و ماخلان و چەند گوندی تری عەبدۆییەکاندا هەبێت. میخین داوای لە فەرماندەی لەشکر کردووە پێش بە عومەر خان بگرێت. بە دەستووری ئەمیر لەشکر میخین لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوبیر و پیاوەکانی لە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمدا ڕۆیشتوون بۆ تەورێز و دوای وتوویژ لەگەڵ فەرماندەی لەشکر، پاش دوو هەفتە دەگەڕێتەوە بۆ ناو عەشیرەتەکەی خۆی. لە تەورێز پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێکراوە و نازناوی ئەمیر عەشایریان پێداوە کە مافی ئەوەی هەیە خۆی بە ئاغای هەموو کوردەکانی ناوچەی سەڵماس بزانێت وکەڵك لە چەند گوندی دیکەش وەربگرێت کە پێشتر لە دەست سمکۆدا بوون، وەك دیاریش شاڵێکیان داوە بەهەریەك لە هاوسەفەرەکانی میخین.

لە کۆتایی تشرینی دووەمدا نوری بەگ پەنجا تفەنگی فرۆشتووە و پارەکەی بۆ کوردەکانی ناوچەی گاویر و گردیلان ناردووە. ئەم هەنگاوەی نوری بەگ بەو مەبەستەیە: ئەگەر ئەو گوندانەی (دەشت) بفرۆشن کە سەر بە برایانی مانا سیریانن،با پارەی لە دەستدا بێت.

لەم دواییانەدا کاربەدەستانی نیزامی یاسایەکی تایبەتیان بۆ هاتنی بەگەکانی کورد بۆ ناو شاری ورمێ داناوە. لەم بارەوە لە ٢٣ی کانوونی یەکەم بە فەرمانی کەلەب عەلی خان، تاهیر بەگ و حەیا بەگ لە بەگزادە کوردەکان کە بۆ کاری تایبەتی خۆیان هاتبوونە ورمێ، لەشارەوە دەیاننێرن.

بەرپرسانی سوپایی فەرمانیان بە ئاغا و بەگەکانی مەرگەوەر و تەرگەوەر و داوە، کەسیان مافی ئەوەی نییە بەبێ مۆڵەتی فەرماندەی نیزامی بێتە ورمێ. تەنیا کەریم خان، حاجی ئاغا، پیرۆت ئاغا و نوری بەگ مۆڵەتیان هەیە ئازادانە هاتووچۆی شار بکەن.

### کرماشان و عەشایرەکانی ناوچەکە

لە٦ی کانوونی دووەم هەواڵمان پێگەیشت کە لە نێوان کەلهور و والی پشتکوە تێکهەڵچوون روویداوە. والی پشتکوە چەند گوندی کەلهورەکانی لە نزیك سنووری دەسەڵاتداری خۆی داگیرکردووە (پێشتر ئەم گوندانە هی والی بوون). کەلهورەکانیش هێرش دەکەنە سەر پیاوەکانی والی و ١٥ کەسیان لێ دەکوژن. ئەمیر کۆن کە یەکێك لە زەویدارەکانی ناوچەکەیە و خەزووری سەرۆکی عەشیرەتی کەلهورە واتە ئەمیر مەخسوس، خەریکی چارەسەکردنی کێشەی نێوان کەلهور و والییە. بۆ ئەم مەبەستەش نامەیەکی بە ئیمزای چەند پیاو ماقوڵی ناوچەکە ناردووە بۆ ئەمیر مەخسوس و والی.

١٣ی کانوونی دووەم بروسکەیەکی رێبەری سەنجابییەکان واتە سەردار ناسر گەیشتووە، ئەو دەنگوباسانەی تێدایە کە لە سەرگیرانی ناوبراو لە ناوچەکەدا بڵاوبووەتەوە. سەردار ناسر دەڵێ ئیستا ئازادە و لەگەڵ سەرۆك وەزیران پەیوەندییەکی باشی هەیە. پارتی ئیجتیماعیون وایان بڵاوکردۆتەوە کە سەردار ناسر دووجار چاوی بە مەلیك فەیسەڵ کەوتووەو پێکەوە پەیمانێکیان مۆرکردووە.

٢٨ی کانوونی دووەم دۆستەکانی سەردار رەشید نامەیەکیان لە لایەن ناوبراوەوە لە تاران پێگەیتشووە کە هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە سیاسەتی لاوازی رووسیا دەربڕیوە و وتوویەتی نەیارەکانی رووسیا زۆر بەهێزن. سەردار رەشیدا هەروا لە سەر گواستنەوەی بەم زووانەی سەردار موقتەدیر و سەردار زەفەر بۆ تاران، نوسیوویەتی[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٣٣٩-٣٥٣، ٣٦١-٣٦٣.

## لەسەر کوردەکانی عەشیرەتی برۆکی

کوردی عەشیرەتی برۆکی تا کۆتایی جەنگی جیهانی ١٩١٨ و ١٩١٩ (لە چوارچێوەی گوبێرنی ئەریولنی پێشوو دەژیان و زستانە هەواریان نێوان رووبارەکانی ئاراس و قەرەسوی خوارو و هاوینە هەواریان دەڤەری بایەزیدی نوێ، گۆندەڵەر، نولی دوز و ئاخ موگان بوو. بەشێکی کەمی عەشیرەتی برۆکی زستان و هاوین لە ناحیەی بایەزیدی نوێ دەژین. عەشیرەتی برۆکی دابەش دەکرێن بۆ یانزە بەش: گیرموڤکی، کارکی، شارکی، جیجیکی، ئالکی، حسکی، شاولیکی، بیرکی، باشکی و گوتکی.

ژمارەی گشتی عەشیرەتی برۆکی ١٤٠٠ بنەماڵەیە (بۆ شوێنی نیشتەجێیان سەیری خشتەی یەکەم بکە) لە کاتی کێشەی ئەرمەنی-تاتار، ١٩١٨ و ١٩١٩ برۆکی وەك دانیشتوانی تری گوبێرتی پێشووی ئەیرەوان لەگەڵ کورد وتاتار کەوتنە بەر شاڵاوی کوشتن و راونانی داشناکەکان. بەشێکی ئەو عەشیرەتە لە لایەن داشناکەکانەوە بە کۆمەڵ کوژران و بەشێکیان چوونە لای هاوڵاتیەکانی خۆیان بۆ گەنجە، بەڵام زۆربەیان لە رێگای بایەزیدەوە چوونە ناوچەی وان چونکە لەوێ تورکەکان ئەو گوندانەیان پێدان کە ئەرمەنییەکان چۆڵیان کردبوو لەوانە: گوندی تیمار، ئاوچیك، وان (گوندی ئاردامیدا)، خاڤاتسور، قەزاق ئەرجیش، کیواش و گوندی بوستان. ئیستا لە شوێنی نوێیان لە ویلایەتی وان ژیانیان خراپ نییە. بەشێکیان خەریکی کشتوکاڵ بوون،ئەوانی تر هەموویان کۆچەرین. تەنیا خێڵی پیرتی و باشکی (نیوەیان) و شاولیکی (٣٠ بنەماڵە) خەریکی کشتوکاڵ بوون، دەوڵەتی تورکیا ماڵیاتی کەمی بۆ عەشیرەتی برۆکی دانابوو. بۆ نموونە مالیاتی سوپای (دوو مەجیلی) دانابوو، وەك رابردوو بۆ خزمەت لە ریزەکانی سوپای حەمیدیە بانگ نەدەکران. بۆ هەر سەرپەز (ئەغنام)، وەك بۆ هەموو کۆچەرەکان دوو قرانیان وەردەگرت،لەم دواییانە کەمیان کردەوە و کردیانە یەك قران. مالیاتی سروشتی (ناتوری) وەك بۆ هەمووان یەك هەشتمیان لەبەرهەم (بۆ دانەوێلە و عەلەف)وەردەگرت. سەرەڕای ئەم بارسوك کردنەی دەوڵەتی تورك و بەهانا چوونی عەشیرەتی برۆکی، ئەم عەشیرەتە نایانەوێ لە چوارچێوەی تورکیا دابمێننەوە و دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ شوێنی پێشووی خۆیان ,چونکە دەترسن دەوڵەتی تورك لە داهاتوودا ناچاریان بکات لە سوپای حەمیدیەدا خزمەت بکەن. تورکەکان بۆ ئەم مەبەستە خەریکی ئامادەکردنی لیستی عەشیرەتەکانن، جگە لەوە هەوارگەکانی گولی روك لەو هەوارگانەی تورکەکان پێیان داون دەوڵەمەنتر و خۆشترن.

جگە لەوە عەشیرەتی بروکی نایانەوێ بگەڕێنەوە بۆ گوندەکانی زستانەهەواری خۆیان ( نێوان رووبارەکانی ئاراس و قەرەسو) کە ئێستا لە دەست تورکاندایە چونکە ئەم زستانە هەوارانە لەو هاوینە

هەوارانەی لەناو خاکی یەکێتی سۆڤیەتی دان زۆر دوورن و بۆ کوردەکان هیچ بایەخێکیان نەماوە، بە سەقامگیربوونی دەسەڵاتی سۆڤیەتی لە قەفقاز و گەڕانەوەی هێمنی بۆ ناوچەکە، جموجۆڵی گەڕانەوەی عەشیرەتەکانی بڕۆکی بۆ نیشتمان دەستی پێکردووە و دەستەی بچووک بچووک بەناو خاکی فارسدا دەگەڕێنەوە بۆ ناو خۆمان و زۆربەیان لە ناوچەی نەخجەوان جێگیر دەبن. لە نێوان ساڵانی ١٩٢٢-١٩٢٣ دوو سەد بنەماڵەی عەشیرەتی برۆکی گەڕاونەتەوە، پەنجا بنەماڵەیان لە هۆزی شاولیکوڤ بە سەرۆکایەتی عەبدوڵڵا مەلا ئۆغلی بوون کە لە کۆتایی پایزی ساڵی ١٩٢٣ لە تورکیا رایانکرد. دوایی داوایان لە کۆنسوڵی ئێمە لە ماکۆ کرد ریگەیان بدات بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان لە ناوچەی قەفقاز، کۆنسوڵ پەیوەندی بە تیفلیسەوە دەکات بەڵام رێگەیان نادەن، ئەوانیش ناچار دەبن لە ناوچەی ماکۆ بمێننەوە و پاشان نەمانزانی لە ورمێ چارەنووسیان بە کوێ گەیشت.

جگە لەوانەی سەرەوە هاوینی ١٩٢٣ لە ناوچەی وان سەد و بیست ماڵی خێڵی مرمیزکی و حەفتا بنەماڵەی کەرکی، پەنجا بنەماڵەی شەرکی و چل بنەماڵەی مامکی بەرەو ناحیەی پێشووی سورمالین بۆ هاوینە هەواری سینیك کەوتنە رێ و دەیانویست بۆ زستان بگەنە قەفقاز. بەڵام تورکەکان ئاگاداری ئەو وەرێکەوتنەی عەشیرەتی بروکی بوون و نەیانهێشت بێنە ناو خاکی ئێمە. هەوڵی دەرباز بوونی بروکیەکان لە ویلایەتی وان وای لە تورکەکان کرد لە دژی کوردەکان هەنگاو هەڵگرن. بە مەبەستی راگرتنی کوردەکانی بروکی تورکیا چەند گەورە پیاوی ئەو عەشیرەتەی کردە خزمەتکاری خۆی و دەستووری پێدان کاروباری عەشیرەتەکە بگرنە ئەستۆ. ئێستا بەکر ئاغای پیریان کردۆتە سەرۆکی عەشیرەتی بروکی لە تورکیا کە ئاگاداری کاروباری عەشیرەتەکانی خۆیەتی و هەرکەس بیەوێ تورکیا بەجێبێڵێ، ئەو تورکەکان ئاگادار دەکاتەوە.

بروکەکان حەز لە چارەی بەکر ئاغا ناکەن و بە جاشی تورکی دادەنێن و بە مەیلی خۆیان نەکەوتووەنەتە ژێر دەستی بەکر ئاغا. سەرکردەکانی خۆیان حەسەن ئاغا حاجی نکلی و تەیموور ئاغا ئالکین کە لە هەوڵی گەڕاندنەوەیان دان بۆ قەفقاز.

بارودۆخی عەشیرەتی برۆکی لەناوچەی وان دەبێ سەرنجی ئێمە بۆ لای خۆی راکێشێت و دەبێ بەرپرس بین لەو کوردانەی کە دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ قەفقاز، پەیوەندی بە کۆنسوڵی خۆمانەوە بکەین لە ورمێ و دەستوور بدەین بە باشی لەگەڵیان بجولێنەوەو هاوکاریان بکەن تا بەم چەشنە لاگیری یەکیەتی سۆڤییەت لە ناو کوردەکانی تری عەشیرەتی بروکی بە هێز بکەن. هەڵسوکەوتی باشی ئێمە لەگەڵ عەشیرەتی بروکی بۆ کوردەکانی تری کوردستان ئەنجامێکی باشی بەدواوە دەبێ، هیوایان بە یەکێتی سۆڤیەت دەبێ و لە کاتی پێویستدا کەلکیان لێوەردەگیرێت.

جەلالیەکانی ماکۆ لە پاییزی ١٩٢٣

| ناوی هۆزو عەشیرەتەکان | ژ.بنەماڵەکان | ناوی سەرۆکەکانیان | ناوی زستانە هەواریان | ناوی هاوینە هەواریان | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| خەلیکا نلو | ١٧٠ | خالید ئاغاو لیزگی ئاغا | ئاخ کوش قرەبولاخ | دومانلو | - سەرۆکی هەموو جەلالیەکان خالید ئاغا بەدەرکریانی سەردار لە ماکو پاییزی ١٩٢٣/ دەوری خۆی لەناو کوردەکان لە دەستداوە. ئیستا جیگای خۆی داوەتە برازاکەی لیزگی ئاغا کە دەولەمەنترین کوردی جەلالیەکان و لایەنگری دەسەلاتدارانی لەشکەری ئارانە |
| گەو خچی ئرشاگی | ٥٠ | حەسن حاجی ئیبراهیم ئوغلی | بەخولی- شاولیك | | |
| عەلی موغالو | ١١٠ | حاجی ئاغا و ئەمو ئاغا | زیلیکی، مولاحەسەن | | |
| خەسو خەلیفلی | ٧٠ | عەلی ماسو | | | |
| بیردکانلو | ٨٠ | میرزا عەلی ئوغلی | سارنیچ، خارس | توروچیشە بورقەلا | - سەرۆکی هۆزی جینەکانلو گینەی کانلۆ سەرۆکی هۆزی خالیکانلوە کانەکە لەسەردەمی سەرداری ماکو دەسەلات هەبووە. نیوان ئەو تاقمانەی سەرەوە هەمیشەشەرە |
| عەسیر کانلو | ١٠٠ | تاهیر ئاغا و ئیسماعیل | شیدی، زاکیرلی، قەرەگوچالی | | |
| بەگی کانلو | ٣٠٠ | ئەمزوو ئاغا | ئیلیانکرا،ئەلیسخان وجیك حارسو ماخات،چول ئینجا گمروخ، ئاتار ئاواد خان، ئیسخان، ساریم ساغ، شوربولاخ ئاراکمە، خاربس- خوسوشیکی | ئاگریچا کیوەکانی سەرسنور لە ئاواجیك و حال بەرەو باکوورو رۆژ ئاوا لە گوندی کیلسیاکەند و شاری ئەکداش | - لەناو هۆزی بەلیخکانلوەکان خەنگێك هەیە کە خەریکی کشتوکاڵن<br>- هۆزی کانلو لەبەرکەمی یان هەمیشە دەیانەوی لەگەڵ بەجیکاناوەکان یەك بگرن<br>- هاوبەندەکانی بەلیخکانلووەکان هەمیشە خەریکی ریگری و تالان کردنن لەناو خاکی تورکیا و ناوچەی ماکو |
| گەمدی کانلو | ٣٠ | ئیسماعیل ئرسمان ئۆغلی | چوخروش، مالیان شائیر١٥مال خەرامان٢٢ مال، یاریقەلای خوارو ١٧مال،یاریم کەمیایدورەم ٤٠مال یاریم کەمیای سەهەمبم مان یاریم کەمیای چوارەم ٣٠ مال | مورس/ خواری ئورزون گوناى کیرەکانی ئاگریچای ئەگراش لەمە حانی ئاوانجیك | - ئەم دواییە سەرۆکی جیندی کانلو عەمو تاهیر ئوغلی بوو. ئیستا عەلی حەسو ئۆغلی یان لەجێی ئەو داناوە بەلام دەسەلاتدارانی لەشکری ئاران دەیانەوێ عەلی حەسۆ گەورەیان بێت.<br>- هیچ پەیوەندی لەگەڵ جەلالیەکاندا نییە، شوێنی کۆچیان لە تورکیایە بەزووتریش بەرو تورکیا دەرۆن |
| جیندی کانلو | ١٤٠ | دەروش عەلی ئوغلی ئەبی سەکو عەلی حەسو عەلی | | | |
| ساکا نوك | ١٥٠ | لیزگی ئاغا | کوزلی، سیلسیام، کیژو گەریك حەسەن ئاغا دومان شیلی زاگامی: حاجو، مرس، سورروك | سەردار بۆلاخ بەرەو ئاراراتی گەورە | - ساکانەکان زۆرجار ئاژەلداری و وەرزێری پیکەوەدەکەن |
| قیزلباش ئوغلی | ٣١٢ | عەلی ئاغا | والی کەنە٢٢مال، پەنجەرلی٦٥ مال، کرلیك ٣٠ مال ئالخاج خالخالی کوچالی، | لە رۆژهەلات ئاراراتی گەورە | - ئەوتی بینینانەی کە لەسەر ساکانەکان نوسراوە هەمووی قز لباشەکانیش دەگریتەوە |

## عەشیرەتی جیلان لەناوچەی ماکۆ پاییزی ١٩٢٣

| ناوی عەشیرەت یان هۆز | ژمارەی ماڵەکان | ناوی سەرۆکەکانیان | ناوی هاوینەهەوارەکانیان | ناوی زستانە هەواریان | |
|---|---|---|---|---|---|
| عەمەوی | ٤٠ | عەلی قەرامانلی سادق | خەنداوەر - قیزل داخ بەشێکیان لەمەحالی ئالیانە | ئوروچیشی ئاقرا | - دراوسێ جەلالیەکانن وزورجاردەبێتە شەریان. |
| گولی کانلو | ٣٨ | حاجی حاسو | کیشی | شاری ئمحور | - لەبەر دوژمنایەتی لەگەڵ هۆزی کولی کانلو هاوینی ١٩٢٣ چون بۆ تورکیا. |
| کوردوی | ٦٠ | حوسێن ئاغا | عەزیم کەند - یاکوبالی بابیر سەری سو | | |
| کولیکی | ٤٠ | جەبار ئاغا | پورناک کوێدەر | ئالاکین | |
| میروی | ٣٠-٢١ | تەخار تایلان | دیلان کەند | ئەکسلی | - هاوینی ١٩٢٣ چون بۆ تورکیا. |
| شاتوی | ٥٠ | یاقوب | سعید کەند، قەرە بزیم | | |
| شێخکانلو | ١٠١ | عەبدوللا ئاغا ئەمرکور، زاهیر | گیگاج ٣٠ ماڵ،مەشەدی میرزاکەند ٢٠ ماڵ، مارکەند٣٣ ماڵ | حاجی بەگ | - سەرۆکی هۆزی شێخکانلو عەبدوللائاغا بەرواڵەت بەسەرۆکی هەمور خێڵەکانیدا ماکۆ دادەنرێت. |
| دیلای | ١٨ | عومەر ئمحور، عەلی عارب | حاجی دیوانە ٨ماڵ، سەعیدئەحمەدیوەلی سوار ١٠ ماڵ | ئیلیا ئلی حەسەنکەند ٣٥ ماڵ، ئاپاسی ئالیک ٣٦ ماڵ، کوچ کەند ٥ ماڵ، دیوان ٥ماڵ، چەخما خلی ٨ ماڵ، ئیسمیل ١٥ ماڵ- قیاس ٨ ماڵ | - دەچنەرێزی هۆزی شێخکانلو دوژمنی هۆزی کیچانلون.<br>دیل لای چەند ساڵە دوژمنایەتی یان لەگەڵ شێخکانلوەکان داهەیە، برای مەحمود ئاغا واتە لیمو ئاغا و لەگەڵ چەند کوردێکی ترعەشیرەتی دیل لای و چوار پێنج کەس لە شێخکانلوەکان کوژران. |
| کیچلانلو | ٢٠٧ حسن ئاغا چیسو، حاجی سەلو | مەحمەد ئاغا عەلی حوسێن، شیبیلوئاغا میرزا مەحمەد قرلی باقی، بەکر مەحمود عیسا ئاجار کەریم ئاغا | ١٨ماڵ، شیبیلو، ١٠ماڵ ،کەمبەرگ کەند ٢٠ ماڵ ، قزل قشلاق٢١ماڵ، ئازالگیخ ٧ ماڵ | | -گەورەی گوندی شیبیلو عەلی حوسێن بەشداری شۆڕشی سمکۆی لە ١٩٢٢دا کردووە بە ئیجازەی سەردار و برایەکەی گەرایەوە گوندی خۆی.<br>- محەمەد ئاغا لە پایزی ١٩٢٣ لە قشلاق مایەوە لەبەر ئەوەی کە عەلی حوسێن گەرایەوە لە لە هەوارگەی خۆی دەرکرابوو، چوار پێنج ساڵ ئەمەوبەر هەوارگەکەی درابوو بەسەردار و حەمەد ئاغا. |
| | ٧٠ | حاجی کەلیاج | کورت کەند- ئاك بۆلاخ | ئمحور | |
| دودی کانلو | ٢٠٠-١٥٠ | عەزیز ئاغا | زەنگلان / حاجی ئابد | قەتور | - لەمەحالی سیمکونوف دەژیت، و هەم ئاژەڵداری و هەم وەرزێری دەکەن .<br>-سەرۆکی دودی کانلو بەشداری چالاکانەی لەراپەرین سمکۆدا کردوە بە لەناوچوونی بزووتنەوەی کورد، سولتان قەرەبیرچوك لەلایەن فارسەکان بەخشرا و ئێستا لای سمکۆیە. |
| مامیکانلو | ١٦٠ | سولتان کەرەبیرچیك | ناوچەی قەتورسلماس | | |
| خەزوی | ٣٠ | ئومەر | ناوچەی ئالیاند | چالدیران | _ هۆزەکانی، مامیکانلو، خەزوی، لەناوچەکانی سیکسن، ئالیان و قوتوور دیارین لەکام گوند دەژین. |
| حەیدەرانلو | ٤٠ | خدر ئاغا | ساول مەحالی چالدیران | | یەکێك لە هۆزەکانی عەشیرەتی حەیدەرانلو هەم لە تورکیا و هەم لە ساکۆش دەژین |
| ژ. کشتی | | | | | |

شوێنەوار، ژمارەی عەشیرەی بروکی/ بروکانلی/ کە لەساڵی ١٩-١٩١٨ لە نێوان روبارەی ئارس و قەرەسوی خوارو لە ناوچەی گیرینی پێشوی ئیرەوان ژیاون.

| ناو | ژمارەی ماڵ | ناوی گەورەکانیان | ناوی زستانە هەواریان | ناوی هاوینە هەواریان |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١- قرمیزکی | ١٥٠ | سانوکەتو ئوغلی | ریگانلو، بورتولانی گەورە | ئاخ، مرغان نزیکەی ئیرەوان بەرەو بایەزیدی نوی |
| ٢- کارکی | ١٠٠ | حەمە حەسو ئوغلی | بور نولانی بچوك | |
| | ١٠٠ | عەلی حاجی بابو ئوغلی | کەردوم واری سەرو | |
| ٣- مامکی | ١٢٠ | حەسن نادر ئوغلی | کەردوم واری ناوەندی | |
| ٤- شارکی | ١٦٥ | گەسو حەسو ئوغلی | کەردوم واری خوارو، سیکانلی لای گۆلی گوکچا/ | |
| ٥- حاجیمکی | ١٢٥ | حەسەن ئاغا | توورون کەندو..... | |
| ٦- ئالکی | ١٠٠ | تەیمور ئاغا حاجی ئاتەش ئوغلی | عەزیزانلو | |
| ٧- خاسکی | ١٥٠ | خانو موستو | گومیك | |
| ٨- شاولیکی | ١٢٠ | عبدولا ئاغا ئومەر ئوغلی | سوتوکلان گوندەکانی لای گۆلی گوکچا | کیوەکانی گوزال دەرە وگۆلی دوز |
| ٩- پیرکی | ١٣٠ | بەکر ئاغا | گول تەپەلای گۆلی گۆکچا | |
| ١٠- باشکی | ١٣٠ | زەینال | قەرەسوگوندەکانی کچا | |
| ١١-گوتکی شاولی | ٨٠ | عەبدولا ئاغا | لای گۆلی، کچا لە ناوچەی بازارگەچار | |
| ژمارەی گشتی | ١٣٥٠ | ماڵ | | |

| ژمارە | ناوی گەورەکانیان | شوێنەوار و ژمارەی عەشیرەتی بروکی لە تورکیا و قەفقاز | | | |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| | | لەقەفقاز | تورکیا | | |
| ١- قزمیزکی | سان کەتو ئوغلی | ٢٠ | ١٣٠ | نامی، ئەرچەك تیمار | لەگوندی دەرەکەند لەشارووری |
| ٢- کارکی | عەبدول حەمید | | ١٠٠ | تیمار | |
| ٣- مامکی | سەرۆکیان نییە بەڵام سەربەحەسەن ئاغا حاجیمکیندن | ٢٠ | ٨٠ | قەزای ئەرجیش و ناوچەی سورمالین | لەناو کوردەکانی قزلباشی ماکو دەژین |
| ٤- شارکی | تەیمور ئاغا ئاتەش ئۆ علی | | ١٢٠ | ناحیەی ئارچیك و ناوچەی سورمالین | |
| ٥- حاجیمکی | حەسەن ئاغا | | ١٦٠ | تیمار، مەرکەز گوندی ئەردایت | * تێبینی/ |
| ٦- ئالکی | سەرۆکیان نی یە بەڵام سەربە عەبدولا ئاغای شاولیکن | ٣٠ | ٩٠ | ئارچیك تەیار قەزای کەواش ناحیەی خەواتسور | لەگوندی دەرەکەنە لەشارووری ٢٠ ماڵ بێ سەرو شوێنە، لەگوندی وارمازیر ٥٠ ماڵ لە ١٩٢٣ هاتون لەشاری شارووری و لەناوچەی گەنجەن. ١٥ماڵ بەدەستی دا شناکەکان لە ١٩١٩ سەربڕان |
| ٧- خاسکی | عەبدولا ئاغا | ٤٠ | ٦٠ | ناحیەی خەواتسور | |
| ٨- شاولیکی | ئوسوف خولش | ٢٠ | ٨٠ | خەواتسور کاوش | |
| ٩- پیرکی | وزیرئاغا سەربە عەبدولا ئاغان | ٣٠ | ٩٠ | خەواتسور، مەرکەز | |
| ١٠- باشکی | | ٤٠ | ٩٠ | گوندنی ئەرداسیت | |
| ١١-گوتکی شاولی | | ١٥ | ٦٥ | | |
| ژمارەی گشتی | | ٢١٥ ماڵ / ١٠٦٥ ماڵ | | | |

## بۆ ستادی لەشکری سوپای رووسیا لە قەفقاز

بۆ ئاگاداریتان کورتە زانیارییەکتان سەبارەت بە کێشەی کورد بۆ دەنێرم، کە هاوڕێ شاخوڤسکی ئامادەی کردووە.

**پاستوخۆڤ - سەرۆکی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی**

**کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت**

**لە راپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم رۆژی ٣ی مارتی ١٩٢٤**

**کوردەکان:**

کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردی کە زۆربەی لە ئەفسەرە کوردەکانی سوپای تورکیا پێك هاتووە، بەشێکی ئەم ئەفسەرانەی خۆی لە دەستدا، ئەویش لەبەر ئەوەی فەرماندەی هێزەکانی سوپای تورکیا فەرمانی بەو ئەفسەرە کوردانە داوە کە خەڵکی ئەو شوێنانەن لە خاکی تورکیا جیابۆتەوە سوپای تورکیا بەجێبێڵن (واتە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان گوایا خەڵکی باشووری کوردستانن، ئەمەبیانوو بووە. وەرگێر). پیشنیاریان بە خالید بەگ کردووە بمێنێتەوە و سەرکردایەتی فەوجی سوپای تورك لە کەرەکیل وەئەستۆ بگرێت، بەڵام ناوبراو ئامادە نەبووە و لە ئەرزەڕۆم ماوەتەوە. هەموو پێوەندییەکی لەگەڵ کونسولی ئێمە پچڕاندووە. لەگەڵ کوردستانی باشوور ئاڵوگۆڕی نامەی هەیە. دەنگوباسی واهەیە کە لە «نانی» تورکی بێزار بووە، بۆیە داوای واز هێنان دەکات لەکارەکەی[1].

---

(1) هەمان سەرچاوە ل٣٧٨-٣٧٩.

## له كۆمیساری گەلی بۆ كاروباری دەرەوە (وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت)

## بۆ هاورێ پیترۆڤ – كەمنیترن، ٤ی تەمووزی ١٩٢٤

باردۆخی گشتی دونیا، وتوویـژەكانی ئێمـە لەگـەڵ ئینگلیـز لـە لەنـدەن، درێـژەی خـەباتی نەتەوایەتی لە توركیا و ئاڵۆزی ئەم خەباتە لە فارس (ئێران) كە خەریكە شـێوازێكی نـوێ لـە ئاستی نێودەوڵەتیدا بەخۆوە بگرێت. هەموو ئەمانە دەرفەتی ئەوەمان پێنادەن بۆ دروستكردنی دەوڵەتێكی كوردی لە داهاتوویەكی نزیكدابە شێوەیەكی ئەوتۆ خۆمـان بـە كێـشەی كـوردەوە خەریك بكەین كە لە بەرژەوەندی ئێمە دابێت. جگە لـەوەش یارمـەتیـدانی ناسیۆنالیـستەكانی كورد لە خەباتیان دژی دەوڵەتی و توركیا و ئێران لەبەرژەوەندی ئێمـەدا نـابێ، چـونكە پـێش هەموو شتێك راپەڕینی چەكدارانەی كورد، دەبێتە هۆی ئـاڵۆزتربوونی بـارودۆخی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاست كە بێ ئەوەش هەر بۆ خۆی ئاڵۆزە، بێگومان بۆ بارودۆخی جیهانی پاشماوەی خراپـی بەداوە دەبێت. با ئەمەش لەبەرچاو بگرین كە دروست كردنی دەوڵەتی سـەربەخۆیی كوردسـتان دژی بەرژەوەندییـەكانی توركیـا و فارسـە. جگـە لـەوە ئاشـكرایە ناسـیۆنالیزمی كـوردی بناغەیەكی ئابووری خۆی نییە بتوانێ دەوڵەتی نەتەوەیی كوردی لەسەر دابمەزرێنێ. خۆ ئەگـەر دەرفەتی هەندێ شتیش بدەین (بۆ وێنە لاوازكردنـی توركیـا) زەمینەشـی بـۆ خـۆش بكـەین، دەوڵەتی كوردی هەر دروست نابێت. جگە لەوەش بەبێ یارمەتی دەوڵەتێكی تر سەرناگرێ ئـەو یارمەتیەش دەبێ لە لایەن دەوڵەتی ئێمە یا ئینگلیزەوە بێت.

پشتیوانی كردنی سەركردە كوردەكان دەبێتـە هـۆی نـاكۆكی ئێمـە لەگـەڵ توركیـا و فـارس، بەرژەوەنـدی ئـەم سـەرۆكانەش رووبـەڕووی بەرژەوەنـدی ئێمـە دەبێتـەوە. ناشـكرێ خـۆ لەرووبەڕووبونەوەی ئینگلیز بپارێزین كە بەرژەوەندی لە دروستكردنی دەوڵەتی كوردی دا هەیـە (ئەویش ئەگەر ئەم دەوڵەتە بە پشتیوانی ئینگلیز یا لە پاوانی سیاسی ئەودا بێت).

لەبەر راگرتنی پارسەنگی هێزەكان ئێستا نـاتوانین بكەوینـە ركابـەری لەگـەڵ ئینگلیزەكـان، پشتیوانی كردنی كوردەكان، توركیا و فارس دەكاتە دوژمنی ئێمەو دەیانخاتە باوەشی ئینگلیـز و دەبێتە هۆی تێكشكانی سیاسەتمان لە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت. بۆیـە بـە پـشتیوانی كردنـی

کوردەکان ئێمە لەلایەکەوە دەکەوینە بەرامبەر بەرەی یەکگرتووی ئینگلیز و تورکیا و فارس، لە لایەکی ترەوە هەرچۆنێك بێ ناتوانین سەربەخۆیی کوردستان راگرین و بپارێزین. بۆ ئەم پێشبینییە ئەوەندە بەسە، ئێمە لەم خۆ بەستنەوە پڕ مەترسییە بە کوردە ناسیونالیستەکانەوە، خۆبپارێزین. ناسیۆنالیزم پێکهێنەری هێزێکە کە تائێستا ئێمە هیچ باوەڕێکمان پێی نییە. جگە لەوە ئێمە باوەڕ ناکەین ئەو سەرکردە ناسیۆنالیستانەی کورد کە داوای یارمەتیمان لێدەکەن لە یەکەم دەرفەت هەڵویستی خۆیان نەگۆڕن و بەرەو لای ئینگلیز نەڕۆن.

با ئەوەشمان لە بیرنەچێت کە ئینگلیزەکان لەسەر ئامادەکردنی کوردان بەگوێرەی پێویست کاریان کردووە، کە دەبێتە هۆی بالادەستی ئەوان لە ناو کوردەکاندا وکەم بوونەوەی ئەگەری هاتنیان بەرەو لای ئێمە.

بەپێی ئەو بۆچوونەی سەرەوە دەکرێ بڵێین راپەڕینی چەکدارانەی کوردەکان لەم کاتەدا، سەرکەوتوو یا تێشکاو، بەگشتی لەدەست ئینگلیزەکاندا دەبێت. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم فاکتەرانە پێویستە هەڵوێستێکی زۆر چاوەڕوانکراو بگرینەبەر و بەزووترین کات راپەڕینی سەرکردەکانی کورد رابگرین و پێشنیاریان پێبکەین هەموو هێزی خۆیان کۆبکەنەوە بۆ رزگار بوون و دابڕان لە ئینگلیزەکان، بۆ ئەوەی سەروەری خۆیان لە بارودۆخێکی لە بارتری جیهانیدا بگرنە دەست. بەم چەشنە ئێمە لامان وایە دروستکردنی کوردستانی سەربەخۆ کاتێك دێتەدی کە بارودۆخی جیهانی ئاڵۆزبێت. ئەمڕۆ بەپێی بەرژەوەندییەکانی ئێمە ئەم کێشەیەمان پێویست نییە[1].

سلاوێکی کۆمۆنستانە.

**چیچیرین**

<u>**نێردراوە بۆ هاوڕێیان:**</u>

١- پیترۆڤ. ٢- سوریتسز ٣- قەرەخان. ٤- شۆمیاتسکی. ٥- پیتریس. ٦- ئەرشیف

(1) هەمان سەرچاوە ل ٣٨٠-٣٨١.

## بۆ: بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست- هاوڕێ پاستۆخۆڤ

## بۆ: کۆنسۆڵی یەکیەتی سۆڤیەت لە ئەرزەڕۆم- هاوڕێ پاڤلۆڤسکی

### کێشەی کورد

مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بە گوێرەی پێویست لە راپۆرتەکانی پێشووی هاوڕێیان شاخۆڤسکی، پاڤلۆڤسکی و مالتسوڤدا بەوردی نوسراوە، ئەرکی من ئەوەیە باسی قۆناغی دواتری بزووتنەوەی کورد بکەم. ئەو بابەتەی بۆ ئەم راپۆرتە نوێیە کەڵکی لێوەرگیراوە، یەکێکە لەو وتووێژانەی ئەم دواییەی ئێمە لەگەڵ یەکێك لە سەرکردەکانی ئەم بزووتنەوەیە بەناوی یوسف زیا بەگ.

### خاکی کوردستان لە داهاتوودا

کوردستانی ئازاد لە داهاتوودا بەگوێرەی کۆمیتەی کوردی دەبێ ئەم شوێنانە بگرێتە خۆ باشووری کوردستان، ویلایەتەکان و شارەکانی تورکیا: بایەزید، وان، موش، بەتلیس، ئەرزەڕۆم، دیاربەکر، سیواس، بەشێکی ئەدەنە (ئورفە) و بەشێکی ترابزونی لازیستان. ئەم ناوچەیەی دوایی،بەگوێرەی کۆمیتەی کوردی بۆیە پێویستە بخرێتە سەر کوردستان، تا دەستی بە دەریای رەش رابگا و حوکمێکی سەربەخۆیی هەبێت.

لە وەڵامی پرسیاری من کە هەڵوێستی لازەکان لەم بارەوە چۆن دەبێت، کوردەکان وتیان بەتەواوی لەگەڵیان پێکهاتوون و لەگەڵمانن. بەڵام سەبارەت بە کوردستانی فارس (ئێرانی ئەمڕۆ) کۆمیتەی کوردی دەڵێ لەدواییدا ئەم پرسە دێنینە گۆڕێ، واتە دوای دامەزراندنی کوردستان لە چوارچێوەی ئەو سنوورانەی کە لە سەرەوە دەستنیشان کران و دوای رێککەوتنی تەواو لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت.

### بارودۆخی ناوخۆی تورکیا و تاکتیکی کۆمیتەی کوردی

ئەو بارودۆخە سیاسی و ئابووریەی ئەمڕۆی تورکیا بە بۆچوونی کۆمیتەی کوردی، ئەرکی سەرشانییان زۆر ئاسان دەکات، لە وتووێژی ١٩٢٣/٥/٢٥ لەگەڵ یوسف زیا بەگ، بەم چەشنە بۆمان دەرکەوت:

١- سیاسەتی ئابووری تورکیا لەم دوایانەدا نە تەنیا باری ژیانی جووتیاران و زەحمەتکێشانی تورکیای بەرەوە باشی نەبردووە، بەڵکو زۆر خراپی کردووە. یەك لە دوای یەك وەرگرتنی مالیاتی نوێ لە جووتیاران بۆتە هۆی نارەزایی و قین و توورەییان. لەناو ئەم چین وتوێژانەدا ئێمە زۆر سەرکوتووین.

٢- دەوڵەتی تورکیا لە عەشیرەتەکانی ئێمە دەترسێت و هەر بۆیە تورك بە فەرماندەی کەرتە چەکدارەکانی ئەم عەشیرەتانە دادەنێن و فەرماندە کوردەکانیش دەکات بەجێگیر یا یاریدەر یا پلەی دووەمیان پێ دەدرێت. ئەم کردەوەیەی دەوڵەتی تورکیا بۆتە هۆی قین و توورەیی لەناو هەم فەرماندە و هەم سەربازەکانی کورد کە بیانویەکی زۆرباشە بۆ ئێمە تا لەناو ئەم توێژەی دانشتواندا چالاکی بنوێنین. سەر ئەنجام بۆ کاروباری خۆمان کەڵك لەو پیاوە ئاینی و ئەو بەگە کوردانە وەردەگرین کە بە هۆی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت وەلانراون. هەروەها بەپێی پەیمانی دوو قۆڵی لە نێوان ئێمە و سەرکردەکانی بەرهەڵستکاران هاوکاری دوو لایەنەمان هەیە.

پێویستە بگووترێت کۆمیتەی کوردی،جاران ئاگاداری کردبووینەوە کە دەیانەوێ بە یەکجاری لە تورکیا جیاببنەوە، هێزە بەرهەڵستکارەکانیش ئاگادار نەبوون. ئێستا ئەم شتە لە بەرهەڵستکارەکان ناشارنەوە بەم دواییانە لەسەر ئەم بابەتە بەتەواوی لەگەڵیان رێککەوتوون.

بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە پێکهاتن لەگەڵ رێبەرانی بزووتنەوی کوردستانی باشوورەوە هەیە ئەوەیە: لەم بارەوە بە یەك گەیشتوون، هیچ گوومانی تێدا نییە پلانی هاوبەشی پێکەوە راپەڕینیان هەیە. ((ئێمە بەتەواوی ئامادەین —ئەمە وتەی زیا بەگە- تەنانەت دژی بچووکترین کەرتی سوپای تورك هێزی ئامادەمان هەیە و ئەگەر دەوڵەتی یەکیەتی سۆڤیەت ئامادەی یارمەتیدان بێت سێ رۆژ دواتر دەست بەکاردەبین)).

## دەسەڵات لە کوردستان

لە وەڵامی پرسیاری من کەلە داهاتوودا چ ستراکتۆرێکی دەسەڵات بۆ کوردستان پێشنیار دەکەن؟ کۆمیتەی کوردی پێی وتین: دەیانەوێ بەرێوەبەرایەتی وەك یەکیەتی سۆڤیەتیان هەبێت، بۆیە ئێستا تا دەسەڵاتیان نەگرتۆتە دەست لە یەکەم قۆناغدا پێویستیان بە شێخ و مەلا هەیە. پێیان وتین شتێکی ژیرانەیە جارێ باسی کۆمۆنیستی لە کوردستان هەر نەکرێت و نابێ بکرێت. ئێمە تەنیا

کەڵك لە متیۆدەکانی دەسەڵاتی سۆڤیەتی وەردەگرین و ناوی پارتی کۆمۆنیستی لینانیین چونکە خەڵك تێگەیشتنێکی لاواز یا پێچەوانە و نادروستیان هەیە.

## داواکاری کوردەکان

هەروەك ئاشکرایە کوردەکان کە داوای یارمەتی لە یەکیەتی سۆڤیەت دەکەن شەش خاڵیان ئاراستەکردووین کە کاتی خۆی راگەیەندراون، ئێستا کێشە لەسەر ئەم شەش خاڵە بە یەکجاری نامێنێت.

## داواکاری کوردان ئەمانەن:

١- پشتیوانی سیاسیان لێبکرێت و دەڵێن کە هاوکاری دوولایەنەی نێونەتەوەیی لەبار هەیە و داوادەکەن کە روونکردنەوەیەکی گونجاو ئاراستەی ئینگلیزەکان بکرێت و ئەم کێشەیە لە کۆنفرانسی لەندەن بەرز بکرێتەوە. ئەگەر لەمبارەوە پێویست بە خۆدەرخستن یا خۆ پشاندانی سیاسی هەبێت ئەوا ئامادەن بە چەکەوە بەم کارەهەستن.

٢- یارمەتی ماددیان بدرێت، دراو بێت گرنگترە. جاریَ نازانن بەتەواوی بۆ ئەم کارە چەندیان پێویستە، لە وتووێژەکاندا ئەوەندە تێگەیشتم بەپەلە نزیکەی دە هەزار سکەی زێر واتە سەد هەزار لیرەی زێریان دەوێت. بە قسەیئەوان دەبیَ دوای یەکگرتنەوەی سنوورەکان کوردستان و یەکیەتی سۆڤیەت یارمەتی چەك و تەقەمەنی بدرێن.

## پەیوەندی دوو قۆڵی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت و لایەنگری رێبازی سیاسی کوردەکان

ئەو یارمەتییەی سەرەوە بۆ کوردەکان بەپێی ئەو مەرجانە دەبێت کە یەکێتی سۆڤیەت بۆیان دادەنێت. کوردەکان ئەو مافەش دەدەن بە خۆیان بە وەرگرتنی وەڵامی ئێمە باس و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم کێشەیە بکەن.پاشان لەمەڕ کاروباری رێکخراوەکەیان پرسیارمان کرد: « ئەگەر یەکیەتی سۆڤیەت ئێستا چارەسەر کردنی کێشەی کورد بەناوەخت بزانیَ هەڵوسوکەوتتان بەرامبەر سیاسەتی ئینگلیز لە کێشەی موسڵدا چ دەبیَ؟». وتیان بە یەکجاری لایەنگری هەڵویستی سیاسی یەکیەتی سۆڤیەت دەکەن، ئەگەر یەکیەتی سۆڤیەت ئامادە نەبێت ئەوا ناچارن چاوەڕێی هەلێکی لەبارتر بکەن، چونکە بۆ ئەوان زۆر زەحمەت تر دەبێت راپەڕینی کۆمەڵانی کورد بۆ وەختێکی تر هەڵگرن. دوور نییە بە گرتنی یەکێك لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی کوردلە لایەن تورکانەوە خەڵك

بوروژێن، ئەوسا راپەڕینی کوردان دژی دەوڵەتی تورك بە هیچ شێوەیەك پێشی پێــی نـاگیرێ. بــەڵام ئەوەی پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە هەیە ئەوەیە: گەرچی نوێنەری کۆمیتــەی کــوردی حەیـدەر زادە ئیبراهیم تۆغلی (شێخ ولئیسلامی پێشووی تورکیا) لە بەغدا دادەنیشێت، بەڵام ئــەرکی سەرشـانی ئەوەیە کە هەڵوێستی ئینگلیزەکان سەبارەت بە یەکگرتنی باشووری کوردستان بە گەلاڵەیەکی نـوێ لەقەڵەم بدا. سەرەڕای بەشی راگەیاندنی کوردەکان،لــە رۆژنامــەی ئینگلیــزی «تــەن» بــە گــوێرەی پێویست و خواستی کوردەکان لە سەر ئەم کێشەیە نووسراوە و روونکراوەتەوە.

هەڵوێستی کۆمیتەی کوردی لە داهاتوودا چۆن دەبێت زۆر زەحمەتە بزانرێ. پێموایــە پــێش هــەموو شتێك پەیوەستە بەوەی کە تا کوێ تورکیا لەسەر کێشەی موسڵ لەگەڵ ئینگلیز پێکدێت و حەیـدەر زادە چەند سەرکەوتوو دەبێ؟.

رەنگە کوردەکان چیتر چاوەڕێ نەبن،دوورنیە لەگەڵ ئینگلیزەکان پێکبێن و بە یارمــەتی ئــەوان دژی تورکیا راپەڕن و تەنیا تا دروستکردنی دەوڵتی کوردی لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بمێننەوە، یــا کاتێــك تێ بگەن هەڵوێستی ئینگلیزەکان لەســەر موســڵ لەگــەڵ تورکــان نیگەتیڤانەیــە، لەگــەڵ تورکیـا پێکبێن و دژی ئینگلیز راوەستن.

لەم ئەگەرەی دواییدا ئەم کێشەیە نەتەنیا بە مەیلی کوردەکانەوە، بــەڵکو بــە هەڵوێــستی دەوڵــەتی تورکیاشەوە بەستراوەتەوە. بەڵام کوردەکان بە چاوێکی خراپەوە دەڕواننە ئەندامانی ئەمڕۆی دەوڵەتی تورکیا، زۆر زەحمەتە لەگەڵیان ریککەون، بۆیە سەرکەوتنی وتووێژەکان پتر بە هەڵوێــستی دەوڵــەتی تورکیاوە بەندە. بە پێچەوانەی ئەم شتە دوور نییە لە تورکیا شۆڕش بکرێت و دەوڵەتی نوێ بێتەسەر کار،بەکورتی لە داهاتوویەکی نزیکدا هەڵویستی کوردەکان دەردەکەوێت[1].

**کۆلیکۆڤ**

**٣ی تەموزی ١٩٢٤ مۆسکۆ**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٣٨٢-٣٨٥.

## بروسكەیەك لە سەقزەوە بە ڕێگای باڵوێزخانەی كۆماری توركیادا

۱۹۲٤/۷/٦\٥

**كۆپییەك بۆ: باڵوێزخانەی ئەمەریكا**
**باڵوێزخانەی یەكیەتی سۆڤیەت**
**باڵوێزخانەی ئەفغانستان**
**سەرۆك وەزیرانی فارس (ئێران)**

لەم دوو ساڵەی دواییدا دەوڵەتی ئینگلیز دەیەوێ سلێمانی بگرێت كە ناوەنـدی كوردسـتانی باشـووره و بەم چەشنە هەوڵدەدات بۆ گەیشتن بە مەبەستەكانی خـۆی بـە ئاژاوەنانـەوەی جۆراوجـۆر بـە ئێرانـەوە بنوسێت. لەشكرەكەی لەگەڵ هێزی ئاسمانیدا بەبیانووی خۆ بەدەسـتەوەنەدانی دانیـشتوان گـەلێك جـار دەستدرێژیان كردۆتە سەر شارەكەمان و بە كۆمەڵ خەلكیان كوشتووە.

بەتایبەتی ئێستا كە خەریكی وتووێژە لەگەڵ دەوڵەتی مەزنی توركیـا، واتـە لـە ۲۷و۲۸ ئـەم مانگـە ٦/۳۱ و ۱۹۲٤،/۷/۱ ئیمساڵ (دەیان فڕۆكەی شەڕكەر لـە شـەبەق تـا شـەفەقی هـەتاو بـەهێزێكی یـەكجار زۆرەوە دەسـتیان داوەتـە بۆمبـارانكردنی شـارەكەمان و وێرانكردنـی مـاڵ وحـاڵ و شـوێنە ئایینییەكانی موسڵمان و ناموسڵمان و خەلكێكی زۆریان لەناوبردووە. ئەوانەی كە توانیویانـە دەربـازبن خۆیـان گەیاندۆتـە گونـد و دێهاتـەكان. هـۆی ئـەم زوڵـم و زۆرەش ئەوەیـە: ئینگلیزەكـان لـە شـارە دوورەكانەوە ئاشووری نەستوریيان بانگەواز كردووە كە بێن لە سلێمانی بـژین و بـە زۆر دەیانـەوێ ئـەو دەڤەرەی بەمیرات لە باوباپیرانمان بۆمان بەجێماوە، لێمان بستێنن. بێگومان ئەم چەوسـانەوە و كـردەوە دڕندانەیە وگەلێك زوڵم زۆری تر، بە پێـچەوانەی یاسـای دەوڵـەتانی خـاوەن شارسـتانییەت و ویـژدانی مرۆڤایەتییە، جێی رق و بێزاری مرۆڤی خاوەن شارستانییەتە. سەرنجی ئێوە بۆ بارودۆخی سـەختی ئـەم گەلە چەوساوەیە كە پەناگەو ماڵی خۆی لـە دەسـتداوە، رادەكێـشین، بـەناوی مرۆڤایەتییـەوە داواتـان لێدەكەین رزگاریان بكەن و ژیانی ئاساییان بۆ دابین بكەن[1].

چاوەڕێ هاوكاری و پشتیوانیتان لێدەكەین.

**مەحموود**
**فەرماندەی گشتی هێزی نەتەوایەتی كوردستان**
**۳۱ی مایسی ۱۳٤۰**

---

(1) هەمان سەرچاو ل ۳۸٦.

- سەعید (سەید) موحەمەد عەلی —سەعید عەلی.... (سی چل ناو نووسراوە، بەداخەوە لەبەر شارەزانەبوونی وەرگێری ئەو بروسکەیە بۆ رووسی و وەرگێری لە رووسیەوە بۆ کوردی، ناخوێندرێنەوە. سەیر ئەوەیە زۆر ناوی تێدایە کوردی نین، دوور نییە کەسێکی تر بەناوی شێخ مەحموودەوە نووسیبی، پێدەچێت هاندەری ئەم نامەیە تورکیا، سۆڤیەت یان ئێران.. بووبێ، یا بە هاندانی یەکێك لەوان نووسرابێت، من دەقەکەی ترم بە هیچ زمانێك لە بەردەستدانییە — وەرگێر-) {ئەم ناوانە لە ژێر نامەکەدایە سەید موحەمەد عەلی، سەید عەلی، موحەمەد رەشید ئاترایل، حاجی ساحیب تەوریزی، سلێمان بەقاڵ، عەبدولکەریم بەقاڵ، عەبدولقادر بەزاز، رەسوڵی نەجار، فاخیر عیزەدین، عەلی نیمچی و رەفعەت...}.

**ئەنقەرە ١٩٢٤/٨/١٣**

ئاشورییەکان فەرمانداری هەکاری رەفعەت بەگیان بە دیل گرتووە. پاش ئەوەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە تورکان لەلایەن ئاشوورییەکانەوە گەمارۆ دەدرێن،زۆر لەو جەندرمانە دەکوژرێن یان بەدیل دەگیرێن. دەوڵەتی تورکیا خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەم رووداوەیە. جێگری وەزیری ناوخۆی تورکیا لەگەڵ وەزیری تەندروستی رەفیق بەگ دەچنە لای عسمەت پاشا و لەوێ بریار دەدەن کە بۆ سزدانی ئاشوورییەکان هێزی سوپایی خۆیان بنێرنە هەکاری.

## ڕووداوەکانی سلێمانی بە گوێرەی گێڕانەوەی

## موسڵاویەك کە لە نزیکەوە بینەری هەندێکیان بووە

ئاشوورییەکان لە سوپای ئینگلیز دان، نەیانتوانیوە سلێمانی بگرن، لە جەژنی رەمەزانەوە تا ئیمرۆ لە ئوردۆگاکانی کەرکووك کۆبوونەتەوەو خۆیان بۆ هێرشی سەر سلێمانی ئامادەکردووە. ئەم تاقمە سەربازە تا هێرش هێنانیان بۆ سلێمانی بە دوای بیانوودا دەگەڕان. بۆ نموونە یەکێك لەوانە لە بازاڕ بیانو بە شیرینی فرۆشێکی کورد دەگرێت و دەیکوژێت، بەبیستنی تەقە و هەرا ئاشووری ئۆردوگاکان ئاگادار دەبنەوە و هێرش دەکەنە سەر خەڵکی بێتاوانی کورد و گوندەکانیان دەستوتێنن و هەر کەسێکیان دەسکەوێ دەیکوژن،خەڵکی تالان دەکەن، تەنانەت هێرش دەبەنە سەر ژنان زێر و زیویان لێ دەستێنن و دەست درێژییان دەکەنەسەر. هەموو ئەم کردەوە دزێوانە لە مانگی رەمەزاندابوو.ئینجا نۆرەی سلێمانی دێ. ئەم شارە تا ئێستا کەس نەیتوانیوە داگیری بکات. قارەمانێکی هەڵکەوتوو ئازای وەك شێخ مەحموودپارێزگاری لێکردووە و دەیکات. دانشتیوانی ئەوێ نە تەنیا شێخ مەحموود بە سەرۆکی خۆیان دەزانن بەڵکوبە رزگارکەری دادەنێن. خەڵکەکە نەیاندەویست لە تورکیا جیاببنەوە و بۆ ئەم مەبەستەش شێخ مەحموودیان بە سەرۆکایەتی دەستەیەك نوێنەر ناردە تورکیا. شێخ مەحموود بە هیچ شێوەیەك لە سەید تەها ناچێت (سەید تەها خەڵکی نەهرۆ سەر بە قەزای شەمدینانی هەکارییە و گوایا ئینگلیزەکان تاجی مەلیکی کوردستانیان لە جیفتخانەی موسڵ لەسەر ناوە)٬ شێخ مەحموود دەیەوێ دەستەمۆی هیچ دەوڵەتێك نەبێت و کابرایەکی بە ئیمانە و ئەو ئیمانەش بەرەو یەکگرتنی دایکی وڵاتەکەی واتە تورکیا رایدەکێشێت.

پێش ڕووداوەکانی کەرکووك ئینگلیزەکان خۆیان بۆ داگیرکردنی سلێمانی ئامادەکردبوو، بۆ ئەم مەبەستەش هەرچی هێزی لە عێراقدا هەیانبوو کۆیانکردەوە. هەموو رۆژێك ٣٥ فڕۆکەی جەنگی ماوەی ٤ تا ٥ کاتژمێر سلێمانیان بۆمباران دەکرد. ئەم بۆمباران کردنە نزیکەی دە رۆژی خایاند و بەشی زۆری تۆپبارانیشی لەگەڵدابوو. دانشتیوانی شاری سلێمانی چیتر نەیاتیوانی بەرگری بکەن. ئینجا فڕۆکەکانی ئینگلیز بانگەوازیان بڵاوکردەوە و داوایان لە خەڵك کرد تەنیا بە خۆبەدەستەوەدان گیان وماڵیان دەپارێزرێت.ئەم بانگەوازە لە لایەن دوژمنانی دانیشتوانی سلێمانی کە لە بەغدا دادەنشین ئیمزا کرابوو، هەر ئەوان بەناوی

نوێنەرانی سلێمانی پەیمانی ئینگلیز و عێراقیان مۆرکرد. بەڵام دانشتیوانی شاری سلێمانی بە پێچەوانەی مەیلی خۆیان باوەڕیان بەو بانگەوازەکرد، شێخ مەحموود زانی چیتر ناتوانێ پارێزگاری لە سلێمانی بکات، شاری بەجێهێشت و بە خەڵکیشی راگەیاند تەسلیم بن. سەربازە ئاشوورییەکان کە دێنە ناو شار، رەوشتەکانی پێشوو دووبارە دەکەنەوە واتە گرتن، کوشتن، تالانکردن و دەست درێژی بۆ سەر ژنان. بەم چەشنە بانگەوازەکانی ئەم نیشتمان فرۆشانە بۆ خەڵك دەرکەوت، ئەم رووداوە تراژیدیە بوو بە هۆی کوژرانی هەزاران کەس لە خەڵکی کورد[1].

تەوحیدی ئەفکار ١٩٢٤/٨/١٤

## میسیۆنێرەکانی ئایینی فەڕەنسا لە ورمێ ١٩٢٤/٨/١٦

ئەوانە جگە لە سیخوڕی کردن لەناو مەسیحییە ئاشوورییەکانی ورمێدا کاردەکەن و یارمەتی ئەو ئاشوریانە دەدەن کە لە موسڵەوە هاتوونەتە ورمێوە.

## وتاری رۆژنامەی ئیزفیستیا لە ٣١ی ئابی ١٩٢٤

لە نێوان تورکیا و ئێران هەرێمێکی زۆر پان و بەرین هەیە کوردی تیا دەژی، لە مێژە بۆتە پێگەی خۆشەویستی سیخوڕەکانی ئینگلیز. هەمیشە وەك چەکێك دژی تورکیا و ئێران و یەکێتی سۆڤیەت بەکاری دەهێنن. بەڵام گەلێکی تر لەو ناوچانەدا دەژین کە ژمارەیان لە چاو کوردەکان زۆر کەمە و کوێرانە بێ مشت و مڕ بوونەتە داردەستی دیبلۆماتەکانی ئینگلیز. ئەم گەلە چارە رەشە پاشماوەی گەلی کۆن و خاوەن مێژووی ئاشوورییە. ئاشوورییەکان بە دڵ و بە گیان (نەك لە ترسان) لە ریزەکانی سوپای ئینگلیزدا جەنگان، ئێستا گەورەترین هێزی سوپایی ئینگلیز لە میزوپۆتامیا پێکدێنن. هەواڵمان پێگەیشتووە کە ئاشوریەکان لەگەڵ ژمارەیەك لە عەشیرەتەکانی کورد دژی تورکیا راپەڕیون، بەڵام تاڕادەیەکیش دژی دەوڵەتی تازە رزگارکراوی فارس (ئێران)ن.

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ٣٩٠-٣٩١.

## رەشنووسی لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی

## بۆ هاورێیان پالیاکوڤ و سورێس لەسەر ورمێ لە مانگی ٨ و ٩ی ١٩٢٤ دا

..... میرزا قادر و کوردەکانی دەڵێن کە شێخ عەبدولقادر لەو باوەڕەدایە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد نەك هەر باوەڕی بە ئینگلیز نەماوە، بەڵکو متمانەی بەدەوڵەتی تورك و فارسیش نەماوە، پێیوایە دەبێ هەر پشت بە گەلی کورد و سەربەخۆیی بزووتنەوەی کورد ببەسترێت.

شێخ عبدولقادر دەورێکی یەکجار زۆری لەناو کوردەکاندا هەیە. ئێستا تورکەکان لە هەموو روویەکەوە خزمەتی دەکەن و بەشان و باڵیدا هەڵدەڵێن، بەڵام بە دەست پێکردنی راپەڕین بێگومان ناوبراو لایەنی بزووتنەوەکە دەگرێت و دەبێتە سەرکردەی.

تورکەکان ئاگاداری هەڵوێستی شێخ عەبدلقادرن، پێشبینی دەکرێت بیکوژن(1).

### بەرێز یاکوڤ زاخاروڤیچ

نامەی رۆژی ١٩٢٤/٧/٢٩ ژمارە ٢٠ی ئێوەمان لەسەر کۆنفراسی (ئەستەنبول) سەبارەت بە کێشەی موسڵمانان پێگەیشت، بە تەواوی لەگەڵتان هاوبیرین، ئەو کۆنفرانسە تەنیا شتێکی رواڵەتی بوو، بۆ کاروباری کۆمەڵگای نەتەوەکان ئامادەکراوە کە ئینگلیزەکان دەیانەوێ بە ئارەزووی خۆیان کەڵکی لێوەربگرن.

بێئەنجامی ئەم کۆنفراسە ئەو فاکتەی ئاشکراکرد کە ئینگلزەکان پتر لە داخوازییەکانی کۆنفراسی لۆزان لە تورکیا داوا دەکەن، بە واتایەکی دی جگە لەوەی دەرفەتی گێرەو کێشە لە سەربە عێراقی کردنی موسڵ و کەرکووك و سلێمانی، نادەن بە تورکیا، داوای جیاکردنەوەی سێ سەنجاقی ناوچەی هەکاریش دەکەن کە لە تورکیایان دابڕن و بخرێنە سەر خاکی عێراق. سنووری عێراق و تورکیا کە تا ئێستا ناوچەکانی باشووری ویلایەتی موسڵ بوون،لەمەودوا دەکەوێتە دەڤەری باکووری موسڵ. لە نامەکاندا هیچ ئاماژەیەکتان بۆ ئەو فاکتە نەکردووە و

(1) هەمان سەرچاوە ل ٣٩٢-٣٩٤.

پێویست بوو لەسەر داوای ئێمە بەزووترین کات ئاگادارمان بکەنەوە کە ئینگلیزەکان داوای کام سەنجاقی هەکاری دەکەن؟ چ هۆیەك پاڵی پێوەناون داوای ئەو ناوچانە بکەن؟.

لە سەر راگەیاندنی فەتحی بەگ لە رۆژنامەی ((تان)) رۆژی ١٩٢٤/٩/١٤ یادداشتی دەوڵەتی تورکیا بۆ کۆمەڵگای نەتەوەکان، ئەو گومانەی لێدەکەوێتەوە کە ئایا ئینگلیزەکان بە راستی نایانەوێ دەوڵەتێکی لەمپەری ئاشووری لەسەر سنوورەکانی تورکیا دروست بکەن؟.ئەم کایەو پیلانەی ئینگلیزەکان بە دوورنازانین. بەڵام بە جدیش لێی ناڕوانین. بە راستی جێبەجێ کردنی ئەم پلانە دووڕوویی ئیمپریالستەکان نیشاندەدات کە بۆ مەبەستی تایبەتی، دیمەنی خۆیان لە ژێر مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلێك، دەشارنەوە. دەوڵەتێکی ئاوا دروست دەکەن، پاشان ئاژاوەی تێدا دەنێنەوە و بە بیانووی دابینکردنی ئاسایش داگیری دەکەن. جگە لەوە جێگەی گاڵتەجارییە وابیربکرێتەوە دەوڵەتێکی ئاشوری لەناو کوردەکاندا دروست ببێت.

لامان وایە ئەم داخوازیە نوێیەی ئینگلیز سەبارەت بە دابڕینی بەشێکی سەنجاقەکانی هەکاری و لکاندنی بە عێراقەوە، لەبەر ئەم هۆیانە زۆر گرینگە:

بە بۆچوونی ئێمە دەوڵەتی ئینگلیز ئێستا لە بەشی ئاسیادا زۆر بە جیدی ئەو پلانە پیادە دەکەن کە تا بەستنی کۆنفرانسی لۆزان جێبەجێ کردنی پێویست بوو، واتە جێ پێی خۆیان لە عێراق قایم دەکەن، لەوێشەوە بەرێکخستنی (بزووتنەوە لە لورستان و عەرەبستان) هەوڵدەدەن دەستیان بگاتە رۆژهەڵات و لەوێوە بۆ باکوور تا زەمینەی دەست بە سەرداگرتنی هەموو کوردستانی تورکیا و ئازەربایجانی فارس خۆش بکەن. بە جێگیر بوونیان لە بۆتان و ناوچەی زاخۆ و باشووری ئەو دەڤەرە، دەیانەوێ پەرە بە پڕۆپاگەندەی خۆیان بدەن لەناو کوردەکانی بۆتان کە هەموویان دژی تورکن.

ئەو کوردانەی لە ئامێدین پەیوەندیان بە کوردەکانی باش قەڵا و ساراوە هەیە. ئنیگلیزەکان دەیانەوێ خۆیان بگەیەننە هەکاریش تا لەوێوە پەیوەندی لەگەڵ کوردەکانی وان و موش و خۆی ببەستن کە سمکۆ چالاکی زۆری لەناویاندا نواندووە، بێگومان لەمەودواش چالاکتر دەبێت.

هەموو ئەمانە ناچارمان دەکەن وابیربکەینەوە کە ئینگلیزەکان لەجنێڤ لەسەر هەڵوێستی خۆیان بمێننەوە و داخوازییەکانی خۆیان پیشکەش بکەن. ئەمەش بۆیان ئاسانترە چونکە تورکیا

لەگۆڕەپانی نێونەتەوەیی دوورخراوەتەوە، ئاشکرایە سوید و هۆڵەندا و ئیسپانیاش یارمەتی نادەن. تورکیا تەنیا بە یارمەتی دەوڵەتانی زلهێز دەتوانێ سەرکەوێ. پێویستە بۆ تورکیا روون بکرێتەوە کە دەتوانێ تەنیا پشت بە یارمەتی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی ئێمە ببەستێ، ئەویش بەومەرجەی سیاسەتێکی رێکوپێك بگرێتەبەر و لە خۆپەسەندی، خۆبەگەورە زانین و تاکڕەوی دەست هەڵگرێ.

لە کاتی روونکردنەوەی هەڵوێستی فەڕەنسا لەسەر کێشەی کورد دەبێ ئەوە لەبەر چاوبگیردرێ کە فەڕەنسا بەشی خۆی لە نەوتی موسڵ واتە چل هەزار پشك و دووپۆستی لە بەرێوەبەرایەتی کومپانیای «تورکیش پیترولیوم» وەرگرتووە.

ئێوە نووسیوتانە،بۆ هەڵوێستی خۆمان لەسەر کێشەی موسڵ،بەداخەوە زەمینەمان خۆشکردووە، بەرامبەر کێشەی کەرکووك کەمتەرخەم بووین، وەك ئەوەی ئینگلیز هاتبێتە ناو قەفقاز. ئێوە زۆر بە رێکوپێکی وەڵامی تورکەکانتان داوەتەوە، خۆیان لەم کەمتەرخەمییە گوناهبارن.واباشە ئەوەی بۆ زیاد بکەین کە دەست بەسەرداگرتنی کوردستان لە لایەن ئینگلیز، بەتایبەتی لە ئازەربایجانی فارس مەترسییەکی گەورە بۆ قەفقاز دروست دەکات. هەڵوێستی ئێمە بە گشتی بەستراوەتەوە بە هەڵوێستی خودی تورکیا.

ئێمە هەمیشە ئامادەبووین بە ئاگاداری و نیازپاکی گوێ بگرین لە هەر چەشنە پێشنیارێکی دەوڵەتی ئەنقەرە سەبارەت بە چۆنیەتی بەشداری و یارمەتیمان لە کێشەی موسڵ. بەڵام دەوڵەتی ئەنقەرە کە لەم نیازپاکییەی ئێمە ئاگاداربوو نەدەبوو بە نهێنی وەك پێشوو هاوکاریمان بکات. دەبوو ئاگادارمان بکاتەوە لەجنێڤ چ هەڵوێستێکی دەبێت؟، ئارەزوو و نیازەکانی چییە؟ و تا چ رادەیەك ئامادەی پاشەکشێ دەبێ و دەتوانێ؟ئینجا بە پشتیوانی کێ؟ ئەم یارمەتییە راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لە لایەن کێوە دەبێت؟ تا بتوانین روونی بکەینەوە تا کوێ دەتوانین لە کێشەی موسڵ (بێ بەشداریمان لە کۆمەڵگای نەتەوەکان) یارمەتی تورکیا بدەین.

دیارە دەبێ دەست پێشخەری و پێشنیارەکان لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە بێت، ئێمە بە هیچ شێوەیەك خزمەتی خۆمانیان بەسەردا ناسەپێنین.

ماوەیەك لە چاپەمەنییەكانی دەرەوە بڵاوببووە كە رەنگە شـورای كۆمـەڵگای نەتـەوەكان لـەم كۆبوونەوەی دوایی خۆیدا باسی چارەسەری كێشەی موسڵ نـەكات، چـونكە ئـەم كێـشەیە بـۆ لێكۆڵینەوە دەداتە دەستی كۆمیسیۆنێك. بەڵام لە ١٩٢٤/٩/٢٣ رووسیا رایگەیاند كـە لـۆرد پارمور داوای كردووە كە ئەم كێشەیە بدرێتە كۆمیسیۆنی باڵا. لەبەر بارودۆخی جیهانی ئەمڕۆ كە بۆ توركان لەبارنییە، هەم زەحمەتە و هەم بەقازانجی دەوڵتی ئەنقەرە نییە ئـەم كێـشەیە تـا كۆبوونەوەی داهـاتووی شـورای كۆمـەڵگای نەتـەوەكان راگرێـت. دووریـش نییـە بـارودۆخی نێونەتەوەیی بە قازانجی دەوڵەتی توركیا بگۆڕدرێت، جگە لەوە دەوڵەتی ئەنقەرە دەتـوانێ لـەم ماوەیەدا سیاسەتێكی ژیرانە رەچاو بكاو لەم رووەوە كە ئەم كێشەیە بۆ توركیا بایەخی ژیـانی هەیە پشتیوان بۆ خۆی پەیدا بكا.

ئەم وتانەی سەرەوە كە بۆ چوونی ئێمەیە و ئاگادارمان كردنەوە داواتـان لێدەكـەین دەسـبەجێ تاقی بكەنەوە و بە بروسكە بۆچوونی خۆتانمان بۆ بەرێكەن.

## ڕەشنووسی ڕووداوە سیاسییەکانی ورمێ

## لەنێوان مانگی ٨ و ٩ی ساڵی ١٩٢٤دا

(شەوکەت) کونسوڵی تورکیا لە تەورێز بە میوانی هاتبووە ئێرە تەنانەت خواحافیزیشی نەکرد و ڕۆیشت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت جارێکی تر تووشی دوژمنایەتی سامی بەگمان دەکات. جگە لەوە پێموایە زۆرشت هەیە ئێمە و تورك پێکەوە دەبەستێتەوە، لە هەمان کاتدا دژی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی فارسیش نین.

## ڕاپۆرتی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٤

ڕۆژی ٢ی تشرینی یەکەم سامی بەگ کونسوڵی تورك لە ورمێ بە دیاری قورئانێکی جوان و نەخشێنراوی چاپی ئەستنەبۆلی بۆ هەر کام لەم کەسانەی خوارەوە ناردووە: کەریم خانی هەرکی و تاهیر ئاغای هەرکی. باش شاە بەندریش وینەی ئەتاتۆرکی بۆ ناردوون.

١٦ی تشرینی یەکەم سامی بەگ دیاری نوێی بۆ ئۆمەر خان و تاهیر ئاغای هەرکی ناردووە کە ئەویش وێنەی موستەفا کەمال پاشا بووە. لەسەر وێنەکان بە مۆر نووسراوە «سەرکەوتووی مەزن» و ئیمزای دەستی خودی کەمالی پێوەیە. لە ١٦ی تشرینی یەکەم سامی بەگ بۆ هەر کام لەم سەرۆکە کوردانەی پاکەتی لۆك و مۆرکراوی ناردووە: تاهیر ئاغا، خورشید ئاغا، کەریم خان، حاجی ئاغا، سەلیم ئاغا، مەجید خان، ئەحمەد خان، لە عەشیرەتی هەرکی و نوری بەگ بەگزادە، عومەر خان، بەحری بەگ، حەسەن ئاغای شکاك، ناوەڕۆکی پاکەتەکان نامەی شێخ (یا شاە) بەندەرە لە گاوەرەوە ناردوویەتی.

## ڕووداوە سیاسییەکانی ناوچەی ورمێ لە تشرینی دووەمی ١٩٢٤

### عەشیرەتەکانی ناوچەکە

...... ڕژێمی فارس جموجۆڵی و چالاکی خۆی لەناو کوردەکانی ئێرە بۆ ڕاکێشانیان لە شەڕی دژی (شێخ خەزعەل) پەرەپێداوە شێخ خەزعەلیش لە نامەیەکدا بۆ سەرکردەکانی کورد

دەنووسێت: «ئاگادارکراوم کە ڕەزاخان ناچارتان دەکات دژی من شەڕ بکەن. ئێوە سەربەخۆن و نەبەستراونەتەوە بە دەوڵەتی فارسەوە لەبەر ئەوە کۆنفرانسی ویرسای سەربەخۆیی کوردستانی گەرانتی کردووە.

من بۆ سەربەخۆیی ئێوە شەڕ دەکەم، نە بە دەوڵەتی تورک و نە بەدەوڵەتی فارسەوە نە بەستراوەمەتەوە و سەر بە خۆم».

لەناو کوردەکان بڵاوە کە شێخ خەزعەلیش سوننەیە و کوردەکان ئامادەنین لە دژی شەڕ بکەن و نابێ دژیشی ڕاوەستن، شێخ بەهێزە و فڕۆکەی شەڕکەری ئینگلیزی لە دەستدایە.

دەوڵەتی فارس ناتوانێ شکستی بدا. بە وتەی ئەو کوردانەی لە سابلاخەوە هاتوون، ئەو کوردانەی کە نێردراون بۆ باشووری ئێران بۆ شەڕ دژی شێخ خەزعەل نایانەوێ شەڕ بکەن و لەوێوە هەڵدێن. ڕژێمی تاران توانیویەتی شەشسەد نەفەر لەو کوردانە چەکدارو بۆ چەند دەستە دابەشیان بکات و دەیەوێ بیانێرێتە باشووری ئێران. حاجی ئاغا یەکێك لە سەرکردەکانی عەشیرەتی هەرکییە دۆستێکی خۆی وتوویەتی: «ئینگلیزەکان دەیانەوێ کوردستان بکەنە موڵکی خۆیان و تورکیاش هەر ئەوەی دەوێ، ئەگەر فارسیش ئەوەندە بە هێز بوایە بە یەکجاری هیوای سەربەخۆیمانی لەناودەبرد و وەك خانی ماکۆی لێدەکردین. ئێستاش ئێمە نازانین چی بکەین».

## هەواڵی ڕووداوەکانی شاری ورمێ ۱تشرینی یەکەمی ۱۹۲٤

بەپێ ئەو هەواڵانەی لەو ناوچەوە گەیشتووە شێخ مەحموود هێزە چەکدارەکانی خۆی هەڵوەشاندۆتەوە و تەنیا سێ سەد نەفەر سوارەی چەکداری بۆ خۆی هێشتۆتەوە کە ئێستا لە سەردەشتن. لەهەمان کاتدا ئینگلیزەکان شێخ قادر برای شێخ مەحموودیان بە حاکمی سلیمانی و ئەو ناوچەیە داناوە. لە سەرەتایی تشرینی دووەمەوە(سەعید عەبدوڵا) و (شێخ موسا) ئاشتبوونەتەوە. تورکەکان مانگانە «۳٥» لیرەی زێڕ دەدەنە شێخ موسا و کردویانەتە قایمقامی حەمیدییەی ناوچەی نەوچە و گردییان، سەعید عەبدوڵا ڕێبەری ئاینی تەواوی کوردەکانی نەوچەیە.

بەپێی ئەو هەواڵانەی لە سەڵماسەوە دێن تورکەکان سمکۆیان کردۆتە فەرمانەدەی تەواوی دەستەکانی حەمیدیەی نەوچە و گردییان. دەڵێن کۆمیتەی کوردی ئەستامبوڵ لەناو کوردەکان پەرەی گرتووە کە:

«لەناو کوردەکانی نەوچەدا کۆمیتەی خۆجێیی دروستبکەن بۆ پڕوپاگەندەی سەربەخۆیی کوردستان.کە کاتی خۆی هات کوردەکان لە هەموو شوێنێك رادەپەڕن و لە شوێنێك ئەنجومەنی کوردستان و دەوڵەتی کاتی پێکدێنن. شێخ عەبدولقادر و شێخ مەحموود وسمکۆ.... لەناو ئەم دەوڵەتەدا دەبن. بەڵام سەید تەها لە بەر چاوی کوردەکانی باکوور و بەشێك لە کوردەکانی باشور کەوتووە و کەسایەتییەکی نییە. ناوبراو پێیوایە سەربەخۆیی کوردستان تەنیا لە ژێر سەرکردایەتی خۆی و بە یارمەتی ئینگلیزەکان دێتەکایەوە.

کوردەکانی سەر بە یەکێتی سۆڤیەت دەڵێن: سۆڤیەت لەناو ئێمەدا شکۆیەکی هەیە، بەلاّم هەندێ جار دەڵێن جارێ لاوازە و زەحمەتە لە داهاتوویيەکی نزیکدا چاوەڕێ ئەو شتەی لێبکرێت.

## هەواڵەکانی ورمێ ٥ی کانوونی یەکەمی١٩٢٤

هەوڵی کاربەدەستانی لەشکری ئێران بۆ راکێشانی کوردەکان سەرکەوتوو نەبووە. بانگەوازی ئەمیر لەشکر لە سەرەتای تشرینی دووەم بۆ رێبەرانی کورد و داوەتکردنیان بۆ ورمێ، سەری نەگرت. عومەر خان سەرەتا لە ترسی سمکۆ ئامادە نەبوو بچێتە ورمێ، تەنیا دوای دووبارە کردنەوەی دەعوەتەکە لە لایەن ئەمیر لەشکەرەوە ناچار دەبێت بڕوا. بەڵام نوری بەگ لە هاتن بۆ ورمێ دوادەکەوێت و لەو کاتەدا کە ئەمیر لەشکەر دەچێ بۆ مەهاباد، نوری بەگ چەکدارەکانی لەسەر رێگا دەبینێ و تورە دەبێ و پێیدەڵێت کە بڕواتە شار و چاوەڕێ بکا تا لە سابلاخ دەگەڕێتەوە.

کوردەکان دەستووری ئەمیر لەشکر زۆر بەخراپی جێبەجێ دەکەن و پێیان خۆش نییە بڕۆنە شەڕی شێخ خەزعەل. ئەمیر لەشکر لە ١٢ی تشرینی دووەم هاتە لام و گووتی ئێمە لە رابردوودا نەماندەتوانی ئێرە چۆڵ بکەین و لەشکری خۆمان بنێرینە باشووری ئێران بگرە کوردستانیش، بەڵام ئێستا ئێمە دڵنیاین چونکە سۆڤیەت دراوسێمانە.

کوردەکان دەنێرین بۆ باشووری ئێران چونکە دەزانین سەرپێچی دەستوورەکانی ئێمە ناکەن و بۆ خۆیان هاولاتی باشن. کە لە رابردوو بە خائین و رێگر و پیاوکوژیان دادەنان تاوانبار ئەوان نەبوون، بەڵکو کاربەدەستانی دەوڵەت تاوانبار بوون. ئەم کاربەدەستانە لە هەموو بارێکەوە چەوساندوویاننەوە، تالانیان کردوون و بەرتیلیان لێوەرگرتوون. یەکێك لەو کاربەدەستانەی دەوڵەت بۆ ئەوەی ببێتە ئیلخانی کوردەکان سی هەزار تمەنی بەرتیل داوە بە ناوەند. کە دەیکەن بە ئیلخان و دێتە ناوچەکە لە ماوەیەکی کەمدا سەد هەزار تمەن بەرتیل لە کوردەکان وەردەگرێت. لەناو کوردەکاندا ئاژاوە دەنێتەوە و پاشان تیلیگرام دەنێرێت بۆ تاران کە گوایە کوردەکان راپەڕیون وئەویش سەرکوتی کردوون، ناوەندیش بەم تیلیگرامانە باوەڕ دەکا و موچەی بۆ دەنێرێ. ئەگەر بە باشی لەگەڵ کوردان بجولێینەوە نیشتمان پەرەستیان دەردەکەوێ. من بۆ خۆم وەك مرۆڤێکی ساکار چوومە ناو کوردەکان و ئەم راستییەم بۆ دەرکەوت[1].

لەگەڵ سلاوم

گۆلیب

## هەواڵەکانی ورمێ ژمارە ٢٣ لە ٢-٦/١٢/١٩٢٤

١١ی کانونی یەکەمی ١٩٢٤ لە گوندێکی نزیك کۆنەشار سمکۆ چاوی بە فەرماندەی لەشکری ئێران «باکوور-رۆژهەلاتی ئێران» عەبدولا خان دەکەوێت[2].

(1) هەمان سەرچاوە ل ٤٠٢-٤٢٥.

(2) هەمان سەرچاوە ل ٤٢٦.

## وەرگێراوی سەرچاوەی نووسراوی ژمارە ٣٠ لە ڕێکەوتی ١٩٢٥/١/٢٧

## سەبارەت بە نوێنەرانی کورد لە پەرلمانی تورکیا

لە ٥٥ نوێنەری پەرلمانی تورکیا ١٧ یان کوردن لەوانە حسێن بەگ کە تورکی خۆشتر دەوێت لە کوردان

- سولێمان سوری بەگ لایەنگری سەربەخۆی کوردستانە لە ژێر حیمایەی رووسیا، بە رواڵەت لایەنگری دەوڵەتە بەڵام لە راستیدا وانییە.

- فەرەیدون فیکری و ئەحمەد لایەنگری ئەمەریکان.

- زولفی. فەوزی و محەمەد لە دۆستانی دەوڵەتی تورکیا و لایەنگری پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردین لە ژێر حیمایەی تورکیا.

- حاجی بەدر ئاغا، رەشید ئاغا، موحەمەد بەگ لایەنگری دەوڵەتن.

- دەروێش و نەجیب نوێنەری ماردینن.

- رەزا بەگ لایەنگری سەربەخۆیی کوردستانە لەپەرلمانی تورکیا،زۆر بلێیە و هەموو دەنگوباسەکانی پەرلمان بۆ کوردەکان دەگێڕێتەوە. لایەنگری رووسیایە و زۆر مەترسی لێدەکرێت.

# کێشەی کورد

## سەرچاوەی ژمارەی ١٥ لە ١٩٢٥/١/٢٠

**ئـەم راپۆرتـە هـی سەرئەفـسەری کـورد حوسـێن عـەونی بەگـە کـە مامۆسـتای قوتابخانەکانی نیزامی ئەستانبۆلە.**

دەڵێ ژمارەی کوردەکان بـە تـەواوی دیـار نییـە. لـە سـەردەمی سـوڵتان سـەلیم کوردسـتان بەتورکیاوە لکێندرا. پاشان ئاماژەی بە شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ عوبێدوڵا کـرد کـە پـەنجا هەزار سەربازی هەبووە و تەنانەت تەورێزیشی گرتووە. وتی لە سایەی دەست تێوەردانی رووسیا دوورخرایەوە بۆ حیجاز. دەڵێ بەپێی یاسای بنەڕەتی نوێ تورکیا بارودۆخی کوردەکـان ئـاڵۆزتر بووە و هیچ مافێکیان پێرەوا نابینن. ئەو دەوڵەتەی پارتی (ئیتحاد و تـەرەقی) سـەرکردایەتی دەکات لەگەڵ داشناکەکان و لە ژێـر کاریگـەری ئـەوان دەسـتیان داوە تـە گـرتن و کوشـتنی ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتییە گەورەکانی کورد.

دوای شەڕی رزگاریخوازی تورکیا دەبو پەنجا تا شەست نوێنـەری کـورد لـە پـەرلمانی تورکيـادا هەبان. بەڵام لە راستیدا نوێنەرێکی راستەقینەی کورد لەوێدا نییە و ئەو کوردانەش کە ئێستا بـەناوی نوێنـەری کـورد لـە پـەرلمانی تورکیـان بـە دەنگـدانی گـەلی کـورد نـەنێردراون یـا هەڵنەبژێردراون.

پاشان باسی شامیل پاشا و براکەی واتە عەبدوالرەزاق بەگی کـرد کـە سـوڵتان عەبدولحەمیـد دووریخستەوەو لەوێ کۆچی دوایـی کـرد. عەبـدولڕەزاق دەبەخـشرێت، وەلێ دوای گەڕانـەوەی، پارتی «ئیتحاد و تەرەقی» دەستووری کوشتنی دەردەکات،لەبەر ئەوە رای کرد بۆ رووسیا، تـا جەنگی جیهانی لەوێ مایەوە و پاشـان رووسـەکان لـە شـەڕی دژی تورکیـا پێـشنیار دەکـەن هاوکارییان بکات. رووسەکان لە باشووری کوردستان بەهۆی «شازادە» شاخۆڤسکی، لە باکوور فەرمانبەری وەزارەتی دەرەوە پرینسیس ڤاسیلی حـاجی میکوفـا، لـە دەرسـیم و ئـەرزەڕۆم و ئازەربایجان حەسەن بەگ لۆردکیپنیدزە،لەناو کوردەکاندا چالاکی دەنوێنن.

ئەنجامی کار و پڕوپاگەندەی نوێنەرانی رووسیا ئەوەبوو: لە کاتی هاتنی فەرماندەی هێزەکـانی رووسیا نیکۆلا نیکۆلایۆیچ بۆ ئـەرزەڕۆم ژمارەیـەك کەسـایەتی و شـێخەکانی کـوردی ناوچـە

داگیرنەکراوەکان وەك مستەفا «(لە پلۆمیر)» و عەلی شێر بەگ لە سیواس و........ دێنە لای بە چەك و تەقەمەنی و تەنانەت بە نیشان و پارەش خەڵاتیان دەکات.

دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر عەبدولڕەزاق بەڵێنی بەخشینی پێدەدەن، باوەڕ بە تورکەکان دەکا و دەگەڕێتەوە بۆ ئەستانبۆل گوایا زەوی و زارەکەی دەدەنەوە. پاشان بۆ موسڵ دوور دەخرێتەوە و لەوێش بە دەستی تورکەکان دەکوژرێت.

بەهەڵوەشانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هیوای کوردەکان بۆ سەربەخۆیی بەهێز دەبێت. عەونی بەگ باسی پلانی ئەرمەنییەکان و پێکهێنانی ئەرمەنستانی مەزنی کرد، بەپێی ئەو پلانە لە ئیریوانەوە تا میرسین، هەموو کوردستانی باکوور دەگرێتەوەو «(دەبێ بکەوێتە چوارچێوەی ئەرمەنیستانی مەزن)». کوردەکانیش کەوتنەخۆ و کۆمیتەیەکیان پێکهێنا. ئەم کۆمیتەیە داوای لە دەوڵەتی تورکیا کرد مافی کوردان بدات، دەوڵەتی تورکیاش لەو سەردەمەدا لەبارودۆخێکدا نەبوو بتوانێ ئەم داخوازییە جێبەجێ بکات. ئەوە بوو پاشان کۆمیتەی کوردان نوێنەری خۆی ناردە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس کە لە چوارچێوەی تورکیا ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان دیاری بکا. ئەگەر تورکیا ئامادە نەبوو جێبەجێی بکا، ئەو دەم کوردەکان دەبێ داوای سەربەخۆیی کوردستان بکەن. ناوبراو وتی کێشەی کورد بە پێچەوانەی کێشەی ئەرمەنستان لە پەرەسەندندایە.

باسی بزووتنەوەی ١٩٢١ی دەرسیمی کرد کە لە لایەن عوسمان تۆپاڵ ئاغا رێکخرا و نوقمی خوێنیان کرد. ناوبراو وتی سەید تەها و مستەفا پاشا کە لە سلێمانین لەگەڵ مولانی زادە رەفعەت یا لە بەرژەوەندی ئینگلیزەکان دەجووڵێنەوە یا لایەنگریانن.

بەکورتی ناوبراو وتی:

١- ئێمە ئۆتۆنۆمیمان دەوێ لە چوارچێوەی تورکیا، ئەگەر نەدرێت داوای سەربەخۆیی دەکەین.

٢- وتی شێخ مەحموودیش پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا هەیە کە بوو بە هۆی بەدگومانی ئینگلیزەکان و هەڵوەشانی دەوڵەتە کوردییەکەیان.

٣-رێکخراوی (کوردستان تەعالی جەمعیەت) کە لە ١٩٢٠ دروستکرا بوو دوای ماوەیەك بوو بە دوو بەش، لایەنگرانی ئۆتۆنۆمی ولایەنگرانی سەربەخۆیی. سەید عەبدولقادر ودووان لە

بنەماڵەی بەدرخانییەکان لایەنگری ئۆتۆنۆمین و ئەوانی تر وەك دوکتۆر شوکری محەمەد بـەگ، مەولانی زادە، «وافـی بـەگ» و ژمارەیـەکی تـر لـە بەدرخانییـەکان لایـەنگری سـەربەخۆیی کوردستانن. ئەوەبو گرووپی دووهەم دوورخرانەوە بۆ دەرەوەی وڵات. دوکتـۆر شـوکری محەمـەد بەگ کە باشترین دوکتوری ئەستانبول بوو رۆیشتە بەیروت پاش ئەوە بۆ بەغـدا. ژمارەیـەکیش وەك فەوزی بەگ، زولفی بەگ، حاجی بەدری ئاغا و دیاب ئاغا و..... لایـەنگری مانـەوە لـە چوارچێوەی تورکیان. گرووپێکی تریش لەو بڕوایـەدان کـە سـەربەخۆیی کوردسـتان تـەنیا بـە یارمەتی ئینلگیزەکان دێتە دی وەك سەید تەها، مستەفا پاشا، مەولانی زادە، رەفعەت بەگ.

## نوێنەرانی کورد لە پەرلەمانی تورکیا ١٩٢٥/١/٢٧

١- حسێن بەگ نوێنەری ئالازێر تـا جـەنگی جیهـانی دووهـەم لـەدەزگای پـۆلیس خزمـەتی کردووە،چونکە لە خزمەت کەمالدا بووە، کەمال بە نوێنەری پارلمان دایانناوە.

٢- سولێمان سوری بـەگ، نوێنـەری بایەزیـدە، لایـەنگری سـەربەخۆیی کوردسـتانە لـە ژێـر حیمایەی رووسیا. ناوبراو لە ١٩٢٣ دووجار لەبایەزید پەیوەندی بە کونسولی ئێمەوە کـردووە، داواکاری پەیوەندی راستەقینەی رووسیایە لەگەڵ کوردستان وەك دراوسێ. دوای ئەمـە نـاوبراو لە لایەن دەوڵەتەوە ئاگادار کرایەوە کە جارێکی تر نابێت بـەم کارەهەڵـسێت کـە بـە رواڵـەت لایەنگری دەوڵەتە بەڵام لە راستیدا دژیەتی.

٣- فەرەیدون فیکری بەگ، نوێنەری دەرسیمە،بەمنداڵی ماڵیان رۆیشتووە بۆ ئەستانبۆل، لەوێ خوێندنی تەواو کردووە و ئەوروپا و ئەمریکا گەڕاوە، لە مێژە ئۆپۆزیسیۆنی دەوڵەتی تورکیایە. رزگاری کوردستان لە ژێر پشتیوانی ئەمەریکا دەبینێت و دەڵێ کە لە سـەدا نـەوەتی خـەڵکی دەرسیم لایەنگری ئەم بیروڕایەن.

٤- فەوزی بەگ نوێنەری دیاربەکرە.

٥- موحەمەد بەگ نوێنەری دیاربەکرە لایەنگری تورکانە.

٦- دەورێش نوێنەری ماردینە، بە زۆر بە فەرمانی کەمال کردوویانە بە نوێنەر.

٧- نەجیب نوێنەری ماردینە، نوێنەری داسەپاوە، بە دەستووری کەمال کردوویانە.

٨- زولفی بەگ نوێنەری دیاربەکرە.

٩- حاجی بەدر ئاغا نوێنەری مەلاتیەیە لایەنگری تورکانە.

١٠- رەشید ئاغا نوێنەری مەلاتیەیە لایەنگری تورکانە.

١١- موحەمەد بەگ نوێنەری مەلاتیەیە.

١٢- حاجی ئەلیاس ئەفەندی نوێنەری موشە لایەنگری دەوڵەتە.

١٣- رەزا بەگ ئەفەندی نوێنەری موشە لە خزمەکانی موسا بەگ دیکتاتۆری موشە دایە، لایەنگری سەربەخۆیی کوردانە.

١٤- عوسمان قەدری بەگ نوێنەری موشە.

١٥- ئیبراهیم بەگ نوێنەری وانە.

١٦- ئەحمەد بەگ نوێنەری دەرسیمە.

١٧- حەقی بەگ نوێنەری وانە.

وەك وتمان ژمارەی نوێنەرانی پەرلمانی تورکیا «٥٥» نەفەرن کە «١٧» یان کوردن.

# کێشەی کورد

## سەرچاوەی ژمارە ١٥ لە ڕێکەوتی ١٩٢٥/١/٢٠

«ئەم دەقە سەرئەفسەری کورد، مامۆستای قوتابخانەی سەربازی ئەستانبۆل، حسێن عەونی بەگ نووسیویەتی. بە وتەی سەرچاوەی ژمارە «١٥» ناوبراو لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردە. ئەم نووسراوەیە یەکەم هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن و ناساندنی حسێن عەونی بەگ. لێرە ناوبراو زۆر داخراو و دوورە پەرێزە و شتەکان بە ئاشکرا و روونی باس ناکات و ناچێتە ناو وردکارییەکان، بەڵام هەرچۆنێك بێت وتەکانی جێی سەرنج و تێڕوانینن».

ناوبراو دەڵێ کەس بە تەواوی ژمارەی کوردەکان نازانێت، تەنانەت مەزندە کردنیشیان زەحمەتە، وەك ئاشکرایە کوردەکان لە وەرزەکانی ساڵ بۆ ئەم لاو ئەو لا کۆچ دەکەن، لە خزمەت کردنی سەربازی خۆدەشارنەوە، بۆ ئەوەی ماڵیات نەدەن رادەکەن. لە سەردەمی سوڵتان سەلیم کە بەگەکانی کورد دەچنە چوارچێوەی تورکیای عوسمانی، سوڵتان سەلیم زەوی وزاریان دەداتێ، و ئەم بارودۆخە تا فەرمانڕەوایی سوڵتان مەحموود بەردەوام بوو، بەڵام پاشان لەبەر وەخۆ کەوتنی سەرکردە و فیۆدالەکانی کورد، تورکەکان لێیان دەکەونە شك و گومان و تەنانەت ترسیشیان لێ دەنیشێ. لەبەر ئەوە دەسەڵاتدارانی تورك بڕیاری لەناو بردنیان دەدەن، ژمارەیەك لە خان و بەگەکانی کورد دووردەخەنەوە ژمارەیەکیان دەگرن و پلەو پایەش دەدەن بە هەندێکیان.

لەو سەردەمەدا عەشیرەتە بە هێزەکانی کورد کە دەسەڵاتیان هەبوو ئەمانە بوون: بابانەکان لە ناوچەی سلێمانی، محەمەد پاشا لە ناوچەی رەواندز کە پاشان لەسەر خواستی خۆی تەسلیمی سوڵتان دەبێت، ئەویش دوریخستەوە بۆ سمیرنو.

دەسەڵاتدارانی تری کوردستان بەگەکانی هەکاری بوون واتە عەشیرەتەکانی گازیران، بۆتان کە لە ناوچەی ئیبنی عومەر دەژین. دوایین ئەمیری هەکاری نوراللە و ئەمیری بۆتان بەدرخان و عیزەدین شێر بەگ بوون.

زۆربەی راپەڕینی ئاشووریەکان بە هۆی پڕوپاگەندە و ئاژاوەی ئینگلیز و میسیۆنێرەکانیان بوو بەتایبەتی کۆنسوڵی ئینگلیز لە موسڵ دەورێکی سەرەکی بینی.

ژمارەیەك کەسایەتی و ناودارەکانی کورد لە لایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە دورخرانەوە بۆ دوورگەی کیرت و ڤارنا و بولفاریا. بەرە بەرە ئەوانی تریشیان لە کوردستان دوورخستەوە، بەم چەشنە ئەریستوکراتی کوردیان لەناو برد. کوردەکانیش کە بێ خان و سەرکردە مانەوە ناچار بوون لە دەوری شێخەکان کۆببینەوە و ئەوانیش جێ خان و بەگەکانی کورد بگرنەوە.

ئەم شێخانە دەورێکی زۆریان لەناو کوردەکاندا هەبووە. شێخ عوبێدولا و کورەکەی شێخ عەبدولقادر بە پەنجا هەزار جەنگاوەر تەورێزیان گرت، بەڵام پاشان بەهۆی دەست تێوەردانی رووسیا، بۆ حیجاز دوورخرایەوە.

بەم چەشنە تەواوی خان و بەگەکانی کورد کە دەوریان لەناو کورداندا هەبوو رۆژ بە رۆژ بەهێز تر دەبوون و کۆمەڵانی خەڵکیش لە دەوروبەریان کۆدەبوونەوە، دوورخرانەوە و لەناوبران. سوڵتان و دەوڵەتەکەی هەرکام بە شێوەیەك و بەبیانوویەك پاکتاوی کردن، دەوڵەتەکانی دراوسێش یارمەتییاندان و گوشاریان خستە سەر سوڵتان بەم کارە هەڵسێت.

کوردان کە لە سیاسەتی سوڵتان گەیشتن بەرە بەرە لە سوڵتان و تورکەکان دوورکەوتنەوە.

گەرچی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم ئیجازەی بە کورداندا بۆخۆیان لەشکەرێك بە ناوی «حەمیدیە» دروست بکەن کە بەشێك لە داخوازییەکانیان بوو، بەڵام کە فەرماندەکانیان پلە و پایەیان وەرگرت لەگەڵ کاربەدەستانی لەشکەری تورك دەستیاندایە چەوسانەوە و ئازاری کوردەکان، کۆمەلاتی خەڵکیش کە لە مەبەستییان گەیشتن بەرامبەریان نارەزاییان دەربری، بێباوەری جێگای ئەو باوەر و هیوایەی گرتەوە کە لە سەرەتای پێکهێنانی «حەمیدیە» هەیان بوو. جێی سەر سورمانە، دەسەڵاتدارانی عوسمانی کە دەبوو پشتیان بە ئەریستوکراتی کورد بەستبا و پشتیوانییان کردبا و بارودۆخ و کێشەی کوردیان پێراگرتبا، سیاسەتی لەناوبردنی چینی ئەریستۆکراتی کوردیات گرتەبەر. ئەمە نیشانەی ئەوە بوو کە دەسەڵاتدارانی تورك لە مێژە هەستیان بە مەترسی کێشەی کورد و بزووتنەوەکەی کردووە و زانیویانە لە نێوان ئەریستۆکراتی تورك و کورد جیاوازی زۆر بەهێز هەیە.

بە دەرچوونی یاسای بنەرەتی تورکیا بارودۆخی کوردەکان خراپتر و نارەزاییان بەرامبەر بە دەوڵەتی تورکیا و پارتی ئیتحاد و تەرەقی پتر بوو کە پێکەوە لەگەڵ داشناکەکان و لە ژێر

کارتێکردنی «بان دووری» و ئامۆژگاری ئەوان دەستیاندایە کوشت و بڕی کوردان. گەلێك کەسایەتی کوردیان لەناوبرد، ئەوانی تریش ناچار بوون رووبکەنە چیا و خۆیان بشارنەوە. تێکڕای ئەم کوشتارە بە بیانووی بەرگری لە یاسای بنچینەیی ئەنجامدرا.

گەورەترین و سامناکترین تاوانەکانی ئەو سەردەمەی دەوڵەتی تورکیا و پارتی ئیتحاد و تەرەقی، هەڵواسینی شێخەکانی کورد بوو، وەك شێخ عەلی، شێخ شیرین، کوڕەکانی شێخی بە ناوبانگ جەلال الدین، شێخ سەلیم، زانایان و کەسایەتی ناوداری تر کە بوو بەهۆی نارەزایی و رق و تووڕەیی کوردەکان، بەڵام لەبەر شەڕی بالکان و پاشان جەنگی جیهانی یەکەم دەسەڵاتدارانی عوسمانی ناچار بوون دەست لەم تاوانانە هەڵبگرن.

لەبەر هەڕەشەی دەرەکی بۆ سەر تورکیا واتە هێرشی دوژمنانی تورکیا و ناموسڵمانەکان، کوردەکان هەموو قین و دوژمنایەتی خۆیان خستە لاوە، لەگەڵ تورکان بۆ پارێزگاری وڵات دەستیان دایە چەك.

جگە لەوە کوردەکانی دەرسیمیش کە شیعە مەزهەبن، لەبەرەی قەفقاز دەستیاندایە راپەڕینێکی مەزن. کوردەکانی تر هەموویان بەدڵ پاکیەوە لە هەموو بەرەکانی شەڕ بەرگرییان لە تورکیا دەکرد .ئەگەر کورد هاوکاری تورکیا نەبان و شەڕیان بۆ نەکردبا، یا بێلایەن بان، تورکیا زووتر و زیاتر بە چۆکدا دەهات و تێشکانی مسۆگەر بوو. ئاشکرایە دوای ئەمە هەقی خۆیەتی تورك زیاتر بایەخ بەکوردان بدەن و بە چاوێکی باش تەماشایان بکەن و مافەکانیان لەگەڵ تورك یەکسان بێ، لە راستیدا هەروا بیریان دەکردەوە.

لە کاتی بزووتنەوەی نەتەوایەتی و شەڕی رزگاریخوازانەدا، کە ئایدیای ناسیۆنالیستی بۆ تورکەکان لە هەموو شتێك گرنگتر و بەرزتر بوو، بە هیچ شێوەیەك نەیاندەویست گوێیان لە ئایدیای ناسیۆنالیستی کورد بێت و هەرگیز وەبیر خۆیان نەدەهێنایەوە. لە کاتێکدا بچووکترین هەنگاو بۆ باشکردنی بارودۆخی کورد، پاڵی بەکوردەکانەوە دەنا بەحەماسەتەوە پشتیوانی تورکان بکەن، کەچی بە پێچەوانەوە ئەوان هەڵوێستی دوژمنانەیان بەرامبەر بە کوردەکان گرتە بەر و بە گومانەوە لێیان دەڕوانین، کوردەکانیش بەسەر سوڕمان و پەشیمانییەوە سەیری سەرکردەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی تورکیایان دەکرد. دوای سەرکەوتنیش هەڵوێستی تورکان بەرامبەر بە کورد خراپتر بوو. هیچ کام لە کوردە بەناوبانگ و رووناکبیرەکانیان نەك

لەهیچ پۆستێکی گرنگ بەڵکو لە پۆستی پلە دوو و سێش دانەنا، بەپێچەوانەوە ئەگەر لە شوێنێکیش کوردێك پۆست یا بەرپرسی هەبووبێت هەوڵیان داوە بیگۆڕن و تورکی لە جێگا دابنێن.

کوردستان دەبوو پەنجا نوێنەری خۆی ناردبایە پەرلەمانی تورکیا، بەڵام تاکە نوێنەرێکیش بە دەنگدانی خەڵکی کوردی نەچۆ پەرلمان. هەندێ نوێنەریان بەناوی ناوچەکانی کوردستانەوە بردە پەرلمان کە هیچ پەیوەندییان بە کوردەکانەوە نە بوو، ئەمەش کوردەکانی زیاتر دژی دەسەڵاتدارانی تورك هاندا. تورك لەم هەموو سووکایەتی و رەوانەبینینی هیچ مافێك بۆ کورد ،نەك هەر رازی نین، بەڵکو دەیانەوێ هیچ حسابێك بۆ کورد نەکەن و بیخەنە پشت گوێ. ئەوانە بەم سیاسەتە کوردیان رووبەرووی خۆیان کردەوە و ناچاریان کرد بیر لە چارەنووسی ئێستا و داهاتووی خۆی بکاتەوەو هەڵوێستی خۆی بگۆڕێ. ئێستا تورکان بە هەق و ناهەق بە هەموو شێوەیەك دەیانەوێ نکۆڵی لە تایبەتمەندی و جیاوازی نەتەوایەتی و هەبوونی گەلی کورد بکەن. هەوڵدەدەن بیسەلمێنن کوردەکانیش تورکن و جیاوازییان نییە، بڵێن کێشەیەك بە ناوی کێشەی کورد بوونی نییە، تورکیاش وڵاتی تورکانە. لە راستیدا رەچاو کردنی ئەم سیاسەتە دەبێ بەو مانایە بێت:

یا جیاکردنەوەی کوردەکان، یاخود لەناوبردنی هەموو تایبەتمەندییەکانی گەلی کورد و دوایی گۆڕینیان بە تورك، وەك گۆڕینی زمان و داب و نەریتیان و..........بە واتایەکی تر تورکەکان دەیانەوێ مافی کورد لە چوارچێوەی تورکیا بناسن و دانی پێدا بنێن، کەواتە بۆ رێگای دووەم، واتە بۆ جیابوونەوە و سەربەخۆیش ئامادە نین و ناهێڵن. کوردەکانیش بەقین و تووڕەییەوە لەم سیاسەتەی دەوڵەتی تورك دەڕوانن،نیگەرانن و زۆر لەم سیاسەتە دەترسن. جاری کوردەکان بە زمانی خۆش و ئارام دەیانەوێ تورکان لەو سیاسەتە زیان بەخشە تێبگەیەنن.

بەڵام ئەم نیازە پاکەش ناتوانێ تورکەکان لەو سیاسەتە شوڤێنییە پاشگەزکاتەوە. گەرچی ئەم چەشنە سیاسەتە داهاتوویيەکی رەش و تاڵی بە دواوەیە، کەچی کوردەکان بە باشی دەزانن جارێ بە هێمنی و سەبرەوە وەڵامیان بدەنەوە.

لەناوبردنی رێبەرانی کورد بە رووداوەکانی بەدلیس کۆتایی نایات. لەساڵانی دوای سوڵتان عەبدولحەمید، رێزوان پاشا و عەلی شامین پاشا و براکەی عەبدولڕەزاق کە بۆ تریپولی و یەمەن

دوورخرا بوونەوە وەبەر لێبووردنی گشتی نەکەوتن. شامیل پاشا لەوێ کۆچی دوایی کرد، دوایی چەند مانگ عەبدولڕەزاق کە بە ڕواڵەت بەخشرابوو، زانی پارتی ئیتحاد و تەرەقی بڕیاری کوشتنی داوە، رایکرد بۆ رووسیا و تا جەنگی جیهانی یەکەم لەوێ مایەوە. رووسیا لە کاتی شەرەکەدا دەیویست کەڵك لە دەوری ناوبراو لەناو کوردەکان، وەربگرێت. بۆ ئەم مەبەستە هێنایانە قەفقاز و لەو ناوچە کورد نشینانەی تورکیا و ئێران کە سوپای رووسیا داگیری کردبوون،بەهاوکاری ئەو دەستیان کرد بەرێکخستنی هێزی چەکدار.

بەڵام زۆربەی کوردەکان ئامادەیی خۆیان بۆ ئەم شتە دەرنەبڕی، چونکە رووسیا تا جەنگی جیهانی یەکەم پڕوپاگەندەیەکی زۆری کرد بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربخۆ لە ژێر حیمایەی رووسیا، بۆ ئەم مەبەستەش لە باشووری کوردستان شازادەی بەناوبانگ شاخۆفسکی، لە باکوور کارمەندی وەزارەتی دەرەوەی رووسیا شازادە پرنیس ڤاسیلی جیمیکوف، لەناو کوردەکانی دەرسیم و ئەرزەڕۆم و ئازەربایجان کوردەکانی حەسەن بەگ کاپانیدزە..... چالاکیان دەنواند.

لە سەردانی فەرماندەی هێزەکانی رووسیا واتە نیکولا نیکۆلایۆیچ بۆ ئازەربایجان، ژمارەیەك شێخ و نوێنەرانی کوردی ناوچە داگیرنەکراوەکان دێنە لای وەك مستەفا لە پلومیر وعەلی شێر بەگ لە سیواس و ژمارەیەکی تر، ئەویش لە پاداشتی ئەو پڕۆپاگەندەیە،بە چەك و تەقەمەنی و میدال و پارە خەڵاتیان دەکات.

عەبدولڕەزاق کە پێشتر باسی لێوەکرا دوای شۆڕشی رووسیا و لێکبڵاوبوونی سوپای رووسیا باوەڕ بە بەڵێنەکانی دەوڵەتی تورکیا دەکات کە لە تاوانەکانی خۆشبێ و سامان و زەوی و زار و پلەوپایەی بۆ بگەڕێنێتەوە، کە دەگەڕێتەوە دەچێتە ئەستانبۆل بەڵام دەسەڵاتدارانی تورك دەینێرنە موسل و لەوێ بە دەستکیسی خۆیان دەیکوژن.

بەم چەشنە کوردەکان سەرەڕای ئەو هەموو دوژمنایەتییەی تورکان بە تورکیا وەفادارن ئەویش لەبەر ئەو باوردۆخەی سەردەم بوو کە پێمان «رێك» دەخرا.

لەبەر ئەوەی ئەگەر بەپێچەوانەوە جوولابایەنەوە کوردەکان دەبو یا لەژێرحیمایەی رووسیا یا ئەرمینیا و یاخود ئینگلیز و ئەمریکا بان کە بەڵێنێکی ئەوتۆیان بە کورد نەدابوو هەر بۆیە

کوردەکان وایانزانی مانەوەیان لەگەڵ تورکیا زیانی کەمتر دەبێت. نیشانەیەکی تری ئەم بۆچوونە هەڵویستی دوای بەستنی پەیمانی ئاشتی و دابەشکردنی تورکیا بوو، کە کاری کردە سەر کوردان و بوو بە هۆی نا ئارامی و پەرێشانی. ئەم کارتێکردنە بە هۆی دەنگوباسی دروستکردنی ئەرمینیای گەورە بەهێزتر بوو، کە لە ئیریڤانەوە تا میرسین واتە کوردستانیش دەگرێتەوە.

ئەوەبوو کوردەکان بڕیاری دروستکردنی کۆمیتەی خۆیاندا و داوای چارەسەری کێشەی کوردیان لە دەوڵەتی تورکیا کرد. بەڵام دەوڵەتی تورکیا ئەوسا لەبارودۆخێکی وادا نەبوو بتوانێ هیچ هەنگاوێك هەڵبگرێت.لەبەر ئەوە ئەم کۆمیتەیە نوێنەری خۆی نارد بۆ کونفرانسی پاریس و لە ژێر پشتیوانی تورکیا داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان کرد،بەو مەبەستەی ئەگەر پەسەند نەکرا ئەو دەم داوای سەربەخۆیی کوردستان بکەن.

گەرچی کوردەکان لەوێ هیچ شتێکیان دەستنەکەوت و هیچ بەڵێنێکیشیان پێنەدرا. بەڵام نیشانیاندا کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ئەرمەنیستانی گەورەوە نییە. کێشەی ئەرمەنیش ئەو زەقی و توندییەی خۆی لە دەستدا و بە دەستپێکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە تورکیا زیانێکی زۆری بەرکەوت،بەم چەشنە کێشەی کورد کەوتە دووهەم.......کورد خۆی دابەدەستەوەو ملکەچی دەسەڵات بوو. هەروەك لە سەرەوە وترا کوردەکان بە ڕێبازێکی کەم توندو تیژی و رق و قین دژی دەسەڵاتدارانی تورکیا درێژەیان بە خەباتی خۆیاندا. کە تورکەکان دەیانویست جێ پێی خۆیان لە کوردستان پتەو بکەن و سیاسەتی خۆیان بەرنەپێش، بەرەو رووی کوردەکان دەبوونەوە، لە کاتی کۆکردنەوەی مالیات یا سەربازگیری دەستبەجێ دانشتیوانی کورد بەرپەرچیان دەدانەوە.

هەندێ جاریش ئەم بەربەرەکانیە دەبوو بە شەڕی چەکداری. لەو کاتەوە سوپای تورك مولگەیان دروستکرد، دەستیان دایە بە بۆمباران، ماڵوێرانکردن،گرتن و ئازاردانی دانیشتوان. بۆ وێنە لە ١٩٢١ لە کاتی راپەڕینەکانی ناوچەی دەرسیم و زارا، سوپای تورکیا زۆر دڕندانە ئەم راپەڕینانەی سەرکوت کرد،دوای بۆمباران کردنی ئەو ناوچانە عوسمان تۆپاڵ ئاغاش ماڵ و سامانی تالان کردن.

جگە لەوە دوای سەرکەوتنی تورکەکان بەسەر یونانییەکاندا دەسەڵاتدارانی تورکیا بەو هەنگاوانە دژی کورد هەڵسان و تائێستاش بەردەوامن و بچووکترین بەرەنگاری کوردەکان لە رەگ و ریشەوە دەردێنن.

هەر کاتێك بیانەوێ دەڤەرەکانی کوردستان بۆمباران دەکەن و بەزووترین کات خۆیان دەگەیێننە ئەو شوێنانەی گومان یا هەستی مەترسی لێدەکەن، لەبەر ئەوە کوردان بێ هیوا بوون لەوەی تورکیا کێشەکەیان چارەسەر بکا، هەنوکە خەریکی دارشتنی رێبازێکی بنچینەیین. وەلێ بارودۆخی کوردستان هێندە جێی مەترسییە بوار نادات بە ئاسانی و بە پەلە بڕیارێکی دیاریکراو بدەن. کوردستان ناوچەیەکە دەتوانێت ولاتە دراوسێکانیش بتەقێنێتەوە، ئاشکرایە هەر جوولانەوەییەکی جیدیش لە کوردستان دەست تێوەردانی ئەو دەوڵەتانەی بە دواوە دەبێت کە بەرژەوەندییان هەیە. زەحمەتە پێشبینی ئەنجامەکانیشی بکرێت و بزانرێ کامەیان بەهێز تر دەبێ و ئەو دەڤەرە کۆنترۆڵ دەکات، کوردیش هێشتا ئامادەی ئەوەی نییە تەنیا و سەربەخۆ بۆ رزگاری راپەڕێت.

لەم چەند مانگەی دواییدا رۆژنامەکان هەواڵی گرتنی نوێنەرانی پێشووی پەرلمانی تورکیایان بلاوکردۆتەوە لە بەتلیس یوسف زیا بەگ ولە ئەرزەڕۆم خالید بەگ (دواتر بیوگرافی هەردوو کەسایەتیتان پێشکەش دەکەین).

هەروەها دەنگۆیە لەبەرەی موسڵ بەتالیۆنێکی کورد بە سەرۆکایەتی کاپیتانێکی کورد چۆتە سەر سنوور و خۆی تەسلیمی عێراق کردووە. ئەمەش مەترسی و نیگەرانی ڕای کۆمەڵگای تورکیای بەدواوەیە. ئێستا لەسەر کوردستان دەنگ وباس زۆرە. کاربەدەستانی تورکیا دەڵێن ئەمانە هەمووی ئەنجامی پڕوپاگەندە و ئاژاوەی دوژمنان و ئەو کەسایەتیانەی سەرەوەیە کە گیراون بە خائینی نیشتمان تاوانبار کراون.

لەم بارەوە تورکیا و تورکە راست رەوە رەگەز پەرەستەکان هێرش دەبەنە سەر ئەو کوردانەی لە ئەستانبۆڵ نیشتەجێن کە هەر لە سەرەتای قۆناغی ئاشتییەوە بۆ بەرژەوەندی تورکان کار دەکەن، بە کۆمیتەی کوردیش «کورد جەمعییەتی» دەڵێن دژی دەوڵەت پڕوپاگەندە دەکا. ئەمە نیشانەی خراپ تێڕوانینی تورکانە لە کورد. بەلام هەر هەولێکی تورکان بۆ شاردەنەوەی بزووتنەوەی کورد لە تەواوی کوردستان بێ ئاکامە،لە راستیدا ترسێکی گەورە کەوتۆتە دلّی دەوڵەت و تورك.

وەلێ نابێ بزووتنەوە نەتەوایەتی کورد بە بزووتنەوەییەکی دژی دەوڵەت یا دژی تورك لە قەڵەمبدرێت، چونکە ئەنجامی پەرەسەندنی ئەو روحە ناسیۆنالیستیەی تورکانە کوردیشی گرتووەتەوە، ئەگەر تورك بەپێی پێویست، بە ئیمان و رێزەوە سەیری کورد و کێشەکەیان کردبا لە

بەرژەوەندی تورکیا دەبوو، چارەسەری کێشەکەش هەر لە دەست ئەوان دایە. بە دوژمن لەقەڵەم دانی هەرجموجۆڵێك و سەرکوت کردنی کوردەکان دژی خۆیان هان دەدەن.

بزووتنەوەی ئیمڕۆی کوردی بۆ پێشخستنی کەلتوور و ئابووری خۆیانە.بەپێچەوانەوە سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کوردەکان لەوانەیە بە زیانی تورکەکان تەواو بێت.

جێ سەرنجە کە تورکەکان گەشە بە ناسیۆنالیزم و شەڕ دەدەن دژی کورد، نایانەوێ بۆ دەنگدانەوەی سیاسەتەکەیان حساب لەسەر کوردیش بکەن، دەڵێن بزووتنەوەی کوردان و هەستی نەتەواویەتییان، ئەنجامی پڕوپاگەندە و ئاژاوەیە، لە بەرژەوەندی بێگانەیە، کە ئەمە درۆ و خۆ فریودانە. دەڵێن خوشکەزا (یابرازای)ی شێخ عوبێدولاّ، شێخ تەها ئاغا کار بۆ ئینگلیزو بەرژەوەندییەکانی ئەوان دەکا، ئەمەش بەو مانایە نییە کە هەموو کورد کەوتۆتە دوای ئەو کوردانەی ئەویان ناردۆتە ئەوێ. گەرچی خزمی شێخ عوبێدولاّیە، خۆشی لایەنگر و پەیرەوی زۆرە بە تایبەتی لە هەکاری وناوچەکانی ورمێ و خۆی، لەکوردستانی ئێران. بەلاّم رۆڵی ئەو لە رۆڵی شێخ عەبدولقادر گەلێك کەمترە، جگە لەوەش لەو ناوچانە تورکەکان لە دژی ئەو پڕوپاگەندە دەکەن و دەوری لاواز دەکەن.

راستە مستەفا پاشای کورد لە بەرژەوەندی دەوڵەتی ئینگلیز لە عێراق کار و پڕوپاگەندە دەکات، بەلاّم لە بنەماڵەیەکی گەورە نییە، تەنیا لەناو عەشایری ناوچەکانی تر دەور و لایەنگری هەیە، مەولانی زادە رەفعەت بەگیش هەروایە. دەوری ئەوانە لە بنەماڵەوە بۆیان بەجێ نەماوە کە ئەمە شتێکی گرنگە لەناو کوردەکان.

بەم چەشنە سەید تەها ئاغا و مستەفا پاشای سلێمانی و مەولانی زادە رەفعەت بەگ لە بەرژەوەندی ئینلگیزەکان کاردەکەن. ئەمەش پتر لەبەر بەخشندەیی ئینگلیزەکانە تا مەیل و داخوازی کوردان، بەو مانایەش نیە کە رێباز و لایەنگری کورد و بزووتنەوە رزگاریخوازەکەیان هەمووی وایە. بەگشتی ئەم جۆرە رێباز و هەڵوێستانە بۆ بزووتنەوەی رزگاریخوازی لە قۆناخی دەرەبەگایەتیدا، ئاساییە، ئینگلیزەکانیش باش لەم شتە گەیشتوون و کەڵکی لێوەردەگرن. کەسایەتی و فیودالّەکانی کورد دەکڕن.دەنگوباسی داوای سەربەخۆیی کوردستان لە ژێر حیمایەی ئینگلیز هیچی راست نییە تەنیا پڕۆپاگەندەی ئینگلیز و بەکرێگیراوەکانیەتی.بەلاّم ئاشوورییەکان لەگەڵ بەکرێگیراوانی کورد بە راستی دەیانەوێ لە ژێر حیمایەی ئینگلیزەکاندا بن.

هەمووان دەزانن کوردستان و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بە ئارەزووی خۆیان ناچنە ژێر رکێفی ئینگلیز، کەسایەتییەکانی کوردیش باش دەزانن سیاسەتی ئینگلیزەکان بریتییە لەدروشمی «دابڕە و دەسەڵات بکە»، کوردەکان کە هەوڵیان بۆ پێکهێنانی بزووتنەوەییەکی یەکگرتوویە ئامادە نین بچنە ژێر ئەم بارە. هەر کەسیش وابیرنەکاتەوە لە مەبەستی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی تێنەگەیشتووەو لە کوردان ناگات.

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە رووسیاوە هەیە ئەوەیە: رووسەکان بە درێژایی نیو سەدەیە بۆ راکێشانی کوردەکان کاردەکەن، ئەو پشتیوانییەی لە عەبدولرەزاق و بەدرخانییەکانیان کرد راستییەکی ئاشکرایە. کوردەکان پێیان وایە سیاسەتی رووسیا داگیرکردنی رۆژئاوای ئاسیایە، بۆیە نایانەوێ لەم بارەوە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ بگرن و خۆیان لە قەرەی بدەن. سەرئەنجام تاکە رێگای لەبار بۆ داهاتووی کوردستان ئەمانەن:

١- ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لە چوارچێوەی یا لە ژێر حیمایەی تورکیا.

٢- ئەگەر نەگونجا و رێك نەکەوت ئەوسا دەبێ داوای سەربەخۆیی کوردستان بکرێت.

گەرچی مەبەستی دوایی و سەرەکی کوردەکان سەربەخۆیی و رزگاری کوردستانە، بەڵام زۆربەی کەسایەتییە کوردەکان لایەنگری ئەو خاڵانەی سەرەوەن و لەو بڕوایەدان هێشتا باری کۆمەڵایەتی و سیاسی بۆ سەربەخۆیی کوردستان ئامادە نییە. هەر بزووتنەوە و راپەڕینێك بۆ سەربەخۆیی دەبێتە بەستنەوەی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردستان بە دەوڵەتە بەهێزەکانەوە کە لە ئەنجامدا کوردستان دەبێتە کۆلۆنییەکی وڵاتانی ئەوروپا.

کەواتە ئەگەر بکرێت کوردستان لە ژێر حیمایەی دەوڵەتێکی لاوازی وەك تورکیا بمێنێتەوە باشترە، ئەودەم هێز کۆبکرێتەوە بۆ سەربەخۆیی کوردستان لە تورکیا کە زۆر ئاسانترە لە رزگار بوون لە ژێر چەپۆکی ئینگلیز.

بەڵام دەبێ ئەوەشمان لەبەر چاوبێت، ئەگەر تورکیا دریغی نەکات لە گەشەپێدانی ئابووری و کلتوری کوردستان و دژی نەوەستێت، ئەوا کێشەکە بە ئاسانی چارەسەر دەکرێت.

سەبارەت بە کوردەکانی موسڵ ئەوانیش لە دەست رژێمی عێراق و دەسەڵاندارانی ئینگلیز ناڕازین، راپەڕینە یەك لە دوای یەکە کانیان دژی ئینگلیز نیشانەی ئەم راستییەن.

له سەرەتای داگیرکردنی ولایەتی موسڵ ئینگلیزەکان لە ناوچەی سلێمانی دەوڵەتی شێخ مەحموودیان پێکهێنا، زۆری پێنەچوو کە شێخ مەحموود دژیان ڕاپەڕی، ئەوانیش دەوڵەتەکەیان تێکدا و شێخ مەحموودیشیان گرت و بۆ سیلان دووریان خستەوە. پاش ماوەیەك لەسەر داخوازی و هەوڵی هێندێ کەسایەتی بەناوبانگ و خاوەن دەوری کورد، ئینگلیزەکان شێخیان ئازادکرد و گەڕاندیانەوە بۆ سلێمانی. بەڵامساڵی «رابردوو» شێخ دژیان ڕاپەڕی و ئەوانیش ناچار بوون هێزی هەوایی بەکاربێنن، سلێمانی و دەوروبەریان بۆمباران و چەند شوێنێکیان کاول کرد.

گەرچی دەوڵەتەکەی شێخ مەحموود بە هەوڵی ئینگلیزەکان دامەزرا، بەڵام دوایی دەرکەوت شێخ پەیوەندی بە دەوڵەتی تورکیاوە هەیە.ژنبراکەی کە ناوی فەتاح بەگە، کاپیتانی پۆلیسی تورکیایە بەناوی نوێنەری موسڵ لە ئەنقەرەیە و دەڵێت بەشداری لە کاروباری پەرلمانی تورکیا ناکات، بەڵام مووچەی نوێنەری پەرلمان وەردەگرێت. پێویستە وەك ئاڵقەی پەیوەندی نێوان شێخ و دەوڵەتی تورکیا، لەئەنقەرە بمێنێتەوە.

کۆمیتەی کوردیش «کوردستان تەعالی جەمعییەت» کە لە ئەستانبوڵ لە کاتی بەستنی پەیمانی ئاشتی لە ساڵی ١٩٢٠دامەزرا، چالاك و بەهێز بوو. لەو ساڵەدا ئەندامەکانی بوون بە دوو بەش: ئۆتۆنۆمی خوازان و سەربەخۆیی خوازان.

سەید عەبدولقادر، هەندێ لە بەدرخانییەکان و ژمارەیەکی تریش ئۆتۆنۆمی خوازبوون، ئەندامانی تری کۆمیتە وەك دوکتور شوکری موحەمەد بەگ، مەولانا زادە رەفعەت بەگ و ژمارەیەکیش لە بەدرخانییەکان لایەنگری سەربەخۆی کوردستان بوون بە بڕوای ئەوان پێشکەوتنی کوردستان بەبێ سەربەخۆیی کوردستان نایەتەدی. ئەمانەی دوایی بۆ دەرەوەی تورکیا دوورخرانەوە. دوکتۆر شوکری محەمەد بەگ سەرەڕای ئەوەی کە لە ئەستانبوڵ باشترین پزیشك و مرۆڤێکی دەوڵەمەند و دەست ڕۆشتووبوو هەموو شتێکی بەجێ هێشت و سەرەتا رۆبشتە بەیروت پاشان بۆ بەغدا و ئێستاش لەوێ واتە لە کوردستانی سەربەخۆ ماوەتەوە و کاردەکات.

مەولانی زادە رەفعەت بەگ وەك پێشتر وتمان بۆ ئینگلیزەکان کاردەکات. شێخ عەبدواقادرو هەندێ لە ئۆتۆنۆمی خوازانیش لەئەستانبوڵن و چالاکی ئەو تۆ نانوێنن. دەکرێ بڵێین کۆمیتەکە لێك بڵاوبووە.عەبدولقادر کەسایەتییەکی ناودارە و دەور و رێزی لەناو کوردەکاندا هەیە. بەو باسانەی سەرەوە بەم ئەنجامانە دەگەین:

**بزووتنەوەی کورد دوو ڕێباز یا دوو کەرتە:**

ئۆتۆنۆمی خوازەکان دەیانەوێ لە چوارچێوەی تورکیا بمێننەوە، هەوڵ بۆ وەرگرتنی مافی کەلتووری و پەرە پێدانی ئابووری کوردستان و پێش خستنی کۆمەڵگای کوردەواری دەدەن، پاشانیش بەپێی هەلومەرجی ئابووری وڵات، ئەگەر پێویست بوو داوای سەربەخۆیی دەکەن.

ئۆتۆنۆمی خوازان لەناو کورددا لایەنگریان زۆرەو خاوەنی بەهێزترین ڕێبازن کە پێویستە بایەخیان پێبدرێ.

سەید عەبدولقادر بەهێزترین کەسایەتی ئەمڕۆی کوردە و لایەنگری سەربەخۆیی کوردستانە کە لایەنگرانی لە ئۆتۆنۆمی خوازەکان کەمتر و لاوازترە. ئۆتۆنۆمی خوازەکان ئەوانە بە هاندەرێکی نیگەتیف و سامناک دادەنێن.

تاقمێکی تر هەن لایەنگری مانەوەن لە ژێر حیمایەی تورکیا،کەبریتین لەو کوردانەی پلە و پایەیان لەناو دەوڵەت وەرگرتووە یا نوێنەری پەرلمانن، وەك فەوزی بەگ، زولفی بەگ، حاجی بەدر ئاغا، دیاب ئاغا، هتد........لایەنگرەکانیان ئەوانەن کە لە کوردستان دوورخراونەتەوە و زمانیان لە بیرچۆتەوە یا تورکیزە کراون. ئەو مووچە خۆر و پیاوانەی دەوڵەتیش کە لایەنگری مانەوەن لەگەڵ تورکیا، لە کوردستان زۆرن.

ئێمە لە سەرەوە باسی لایەنگرانی ئینگلیزمان کرد وەك سەید تەها، مستەفا پاشا، مەولانی ڕەفعەت زادە کە پێیان وایە ئابووری کوردستان و کۆمەڵگای کوردەواری تەنیا بە پشتیوانی ئینگلیزی دەوڵەمەند و بەهێز،پێش دەکەوێ.

ئەم ڕاپۆرتەی عەونی بەگ بە بیروڕای « وەرگێڕی سەفارەتی سۆڤیەت» زیاتر بۆچوونێکی گشتی و سەرپێییە. هەڵسەنگاندنی بیروڕا یا دیسپلینی سیاسی کەسایەتییە کوردەکانی وەك خالید بەگ و سمکۆی تێدانییە،وێدەچێ بە ئەنقەست باسییان نەکات. دەتوانین بڵێین ڕاپۆرت نووسەکە پەیوەندی بە کۆمیتەی ئەستانبوڵەوە هەیە (یا لەگەڵ ئەوان بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان کار دەکا).

ئەم ڕاپۆرتە نەك هەر هەڵویستی کۆمیتەی کوردی نییە کە گوایە ئێستا لە قۆناغی دابەشبوون دایە بەڵکو سەرتاپای گلەیی و ڕەخنە و پاڕانەوە و داخوازییە لە تورکان. باسی لایەنگرانی

رووسیا هەر ناکات کە یا نازانێ لایەنگرانی رووسیایش لەناو بزووتنـەوەی کـورد هـەن و یـا دژی لایەنگرانی رووسیایە, بێ مەبەست نییە لێی بێ دەنگە*.

## سەبارەت بە یوسف زیا ئەفەندی

خوێندەواری ناوەندی هەیە، تا شۆڕشی تورکەکان وەك مووچەخۆرێکی مامناوەنـدی لـە بـەتلیس خزمەتی کردووە. هەرلە سەرەتاوە خزمـەتێکی زۆری بـە بزووتنـەوەی نەتەواویـەتی کـوردکردووە لەناو تورکیا، لە خولی یەکەمی هەڵبژاردنی پارلەمان بە نوێنەری بەتلیس هەڵبژیردرا. لە پەرلمان دژی دیکتاتۆریەتی مستەفا کـەمال هەڵویـستی وەرگرت،ئـەوە بـوو کـە چـووە ریـزی گرووپـی دووهەمی ئەنـدامانی پارلـەمانی تورکیـا، لـەم گرووپـەدا زۆر چـالاکانە کەوتـە هـەڵ تەقـەلا. دەوڵەتیش لە خولی دووەمی پەرلمان بۆرێگرتن لەم گروپە هەموو رێگایەکی گرتە بەر،ئەویش واتە یوسف زیا هەڵوێستی دوژمـنانە تری بەرامبەر بە دەوڵەت و پـارتی گـەل گرتەبـەر و دژی ئەوانـە درێژەی بەپرۆپاگەندەکردن دا. بەگشتی چـالاکییەکانی دژی دەوڵـەت بـوو بەتایبـەتی لـە ناوچـە کوردنشینەکانی رۆژهەلات، بۆ دەوڵەتی ناوەندی مەترسییەکی گەورەی دروستکرد. گەرچی لەمێژ بوو بڕیاری دەستگیرکردنی درابوو، بەلام بیانوویەکیان بـۆ جێبـەجێ کردنـی نـەبوو، ناچـار هـەر چاودێرییان دەکرد و دوای دەکەوتن.

سەرئەنجام لە سەرەتای مانگی کانوونی دووەمی ئیمساڵ «١٩٢٥» هاوکات لەگـەڵ خالیـد بـەگ دەستگیرکرا،گەرچی نیزامیش نەبوو کەچی بردیانە دادگای نیزامی بەتلیس.

یوسف زیا ئەفەندییان بەوە تاوانبار کرد کە پەیوەندی بە ئیحسان بەگەوە هەیـە کـە فەرمانـدەی بەتالیۆنە کوردەکان بووەو چۆتە پاڵ ئینگلیزەکان، بەخیانەت کردن بە دەوڵەت تاوانبار کرا.گوایـە سێ ساڵ زیندانی بۆ بڕاوەتەوە. یوسف زیا نە کەسایەتییەکی گەورەی کوردە نـە دەورێکـی بـالای لەناو کوردادا هەیە، بەلام زۆر چالاك و کاریگەرە*.

## سەبارەت بە خالید بەگ

---

* ABNP Ap OP. 0732 onucl 8 nan. 158 gel 470 âp. 145-158.

* سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٩.

خالید بەگ لە قوتابخانەی عەشیرەتەکان لە ئەستانبۆل خوێندنی تەواو کردووە. دوای تەواوکردنی خوێندن، دەکرێ بە سەرلەشکری عەشایرەکانی کورد کە لە چوار فەوجی عەشیرەکەی ئەو واتە عەشیرەتی جبرانلی پێکهاتبوو.

خالید بەگ هەر لەو رۆژەوە بە هەموو هێز و توانایەوە خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لە مێژوو، ئایین و هونەری کوردی، تا گەیشتە ئاستێکی بەرز، ئێستا مرۆڤی هەرە تێگەیشتوو خوێندەواری کوردە.

لە کاروباری سەربازیشدا مرۆڤێکی زۆر زاناو بە توانایە، بۆیە لایەنگری زۆر و رێزێکی تایبەتی لەناو دانشتیوانی کورددا هەیە. توێژینەوە لەسەر داب و نەریت و ژیانی کوردان بوو بە هۆی ئەوەی،خالید بەگ بە ئیمان و بیروباوەڕێکی تۆکمە، هەوڵی پێشخستنی کۆمەڵگای کوردەواری بدا، مەبەستی خۆیشی لە هیچ کەس نەدەشاردەوە و بە هەمووانیشی دەوت.هیچ بەشدارییەکی لە بزووتنەوەی تورکاندا نەکرد و لە لاوە بۆی دەڕوانین. زۆرجارداوای لە کارکشانەوەی خۆی دەکردو دەیویست بە ئازادی خەریکی کاروبار و کۆمەلایەتی و سیاسی بێت، بەلام تائێستا نەیتوانیوە بە مەبەستی خۆی بگات. لەبەر ئەوەی چالاکی سیاسی ناوبراو بە دڵی دەوڵەتی تورکیا نەبوو، هەوڵیاندا لە چوارچێوەی داموودەزگای نیزامیدا بیهێڵنەوە تا دوورنەکەوێتەوە وبتوانن چاودێری بن. دەڵێن لەم گەشتەی دوایی بۆ ئەرزڕوم مستەفا کەمال چاوی بە خالید بەگ دەکەوێت و داوای لێدەکات خۆی لە کارنەکێشێتەوە و بیریشی لێنەکاتەوە. بەم دواییانە هەندێ چالاکی نواند، لە سەرەتای کانوونی دووەمی ئیمساڵ گیراو دایانە دادگای نیزامی بەتلیس و بۆماوەیەکی نادیار زیندانییە.

کە ویستیان بیبەن بۆ بەتلیس نەیانوێرا بەو رێگا و ناوچەیەدا بیبەن کە لایەنگری زۆرە، ناچار بە شاری قامیش و ئەلاشکیردا بردیان تا لە مەترسی لایەنگرەکانی رزگاریان بێت و ئاژاوە دروستنەبێت، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر زستان نەبا ئەم هەراو هۆریا و نارەزایەی کوردان سەبارەت بە گرتنی خالید بەگ دەبووە راپەڕینێکی تەواو *.

---

* سەرچاوە پێشوو ل ١٦٠.

خالید بەگ سەرەتا سەرکردەی یەکێك لە دەستەکانی حەمیدییە بوو پاشان دەکرێتە فەرمانـدەی «٤»ی لەشکر واتە فەرماندەی لەشکرێکی حەمیدییە. ناوبراو لەگەڵ ئەفسەرانی تری کوردی نـاو حەمیدییە (بەتایبەتی پاش کۆنگرەی ئەرزەرۆم و سیواس کە کەمالییەکان هیچ شتێك بـۆ کـورد ناکەن و بەڵێنـەکانیان درۆ دەردەچێت) لەگـەڵ سـەرۆك هۆزوعەشـایر وکەسـایەتییەکانی کـورد پەیوەندی دەبەستن و بەرنامەی هەڵگیرساندنی شۆڕش بـۆ سـەربەخۆیی کوردسـتان دادەڕێـژن.لـە کانوونی یەکەمی ١٩٢٠ لە ئەرزەرۆم «کوردستان ئیسقتلال جمعیتی» یا «کۆمیتەی سـەربەخۆیی کوردستان»یان دامەزراند، خالید بەگ بە سەرۆکی ئەم کۆمیتەیە هەڵبژێرا و لە تەواوی کوردستان دەستیان دایە چالاکییەکی بەربڵاو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردەواری لە خوێندکار و ئەفسەر و سەربازەوە بگرە تا سەرۆك هۆز و خیلەکانی کورد هاتنە ڕیزی ئەم کۆمیتەیە.

خالید بەگ لە هاوینی ١٩٢٠پەیوەندی دەکا بە کۆمەڵەی کوردی لە ئەستانبۆڵ بـە کـوڕی شـێخ عوبێدوڵای نەهری شێخ قادر و بە عەبدورەحمان هەکارییەوە، لە ڕێگای ئەوانیشەوە پەیوەنـدی بـە نوێنەری بەتلیس لە پەرلمانی تورکیا واتە یوسـف زیـا بـەگ و کەسـانی تـرەوە دەکـا. پلانێکـی هاوبەش بۆ سەربەخۆیی کوردسـتان دادەڕێـژن، هەوڵـدەدن و بەکۆکردنـەوەی تۆمـار و ئیمـزا لـە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکان داوای سەربەخۆیی کوردسـتان بکـەن. ئـەم داخوازییـە بـە هـۆی مستەفا پاشای کورد و شەریف پاشاوە دەدرێتە کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم).

پاش ئەوە کەمال (ئەتاتورك) خالید بەگ دەکا بە سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای سوپا تابەم پۆسـت و مەقامە لە ڕێگای لا بدەن یا باشتر بیخەنە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵ تا لە کاتی پێویـستدا بتـوانن بیگرن. خالید بەگیش بۆ داپۆشینی چالاکییەکانی ئەم پۆسـتە پەسـەند دەکـات و بیـانوو نادات‌ـە دەست تورکان، زۆری پێناچێ یوسف زیای هاوکاری، بە هۆی چالاکی بۆ سـەربەخۆیی کوردسـتان لە پەرلمانی تورکیا دەردەکرێت. لە ١٩٢٢ کۆمیتەی ئەرزەرۆمی کوردی بـە سـەرۆکایەتی خالیـد بەگ بڕیاری دا کە پشتیوانی سۆڤیەت بکات بۆ سـەربەخۆیی کوردسـتان (بـەڵام کوردناسـەکانی سۆڤیەت نامەکانی کۆمیتەی کـوردی کـە هـەم پێـشتریش داوای پـشتیوانیان لەبەلـشەفیکەکان کردووە، وەڵام دەدەنەوەو پاکانە بۆ سۆڤییەت دەکەن و دەڵێن لەبـەر هـۆی سیاسـی و بـارودۆخی ناوخۆ و نێونەتەوەیی ئەو دەم سۆڤیەت نەیتوانی ئەم داخوازییەی کـوردان جێبـەجێ بکـات. لـە بەڵگەنامەکاندا بەڵێنی زۆریان داوە بە خالید بەگ و هاوڕێکـانی و پێـشتریش ئـەو بەڵێنانـە بـە

کامیل بەدرخان دراون کە پتر لە ٩ ساڵ لە سۆڤیەت چاوەڕێی درۆ و دەلەسەکانیان دەبێت، سەرئەنجام لەسەر داخوازی کەمال لە سۆڤیەت دەردەکرێت - وەرگێڕ)، لە ژێر گوشاری بەلشەفیکەکان بەو مەبەستەی سۆڤییەت پشگیریان بکات دوو کۆمیتەی کوردی ئەرزەڕۆم و ئەستانبۆڵ یەك دەگرن.

خالید بەگ سەرۆکی هۆزی گەورەی حەسەنانلی لە شەوی ٢٠ی دیسامبەری ١٩٢٤ لە لایەن هێزەکانی تورکەوە لە بارەگاکەی دەگیرێت و لەگەڵ کەسایەتییەکی کوردپەروەر دەینێرنە بەتلیس، زۆری پێناچێ ئازاد دەکرێت. پاش تێگەیشتن لە سیاسەتی تاوانبارانەی سۆڤیەت، لەگەڵ شێخ سەعیدی پیران هەوڵ بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی تری کورد دەدات. پاش شکانی شۆڕش شێخ سەعید لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێکانی بە هەزار چەکدارەوە بەرەو کوردستانی رۆژهەلات بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ سمکۆ وەڕێ دەکەون، بەلام لە ناوچەی ماکۆ هێزەکانی فارس لە سەرداخوازی دەوڵەتی تورك رووبەروویان دەبنەوەو هێرشیان دەکەنە سەر و کوڕی خالید بەگ شەمسەدین و کوڕی شێخ سەعید عەباسەدین و ژمارەیەکی تر شەهید دەبن. خالید بەگ و شێخ سەعید لە بەهاری ١٩٢٤ بە نیازی دەست پێکردنەوەی شۆڕش دەگەڕێنەوە بۆ کوردستانی باکور، بەلام لە گوندی شیروان شێخ لەگەڵ دوو هاوڕێی تریدا دەکەونە بۆسەی هێزەکانی تورك و لە ٣١ی تەمووزی ١٩٢٤ لە دیاربەکر لە داردەدرێت.

خالید بەگ ئەو مرۆڤە بوو کە هیوای زۆر بەبەلشەفیکەکان بوو و ماوەیەکی زۆر پەیوەندی پێیانەوە دەبێت. پاش شکانی شۆڕشی شێخ سەعیدیش متمانە بەبەلشەفیکەکان ناکات پەناهەندەی سۆڤیەت بێت و سۆڤیەتیش هەوڵ نادا خالید بەگ لە مردن رزگار بکا و داوا لە تورك بکات یا زیندانی بکرێت یا لێی ببورن

**د. ئەفراسیاو هەورامی**

## سەبارەت بە سەرکردەکانی تری عەشایری کورد

### سەرچاوە ژمارە ٣ ڕێکەوتی ١٩٢٥/١/١٤

ڕێبەرانی عەشایری کورد لە ناوچەکانی دیاربەکر و سیواس کوڕەکانی خوالێخۆشبوو ئیبراهیم پاشا، واتە عەبدولحەمید و عەلی بەگن. دەسەڵات و دەوریان زۆرە، دەتوانن تاسەد هەزار نەفەر کۆبکەنەوە. پارەکە پێشنیاری نوێنەرایەتی پەرلمانی تورکیایان پێکرا، بەڵام پەسندیان نەکرد.

عەبدولحەمید بە یارمەتی شەریف پاشا کوڕەکانی خۆیی ناردە فەرەنسا بۆ خوێندن. لێرەدا دەردەکەوێت کە عەبدولحەمید دەیەوێ لەگەڵ فەرەنسییەکان کار بکا و لە ژێر حیمایەی ئەواندا بێت و ڤیزای فەرەنسی وەربگرێت. دوژمنێکی سەرسەختی تورکانە، دەڵێن دەیەوێ تۆڵەی باوکی بکاتەوە.

سەرکردەی کوردەکانی مالاتیا و خارپوت مەحموود کوڕی عوسمان پاشا و مەحموود عەلین. مەحموود عەلی نوێنەرە لەپەرلمان. ئەم دوو برایە «٣٥» گوندیان هەیە و دژی سەربەخۆیی کوردستانن دەوڵەتی تورکیاش بەرامبەریان باشە. لە ئانادۆڵیش هەر بەگێکی کورد تا سەد گوندی هەیە و جویتارەکانیش هیچ زەوی و سامانێکیان نییە، هەمووی هیخاوەن موڵك و ئاغاکانە.

ڕێبەرانی عەشایری ناوچەی دەرسیم مستەفا ئاغا، خەیری عەلی، حەیدەر پاشازادە موحەمەد بەگە. خەڵکی ئەو ناوچەیە قزڵباشن واتە شیعەن، زۆر ئازاو چالاك و میرخاسن.

گەرچی دەوڵەتی تورکیا نزیکەی سەد و پەنجا ساڵە لەم ناوچەیە خەریکی ریفورمە، بەڵام هێشتا نەیتوانیوە بەجێ بگەیەنێت. لە رابردوودا دانیشتوانی دەرسیم دەیانویست لە ژێر حیمایەی ئەمەریکا بن و سایەی ئەمریکا بەسەر کوردستانەوە بێت، ئێستاش هەر لەسەر ئەو بڕوایەن.

مستەفا ئاغا و خەیری بەگ کە ماوەیەك لەمەو بەر چاوم پێکەوتن و لەگەڵیان دوام، ئەم راستییە ناشارنەوە.

به وتەی ئەمەریکا و ئینگلیز بە یارمەتی پارەو کەلتووری خۆیان دەتوانن گەلانی چەوساوە و ژێر دەست رزگار بکەن. بەرەو پێشکەوتن و مرۆڤایەتی بیانبەن بەبێ لەبەرچاو گرتنی رۆڵی ئایینی و رەگەزیان. هەموو ساڵێکیش ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارانی دەرسیم و بەشێك لە جوتیاران بۆ کارکردن دەنێرنە ئەمریکا و پارەیەکی زۆر لەگەڵ خۆیان دەهێننەوە.

لە ئەرزەڕۆم خالید بەگ و بەگەکانی تر وەك کەیفی بەگ. عەباس بەگ، یوکلی خان ئۆغلی، محەمەد بەگ و یوسف بەگ کوڕی مستەفا بەگ کە هەموویان سەر بە خالید بەگن. خالید بەگ ٤٥ ساڵیەتی مەبەستی ئەو یەکخستنی تەواوی کوردانە بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ، دەیەوێ دەوڵەتێکی کوردی پێکبێنێ، چاوەڕێیە رووسەکان یارمەتی بدەن ئینجا دەوڵەتەکەی رابگەیەنێ. لەبەر ئەوەی لایەنگری رووسیایە، لە سەرەتای کانوونی دووەمی ئەمساڵ «مانگی یەکی ١٩٢٥» لەگەڵ موسا بەگ خەڵکی موش، گیران و برانە دادگای نیزامی بەتلیس. بەڵام کۆمیتەی بەتلیس هێرشی کردە سەر زیندان، خالید بەگ و موسایان ئازادکرد، دوای ئەمە دەوڵەتی تورك چوار بەتالیونی لە هێزە سەرکوتکەرەکانی نارد بۆ دەستیگرکردنەوەیان.موسا بەگ رێبەری عەشیرەتەکانی مووشە، زۆر بە تەمەنە منداڵێکی زۆری هەیە و دۆستی رووسیایە *.

## هەندێ زانیاری لەسەر کەسایەتییەکان (هەورامی)

١- چیچیرین گیئۆرگی واسیۆیچ ١٨٧٢-١٩٣٦ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت بووە لە نێوان ١٩١٨-١٩٣٠. کەسایەتییەکی دەوڵەتی و پارتی بووە. لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر و گەڕانەوەی بۆ رووسیا بوو بە جێگری نارکوم «وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت». ئیمزاکەری پەیمانی برسیتە لەگەڵ ئەڵمانیا. لە ساڵی ١٩٢٠ کەوتە وتووێژ لەگەڵ ئێران و تورکیا و ئەفغانستان. سەرۆکی دەستەی بەشداری سۆڤیەت بوو لە کۆنفرانسی لۆزان ١٩٢٢-١٩٢٣ لە ١٩٢٥ و ١٩٢٧ پەیمانی بێلایەنی و هێرش نەکردنی لەگەڵ تورکیا و ئێران مۆرکرد. ئەندامی کۆمیتەی

* هەمان سەرچاوە ل ١٦١-١٦٣.

ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت «بەلشەویك» بوو لە کۆنگرەکانی ١٦ و ١٥.لە ١٩٣٠ بە هۆی نەخۆشی دیابیت و پۆلی ئیفرێت لە کارلابرا.

کتێبکێکی نووسیوە بە ناوی «دیپلوماسیەتی قوتابخانەی لینین» لە ١٩٦٦ و ١٩٧٥ چاپکراوە دەورێکی نامرۆڤانەی بەرامبەر بە کێشەی کورد هەبووە.

٢- شۆمیاتسکی باریس زاخارویچ ١٨٨٦-١٩٣٨. کەسایەتییەکی پارتی و دەوڵەتی بووە، لە نێوان ١٩٢٣-١٩٢٥ بالوێزی سۆڤیەت بووەلە ئێران. لە ١٩٢٥ بووە بە سەرۆکی زانکۆی کۆمۆنیستی زەحمەتکێشانی رۆژهەلات.

لە سەردەمی ستالین دوورخرایەوە و زیندانی کرا، پاش مەرگی ستالین پاکانەی بۆ کرا. یەکێك لە جێبەجێکەران و لایەنگرەکانی سیاسەتی نادروستی دەرەوەی سۆڤیەت بووە و هاندەری رژێمی ئێران بووە بەتایبەتی دژی بزووتنەوەی کورد. نوسراو و راپۆرتەکانی لە خزمەتی داگیرکەرانی کوردستاندا بووە.

٣- سوریتس یاکۆف زاخارۆیچ باڵوێزی سۆڤیەت لە تورکیا نێوان ١٩٢٣-١٩٣٤.
٤- قەرەخان لیڤ میخائیلویچ باڵوێزی سۆڤیەت لە تورکیا لە نێوان ١٩٣٤-١٩٣٧.
٥- مالتسف یۆری و لادیمیرویچ کۆنسوڵی سۆڤیەت لە بایەزید لە نێوان ١٩٢٢-١٩٢٣ پاشان لەسەر داخواز و گوشاری تورکیا کۆنسوڵخانەکەی سۆڤیەت بۆ هەمیشە لەوێ داخرا.
٦- پاڤلۆڤسکی ئیگناتین فەرانتسۆیچ کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ئەرزەرۆم نێوان ١٩٢٢-١٩٢٤.
٧- دۆبسۆن ئەرکادی باریسۆیچ کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ ١٩٢٣-١٩٢٤ و لە ١٩٢١-١٩٢٣ کۆنسوڵی لە ماکۆ و لە نێوان ١٩٢٤-١٩٢٧ کۆنسوڵی لە تەورێز بووە.
٨- گولیب ئەلیکساندر نائومویش کۆنسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ ١٩٢٥-١٩٢٦.
٩- دومپیس ماکس فەرانتسیۆیچ کۆنسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز ١٩٢١-١٩٢٢.

## سەبارەت بە سمكۆ

سمكـۆ لـە بنەماڵەیـەكی نیـشتمانپەرەوەر و خـەباتگێڕی كوردسـتان بـووە مێـژووی خـەباتی بنەماڵەكەیان بەتایبەتی باو بـاپیرانی و براكـەی جـافر ئاغـای شـكاك لـە پێنـاوی ئـازادی و سەربەخۆیی كوردستان، شاراوەنییە. سمكۆی نەمریش درێژە پێدەری ئەو خەباتە بووە و یـەكێك لە سەركردە هەرە گەورەكانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد بووە، ئـازایی، نەترسـی، ژیـری و سیاسی بوونی ئەو مرۆڤە مەزنە لە سەركردە و كەسایەتییەكانی تری كورد جیادەكاتەوە، دیارە لێرە مەبەست لە نوسـینی ئـەم نوسـراوەیە هەڵـسەنگاندنی كەسـایەتی «سمكـۆ» و مێـژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد بە سەرۆكایەتی «سمكۆ» نییە، بـەڵكو وەبیرهێنانـەوەی هەنـدێ راستی و زانیارییە سەبارەت بەو بەڵگانە و بۆچوونی رووس و سۆڤیەتییەكانە كـە لـە سـەریان نووسیوە. زۆرجار بەوە تاوانبار كراوە كە لەگەڵ تورك و ئینگلیز پەیوەندی هەبووە و بە قـسەی وان جووڵاوەتەوە و یاخود دژی رووس و سۆڤیەت بووە زۆریشیان بـە كوشـتنی مەسـیحییەكان تاوانباری دەكەن، زۆر لە داگیركەرانی كوردستان (بەتایبەت كوردناسەكانیان) بە چەتەو رێگری دادەنێن. وەڵامدانـەوەی ئـەو هـەموو تاوانـە نارەوایانـە پـەرتووكێكی تایبـەتی دەوێـت كـە خۆشبەختانە لەم بارەوەش بەڵگە و فاكت یەكجار زۆرە كە زۆربەشیان سەرچاوەكانیان رووسی یا سۆڤیەتین. لێرەیش مەبەست چاو خشاندنێكی كورتـە بـە مێـژووی پەیوەندییـەكانی «سمكـۆ» لەگـەڵ رووس و سـۆڤیەت و پەیوەنـدی لەگـەڵ داگیركـەرەكانی كوردسـتان، چـۆن و لـە چ كاتێكدابووە. «سمكۆ» لەگەڵ هەموو زلهێز و دەوڵـەتی تـردا هەوڵیـداوە سـەرنجی رووسـیا یـا سۆڤیەت بۆلای كێشە رەواكەی راكێـشێت، بـەڵام ئـەنجامێكی نابێـت. رووسـیا یـا سـۆڤیەت هەمیشە یا درۆیان لەگەڵ كردووە یا ویستوویانە دارەدەستیان بێت یـا ئەرمـەنی و ئاشـورییان بەگژداكردووە، زۆرجاریش سوپاكەیان بەشداری كردووە لە دامركاندنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی كورد و بەشانی هێزی داگیركەرانی كوردستان بێ شەرمانەترین كارەساتیان بەسەر كورد و كەسایەتی سمكۆ هێناوە. ئەویش لەو كاتانەدا بووە كە سمكۆ بە پێی ویست و ئـارەزووی ئـەوان نەجووڵاوەتەوە و نەیویستووە داردەستیان بێت یا ئەو مەرج وسنوورەی سمكـۆ بـۆی دانـاون بـە دڵیان نەبووە، داوای لێكردوون ئەوانیش كێشەی گەلەكەی بە رەسمی بناسن و یارمەتی مادی و مەعنـەوی بـدەن ئینجـا ئـەویش هاوكـاری و دۆسـتایەتییان بكـات. یالـە كاتێكـدا سـوپای داگیركەری رووس كوردستان داگیردەكا و دەیەوێ وەك داگیركەرانی تـری كوردسـتان دەسـەڵات

بەسەر کورددا بسەپێنن، سمکۆ بەرەنگاریان دەبێتەوە و سنووریان بۆ دادەنێ، ئەوان ئەمە بە ئاژاوەگێڕی تورك و پاش شۆڕشی ۱۹۱۷یش بە ئاژاوەی ئینگلیز دادەنێن. سمکۆ چ کاتێك بەرەو رووی هێزەکانی رووس دەبێتەوە و دژی مەسیحییەکان هەنگاو هەڵدەگرێت؟ کەی ناچاردەکرێت کوردستانی رۆژهەڵات جێبهێڵێت و بڕوات بۆ کوردستانی باکوور و باشوور؟ بۆ ئەوانە و گەلێك پرسیاری تر لەم باسەدا هەر بەپێی سەرچاوە رووس و سۆڤیەتییەکان وەڵامێکی کورتیان دەدەینەوە. لە لایەکی ترەوە دسەڵاتدارانی رووس و سۆڤیەت گەلێك جار نوێنەریان ناردۆتە لای سمکۆ وەك سەرکردەیەکی شۆڕشی کورد وەك خاوەن دەور و دەسەڵات بەتایبەتی ئەو کاتەی ئیشیان پێبووە و پێویستیان بە یارمەتی کورد هەبووە. یا نوێنەری قەیسەری رووسیا واتە حاکمی قەفقاز بانگهێشتی دەکا بۆ بەتلیس و وەك سەرۆکی وەڵاتێك پێشوازی لێدەکات یا گەلێك جار سمکۆ لەگەڵ بەرگریی دیپلوماسی و لەشکری رووس و سۆڤیەت لە کوردستانی رۆژهەڵات پەیوەندی دەگرێت، ئەم پەیوەندییانە هەمووی لە چوارچێوەی هاوکاری کورد و رووس و داوای یارمەتییە لە رووسیا و سۆڤیەت بووەبۆ سەربەخۆیی کوردستان.کەواتە چۆن ئەم سەرکردە لێهاتووە بە فیوداڵ و رێگر و پیاوی ئەم و ئەو دادەنرێت؟!

چۆن سمکۆی قارەمان کە سەردەمێك حکوومەت و دەوڵەتی دامەزراندووە، گەلێك شتی باشی کردووە و رۆژنامەی دەرکردووە بە مرۆڤێکی کۆنەپەرست ناو دەبرێت؟ چۆن دەڵێن ئەم مرۆڤە پارە و چەکی لەم و لەو وەرگرتووە، یا ئیش و کاری راو و رووت بووە.و...؟

خۆ سمکۆ ئەگەر مەبەستی پارەو دەسەڵات بایە هەم ئێران و هەم تورکیا ئامادە بوون و بە رەسمی دەسەڵاتی ناوچەییەکی کوردستانی بدەنێ، ئەو مەبەستی رزگاری وەڵاتەکەی بووە، لە لایەکی ترەوە سمکۆ پێویستی بە پارەنەبووە تالەم و لەو داوا بکات یا دەست بکا بە تالان و راو رووت. سمکۆی کۆڵنەدەر کە هەموو ژیانی لە پێناوی گەلەکەی دانابوو تووشی ئەو هەموو شەڕ و کێشانە بووە لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان،چەند جار راپەڕی و شۆڕشی دەسپێکرد، ماڵ وسامان و بنەماڵەکەشی لە پێناویدا بەختکرد جێحەوانەوەی نەبوو، لە هەموو لایەکەوە هێرشی دەکرایە سەر و پیلانیان بۆ دادەنا، زۆرجار لە کوشتن رزگاری بووە. ئایا ئەوە مرۆڤێکی فیوداڵ و سەرۆك عەشیرەتە؟..... بەبڕوای کوردۆلۆژی سۆڤیەتی کە بە بیروباوەڕی چەوتیبەلشەفیکی بابەتەکان و کێشەی کورد، بەتایبەتی کەسایەتییەکانی کورد،

هەڵدەسنگێنن، سمکۆ نەبێ هیچ مرۆڤێك ئامادەی ئەم هەموو خۆبەخت کردنە نییە؟ باسی تاوانی دەوڵەتەکەی خۆیان ناکەن کە لە لێدانی سمکۆ و بزووتنەوەکانی کورد چەند گاریگەر بوونە.

کۆنسوڵ و سیخوڕ و فەرمانبەرانی لەشکری رووس یا سۆڤیەت سەدان راپۆرتیان لەسەر سمکۆ و ئەو شۆڕشانە نووسیوە کە بە سەرکردایەتی ئەو بەڕێوەچوون. دەیان شەڕی خوێناوی لە نێوان سمکۆ و داگیرکەرانی کوردستان چ تورك چ فارس روویداوە، چەند کەسیان لە بنەماڵەکەی سمکۆ شەهید کردووە و گەلێك جاریش پێکەوە دژی سمکۆ هێزەکانیان یەکخستووە و کوردستانیان تالان کردووە. سمکۆ دەیەوێ گەلەکەی لەو کارەساتانە رزگار بێت، چۆن دەبێتە داردەستی ئەم و ئەو.

وەنەبێئارشێڤو دامودەزگاکانی رووسیا یا سۆڤیەت سەرچاوە و زانیاری کەمیان لەسەر سمکۆ و خەباتی بێوچان و دوورودرێژی ئەم قارەمانە هەبێت، بەڵکو زیاتر و باشتریش ئەم سەرکردەیان ناسیوە، بەڵام بۆ ئاوا مامەڵەیان لەگەڵ کردووە؟ لەبەر ئەوەی:

١- داردەستیان نەبووە.
٢- پیلانی کوشتاری مەسیحییەکانیان خستۆتە ملی ئەو، ناشنوسن کێ دەست پێشخەر بووە؟ چۆن دەستی پێکرد؟ بۆ سمکۆ وەڵامی دانەوە؟.
٣- تاوانەکانی رووسیا و سۆڤیەت بەرامبەر سمکۆ لە ئەژمار نایەن، زەق ناکرێنەوە، بە واتایەکی تر بە وردی لەسەری نانووسن.
٤- بۆ لە رووس و سۆڤیەت هەڵگەڕایەوە؟ کە بۆ پارێزگاری خۆی و گەلەکەی تاکتیکی پەنابردنە بەر ئەم یا ئەوی بەکارهێناوە، ئایا لەجێی خۆیدا بووە ناچار بووە یا پێویست بووە؟.
٥- کاربەدەست و نووسەرانی رووس و سۆڤیەت سووکایەتی زۆریان بە بزووتنەوەی کورد و ئامانجەکانی کردووە، هۆیەکەشی زیاتر ئەوەیە ویستویانە تاوانەکانی خۆیانی پێداپۆشن.
لێرەدا ئاماژە بە هەندێ پەیوەندی نێوان سمکۆ و رووسیا دەکەین تا بزانین راستییەکان چۆنن.

## کورتەیەك لە دۆسیەی سمکۆ بەپێی ئارشیڤەکانی سۆڤیەت

باپیری «سمکۆ» عەلی ئاغا بەشداری شۆڕشی شێخ عوبێدولاّ بووه. سمکۆ و بنەماڵەکەی خەباتێکی زۆریان دژی قاجارەکان کردووه، دوای شەهید بوونی جافر ئاغای برای لە ١٩٠٥ لەگەلّ باوك و بنەماڵەکەی دەچنە کوردستانی باکوور و لەوێوە بە یارمەتی کوردەکانی ئەوێ بۆتۆڵە سەندنەوەی براکەی هێرش دەکاتە سەر ناوچە سنوورییەکان و قوتور دەخاتە ژێر دەستی خۆی.

پاشان کە تورکەکان لە ساڵی ١٩٠٨ دێن و ناوچەکە داگیردەکەن بۆ دەرپەراندنیان داوای یارمەتی لە دەوڵەتی رووسیا دەکات، بەلاّم وەلاّمی نادەنەوە.

## کۆنسۆڵەکانی رووس لە ساڵی ١٩١٠

## باسی شەڕە قورسەکانی سمکۆ و کوردی تر دەکەن دژی تورکیا

تورکەکان کە دەیانەوێ قوتور داگیربکەن سەرەتا پێشینار بە «سمکۆ» دەکەن قوتور بخرێتە سەر ئیمپراتۆریەتەکەیان و بەڵێنی پێدەدەن بۆ هەمیشە حاکمی قوتور و سەلماس و چاریق، سوما بێت و دەسەلاّتەکەشی بە رەسمی بناسن. بەلاّم سمکۆ ئامادەنابێت و داوای چەك و پارە لە دەوڵەتی ئێران دەکات تا تورکان لە ناوچەکە وەدەرنێ، ئێرانیش ئامادە نابێت، ئینجا «سمکۆ» دژی تورك دەست بە شەڕی پارتیزانی دەکات.

«سمکۆ» لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١١ داوای یارمەتی لە رووسیا دەکات و دەڵێ ئێران کە لەژێر حیمایەی ئێوەیە توانای دەرکردنی تورکانی نییە کە راستەوخۆ دژی من وەستاون، پێویستە نەهێڵێن تورکیا ئەو شوێنانە داگیربکات. بەلاّم رووسیا بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەلّ تورکەکان تێکنەچێ داواکارییەکەی «سمکۆ» وەدوا دەخات. سەرئەنجام سمکۆ بەهۆی راکێشانی کوردەکانی ئەو ناوچانە پیلانی تورك بۆ داگیرکردنی ئەو دەڤەرە، تێکدەدات.

لە کۆتایی ساڵی ١٩١١ کە هێرشی تورك بەردەوام دەبێت و سالارئەلدەولەش بە پشتیوانی تورکیا دەیەوێ لە ئێران دەسەلاّت بگرێتە دەست، رووسیا ناچار دەبێ لەگەلّ هێزەکانی ئێران بۆ دەرکردنی سوپای تورك هەنگاو هەڵگرێت.

راپۆرتی کۆنسۆڵەکانی رووسیا لە هەمانکاتدا باسی سەرکەوتوویی شەری پارتیزانی «سمکۆ» دەکەن دژی سوپای عوسمانی، هاوکات لەگەڵ راپەرینە سەرکەوتووەکانی سەعید بەگ لە ویلایەتی وان و سییرت و بەدلیس، راپەرینی کوردان بە سەرۆکایەتی کوری حسێن پاشا، راپەرینی هۆزەکانی تالەبانی و داودی و هەمەوەند و زەنگەنە بە سەرۆکایەتی محەمەد عەلی کە لە ناوەراستی کانوونی دووەمی ۱۹۱۱ لە بەغدا داوای یارمەتی لە کۆنسۆڵی رووسیا دەکات و دەڵێ ئامادەن هەموو کوردەکانی کەرکووك و سلێمانی دژی تورك راپەرێنن. لە لایەکی تریشەوە کوردەکانی ناوچەی شەمزینان بە سەرۆکایەتی محەمەد سادق و موسا بەگ ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاری کردنی رووس دەردەبرن، کەچی رووسیا ئامادە نابێ پشتیوانی راپەرینی دەرسیم بکات، ئەمانە و دەیان وێنەی تر. جگە لە «سمکۆ» رووسیا پشتیوانی شێخ عەبدوسەلامی بارزانیش ناکات. لە زمانی «سمکۆ» دەگێرنەوە کە زۆرجار وتوویەتی: ژێر دەستی ئێران بوون کە رووسیا پشتیوانیەتی زۆر باشترە لە ژێر دەستی تورکان.

کۆنسۆڵ و دیپلۆماتەکانی رووسیا دان بەوە دادەنێن کە «سمکۆ» نەیهێشتووە تورك لە کوردستانی رۆژهەڵات جێگر بن، ئەوەش ناشارنەوە کە نزیکایەتی کورد و رووس هەمیشە تورکەکانی نیگەران کردووە.

تەواوی راپۆرتەکانی کۆتایی ساڵی ۱۹۱۱ و ۱۹۱۲ نیشانەدەن کە کوردەکان رۆژ بە رۆژ لە تورك دووردەکەونەوە و لایەنگری رووسیا دەکەن و ئامادەن یارمەتی بدەن بەتایبەتی سەید تەها، عومەر خان، سمکۆ، ئیبراهم ئاغا، تەیمور جەنگۆ.

پاش ئەوەی «سمکۆ» ناهێڵێ هێزی تورك لە سەر سنوور جێگیر بن بە نێوبژی کاربەدەستانی رووس، ئێران بەرەسمی دان بە حوکمداری «سمکۆ» لە ناوچەکەدا، دەنێ. رووسەکان لەو بروایەدا دەبن لە سمکۆ بەولاوە کەسێکی دی ناتوانێ ئەو دەورە لە ناوچەکەدا بگێرێت،لابردنی سمکۆ لاواز بوونی رووسیا و ئیرانە یا لە دژیانە، کەچی بەپارێزو گومانەوە باسی میرخاسی و ژیرایەتی سمکۆ دەکەن. پاش رۆیشتنی سوپای تورك هێزەکانی رووس جێگایان دەگرنەوە بەبیانووی ئەوەی پێش بە تورکیا بگرن، ماوەیکیش دەیانەوێ بیخەنە سەر خاکی خۆیان و ئەگەر بۆیان نەکرا بە ئێرانیەوە ببەستنەوە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هێشتا جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێنەکردبوو.

رووسەکان لە کۆتایی ساڵی ١٩١٢ بە فەرمی سمکۆ دەعوەت دەکەن، حاکمی قەفقاز پێشوازی لێدەکا، نیشان و میدالیای رەسمیشی پێدەدەن و بە مەراسیمی نیزامی وەك سەرۆکی وڵاتێك پێشوازی لێدەکەن. ئەم داوەت کردنەی سمکۆ لەلایەك دانپێدانانی دەسەڵاتی ناوبراو بوو لە لایەکی تریش مانۆڕ بوو بەرامبەر بە تورك و فارس کە سمکۆ لەگەڵ رووسیایە.

روسەکان لە تفلیس بەڵێنێکی زۆر بە سمکۆ دەدەن و دەیانەوێ سمکۆ بە دەسکیسی ئەوان بجووڵێتەوە، کەچی زۆری پێناچێ بە هۆی دەست تێوەردانی ئەرمەنەکان لە کاروباری کورد لەناو دەسەڵاتدارانی قەفقاز رۆژ بە رۆژ پەیوەندییەکانی کورد و رووس ئاڵۆزتر دەبێ بەتایبەتی بەرامبەر سمکۆ، هەڵوێستێکی نامرۆڤانە دەگرنەبەر کە ئەنجامەکەی پاشان دەردەکەوێت. سەردانی سمکۆ بۆ تەفلیس و چاوپێکەوتنی دەسەڵاتدارانی رووس بە پێی راگەیاندنی کۆنسوڵەکانی رووس لە کوردستان دەنگێکی یەکجار گەورەی دابۆوە و کۆمەڵانی گەلی کوردی و هەردوو پارچەکانی عوسمانی و فارس بەرەو رووسیا راکێشاوە بەو هیوایەی دراوسێ مەزنی کوردستان واتە رووسیا پشتی کورد دەگرێت، لە لایەکی ترە دەسەڵاتدارانی تورك و فارس زۆر نیگەران دەکات و سەرئەنجام دەبێتە هۆی پرۆتێستی هەردوو لایەن.

سەفیری تورکیا لە رووسیا تورخان پاشا کە ناڕەزایی وەڵاتەکەی خۆی لە دەعوەتی سمکۆ بۆ تەفلیس دەردەبڕێت، سازانۆڤ بێ شەرمانە پێیدەلێ «سمکۆش» وەك سەرداری ماکۆ دۆستی رووسیایە و دەلێ دەوڵەتی رووسیا بەشداری ئەم پێشوازەیە نەبووە و ئەو میدالیا و نیشانەی کە پێیدراوە لەسەر داخوازی خودی (سمکۆ) بووە، سمکۆش لە ریزی خزمەتکارانی رووسیایە و هیچ کاتێکیش دژی تورکیا کەلکی لێوەرناگیرێت. سەفیر و کونسوڵەکانی رووسیا لە فارس و تورکیا بێ ئاگایی خۆیان لە سەفەری سمکۆ بۆ رووسیا دەردەبڕن و بە کاربەدەستانی هەردوو دەوڵەت دەڵێن بەو چەشنە نییە ئەوان بیردەکەنەوە و سمکۆ بۆ خۆی چووە و لەبەر سمکۆ پەیوەندی دەوڵەتەکەیان لەگەڵ ئێران و تورکیا تێکنادەن.

پاشان لە راپۆرتە یەك لە دواییەکەکانیان بۆ پیترزبورگ دەڵێن سەفەرەکەی سمکۆ بۆ (روسیا) زیانێکی گەورەی بە دواوە بووە، سمکۆ ئەو کەسایەتییە نییە کە داوەتی بکەین. پەیوەندی ئێمە و تورك و فارس بەبێ ئەوەش باش نییە، بە داوەتی سمکۆ خراپتریش بووە.

له سەرەتای ساڵی ١٩١٣ کاتێك کە بڕیاربوو کێشەی سنوورەکانی نێوان رووسیا و ئێران دیاری بکەن، پیتربورگ لە دەستورێك بۆ کۆنسۆڵە و باڵوێزەکانیان داوا دەکەن کە نەهێڵن (سمکۆ) و عەبدوالرەزاق و سەید تەها هیچ چالاکییەك بنوێنن نەوەك کۆسپ بخەنە سەرکاری کۆمیسیۆنی دیاریکردنی سنوورەکان. رووسەکان کە ئیشیان بە سمکۆ نامێنێت، بۆ ئەوەی دەسەلات و دەوری سمکۆ کەم بکرێتەوە دوژمنایەتی کۆنی هەندێ لە سەرکردە و عەشیرەکانی کورد دژی (سمکۆ) زیندوو دەکەنەوە، یارمەتیان دەدەن و جیاجیا پەیوەندییان پێوەدەکەن و پارەو چەکیان دەدەنێ. رووسەکان دەست لە کاروباری ناو دەسەلاتی سمکۆ وەردەدەن، دەیانەوێ دەسەلاتی فەرماندەکانی سوپای رووسیا و کونسولەکانیان لە ناوچەکەدا بەسەر سمکۆدا زاڵ بێت، لە هەمووی خراپتر پیاوە ئایینیەکانی رووس لە ورمێ و ناوچەکە، خاچ پەرستانی (ئەرمەنی و ئاشووری) دژی نامەسیحییەکان هان دەدەن و شەرمەزاری بۆ دەولەتی رووسیا دروسدەکەن.کۆنسۆڵی رووسیا و فەرماندەی هێزەکانیان داوای گەڕاندنەوەی ئەم پیاوە دینیانە دەکەن، لە ئەنجامدا دەولەتی رووسیا ناچار دەبێت بیانگەڕێنێتەوە بۆ رووسیا.

سیاسەتی کاربەدەستانی رووس لە ناوچەکە دەبێتە هۆی نارەزایی خەڵك بەتایبەتی «سمکۆ» کە ئەنجامەکەی تێکهەڵچوونی کورد و سەربازەکانی سوپای رووسی بە دواوە دەبێت. بەپێی هەندێ بەڵگە کوردەکان لە ساڵی ١٩١٣دژی هێزەکانی رووسیا دەست بەشەڕی پارتیزانی دەکەن. رەفتاری ناشایست و سەرکوتکەرانەی سوپای رووس پاڵ بە هەندێ سەرکردە و سەرۆك هۆزی کوردی ناوچەکەوە دەنێن بۆ بەرەبەرەکانی و دەرکردنی سوپای رووس داوای هاوکاری و یارمەتی لە تورك و فارس بکەن.

پاش ئەوەی جێپێی هێزەکانی رووس لە ناوچەکە لەق دەبێ و مەترسی راپەڕینێکی گشتی دەکرێت، بۆ گەڕاندنەوەی متمانەی کوردەکان، رووسیا هەوڵێکی زۆر دەدا، بەلام مەسیحییەکانی ناوچە دەست لە ئاژاوەنانەوە هەڵناگرن و داوای کوردەکانیش لە کاربەدەستانی رووس بۆ راگرتنی و کۆنترۆل کردنیان، بێکەڵك دەبێت.

پێش هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم رووسیا هەوڵێکی زۆر دەدا تورکیا بەشداری شەڕ نەکات یالانیکەم بێلایەن بمێنێتەوە. هەربۆیە داواش لە سمکۆ دەکەن هیچ چالاکییەك دژی تورك نەنوێنێت، تەنانەت هەڕەشەشی لێدەکەن، لە کاتێکدا هەولی کوردەکان دژی زۆرداری

لەشکریانی رووس بە ئاژاوەی تورکیا دادەنێ و سمکۆش بەوە تاوانبار دەکەن کە پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان هەیە. لە لایەکی تر دەسەڵاتدارانی تورك چەند جار داوای تەسلیمکردنی سمکۆ و عەبدولڕەزاق و سەید تەها لە کاربەدەستانی رووس دەکەن، رووسەکانیش وەك خاوەن دەسەڵاتی ناوچەکەرەفتار دەکەن، نە دەسەڵاتی سمکۆ بە رەسمی دەناسن و نە بیروڕای دانیشتوانی کوردی خاوەن ناوچەکە لەبەرچاو دەگرن. چەکدار کردنی خاچ پەرستان و پشت پێبەستنیان و بواردان بۆ حوکومکردنی ناوچەکە بە تایبەتی پاش جەنگی جیهانی، ئەمانە هەموویان بوونە هۆی کاردانەوەیەکی نێگەتیف لەناو کوردەکان.

هەوڵدانی کورد بەتایبەتی «سمکۆ»، تێکهەڵچوون لەگەڵ رووسەکان، خۆنزیك کردنەوەیان لە نوێنەرانی رووسیا لە ناوچەکە بەتایبەتی کونسوڵ و فەرماندەکانی لەشکری رووس،لە ئەرشیڤەکانی رووسیا پارێزراون. بەڵام بەداخەوە کوردناسان، بەریز واتە بەپێی رەوتی رووداوەکان لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکردوون گەلێك جار بەناهەق کوردیان بەتایبەتی سمکۆ و عەبدولڕەزاق و سەید تەهایان بە ئانتی رووس، ئانتی مەسیحی یا هاوکاری تورکان و... تاوانبار کردووە، ئەمەش پتر بۆ پینەکردنی شکستی سیاسەتی بێبەرهەمی کاربەدەستانی رووسیایە لەمەڕ کێشەی کورد. بەڵگە، دیکۆمینت و رەوتی رووداوەکان چ پێش جەنگ و چ لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا ئەو راستییە نیشان دەدەن کە کورد دەستپێشخەری شەڕ و ئاژاوە لەگەڵ رووس و خاچ پەرستەکان نەبووە و بەرپەرچی ئەو نوسەر و کوردناسانە دەداتەوە و کە ناهەقییان بەرامبەر کورد کردووە. کورد بە هۆی ئەو زوڵم و زۆرییەی تورك و فارسی داگیرکەر بە درێژایی مێژوو لێیان کردووە، هەمیشە خوازیاری هێزێکی دەرەکی و پاڵپشتێك بووە بەتایبەتی رووسیا کە نزیك بووە لە کوردستان و بە هۆی دوژمنایەتی کۆنی رووسیا لەگەڵ دوو داگیرکەری کوردستان،تا بتوانێ خۆی رزگار بکات، بەڵام بەداخەوە ئەم ئارەزووەی نەهاتۆتە دی.

کۆنسۆڵی رووس لە سابلاخ دەنوسێت سەرەتای جەنگ کوردەکان زۆر بە هیوای رزگاری وڵاتەکەیان بوون، لە زمانی یەکێك لە بەگزادەکانی کوردەوە دەڵێ: ئەگەر وڵاتانی ئەورپایی بەشداری جەنگ بکەن هەموو کورد رادەپەڕێت و پشتیوانی لێدەکات ئومێدێکی زۆریان بە رووسیا هەیە پشتگیری کورد بکا تا دەگاتە سەربەخۆیی.

تورکان زۆربەی راپەڕینەکانی کورد بەتایبەتی پێش جەنگی جیهانی یەکەم بە ئاژاوە یا دەسکردی رووسیا دادەنێن، هاوپەیمانەکەشیان واتە ئاڵمان عەبدولڕەزاق و سمکۆ و سەید تەها بە داردەستی رووسیا دەزانن و دەڵێ:تا ئەوانە لە ئێران بە پشتیوانی رووسیا خەریکی پیلان گێڕان بن، ئارامی لە کوردستانی تورکیا نابێت.

روسەکان چ بە هۆی سیخوڕەکانیان چ بەهۆی پەیوەندیان لەگەڵ کوردەکان هەڵوێستی گشتی کوردیان بەرامبەر بە جەنگی جیهانی یەکەم زانیوە، بۆیان روون بۆتەوە کورد لەگەڵ کام بەرەی جەنگدا دەبێت. چەند بەڵگەنامەیەکی گرنگ لەم بارەوە هەیە کە تێدا هاتووە، تورکەکان بە دەستپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم داوا لە «سمکۆ» دەکەن هاوکارییان بکات و دژی رووس بجەنگێ، بەڵام سمکۆ ئامادە نابێت، ئینجا ئەوان هەندێ نەیاری «سمکۆ» هان دەدەن کە بیکوژن. یا شێخ عەبدولقادر لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بالوێزی سۆڤیەت لە ئانقەرە دەڵێ: ئەڵمانییەکان هاتوونەتە لای و پێشنیاری سی هەزار پارچە چەك و پارەیەکی زۆریان پێکردووە کە بەشداری جەنگ بکا، بەڵام قبووڵی نەکردووە و بێلایەنی خۆی دەربڕیوە، بۆ باڵوێزی رووسیاش بێلایەنی خۆی دەردەبڕێ، بەڵام رووسەکان باوەڕ بەبێلایەنی شێخ ناکەن و دەڵێن دەبێ دژی تورك و ئاڵمان بەشداری جەنگ بکەی، شێخ قادریش دەڵێ من ئامادەم، بە مەرجێك رووسیا ئۆتۆنۆمی بۆ کورد مسۆگەر بکا، دەنا پارەو چەك بۆ من بایەخی نییە.

جگە لەو راپەڕینە یەك لە دوای یەکانەی کورد دژی داگیرکەرانی تورك و فارس تا دەستپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم و لە کاتی شەڕیش بە دەستووری سوڵتانی عوسمانی زیاتر لە یەك ملیۆن کورد لە کوردستانەوە دەگوێزرێنەوە بۆ رۆژهەڵاتی تورکیا بەبیانووی ئەوەی یارمەتی رووسەکان دەدەن یا رادەپەڕن، ئەمە بەکارێکی دژی مرۆڤایەتی و بۆ کورد بە گەورەترین کارەساتەکانی جەنگی جیهانی یەکەم دەژمێردرێ، نیوەی ئەو راگوێزراوانە لە رێگایا لەبەر برسیەتی و نەخۆشی یا لە لایەن هێزە سەرکوتکەرەکانی تورکەوە دەکوژرێن. دەکرێ ئەم پاکتاو کردنە ناوی جینوسایدی لێبنێین، خۆی لە خۆیدا گەروەترین بەڵگەیە بۆ کورد کە لەو سەردەمەدا توشی چ کوێرەوەیی و ماڵ وێرانییەك بووە. لە هەمانکاتدا لە کوشتاری مەسیحی و ئەرمەن و ئاشوورییەکاندا،کورد بە هاوکاری دەوڵتی عوسمانی دادەنێن. رۆژنامەی مشاکی ئەرمەنی دەنووسێ، ناوچەکانی باشوور تا رۆژهەڵاتی وان تا دەست پێکردنی جەنگ

دانیشتوانەکەی هەشت سەد هەزار کورد بووە،بە تەواوی چۆڵکراون و سەدان گوند لەگەڵ خاك یەکسانکراوە، سەربازەکانی رووس تا چل هەزار کوژراوی کوردیان ژماردووە.گەورەترین راپەڕینی جەماوەری لە بەهاری ساڵی ١٩١٤ لە بەتلیس بە سەرۆکایەتی مەلا سەلیم بوو، عەبدولڕەزاق و بنەماڵەی بەدرخانییەکان و سمکۆ و سەید تەها سێ ساڵ خەریك بوون تا ئامادەیان کرد.

هێنانەوەی ئەم رووداوانەی پێش جەنگ و سەرەتای شەڕ وەڵامی ئەو بوختانەن کە بە کورد کراوە بەتایبەتی بە سمکۆ کە گوایە هاوکاری تورکی کردووە یا دەستی لە کوشتاری مەسیحییەکاندا هەبووە.

هێزەکانی رووسیا کە لە ١١ی ئازاری ساڵی ١٩١٥ ورمێ دەگرن و مارشمعون و ئاشووری و ئەرمەنییە هەڵهاتووەکان لە ناوچەی ورمێ چەکدار دەکەن تا پێکەوە بەرەنگاری دەستدرێژی لەشکری تورك بن، بەڵام بە کەڵك وەرگرتن لە پشتگیری و هێز و سوپای رووس بانگەشە بۆ دەسەڵاتداری ناوچەکە و تەنانەت داوای دامەزراندنی دەوڵەتیش دەکەن، کە دەبێتە هۆی نارەزایی و بەرەنگاری کورد و چەند شەڕێکی خوێناویش لە نێوانیاندا روودەدات، سەرئەنجام نێوان کورد و رووسیش لەسەر سیاسەتی چەوتی رووسەکان کە هاندەر و پشتوانی مەسیحییەکان دەبن تێکدەچێت. دوای پاشەکشە سوپای رووس لە ناوچەکە هێزە چەکدارەکانی ئاشووری و ئەرمەنی کە دەست لە دەست درێژی کردن بۆ سەر کوردان هەڵناگرن و دەیانەوێ بەسەر ناوچەکەدا حاکم بن بەرەو رووی کوردان دەبنەوە، «سمکۆ» و سەرکردەکانی کوردیش لە رێگای کونسوڵی رووس و مارشمعون هەوڵی زۆر دەدەن پەیوەندی کورد و مەسیحییەکان لە ناوچەکە ئاسایی بکەنەوە تا تورك و فارس کەڵك لە ناکۆکی کورد و مەسیحی وەرنەگرن و بێن ناوچەکە داگیربکەن و پەیوەندی کورد و رووسیش ئاڵۆزتر نەبێت. بەڵام بێ کەڵك دەبێت زۆری پێناچێت هێزەکانی رووسیا دێنە ناو شاری «خۆی» بەبیانووی پەیوەندی «سمکۆ» لەگەڵ تورکان لە ١٥ی شوبات ١٩١٥ سمکۆ دەگرن و دەینێرن بۆ تفلیس. عەبدولڕەزاقیش کە لەوێ دەبێ، بە رووسەکان رادەگەێنێ، کورد بەتایبەتی «سمکۆ» هیچ تاوانێکی نییە، فەرماندەکانی رووسیا و ئەرمەنییەکان تاوانبارن.

لە سەرەتای ئایاری ١٩١٥ رووسەکان عەبدولڕەزاق و فەرماندارى خۆی تەیمورخان و دوانزە لایەنگری عەبدولڕەزاق و هەشت لایەنگری «سمکۆ» دەگرن و دەیانبەن بۆ جولفای رووسیا، گوایا بڕیاربووە ئەگەر هێزەکانی رووسیا لە دەوروبەری دیلەمان تێشکان، ئەوانە لە پشتەوە هێرش بکەنە سەریان. رووسەکان جگە لە گرتنی سەرکردەکانی کورد دەست دەکەن بە چەك کردنی هێزەکانی کورد. ئەمەش لە سەرانسەری کوردستان دەنگ دەداتەوە و دەبێتە هۆی نارەزایی کوردان. لە هەمان کاتدا هێزی چەکداری ئەرمەن و ئاشووری بە پشتیوانی هێزەکانی رووس دەست بە گرتن و کوشتنی کوردەکان دەکەن گوایە هاوکاری تورکن و بەشداری کوشتنی مەسیحییەکانیان کردووە.

کورد و سەرکردەکانی نە تەنیا هیوایان بە رووسیا نامێنێت بەڵکو وەك داگیرکەری وڵاتەکەیان سەیری دەکەن کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ تورك و فارسی داگیرکەر جیاوازی نییە. زۆری پێناچێ عەبدولڕەزاق ئازاد دەکرێ. بەڵام گەڕانەوی بۆ شاری خۆی و ناوچەکەی، لێ قەدەغە دەکرێ، بەو مەبەستە ئازادی دەکەن بینێرن بۆ کوردستانی باکوور تا لەوێ راپەڕینی دژی تورك رێك بخا. دیارە عەبدولڕەزاقیش کە خۆی شاهیدی ئەو هەموو تاوانانەی رووس و گرتنی «سمکۆ» و هاورێیانی بووە،کاتی خۆی لە دەست تورکان هەڵدێت و دەچێ بۆ رووسیا تا پشتگیری کورد دابین بکا و لە هەموو کوردستان راپەڕینێك دژی تورك رێکخات و یارمەتی رووسیا بدات. تاوانی هاوکاری کردنی تورکی لەسەر لادەبرێت، ئەمجار بڕیار دەەن بینێرن بۆ تەفلیس وەك دەسبەسەر ماوەیەك لەوێ دەبێت، زۆری پێناچێ سەید تەهاش دەگرن و دەینێرن بۆ رووسیا و گوایا لە بەرەی شەڕدا گیراوە. لە هەلومەرجێکی ئاواچارەنووس سازی گەلی کورد کە سەرکردە و بزووتنەوەکەی بەرەو هەڵدێردەبەن و بەرەو رووی کارەساتێکی چاوەڕوان نەکراو دەبێتەوە، دیارە کورد یا دەبێتە دوژمنی رووس یا بەپێچەوانەوە.

لە لایەکی تر کورد و ئاشووری و ئەرمەن کە دەبوو دژی دوژمنێکی هاوبەش و بۆ ئامانجێکی هاوبەش واتە رزگار بوونیان، لە یەك بەرەدا بوونایە، دەکرێن بە دوژمنی یەکتر و دەیان شەڕی خوێناوی لە نێوانیاندا رودەدات. رێکخەری ئەم پیلانە کێ بوو؟ و کاربەدەستانی رووس بۆ پشتیان نەگرتن؟ و......

جگە لەو بەڵگە و دیکۆمێنتانەی کە بە جیا ئاراستەکران، دەوری کورد لە یارمەتیدانی سوپای رووس چ لە کوردستانی رۆژهەڵات و چ لە کوردستانی باکوور مەزندە ناکرێت کە بە خوێنی هەزاران رۆڵەی کورد و وێرانی کوردستان و گواستنەوەی کورد بۆ رۆژئاوایی تورکیا و تۆڵەی و بێبەزەییانەی سەربازانی تورك بە تاوانی هاوکاری سوپای رووس،تەواو دەبێت. کونسولی رووسیا نیکیتین لە ورمێ لەسەرەتای شەر لەگەڵ سوپای رووسیا باسی هاوکاری کوردەکانی دەشت و مەرگەوەر دەکات.

روسەکان کە هەست بە مەترسی راپەرینی کوردەکانی ناوچە دەکەن بەتایبەتی ئەگەر هێزەکانی رووسیا و تورکیا لە ناوچەکە بەرەو رووی یەکترببنەوە ئەوا بێگومان کوردەکان پشتی لەشکری تورك دەگرن، بڕیار دەدەن «سمکۆ» ئازاد بکەن. لە سەرەتای نیسانی ١٩١٦ «سمکۆ» لە تفلیس ئازاد دەکەن و دەیهێننەوە سەڵماس، ئینجا لەگەڵ دەوڵەتی ئێران سەبارەت بە رەسمی ناسینی دەسەڵاتی «سمکۆ» دەکەونە وتووێژ، هەردوولا دەزانن تاکە هێزێك کە بتوانێ پێش بە دەستدرێژی سوپایی تورکیا بگرێت سمکۆیە، یا ئەگەر سمکۆو خەڵکی ناوچەکەیان لەگەڵ نەبێت ناتوانن سنوورەکانی ئێران و تورکیا بپارێزن.

کەچی دوای ئازادکردنی سمکۆش کاربەدەستانی سوپای رووس دەست لە دژایەتی سمکۆ هەڵناگرن، بەتایبەت جەنراڵ چیرنەزوبۆڤ فەرماندەی هێزەکانی رووسیا لە ئێران. بۆیە سمکۆ داوا لە حاکمی قەفقاز دەکات پێش بە ملهوڕی ژەنراڵ جیرنە زۆبۆڤ بگرن تا واز لە کردەوەی دوژمنانە بێنێ. چیرنەزوبۆڤ هیچ متمانەیەکی بە سمکۆ نابێت،بەو بیانوەی سەر بە تورکیایەو نایەوێ مرۆڤێکی ئاوالە پشتەوەی هێزەکانی رووسیا بێت. داوا دەکات سمکۆ چەکەکانی تەسلیم کات. لەلایەکی تر داوا لە سمکۆ دەکەن لیستی تەواوی چەکدارەکانی خۆی بداتە کاربەدەستانی رووس و کارتی تایبەتیان پێببێت، بە کورتی رووسەکان دەیانەوێ سمکۆ کۆنترۆڵ بکەن و لە ژێر دەستیاندا بێت، بۆیە هەردەم بیانوییەکی پێ دەگرن، سمکۆش ئامادە نابێت داخوازەکانیان جیبەجێ بکات،تەنانەت کۆنسۆڵی رووسیاش نیکیتین دژی دەسەڵاتدارێتی سمکۆ لە ناوچەکە دەوەستێ،بەو بیانوەی لە کاتی خۆیدا هێرشی کردۆتە سەر هێزەکانی رووسیا لە ورمێ و هەبوونی مرۆڤێکی ئاوا لە پشتەوەی بەرەی لەشکری رووسیا مەترسییەکی گەورەیە. دەڵێت کە

نابێ بە هیچ شێوەیەك باوەڕ بە سمکۆ بکرێت و لەمێژە مـن سمکـۆم تاقیکردۆتـەوە هـەر بۆیـە پێویستە مەرجەکانی خۆمان بەسەر سمکۆدا بسەپێنین.

سمکۆ بۆ ئەوەی ئەو تاوانە پوچەڵ بکاتەوە کە ئاشووری و ئەرمەنییەکان دابوویانە پـاڵی گوایـا پەیوەندی بە تورکیایەوە هەیە،لەگەڵ هێزەکانی رووسیا سەرکەوتوانە پێش بە هێرش تـەمووز و ئابی ساڵی ١٩١٦ی تورکان دەگرێ. بەڵگە و دیکومینتـەکانی رووسـیا ئـەم راسـتیە نیـشان دەدەن. جگە لەو بەڵگانەی بە جیا بڵاومان کردنەوە،لەم پەرتوکەدا هاتووە کە سمکۆ گەلێك جار یارمەتی سوپای رووسیای داوە و لە ئابلووقەی لەشکری تورك رزگاری کردووە.

جگە لەوە بەپێی سەرچاوەکانی رووسـیا لـە ١٤ هـەزار چـەکداری هێـزی تـورك لـە دەرەوەی هەمەدان دە هەزاریان کورد بووە،کاتێك لەریزی پێشەوەی سـوپای تـورك چـاودێری هێزەکـانی رووسیا دەبـن سـوپای تـورك بـەجێ دەهـێڵن. دوای جـەنگی جیهـانی یەکـەم و هەڵوەشـانی ئیمپراتوری عوسمانی پیلانەکانی تورك لەگـەڵ هاوپەیمانـەکانی تێکدەچـێ. بـە هـۆی شۆڕشـی ئۆکتوبەری ١٩١٧ زۆربەی هێزەکان رووسیا لـە ئێـران دەکـشێننەوە و ژمارەیـەکیش کـە دژی رژێمی نوێی و وەفادار بە قەیسەر، بەو هیوایە لە ئێران دەمێننەوە کـە بـە یارمـەتی وڵاتـانی هاوپەیمانی پێشووی رووسیا رژێمیبەلشەفیکی رووسیا لەناو بەرن. بەڵام سەرکەوتوو نابن و لـە خزمەتی سوپای ئێراندا دەمێننەوە. ئێرانیش لە شەڕ دژی سمکۆ کەڵکیان لێوەردەگرێت. ئەوانە درێژە بە سیاسەتی دژی کـوردی خۆیـان دەدەن، بەتایبـەتی ژەنـراڵ فیلیپـۆڤ کـە فەرمانـدەی قەزاقەکانی ئێران و ژمارەیەك لە هێزە بەجێ ماوەکانی رووس دەبێـت، هێـرش دەکاتـە سـەر سمکۆ، سمکۆش پاشەکشە دەکات بۆناو خاکی کوردستانی باکوور.زۆری پێناچێ سمکۆ هێزێکـی نوێ کۆدەکاتەوە و ناوچەکە دەخاتەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆی.

سمکۆ لە ماوەی ژیانی پڕ لە شانازی خۆی چەند جار لە لایەن کاربەدەستانی ئێـران و تورکـەوە پیلانی کوشتنی دارێژراوە، هـەموو جـارێ کـەس و کـاری نزیکـی خـۆی و بنەماڵەکـەی لـە دەستدەدات.

## داخوازییەکانی سمکۆ و سەید تەها بۆ راپەڕینکی گشتی لە کوردستان

سـەربەخۆیی رۆژهـەلات و بـاکووری کوردسـتان ئاراسـتەی کاربەدەسـتانی ئینگلیـز و چـەند گەلالەیەك پێشنیار دەکرێت لەوانە: یا دەوڵەتی بەریتانیا پێکهێنـانی دەولـەتێکی سـەربەخۆی کوردستانی رۆژهەلات و بـاکوور پەسـەند بکـات یـا بخرێتـە ژێـر کـۆنترۆلی ئینگلیـز یـا لـە کوردستانی ئێران سەربەخۆیی کوردستان رابگەیندرێت، ئەگەر ئەم پێشنیارەش پەسەند نـەکرا، با کوردستانی رۆژهەلات بخرێتە سەر کوردستانی باشوور کە ئەو دەم لـە ژێـر دەسـەلاتی شـێخ مەحموود و چاودێری ئینگلیزەکاندا بوو. کاربەدەستانی ئینلگیزیش خەریکی تاوتوێکردنی ئـەم پێشنیار و گەلالانە دەبن، بەلام تێکچوونی پەیوەندییان لەگەلٚ شێخ مەحموود، پەیمانی دۆستی و هاوکاری نێوان شـێخ مـەحموود و کەمالییـەکان، پەیوەنـدی شـێخ وبەلـشەفیکەکان، رووداوی چاوەڕوان نەکراوی تر وەك پاشەکشێی تورك و فـارس بەرامبـەر بـە ئینگلیـز، ئـەو کۆسـپ و تەگەرانەی لە ئەنجامی تێکچوونی پەیوەندی کـورد و مەسـیحی هاتوونـە ئـاراوە، خـۆ نزیـك کردنەوەی فەرەنسا و ئیتالیا وەك هاوپەیمانی ئینگلیز لە کەمالییەکان و گەلێك هۆی تر، دەبنە هۆی ئەوەی هیچ کام لەم پڕۆژانە بڕیاریان لەسەر نەدرێت.

تەنانەت سەید تەها،مەترسی بەلـشەویزم و تەنینـەوەی بـۆ رۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت، بـەرەنگار بوونـەوەی بـە هـۆی دامەزرانـدنی دەولـەتێکی کـوردی لـە نێـوان رووسـیای سـۆڤیەتی و کەمالییەکان، نزیك بوونەوەیبەلشەفیك و کەمالییەکان، وەك مەترسییەك بۆ گەلانی ناوچەکە بە کاربەدەستانی ئینگلیز رادەگەیێنێت.

سمکۆ کە لە سالٚی ١٩١٩ ورمێ و شاپور و سەلٚماس و خۆی و قوتور و مـاکۆی لـە ژێـر دەسـدا دەبێت، و دەولٚەتی ئێرانیش تەواوی هێزەکانی خۆی دەنێرێتە سـەری، پـاش چـەند هێـرش ناکـام دەبێ. بزووتنەوە و دەسەلاتی سمکۆ تا سـەرەتای ١٩٢١ دەگاتـە ترۆپکـی خـۆی، زۆری پێناچـێ عەشیرەکانی سابلاخ و مامەش و مەنگوڕ و دیبوکری و پیران و زەرزا، گەورگ و فـەیزوللا بـەگی بانە دەچنە ریزی شۆڕشی سمکۆ، ئـەمجارە سمکـۆ سـابلاخ دەکاتـە ناوەنـدی سـەرکردایەتی خـۆی میاندوابیش دەگرێ. هێزەکانی ئێرانیش بە سەرۆکایەتی ژەنـرالٚ جـەهانبانی دوای چـەند هێـرش تێکدەشکێن و لە حالەتی هێـرش کردنـەوە دەکەونـە بـەرگری و زیـانێکی زۆریـان لێدەکـەوێت. سەرئەنجام دەولٚەتی ئێران لە نیوەی یەکەمی سالٚی ١٩٢٢ ناچار دەبێ وتوویژ لەگەلٚ سمکۆ بکات، بە گوێرەی هێندێك سەرچاوە ئامادە دەبێ ئۆتۆنۆمی بدا بە کوردان. لەو ماوەیەدا سمکۆ هێزێکـی

زۆر کۆدەکاتەوە، شاند و نوێنەری خۆی دەنێرێتە ناوچەکانی سنە و هەورامان و کرماشان و لورستان و بەختیاری و..... ئەوانیش ئامادەیی خۆیان بۆ پشتگیری سمکۆ و شۆڕشێکی سەرتاسەری دەردەبڕن.

لە مانگی ئازاری ١٩٢٢ عەشایرەکانی لوڕ و بەختیاری بە سەرکردایەتی والی لۆرستان ناوچەکانی خۆیان تا نزیك هەمەدان ئازاد دەکەن، زۆری پێناچێ هەمەدانیش دەکەوێتە ژێر دەستیان لە باکووریش تەورێز دەکەوێتە مەترسی. دەوڵەتی ئێران پێشنیاری راوەستانی شەڕ و گۆڕینەوەی دیل و زیندانییەکان دەکا، سمکۆش ئامادە دەبێت. لە ماوەی وەستانەکەدا دەوڵەتی ئێران و تورکیا بەنهێنی بۆ لێدانی سمکۆ پێکدێن و لە دوو لاوە هێرش دەکەنە سەری، سمکۆ دەشکێت و پەنا بۆ کوردستانی باشوور دەبات. دەوڵەتی ئێران چەند جار داوا لە ئینگلیزەکان دەکا سمکۆیان تەحویل داتەوە، بەلام ئینگلیزەکان قبووڵ ناکەن و دەڵێن کە سمکۆ لە ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی ئێمە نییە.

دوای تێکچوونی مەلیکایەتی شێخ مەحموود جێ پێی سمکۆ لێژ دەبێ و شۆڕشی کورد لە هەردوو پارچەی کوردستان شکست دێنێ. ئەمجارە سمکۆ داوا لە ئینگلیز دەکات بکەوێتە نێوبژیکردنی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران و گەرانتی پاراستنی ژیانی بکرێت. ئەوانیش ئەم داخوازییەی سمکۆ جێبەجێ دەکەن و دەوڵەتی ئێران لە ساڵی ١٩٢٤ بەخشیننامەی بۆ دەنێرێ و سمکۆش دەگەڕێتەوە چاریق.

بەلام ئارام ناگرێت و بەنهێنی خۆی بۆ شۆڕشێکی تر ئامادە دەکات. سمکۆ لە ئەیلولی١٩٢٤ نزیك ورمێ دەیلەمان لە هێزەکانی ئێران پاك دەکاتەوە و بە نیازی ئازادکردنی شارەکانی تر بەتایبەتی ورمێ دەبێ، بەلام دەوڵەتی ئێران هێزێکی زۆر دەنێرێتە سەری و سمکۆ ناچار دەبێ پاشەکشە بکا بۆ کوردستانی باکورو لەوێش هێزەکانی تورکیا گەمارۆی دەدەن و هێزەکانی چەك دەکەن. سمکۆ تا ساڵی ١٩٢٨ لە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی دەوڵەتی تورکدا دەبێت لەسەر داخوازی دەوڵەتی ئێران تورکەکان داوا لە سمکۆ دەکەن بێتە مالاتیا یا ئەرزەڕۆم، سمکۆ ئامادە نابێت و لە ژێرەوە داوای لێبوردن لە دەوڵەتی ئێران دەکات کە بواری بدەن بگەڕێتەوە ئێران و لە سۆما و برادۆست بژیت، ئێران دەڵێ بەو مەرجە ئامادەیە بواری سمکۆ بدات بگەڕێتەوە کە یا لە تاران یا لە تەورێز دابنیشێت. سمکۆ ئامادە نابێت و بڕیاری هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش دەدات.

سەرئەنجام لە ١٢ای تەموزی ١٩٣٠ سمکۆ بە دوو سەد چەکدارەوە دێتە شنۆ و دەوڵەتی ئێران بەڵێنی پێدەدات کە ژیانی بپارێزێت و ماڵ و سامانەکەشی بداتەوە. گوایە کاربەدەستانی بەرزی ئێران پێشنیار بە سمکۆ دەکەن بۆ وتووێژ بچێتە تەورێز. بەپێی هەندێ سەرچاوە ئەم وتووێژە بە دەستووری رەزا شا رێك دەخرێت، رەزا شا داوای سەری سمکۆ دەکا بە زیندوویی یا مردویی. پاش ئەوەی کە سمکۆ ئامادە نابێت بچێتە تەورێز، ناجوامێرانە تەقەی لێدەکەن وبۆ ترساندنی خەڵك لاشەکەی بە ماشێنەوە دەبەستن و بەناو شاری شنۆ و ورمێدا رایدەکێشن. بەم چەشنە ژیانی ئەو پاڵەوانە کوردە کۆتایی دێت.

## شێخ عەبدوسەلامی بارزانی

لە کۆتایی ساڵی ١٩٠٩ و سەرەتایی ساڵی ١٩١٠ دژی دەسەڵاتدارانی عوسمانی رادەپەڕێ، تورکەکان بۆ سەرکوت کردنی شۆڕشەکەی هێزێکی زۆر دەنێرنە سەری، بەڵام هێزەکە تێکدەشکێ و راپەڕینەکە تا دەڤەری موسڵ پەرە دەستێنێ.

راپەڕینەکەی شێخ هاوکات بوو لەگەڵ: راپەڕینی کوردەکانی بایەزید و ناوچەکانی دەوروپشتی بە سەرۆکایەتی حسێن پاشا و عەبدولقادر، راپەڕینی بەتلیس بە سەرۆکایەتی موسا بەگ و سەلیم ئاغا. لە ساڵی ١٩١٤ راپەڕینەکەی شێخ عەبدوسەلام توشی شکست دەبێت و شێخ دێتە ناوچەی ورمێ و ماوەیەك لەوێ بەنهێنی ژیان دەباتە سەر و لە ژێر چاودێری و ئاگاداری سمایل ئاغای شکاك و سەید تەها دەبێت هەر لەو ماوەیەدا لە ورمێ پەیوەندی بە کونسولی رووسیاوە دەکا بۆ داوای یارمەتی و پشتگیری دەوڵەتی رووسیا بۆ راپەڕین دژی تورکیا. سەرئەنجام شێخ بە مەبەستی چاوپێکەوتن لەگەڵ کاربەدەستانی بەرزی رووس دەچێتە رووسیا و لە تەفلیس چاوی بە حاکمی قەفقاز دەکەوێت رۆیشتنی شێخ بۆ رووسیا دەبێتە هۆی پەرۆشی کاربەدەستانی تورك و رەخنەو پرۆتیستی خۆیان لەم بارەوە ئاراستەی دەوڵەتی رووسیا دەکەن. کاربەدەستانی رووسیاش بەڵێن بە تورکەکان دەدەن کە هیچ یارمەتی و پشتگیرییەکی شێخ نەکەن و بۆ ئەم مەبەستەش شێخ دەنێرن بۆ نەخچەوان و دەیخەنە ژێر چاودێری، پاشان دەیگوازنەوە و پێی دەڵێن نابێ بەهیچ شێوەیەك دژی تورك بجولێتەوە.

هێشتا جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێنەکردبوو کە شێخ جارێکی تر داوای یارمەتی لە دەوڵەتی رووسیا دەکا و ئاگاداریان دەکاتەوە کە وەڵامەکەی پەسەند بکرێ یا نەکرێ

دەگەڕێتەوە کوردستان، بەڵام پیتربۆرگ لە وەڵامی حاکمی قەفقازدا دەڵێ دەوڵەتی رووسیا دژی هەر چەشنە یارمەتیدان و راپەڕینێکی شێخە دژی تورکیا، جگە لەوەش فەرمان دەدەن بە حاکمی قەفقاز کە نابێ بواری گەڕانەوەی شێخ عەبدوسەلام بدەن بۆ کوردستان، مانگانە سەد و پەنجا رۆبلی بۆ بنێرنەوە با لە تەفلیس لە ژێر چاودێری و کۆنترۆلتان بێت. شێخ عەبدولسەلام کە دەزانێ رووسیا ئامادە نییە یارمەتی کورد بدا داوای گەڕانەوە دەکا بۆ کوردستان، بواری پێدەدەن بگەڕێتەوە و لە ناوچەی ورمێ لە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی کۆنسوڵخانەی رووسیا بێت و بەبێ مۆڵەتی ئەوان نەجوڵێتەوە، تەنانەت پێی دەڵێن نابێ بگەڕێتەوە بۆ شەمدینان و رەواندز و ناوچەی بارزان، ئەگەر دژی تورکیا بجووڵێتەوە، رووسیا هیچ هاوکاری و پشتیوانێکی نهێنی شێخ ناکات. لە فەرمانێکی دەوڵەتی رووسیا بۆ کونسوڵەکەیان هاتووە کە بە شێخ عەبدوسەلام بڵێن بەبێ ئیشارە و ئاگاداری ئێمە دژی تورکیا هیچ جموجوڵێك نەکات، لە هەمان کاتدا دەڵێن ئەگەر نێوان ئێمە و تورکیا تێکچوو دەتوانین کەڵك لە شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و کوردەکانی تر وەربگرین. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩١٤ شێخ بەشێوەیەکی نەزانراو و نهێنی کە بۆ ئێمەش روون نییە لە ناوچەیەکی سەر سنووری دەستکردی عوسمانی و ئێران دەڕفێندرێ و تەسلیمی کاربەدەستانی تورك دەکرێت، لە ساڵی ١٩١٤ لە موسڵ لەگەڵ چوار نەفەر لە هاوڕێیانی لە سێدارە دەدرێن.

بە دەست پێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم، گەلی کورد یەکێك لە سەرکردە گەورەکانی خۆی کە دەیتوانی دەورێکی گەورە لە چارەنووسی گەلی کورددا ببینێت لە دەستدا، رووسەکانیش لەکاتی جەنگدا تێگەیشتن بە کوژرانی شێخ عەبدوسەلامی بارزانی کە هیچ یارمەتییەکییان نەدا، چ پاڵپشتێکیان لە دەستداوە.

## عەبدولڕەزاق بەدرخان

ناوبراو کە ماوەیەك سکرتێری سەفارەتخانەی تورکیای عوسمانی لە پیتربرۆگ بووە و ماوەیەکیش سەرۆکی تشریفاتی دەرباری عوسمانی بووە، پەیوەندی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی رووسیا نە پچڕاندووە بەو هیوایەی رووسیا پشتگیری خەباتی رەوای کورد و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بکات. ئامادەیی خۆی و بنەماڵەکەی بە هاوکاریکردن و دۆستایەتی رووسیا دەردەبڕێت

و زۆرجار بەنهێنی چاوی بە وەزیری کاروباری دەرەوەی رووسیا و حاکمی قەفقاز کەوتووە، لە کونسولخانە و سەفارەتەکانی رووسیا بووە لە ئێران و تورکیای عوسمانی.

لە سالی ١٩٠٦ سەرۆکی شارەوانی ئەستانبۆل رزوان پاشا بەنهێنی و نەزانراوی دەکوژرێ و تاوانەکەی دەخەنە ئەستۆی عەبدولرەزاق و دەبێتە بیانوویەك بۆ گرتنی ناوبراو و ژمارەییەکی زۆر لە بنەمالەکەی و کەسایەتی تری کورد. پاشان دووردەخرێتەوە. عەبدولرەزاق و عەلی شامیل پاشا دەنێردرێن بۆ تریپولی و لەوێ زیندانی دەکرێن، بە هاتنە سەرکاری تورکە گەنجەکان و دەوری کوردەکان عەبدولرەزاق ئازاد دەکرێت و سەر لە نوێ دەست بە چالاکی دەکاتەوە. لە ١٩١٠ داوای پەنابەری لە رووسیا دەکات، بەلام دەسەلاتدارانی ئەو دەمەی رووسی دژی پەنابەری و مانەوەی عەبدولرەزاق دەبن. لە سالی ١٩١١ دەچێتە ماکۆ و لەوێشەوە بۆ قوتور و لەگەل کەسایەتییەکانی کورد پەیوەندی دەگرێ و بۆ راپەرینێکی گشتی لە کوردستانی باکوور بە پشتیوانی و یارمەتی رووسیا گەلالەیەك ئاراستەی کۆبوونەوەی سەرۆك و کەسایەتییەکانی کورد دەکاو دەلێ پێویستە مەسیحییەکانیش بەشداری راپەرینەکە بکەن و لانی کەم ئەگەر بەشداریش نەکەن پەیوەندییەکی دۆستانە و ئاشتیانەیان لەگەلدا ببەسترێ و راپەرینەکە لە کوردستانی عوسمانی بێت و دژی ئێران هیچ چالاکییەك نەکرێت.

عەبدولرەزاق لە ئازاری ١٩١١لە وان پەیوەندی بە کۆنسولی رووسیاوە دەکاو دەلێ: ئێمە ئامادەی راپەرینین و ئەگەر یارمەتیمان بدەن ئامادەین وان بگرین و سەرباز و چەکدارە کوردەکانی ناو سوپای تورکیاش کە ژمارەیان یەکجار زۆرە ئامادەن بێنە ریزی شۆرش.

پاش داگیرکردنی ناوچەکە لە لایەن سوپای تورکەوە دەولەتی تورکیا داوا لە کونسولی خۆی لە ورمێ دەکات کە عەبدولرەزاق بگرن و تەسلیمی بکەنەوە، یاخود بیکوژن. عەبدولرەزاق ناچار پەنا دەباتە بەر کونسولخانەی رووس لە ورمێ.

دەولەتی رووسیاش لە پیتربرۆگ داوایەکەی عەبدولرەزاق بە پیلان دەزانن، سەفارەت و کۆنسولخانەکانیان لە ئێران و تورکیا ئاگادار دەکەنەوە کە ئێمە شکمان لە عەبدولرەزاق هەیە و دوو دلین لەوەی کە خۆی بە دۆستی ئێمە دادەنێت. پەیوەندیتان پێوە هەبێت، بەلام دەبێ زۆر ئاگادار و دوورە پەرێزبن. عەبدولرەزاق لە ورمێوە بەنهێنی دەنێرنە تەورێز و لەوێشەوە بۆ یریڤان.

ناوبراو دەیەوێ لەوێ گۆڤارێك دەربكات و بیروباوەڕی سەربەخۆی كوردستانی تێدا بڵاو بكاتەوە. لەوێ پشتگیری لێناكرێت و سەردانی پاریس دەكات و لەگەڵ كوڕی حسێن پاشا و عەبدولقادر كە ئەو دەم لەوێ گۆڤاری مەشروتییەتیان دەردەكرد، بۆ پلانێكی هاوبەش پەیوەندییان پێوە دەكات. كاربەدەستانی رووس زۆر هەوڵ دەدەن عەبدولڕەزاق لە پاریس نەگەڕێتەوە تا بە قسەی خۆیان كێشەیان لەگەڵ توركەكان بۆ دروست نەبێت.

بەڵام عەبدولڕەزاق دەیەوێ بگەڕێتەوە كوردستان لانی كەم لە رووسیا یا لە ئێران بێت كە لە كوردستان نزیكە. سەرئەنجام دەگەڕێتەوە بۆ یریڤان و كاربەدەستانی رووس لەوێ دەستووری پێئەدەن هیچ چالاكییەكی سیاسی نەنوێنێ.

روسەكان پشتیوانی پلانی هاوبەشی عەبدولڕەزاق و شێخ عەبدولقادری كوڕ حسێن پاشا بۆ سەربەخۆیی كوردستان ناكەن.

دەسەڵاتدارانی تورك كە پێشتر لەروسیا وئێران هەوڵی كوشتن و گرتن و تەسلیم كردنەوەی عەبدولڕەزاق و سەید تەها و جەودەت بەگیان دەدا، كە بۆیان ناچێتە سەر ئەم جارە بە ناردنی نامە و شاند، داوای لێبوردنیان لێدەكەن. عەبدولڕەزاقیش دەكەوێتە وتووێژ لەگەڵ توركە گەنجەكان و بەدانانی چەند مەرجێك ئامادە دەبێت بگەڕێتەوە.

١- بە رەسمی ناسینی گەلی كورد.

٢- كردنەوەی قوتابخانە بە زمانی كوردی لە كوردستان.

٣- گەڕاندنەوەی سەروەت وسامانی بنەماڵەكەیان كە لە لایەن حكوومەتی توركەوە دەستی بەسەر داگیراوە.

٤- كردنی بە سیناتۆری پەرلەمانی توركیا.

٥- دانی پۆستی ئیداری بە بنەماڵە و خزمەكانی لە داموودەزگاكانی دەوڵەت.

بەڵام ئەم داخوازیانە لە لایەن دەوڵەتی توركەوە پەسەند ناكرێن. لە نیوەی دووهەمی ساڵی ١٩١٣ و سەرەتای ساڵی ١٩١٤ راپەڕینی كوردەكان پەرەدەستێنێ و شەریف پاشا لە پاریس خواستەكانی كورد لە رۆژنامەی مەشروتییەت بڵاو دەكاتەوە. بەهاری ١٩١٤ راپەڕینی بەتلیس لە لایەن عەبدولڕەزاق و بەهاوكاری كامیل بەگ و سەید تەها و سمكۆ رێك دەخرێت، گوایا بە پشتیوانی دەوڵەتی رووسیایە، بەڵام هەروەك لە بەڵگەكاندا هاتووە رووسەكان ئەو چەك و

پێداویسیانەیان پێنادەن کە پێشتر بەڵێنیان دابوو. لەبەر کێشە و کۆسپ دروستکردنی ئەرمەنەکان ئەم ڕاپەڕینەش سەرناگرێت.

عەبدولڕەزاق لە ساڵی ١٩١٤ جارێکیتر دەگەڕێتەوە ڕووسیا لە پیتربۆرگ لەگەڵ کاربەدەستانی بەرزی ڕووسیا لەسەر جێبەجێ نەکردنی بەڵێنەکان، هەروەها ئەوگرفتانەی هاتوونەتە سەر ڕێ، وتووێژ دەکات، بەو هیوایەی ئەم جارەیان ڕاپەڕینەکە بە ڕێکوپێکی و یارمەتی دراوی و چەکی ڕووسیا سەرکەوتن بە دەستبێنێت.کەچی پێیڕادەگەیەنن خۆ لە تێکهەڵچوون لەگەڵ تورکیا بپارێزێت، پێشنیاری پێدەکەن بچێتە تەورێز و لەوێ لە ژێر چاودێری کۆنسوڵی ڕووسیا و حاکمی تەورێز کە دۆستی ڕووسیا دەبێت بژیت. ڕووسەکان لەو دەمەدا هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد بە تێکدانی ئەو بەڵێنانە دادەنێن کە تورکیا بە مەسیحییەکانی کوردستانی باکووری دابوو. هەندێ لە دبلوماسییەکانی ڕووسیا ڕاپەڕینەکانی کورد بە دەستکردی کاربەدەستانی تورك دەزانن تا تورکیا هیچ مافێك نەدا بە مەسیحییەکان.

سەرەڕای هاوکاری نەکردنی بزووتنەوەی کورد بەڵگە و سەرچاوەکانی ڕووس باسی ڕێکخستنی دەستەی چەکداری کورد لە لایەن عەبدولڕەزاقەوە دەکەن کە لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەکەم زۆر هاوکاری سوپای ڕووسیان کردووە بە سەرۆکایەتی ژەنراڵ چیرنەزوپۆڤ.دوای پاشەکشەی هێزەکانی ڕووس زۆری پێناچێ دەگەڕێنەوە بۆ ناوچەی ورمێ، گوایە لە دیسامبری ١٩١٤ کوردەکان بە سەرۆکایەتی سمکۆ و سەید تەها و عەبدولڕەزاق هاوکاری تورکیایان کردووە، سمکۆ و سەید تەها و عەبدولڕەزاقیش دەگرن و دەیانبەن بۆ ناو خاکی ڕووسیا و چەکدارەکانی کوردیش چەك دەکەن. شازادە شاخۆڤسکی بەرپرسی دەوڵەتی ڕووسیا بۆ کاروباری کوردستان زۆر هەوڵدەدا ئەو شك و گومانە بڕەوێنێتەوە کە ناحەز و دوژمنانی کورد لە لای کاربەدەستانی نیزامی بۆیان دروستکردوون، بەتایبەتی لای حاکمی قەفقاز و نیکیتین کونسوڵی ڕووسیا لە ورمێ کە دەورێکی زۆرخراپی لە پەیوەندی کورد و ڕووس دا گێڕاوە. سەرەتا سەرکەوتوو نابێت بەڵام کە بەرەی قەفقاز دەکەوێتە مەترسی، ڕووسەکان پێشبنی هاوکاری کورد و سوپای تورك دەکەن، بۆ بەرگری لەم ڕووداوە عەبدولڕەزاق و پاشان سمکۆ ئازاد دەکەن و دەیانگەڕێننەوە کوردستان. (تراژیدیای سەرکردە و کەسایەتییەکانی کورد کە پەیوەندییان بە ڕووسیاوە هەبووە یەك لە یەك خەماوی ترە و لێکۆڵینەوەی دوور و درێژیان گەرەکە،بەتایبەتی: سمکۆ، عەبدولڕەزاق،سەید تەها، کامیل بەگ، خالید بەگ، زیا بەگ و شێخ مەحموود......).

## ڤارەنتسۆڤ داشكۆڤ ١٨٣٧-١٩١٦

یەکێك لە کەسایەتییە دەوڵەتییەکانی رووسیا ژەنراڵ لیتینانت دۆستێکی نزیکی ئەلیکساندەری سێهەم لە نێوان ١٨٨١-١٨٩٧ وەزیری دەرباری (قەیسەر) و کارە تایبەتییەکانی ئیمپراتۆری رووسیا بووە. لە ساڵی ١٨٩٧ ئەندامی شوورای دەوڵەتی رووسیا و لە نێوان ١٩٠٥-١٩١٥ حاکمی قەفقاز بووە. یەکێك بووە لە رێکخەرانی زەڤیشەڤەنیا (واتە گرووپی تیرۆر) کە هێزێکی نیهێنی سەر بە دەربار و ئەرِیستوکراتی رووسیای قەیسەری بووە. ئەم هێزە وەك دەزگایەکی پۆلیس بۆ سەرکوتکردنی هێزی بەرهەڵستکار و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانی رووسیا کاری کردووە. ئەرمەنییەکانی قەفقاز دەستێکی باڵایان لەم دەزگا پۆلیسیەدا هەبووە.

کوردەکان پەیوەندیان بەم حاکمەوە زۆر بووە کە نزیکەی دە ساڵ لە قەفقاز حاکم بووە، زۆرجار نوێنەرانی کورد هاتونەتە لای یا نامەیان بۆ نووسیوە. لەوانە کۆر حسێن پاشا کە بە ئیمزا و ناوی سەرکردەکانی کوردەوە ئامادەیی خۆی دەربڕیوە کە گەلی کورد و کوردستان ئامادەیە بکەوێتە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی رووسیا و ببێتە هاوڵاتی ئەوێ.

کۆر حسێن پاشا چەند جار دژی تورك سەرکردایەتی راپەڕینی کوردی کردووە. بەڵگەنامە و سەرچاوەکانی رووسیا بەتایبەتی لەو سەردەمەدا ئەو راستییە دەردەخەن کە ڤارنتسۆڤ نەك هەر هەڵوێستی بەرامبەر کورد باش نەبووە بەڵکو دژی کورد و یارمەتی دەوڵەتەکەی بووە بۆ کورد. لایەنگری ئاسایی بوونی پەیوەندی نێوان رووسیا و تورکیا بووە. بە پێشنیاری ئەو، کونسوڵخانەی رووسیا لە سابلاخ دەکرێتەوە تا بۆ بەرژەوەندی رووسیا کوردەکان بۆ لای خۆی راکێشێ.ناوبراو پێشنیار دەکا دەوڵەتەکەی لە کۆنفرانسی بەرلین پاراستنی ئەرمەنییەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە دەست درێژی کوردەکان، مسۆگەر بکات.

کۆشتاری کوردەکانی ورمێ و سابلاخ و......لە لایەن سوپایی رووسیا لە ساڵی ١٩١٤بە فەرمانی ناوبراو بووە. شائۆمیان س. گ کە خۆیی بەرەگەز ئەرمەنییە دەڵێ: سیاسەتی ڤارەنستۆڤ داشکۆڤ لە لایەن بورژوازی ئەرمەنی و داشناکەکانەوە دیاری دەکرا.جگە لەوە وەك لە بەڵگەکاندا هاتووە ڤارەنستۆڤ کە پیرە پیاوێك بووە بە هۆی ئەوەی کیژۆڵەیەکی ئەرمەنی دەبێتە ژنی بە ئاشکرا لایەنگری ئەرمەنییەکان دەکا.ناوبراو دەورێکی نێگەتیڤانەی بینیوە لە دارِشتنی سیاسەتی دەوڵەتی رووسیا بەرامبەر بەکورد.

## سەید تەها

نەوەی شێخ عوبێدولاّی نەهرییە ناوبراو دەورێکی بەرچاوی لە راپەرینەکانی ساڵی ١٩١٠ و ١٩١٣ و ١٩١٤ی کورددا گێڕاوە، هەوڵێکی زۆری داوە بۆ تەبایی و ئاشتی نێوان کورد و مەسیحییەکانی کوردستان بەتایبەتی ئەرمەنییەکانی، دڵنیایان دەکات کە بزووتنەوەی کورد لە بەرژەوەندی ئەوانیش دایە. کە ژیانی لە لایەن دەسەلاّتدارانی تورکەوە دەکەوێتە مەترسییەوە ماوەیەك دەبێتە پەنابەری رووسیا و لە شاری نۆڤەرەسیك دادەنیشێت. گوایا شێخ عەبدولسەلامی بارزانی لە رێگای سەید تەهاوە پەیوەندی بە رووسەکانەوە کردووە، کە رووسەکان ئیشیان پێدەبێت دەیگەرێننەوە ناوچەی ورمێ.

مینورسکی دبلوماس و کوردناسی رووس پێش جەنگی جیهانی یەکەم کە لە نێوان تاران و ئەستانبۆڵ لە هاتوچۆ دادەبێت، لە سەرداخوازی ئەو دەوڵەتانە بە کونسوڵ و فەرمانبەرە نیزامییەکانی خۆیان پێشنیار دەکات کە بوار بە سەید تەها و عەبدولڕەزاق بدەن ئاژاوە لەسەر سنوورەکانی فارس و تورك بگێڕن و ناوچەکە نائارام بکەن کە لەوانەیە وەك ئاژاوەکەی شێخ عوبێدولاّی نەهریی دەست بە کوشتن و تالاّن کردنی خەڵك لە ناوچەکە بکەن، چونکە هەبوونی ئەوان لە ناوچەکە بۆتە هۆی پرۆتیستی تاران و ئەنقەرە لە رووسیا.

کونسوڵی رووسیاش لە تەورێز کاربەدەستانی خۆیان لە پەیوەندی نهێنی سەید تەها و تورکەکان ئاگادار دەکاتەوە،بەم شێوەیە تاوانێکی نارەوا دەداتە پاڵ سەید تەها. دەستوور دەدا چاودێری بن و هەوڵدەدا کەسایەتی ناوبراو لەناو کوردەکاندا لاواز بکا و نەیارێکی بۆ بدۆزێتەوە. سەرئەنجام دەرکردنی لەناوچەکە بە ئەستۆی کاربەدەستانی لەشکری رووس دەسپێرێ.

کۆنسۆڵی رووسیا لە ورمێ ئۆسپینسکی و ژێنراڵ ڤارۆپانۆڤ فەرماندەی هێزەکانی رووس لەناوچەی ورمێ، هەروەها شانیلۆڤ فەرماندەی هێزەکانی رووس لە قەفقاز و قەشەی میسیونێری پراڤسلاوی رووسیا لە ورمێ ئارخی ماندرین سێرگی هەموویان لەسەر لێدانی کوردەکان بەتایبەتی سمکۆ و سەید تەها یەك دەنگ دەبن، بابیچ،یەکێك لە ئەفسەرەکانی رووس کە پاش کوشتاری کوردەکان لە لایەن لەشکری رووسەوە دەچێتە ناوچەکە و چاوی بە دانشتیوانی دەکەوێت، تاوانی لەشکری ولاّتەکەی دەکاتە راپۆرتێك و بۆ کاربەدەستانی خۆی دەنێرێ، دەڵێ:هۆی ئەمەیە کوردەکان لەئێمە دوور کەوتوونەتەوەو دژی لەشکری رووس دەسیتان داوەتە شەڕی پارتیزانی. کاربەدەستانی رووس کە هەست بە مەترسی نزیك بوونەوەی

کورد و تـورك و فـارس دەکـەن دەیانـەوێ هێزەکـانی رووسـیا لەناوچـەکە وەدەرنـێن. لەگـەڵ ژمارەیەك کەسایەتی ناوداری کورد پەیوەندی دەگرن و ناڕاستەوخۆ دان بـە تاوانـەکانی خۆیـان دادەنێن. دوای ماوەیەك سەید تەها و عەبدوڵا بەگ و پیر و بەگ و ژمارەیەکی تر لە ناسـراو و کەسایەتی کورد کە لە رووسیا زیندانی کرابوون ئـازاد دەکـەن. بـەم چەشـنە دەیانـەوێ قـین و نەفرەتی کوردەکان بەرامبەر رووسیا کەم بکەنەوەو پێش بە کارەساتی چاوەڕوان نەکراو بگرن.

پێویست بە بیرهێنانەوەیە، سوپای رووس سەرەتای شەر سەید تەهادەگرن و دەینرێنە رووسـیا و لە شاری ئۆزینبۆرگ زیندانی دەکەن. بڕیـار دەدەن تاکۆتـایی شـەڕ هـەر لـەوێ بێـت.چـونکە دەترسن هەر کە گەڕایەوە، کوردەکان دژی رووسیا هان بدا و دەسـەڵاتی رووسـیا لاواز بکـات. بەڵام سەید تەها بەر لە کۆتایی شەڕ ئازایانە لەوێ رادەکا و خۆی دەگەیەنێتەوە کوردستان و بۆ چارەسەری کێشەی کورد بە یارمـەتی بـەریتاینا هـەوڵێکی بـێ وچـان دەدا. لەگـەڵ سمکـۆ و مستەفا پاشا یـامولکی هـەوڵ دەدەن شـێخ مـەحموود واز لـە پەیوەنـدی تـورك و دژایـەتی ئینگلیزەکان بێنێ، چونکە هیچ ئومێدێکیان بەبەلـشەفیکەکان واتـە رووسـەکان نـامێنێ کـە بەئاشکرا پشتیوانی کەمالن.

سەید تەها تێدەکۆشێ ئینگلیزەکان دەسەڵاتی سمکۆ لە کوردستانی رۆژهەڵات بە رەسمی بناسن. ئینگلیزەکان گوێ دەدەنە هەندێك لە داخوازییـەکانی سـەید تـەها، وەك: لێبـوردنی گـشتی و باسکردنی کێشەی کورد لە کۆنفرانسی ئاشتی. بەڵێن دەدەن حوکمداری رەواندز و شەمدینان و نەهری بدەنە دەست سەید تەها. بەڵام بە تێکچوونی نێوان شێخ مەحموود و ئینگلیزەکـان جـێ پێی سەید تەها لاواز دەبێت،گەرچی ژمارەیەك لە کاربەدەستانی ئینگلیـز لـە کوردسـتان وەك (لیچمان) پێشنیاری دروستکردنی دەوڵـەتێکی کـوردی دەکـەن لـە باشـووری کوردسـتان بـە سەرۆکایەتی سەید تەها، بە داخەوە ئەویش سەرناگرێت.

# راپۆرتی سەیادیان بۆ کۆمیتێرن سەبارەت بە کوردستانی ئازاد

## (ئەم زانیارییانە لە لایەن زالیسکۆڤ و یورکورڤاوە نوسراون)

**١٩٢٣/٥/١**

سوپای سمکۆ ئێستا سێ هەزار چەکدارە، پێکهاتووە لە کوردەکانی باش قەلا، تەرگەوەر، ئاخ وێران و ورمێ و جۆلەمێرگ. هێزێکی تری کوردی هەیە بە سەرکردایەتی چەتۆ کە ژمارەیان دوو هەزار چەکدارە، سمکۆ چەکیان دەکا و پاشان دووریان دەخاتەوە بۆ ناوچەی ئورەمار. چەك کردنی چەتۆ لەبەر ئەوە بووە، گوایە باخەکانی ناوچەی سەلماسی تالان کردووە. بەلام هۆی راستەقینە ئەوەیە: سمکۆ لە پەرەسەندنی دەور و دەسەلاتی چەتۆ دەترسێت کە لەوانەیە ببێتە سەرکردەی یەکەم و دەسەلات لە سمکۆ وەرگرێت.

مانگێك دەبێت سەرباز و نیزامییە کوردەکانی ناو سوپای تورکیا کە بۆ یارمەتی سمکۆ نێردرابوون و ژمارەیان دوو هەزار نەفەر دەبوو، رۆیشتوون. دەکرێ بلێین کە تورکیا لەبەرامبەر یونانییەکان شکستی خواردووە، بۆیە ئەو هێزانەی کێشاوەتەوە. ئێستا سمکۆ چوار سەد سەربازی تورکیای لا ماوە کە لە سالانی ١٩١٧ و ١٩١٨ رایان کردۆتە لای سمکۆ لەگەل ٥-٦ ئەفسەری تورك کە ئەوانیش تۆپچی و دۆشکەچین و مووچەی باش وەردەگرن. سوپای سمکۆ بە چەکی فەرەنسی و تورکی و رووسی چەکدارن. هەر کوردێك تا دوو سەد فیشەکی پێیە.سمکۆ دە رەشاش و سێ تۆپی سێ ئینجی و دووی شەش ئینجی مودیل کۆنی هەیە (رەنگیان سوورە و تایەکانیان بەرزن)، لە سوپای ئێران وەدەستی کەوتوون.

ناوەندی سەرکردایەتی گەورەی سمکۆ لە قەلای چارێکە (چهریق قلعە). فەرماندەی گشتی هێزەکانی بۆ خۆیەتی. بەرەی شەرەفخانەی راستەوخۆ بە عومەراغا سپاردووە. ناوبراو گەنجە تەمەنی ٣٨ سالە، نەترس و ئازایە، پارتیزانێکی بە ئەزموونە.

سمکۆ تەواوی کاروباری ئەم بەرەیەی داوەتە دەست عومەر خان. بەلام عومەر خان وەفاداری سمکۆ نییە. دەکرێ بلێین هەر بڕوای پێنییە و حەز لە چارەی ناکات. ئامادەیە سمکۆ جێ بهێلێت و رابکات، بەلام لە هیچ شوێنێك جێی نابێتەوە. فارس و تورکەکان دەیکوژن. لایەنگری ئەرمەنییەکانە (چونکە دایکی ئەرمەنی بووە ئەگەر لە لایەن ئەرمەنەکانەوە یا

رووسەكانەوە بانگ و داوەت بكرێ، دەست بەجێ دوایان دەكەوێ. لە تەورێز دەستە چەكدارەكانی خۆمپایت و سومبات كە لە زەنگیزۆر لە (روسیا)وە هاتبوونە ئێران و بڕیار بوو بیانێرنە شەڕی سمكۆ، عومەر خان نەیدەویست دژی ئەرمەنییەكان شەڕ بكا،بەتەما بوو بەرەی شەڕ جێ بهێڵێ و بكشێتەوە بۆ چاریق قەلا. بەلام كە هەواڵەكە بە درۆ دەرچوو بەرپرسی بەرەی كۆنی وەئەستۆگرتەوە.

جەنتۆ فەرماندەی شاری دیلەمان وەفاداری سمكۆیە و چوار سەد كوردی چەكداری لە ژێر دەست دایە. فەرماندەی ناوچەی هەرەگرینگ و بە هێز واتە كۆنە شار (كە دەكەوێتە ١٦ فەرسەخی رۆژئاوای شاری دیلەمان) بە ئەستۆی جەوهەر ئاغایە، ئەویش زۆر نزیك و وەفاداری سمكۆیە و هێزەكانی دەگاتە چوار سەد كەس. كۆنە شار لە لای دیلەمانە، ئەو بەرزایانەی بەسەر رێگای دیلەمان-خۆی دا دەڕوانێ‌بەرگری لەو شارە دەكەن. چەتۆ و جەوهەر ئاغا هەردووكیان خزمی سمكۆن.

فەرمانداری ورمێ بە ناوی تەیمور ئاغا كە ئێرانییە لە لایەن سمكۆوە دیاری كراوە، پێشتر دەوڵەت بە فەرمانداری سەلماس دایناوبوو. تەیمور ئاغا لە كۆنەوە دۆستایەتی لەگەڵ سمكۆ هەیە. خزمەتی سمكۆی زۆركردووە و ئێستا بە ئاشكرا هاتووەتە لای، ناوبراو بە ئەشكەنجەگەری مەسیحییەكان بە ناوبانگە.

ئێستا لە بەرەی (خۆی) سمكۆ شەڕی لە هێڵی (تەسویچ- موغان جیك) راگرتووە بەرامبەر ئەو هێزانەی دەوڵەتی ئێران ناردوویە تەسەری. هێزەكانی ئێران بە تەواوی دەشكێن و رادەكەن. زۆریان دەگەڕێنەوە بۆ گوندەكانیان. ورەی ئەو قەزاق و جەندرمانەی ئێران كەلە بەرەكانی شەڕی سمكۆ گەڕاونەتەوە زۆرخراپ و نزمە. جگە لەوە لە مووچەكەیان كە مانگانە (٩) تمەنە نارازین،دەڵێن زۆر كەمە چۆن دەبێ بەم مووچەیە خۆت بەكوشت بدەی و نەتوانی خاو خێزانت بە خێو بكەی.دەڵێن ئێستا لە بەرەكان شەڕ نییە، سمكۆ خەریكی كۆكردنەوەی خەلەوخەرمانە و كاربەدەستانی دەوڵەت لە تەورێز چاوەڕێی یارمەتی تارانن. فەرمانبەرێكی پۆست كە لە تاران گەڕاوەتەوە، دەڵێ لە رێگا كاروانێكی سەربازی دیتوە، پەنجا واگۆن چەك و تەقەمەنی و جل و بەرگی سوپایی پێبووە بۆ تەورێز، جگە لەوە دەڵێت بڕیار وایە هێزێكی پێنج هەزار نەفەری لە چەكدارانی بەختیاری بنردرێت بۆ تەورێز. پەیوەندی نێوان سمكۆ و سەرداری ماكۆ دۆستانەیە.

سەرداری ماکۆ وانیشان دەدا هیچ پەیوەندیەکی بە سمکۆوە نییە. بەلام بە نهێنی بە خواردەمەنی و تفاق و مەڕ و مالات، یارمەتی دەدات و جموجۆلی هێزەکانی ئێرانی پێڕادەگەیەنێ. کوردەکانی ناوچەی سابلاخ نایانەوێ لەگەل سمکۆ بن. سمکۆ داوای یارمەتی لێکردبوون، بەلام ئەوان ئامادە نەبوون و گوتوویانە کە بەشا و ئێران وەفادارن و هەر بە ئێرانی دەمێننەوە. نزیکەی دوو سەد نەفەر کوردی ئەو ناوچەیە هاتوونە ریزی لەشکری سمکۆ کە لە ناوچەی سابلاخ خەریکی تالان و راووڕوتن.

## ئامانجەکانی سمکۆ

ناوبراو لە ورمێ و سەلماس خەلکی دەولەمەند و سەید و تاجیر دەگرێت و دارکارییان دەکات قوون و... داخ دەکات و لە چالێکدا سەرەوخوار هەلیان دەواسێت.تامانگی ئەیلولی ئەمسال سەد و پەنجا نەفەر لەوانە توانیویانە رابکەن و خۆیان بگەیەننە تەورێز، هانایان هێناوە لە دەست سمکۆ رزگاریان بکەن. لە تەورێز لە بازاڕی تەورێز ئەم سەیدانە کۆبوونەتەوەو داوایان کردووە فریایان کەون. تەنیا موسلمانەکان بە باشی و ئازادی لە ژێر بالی سمکۆدا دەژین. ئەرمەنی و ئاشووری و رووس هیچیان نییە. دەست لە موسلمانەکان نادات. ژنە رووس و ئەرمەنی و پیر و مندالەکانیان ناچار دەکات ببنە موسلمان. تۆبزی لە پیاوەکان دەکا چەند ژن بێنن و مارەیی لە کچ و ژنە جوانەکان وەردەگرێت. شەش مانگ لەمەو بەر سمکۆ داوای لە ئاوارەکانی سەلماسی نیشتەجێ تەورێز کردبوو بگەڕێنەوە بە مەرجێك کە ۱/۵ بەرهەمی خۆیان لەگەل ۱۵ قران مالیات بدەن. ئەرمەنەکان ئامادەنەبوون، دەلێن ئەو کاتە دەگەڕێنەوە کە ئالای سوور لەوێ بدرەوشێتەوە، هەتتا لەگەل داشناکەکانیش نایانەوێ بگەڕێنەوە. ئینگلیزەکان لە ورمێ ئازادانە بە ماشێن هاتووچۆ دەکەن. سمکۆ جل و بەرگی لەشکری ئینگلیزی داوە بە چەکدارەکانی خۆی. (۸) تا (۱۰) ئینگلیز لەگەل سمکۆ دان. گەرچی ئەمریکییەکان بۆ یارمەتی دانی خەلکی هەژاری ناوچەکە چووبوونە ورمێ و جل و بەرگیان بۆ بردبوون کەچی سمکۆ تالانیان دەکا و هێندەی نەمابوو بیانکوژێ. بەرووتی دەگەڕێنەوە تەورێز، سمکۆ وتوویەتی کە کۆمەلانی خەلکی کورد دەبێ لە ناوچەکانی ئێران و تورکیا کوردستانی ئازاد دروستبکەن.

لە شەڕی ناوچەی قەرەداغی نێوان ئەمیر ئەرشەد و کالیبەرخان، کالیبەرخان تێکدەشکێت. تەقی خان و سوجدە ئەلمەمالیك زۆر بە زەحمەت دەتوانن خاوخێزانیان بەرنە چیاکان و خۆیان پەنابدەن. سەرکەوتنی ئەمیر بە یارمەتیدانی داشناکەکان بوو کە پێنج سەد ئەرمەنی و بیست رەشاش و تۆپی لەگەڵ بووە، سوورە لەسەر ئەوەی هێرش بکاتە سەر تەورێز. دیموکراتە راستڕەوەکان بانگەواز بۆ تەورێز دەکەن، ئەگەر ناوبراو تەورێز بگرێت ئازەربایجان دەکا بە پاشانشینێکی بچووك.

ناوچەی مەزەند: حەبیبولا خانی فەرەند، سەربازە تورکەکان کۆدەکاتەوە و تا ئێستا دوو سەد کەسی هەیە، دەتوانێت تاهەزار نەفەر لە گوندەکانی خۆی کۆبکاتەوە، تەنیا پێویستی بە پارەیە. داوای رێنوێنی و دەستووری رووسیا دەکا، دەیەوێ هاوڕێ بالاندین لە تەورێز گەنمەکەی لێبکرێ تا بە پارەکەی خۆی بەهێزبکات. تاکە رەشاشێکی نییە و فەرماندەیەکی لەشکریشی پێویستە. داوا لە رووسیا دەکا دوو پسپۆڕی لەشکری رووس یا ئەرمەنی بۆ بنێردرێت. حەبیبولا خان لە ئەمیر ئەرشەد دەترسێت. حەبیبولا خان لە مێژە لایەنگری رووسیایە و لە ئازەربیاجان پتر بە شۆڕشگێڕ ناسراوە.

لە تەورێز: پۆلیس بەردەوامە لە تەنگەتاو کردنی شۆڕشگێڕ وبەلشەفیکەکان. بیست رۆژ لەمەو بەر ٧ نەفەر لە سوسیال دیموکراتەکانی ئێران گیران. رۆژنامەی ئەرمەنی بە ناوی «زەنگ» بەتاوانی رێبازیبەلشەفیکی داخرا. دەولەت داوای لە ئاوارەکانی زەنگزۆری نیشتەجێی تەورێز کردووە کە لە ماوەی ١٥ رۆژ ئێران بەجێ بهێڵن، چونکە نرخی نان لەبەر ئەوان زیادی کردووە[1].

**سەیادیان**

(1) puxghn op. 495 on. 154 gen 104 op. 9

# راپۆرتی فریدریك

# بۆ هاوڕێ دیمیترۆڤ سەرۆکی کۆمینتێرن

# سەبارەت بە بارودۆخی تورکیا

**١٩٤٤/٦/٢**

..... وابزانم شتێکی زیادەیش نەبێت باسی هەبوونی حیزبێکی کوردی لە تورکیا بکرێت کە تا ساڵی ١٩٢٥ بە ئازادی پاشان بەنهێنی چالاکی نواندنەوە، ئەم پارتە کوردییە کۆنە پەرەست و فیودالە پارتی «کورد تەعالی جەمعیەتی» ە یا «کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردی»یە کە سیخوڕەکانی ئینگلیز و فەرەنسا پشیتوانی دەکەن و پەیوەندی بەوانەوە هەیە. ئەفسەرێکی بە ناوبانگی ئینگلیز لورینس یەکێك لە دامەزرێنەران و سەکردایەتی ئەم پارتە بووە.

لە ساڵی ١٩٢٥ ئەم پارتە ناوی «خۆیبوون»ی لێنرا و چەند راپەڕینی گەورەی لە ساڵانی ١٩٢٥ و ١٩٣٠ و ١٩٣٧ دژی ئەنقەرە رێکخست. تا ١٩٤٥بەچەك بەرەبەرەکانێی دەسەڵاتدارانی تورکیای کردووە. (بەپێ ئەو راپۆرتانەی بە دەستمان گەیشتوون) ئەم پارتە بە رواڵەت بزووتنەویەکی رزگاریخواز سەرکردایەتی دەکات و ناوەڕۆکێکی کۆنە پەرستانەی هەیە.دەبێ ئەوەش بگوترێت، هێشتا چەوسانەوەی گەلانی رۆژهەڵاتی تورکیا بە تایبەتی کوردەکان کە ژمارەیان دەگاتە ٣ ملیۆن نەفەر، بەردەوامە(2).

## تێبینییەك لەسەر راپۆرتی سەیادیان

ناوی نووسەرەکە خۆی هەمووشتێك دەردەخات فەرمانبەرێك یا کاربەدەست و بەرپرسێکی بەشێکی (ك بی گ) بووە ئەو دامووەزگایەی کە تەواوی سەرکردە و زانا و پسپۆڕی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهانی بە سەرکردایەتیبەلشەفیکەکانی رووسی (سۆڤیەت)، لە خۆگرتبوو، ئەرکیان رێنوینی کردن، یارمەتیدان، یا دانانی رێباز بووە بۆ بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و سوسیالیستی و رزگاریخوازانی جیهان، بە تایبەتی یارمەتی بۆ گەلانی ژێر دەست و بەشخوراو.

سەیادیانی بەڕەگەز ئەرمەنی، نە تەنیا چاوی بینینی سمکۆی نەبووە بەڵکو رقیشی لەکورد بووە، تاتوانیویەتی نە هەر بەد ناوی کردووە، بەڵکو بوختان و درۆ و دەلەسەشی بۆ هەڵبەستووە.

---

(2) puxghn op. 495 on 74 gen 494 odp. 11.

خوێنەرانی بەڵگەکانی پێشوو ئەگەر لە یادیان مابێت لە زۆر جێگەدا سمکۆ پەیوەندی بە دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتەوە کردووە و داوای یارمەتی یان لێدەکات، ئامانجەکانی خۆی و گەلەکەی و ئەو مەرجانەی خستۆتە روو کە ئامادەیە لەگەڵ سۆڤیەت پەیمانی دۆستایەتی و دراوسێیەتییان لەسەر ببەستێت، لە جەنگی جیهانی یەکەمدا هاوکاری سۆڤییەتی کردووە، دەسەڵاتداری سمکۆ لە ناوچەکە، دەرکردنی رۆژنامەو..... شەڕ و قارەمانییەتی بەرامبەر لە شکری فارس و تورك و دوژمنانی کۆن و نوێ، لە دەسدانی براو و کوڕ و ژن و خزم و ماڵ و سامانی، زۆر سەرچاوەی تریش سمکۆ یان هەڵسەنگاندوە دەیسەلمێنن چ کەڵەپیاوێك بووە. دیارە سەیادیان وەك هاوخێڵە ئەرمەنییەکانی خۆی لە ناوچەکە ئەم درۆ و دڵەسە و بوختانانەی بۆ سمکۆ هەڵبەستووە تا بە ناوی سمکۆوە کورد بەوە تاوانبار بکا کە دژی ئەرمەنی و ئاشووری و رووسە. ئەو ئەرمەنی و ئاشوورییانەی گەلی کورد لە هەموو پارچەکانیکوردستان باوەشی بۆ کردنەوە ودالدەی دان و جێگیربوون و لە دەستدرێژی تورك و فارس و ئازەری و عەرەب پاراستیانن و کوردستان بوو بە نیشتمانیان و نان و ئاوی ئەم وڵات و گەلەیان خوارد، کەچی بەفیتی ئەم و ئەو نەك هەر دژی بزووتنەوەی کوردی رۆژهەڵات وەستان بەڵکو دژی بەشەکانی تریش جووڵانەوە، بگرە داوای دەسەڵات و کیانیشیان لە کوردستان دەکرد. وێڕای رێزم بۆ هەردوو گەلی ئەرمەنی و ئاشووری، ئەو تاوانانە شەرمەزار دەکەم کە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستان بەرامبەریان کراوە. گەلێك جاریش لەگەڵ کورد هەرسێکیان کەتوونەتە بەر شاڵاویان و گەلێك جاریش شان بە شانی یەك بەرامبەری دوژمنان وەستاون..... لێرە من بوار بە خۆم و بەهیچ کەس نادەم ناهەقی بەرامبەر ئەو دوو گەلە بکات کە لەگەڵ گەلی کورد مێژووی تراژیدی هاوبەشیان پترە لە ژیانی پڕ کامەرانی وئاسودەیی.
بەڵام تاقمی ئەو تۆی وەك سەیادیان هەبوون کە لە ناو تەواوی دامودەزگاکانی سۆڤیەت هێلانەیان کردبوو، لە هیچ راپۆرتێکدا بەباشی باسی کورد و کێشە رەواکەی یا سەرکردەکانی کوردیان نەکردووە و مافی چارەنووسی و دروستکردنی کوردستانی سەربەخۆیان بەکورد رەوا نەبینیوە.کورد لەروانگەی ئەوان سەر بە تورك یا ئیمپریالیزم یاکۆنەپەرەست بووە.دروستکردنی دەوڵەتی کوردی دراوسێی قەفقازیش بەبڕوای ئەوان دەبێتە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر سۆڤیەت،هەموو جارێکیش کاوێژی دەکەن و بە گۆڕینی دێر و وشەکان سەرکردایەتی سۆڤیەت لە مەترسی کورد ئاگادار دەکەنەوە.

سەیادیان راپۆڕتەکەی ئەو کاتە نووسیوە کە داگیرکەرانی کوردستان بە دوای سمکۆ دادەگەڕێن لەناوی بەرن، سوپا و هێزی خۆیان بۆ ئەم پیلانە وەگەڕخستووە. نووسەر هەر لەم راپۆرتەدا خۆی بەدرۆ دەخاتەوە! دەمێك دەنووسێ دوو هەزار سەربازی تورکی لایە دەمێك دەنووسێ کە ژمارەیەکی زۆر ئینگلیزی لایە بە پارەو چەك یارمەتی دەدەن، جەنگاوەرەکانی جل و بەرگی سوپایی ئینگلیزیان لە بەرە. دەنوسێ ئەرمەنییەکان لە دەست سمکۆ لە سەلماس هەلدێن بۆ تەورێز، بەلام بەلگەی مێژوویی هەیە کە زۆربەیان لە ریزی سوپای ئێران بوون، هەر تەنیا ئەرمەنی هەلنەهاتوون تا ببێتە بیانووی هێرش هێنانە سەر کوردستان و ئەو هەلاتووانەش چەکدار بکا و لەگەل سوپا سەرکوتکەرەکەی بۆ شەڕی دژی کورد کەلکیان لێوەربگرێت. ئەگەر راپۆرتی سەیادیان لەگەل راپۆرتی کونسول و سەفیرەکانی سۆڤیەتی هەمان کات بەراورد بکەین دەبینین بەپێچەوانەی وتەی سەیادیان سمکۆ لەو سەردەمەدا لە نێوان هەر سێ پارچەی کوردستان لە هاتوچۆ دابووە کە قۆناغێکی ئالۆزی شەڕ و پێکدادان بووە لەگەل داگیرکەرانی کوردستان، کاتی ئەوەش نەبووە بە زۆر ئەرمەنی و ئاشووری و رووس بکاتە موسلمان جگە لەوە سمکۆش سەرکردەیەکی دینی نەبووە و.....

نووسەر بۆ شیرینکردنی خۆی لە زمانی ئەرمەنییەکانەوە دەگێڕێتەوە گوایا ئەوان ئامادە نین بگەڕێنەوە جێ و شوێنی پێشووی خۆیان تا ئالای سوور لەوێ نەدرەوشێتەوە، کە جێی پێکەنینە.

نووسەر لە باتی ئەوەی باسی بارودۆخی کوردستان، راپەڕینەکەی سمکۆ، شەڕەکانی لەگەل هەر داگیرکەرێکی کوردستان، ئەو پروپاگەندە و پیلانە گلاوانەی دژی سمکۆ گێڕابوویان، بکات، درۆ و دەلەسەی بۆ هەلدەبەستێ. هەر لەو سەردەمەدا نوێنەری سمکۆ هەمیشە لە ورمێ لەگەل کۆنسۆلی سۆڤیەت لە هاتوچۆدا بووە، خۆ ئەگەر سمکۆ وەك سەیادیان باسی دەکا ئاوا با، ئەوان دەیانزانی. تەنانەت یەکێك لەو کونسولانە دەنوسێ: سمکۆ مرۆڤێکی لیهاتوو بوو نەك سەرکردەیەکی تالانکار. کەچی سەیادیان دەلێ خەلك سەرەو خوار هەلدەواسێ و بە زۆر پارەیان لێدەستێنێ.....

**د. ئەفراسیاو هەورامی**

# بۆ سەرکردایەتی کۆمینترین

# لەسەر گۆڕی ئەتاتۆرك

## بەیاننامەی کۆمیتەی ناوەندیی

## پارتی کۆمۆنیستی تورکیا بەبۆنەی کۆچی دوایی ئەتاتۆرکەوە

لە١٠ی تشرینی دووەمی ١٩٣٨ یەکێك لە پیاوە گەورەکانی سەردەم بنیادنەری تورکیای نوێ و سەربەخۆ، تورکیای پێشکەوتنخواز، یەکەم سەرۆك کۆمار و بێ وێنەی تورکیا کەمال ئاتاتورك کۆچی دوایی کرد. مرۆڤێك کە سەرکردایەتی خەباتی سەرکەوتووانەی گەلی تورکیای کرد بۆ رزگاربوون لە هێرشی ئیمپریالیستە داگیرکەر و جەلادەکانی نێوان ١٩١٩-١٩٢٣.

پیاوانە دژی کۆنەپەرستانی ناوخۆ و بۆ ریفورمێکی گەورە لە تورکیا، بۆ ئاشتی، بۆ تورکیای کۆماری سەربەخۆ و ئازاد خەباتی کرد. وەك رۆڵەیەکی پاکی گەلی تورك، لە جەنگی ئیمپریالیستی، یەکەم کەس بوو دیمەنە ترسناکەکانی، کۆیلایەتی و ئەو چەساندنەوەی پیشبینی دەکرد کە شەڕی ئیمرپالیستەکان بە دوای خۆیدا هێنا، دژی ئەڵمانیا بوو کە دەیویست ئاغایەتی بەسەر گەلی تورکیا دابکات. ئەو پارتی کۆماری گەلی تورکیای دامەزراند و بە دەستی خۆی شەش پرەنسیپی سەرەکی بۆ نووسی: ((یەکسانی،گەلی، دەوڵەتی، کۆماری، ناسیۆنالیزم، مەدەنییەت)).

ئەو رێبەری خەباتی گەلی تورکیای کرد بۆ لە ناوبردنی، کۆنەپەرستی و رژێمی خوێنمژی سوڵتان و خەلیفە، بۆ یەکسانی مافی ژن و پیاو، بۆ جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، بۆ هێنانەدی ئەلف و بێی لاتینی و لە ناوبردنی نەخوێندەواری، بۆ بنیادنانی تورکیایەکی پیشەسازی. لە سەردەمی کۆماری ئەتاتورك، چینی کرێکاری تورکیا پەرەی سەند و توانی لە خەبات بۆ دانانی یاسای کار سەرکەوێت، لەم ماوەیەدا جوتیارانی تورکیا توانیان ماڵیاتی سەدەکانی ناوەندی لەناو بەرن. تورکیا کە لە سەردەمی کۆمار سەرکەوتنی زۆری بە دەستهێنا. ئیمپریالیستەکان بە تایبەتی

ئاڵمانیا فاشیست، وازیان لە پیلان دانان نە دەهێناو دەیانویست نیشتمانەکەمان بخەنە ژێردەستی خۆیان، بۆ ئەم مەبەستەش پشتیان بەدەرەبەگەکان و ئەو سەرمایەدارە گەورانە بەستووە کە لەلای گەلی تورکیا وەلانراون و بەستراونەتەوە بە سەرمایەدارانی دەرەوە، وەك یونس نادی. هەوڵەکانی ئاڵمانیایی فاشی لە وەڵاتەکەمان بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی، هەورێکی تاریکە بەسەر ئاسامانی تورکیاوە، سەربەخۆیی و ئازادی گەلی تورکیای خستۆتە مەترسی و دەیەوێ ئەو دەسکەوتانە تێکبدات کە لەو ماوەیەدا بە دەستی هێناوە.

بۆ ئەو دەستکەوتانەی کە گەلی قارەمانی تورکیا بە سەرکردایەتی کەمال ئاتاتورك بە دەستی هێنا، بەرامبەر بەم مەترسییە گەورەیەی ئیمڕۆ هەڕەشەی لێدەکا، گەلی تورکیا لەسەر گۆڕی ڕێبەری مەزنی خۆی سەری ڕێز دادەنەوێنێت. بەڵێن دەدەین ڕێبازەکەی بەرنەدەین و ڕیزەکانی خۆمان پتەوتر کەین و سووربین لەسەر ئەو مەبەستانەی ڕێبەری خۆشەویستمان ئاتاتورك خەباتی بۆ کرد.

کۆنەپەرستان لە یەك جیاکردنەوەی گەلی تورکیایان دەوێت بۆ ئەوەی هێز و وزەی لاواز بکەن و بەم چەشنە سەربەخۆیەکەی خۆی بداتە ئیمپریالیستیەکان و خۆیان بکەنە خاوەنی تورکیا و ئازادی و مافی گەلەکەمان پێشێل بکەن. ئەوا ئەو تورکانەی کە وەڵاتەکەی ئێمەیان خۆشدەوێت و نایانەوێ ببنە کویلەی ئیمپریالیستە دڕندەکان دەبێ ڕیزەکانی خۆیان ڕێکبخەن بۆ خەبات و لە ڕەگ وریشە دەرهێنانی کۆنەپەرەستی و تاقمی ئەڵمانیای فاشیستی و بوار نەدەین پیلانەکانیان سەربگرێت. ئێمە کۆمۆنیستەکانی تورکیا وێڕای سەر دانەواندن بەرامبەر بە لاشەی پاکی کەمال ئاتاتورك، سوێند دەخۆین لەگەڵ چینی کرێکار و گەلی تورك بە هەموو توانامان بۆ سەربەخۆی و پێشکەوتن و ئاشتی و ئازادی تورکیا خەبات بکەین.

کەمال ئاتاتورك وەسیەت و ئامۆژگاری لاوەکانی تورکیای کرد کە ئاڵای سەربەخۆیی و یەك پارچەبوون دانەنێن و دەستی پتەوی سۆڤیەتی دۆست بەرنەدەن کە پاڵپشتی خەباتی سەربەخۆیی وەڵاتەکەمان بووە. سوێند دەخوێن ئێمە ئەو وەسیەت و ئامۆژگارییە جێبەجێ بکەین و داوا لە هەموو تورکێکی بە شەرەف و هەموو کەمالییەکان دەکەین ئامۆژگارییەکانی ئەتاتورك بەجێ بگەێنین.

کۆمۆنیستەکانی تورکیا پارتی کۆمۆنیستی تورکیا پێشەنگی خەباتکارانی نیشتمانەکەیانن بۆ ئاشتی و ئازادی و سەربەخۆیی تورکیا(3).

**کۆمیتەی ناوەندیی پارتی کۆمۆنیستی تورکیا**

**تێبینی:**

کەم کەس هەیە ئاگای لە سیاسەتی کەمال ئاتاتورك بەرامبەر بە پارتی کۆمۆنیستی تورکیا نەبێت. ئەو ئاتاتورکەی چەند جار پارتی کۆمۆنیستی تورکیای سەرکوت کرد و سەرکردەکانیشی لەناوبرد، خۆ ئیتر باسی قاعیدە و ئەندام و لایەنگرەکانیان ناکەم کە بە هەزاران نەفەریان کوژراوە، زیندانی و دەربەدەرکراون، توشی راوەدوونان بوون و پارتەکەیان قەدەغەکرا. ئەم بەیاننامە و پێداهەلگوتنە و شیوەنەش پاش ئەو هەموو تراژیدییە بوو کە بەسەر پارتی کۆمۆنیست داهات. لێر نامەوێ ناوی سەرکردەکانیان بێنم کە بە دەستوری ئاتاتورك لەناو بران، چونکە لەگەلێك سەرچاوەدا مێژووی ئەم پارتە نوسراوە.

بەلآم مەبەستی من لێرە وەبیرهێنانەوەی هەندێ وشەو زاراوەیە کە لە بەیاننامەکەدا ئەم ئینترناسیۆنالیستە یەك لە دوای یەکانە، دووپاتی دەکەنەوە، وەك گەلی تورکیا، گەلی تورك، هەموو تورکێکی بە شەرەف، ئەو تورکانەی وەلآتی خۆیان خۆش دەوێت و......

پارتی کۆمۆنیستی تورکیا بە روالەت پارتی هەموو گەلانی تورکیا بووە کەچی هەر دەلێ تورکیا تەنیا تورکی تێدا دەژین. مەگەر بە ئینکاری هەبوونی گەلانی تر لە تورکیا دانانرێت؟ لە جێگای تردا دەلێ: دەبێ هەموو تورکێکی بە شەرەف وەسیەتەکانی ئاتاتورك ئەو ئاتاتورکەی کە گەورەترین و بێ روحم ترین داگیرکەری کوردستان بووە جگەلە چەوسانەوە و تواندنەوەی گەلانی تر. ئەو حیزبە بوو هاوکار و بەشداری هێرشە سەرکوتکەرەکانی سوپای تورك بۆ سەر کوردستان، هەر ئەو حیزبە بوو پیروزبایی دەنارد بۆ ئاتاتورك کە شۆڕشەکانی کوردی یەك لە دوایی یەك نوقمی خوێن دەکرد و بەناوی سەرهەلدانی شێخ و کۆنەپەرست و جیاخواز و نۆکەرانی ئیمپریالیزم، بزووتنەوەکانی کوردی لەناودەبرد..

**د. ئەفراسیاو هەورامی**

---

(3) puxghu op. 495 oneut 74 gen. 488 up. 10.

## راپۆرتی هاوڕێ سیمیرنۆڤ سەبارەت بە کێشەی کورد

## بالوێزخانەی یەکێتی سۆڤیەت لە ئێران ١٨ کانوونی یەکەم ١٩٤١

## بۆ جێگری کۆمیساریای گەل (وەزیری دەرەوە) هاوڕێ دیکانرۆڤ. گ

لە یەکێ لە تێلێگرافەکاندا ئێوە داوای بۆچوون و پێشنیاری ئێمەتان کردووە سەبارەت بەکێشەی کورد و ئازەری. بەداخەوە بە گوێرەی پێویست من لەم کێشەیەم نەکۆڵیوەتەوە، لەبەر ئەوە زانیاری پێویستمان لەم بارەوە نییە، بە تایبەتی زانیاریمان لەسەر پەیوەندی نێوان کورد و ئازەری لاوازە و بوار نادات پوختەیەکی تەواوتان لە سەر ئەو کێشە گرینگ و ئاڵۆزە، پێشکەش بکەم. لەبەر ئەوە ناچارم راپۆرتەکەم تەنیا بەچەند تێبینی و پێشنیار کە دەبێ سیاسەتی ئێمە بەرامبەر بە کوردەکان چۆن بێت، سنووردار بکەم.

بۆهەڵوێستی ئێمە سەبارەت بە کێشەی کورد پێویستە پێش هەموو شتێك پەیوەندییەکانمان لەگەڵ تورکیا و ئینگلیزیش لەبەر چاوبگرین. چونکە ئەم وەڵاتانە سەبارەت بە کێشەی کورد زۆر هەستیارن و چاودێری هەڵسوکەتی ئێمەن لەناو کوردەکاندا. بەتایبەتی لەم کاتەدا کە چارەسەری کێشەی ئەم گەلە بە رێگایەکی ئیداری یائۆتۆنۆمی لە ئارادایە. ئەم کێشەیە کاتێك چارەسەر دەکرێ کە ئەو وڵاتانەی سەرەوە و یەکێتی سۆڤیەت رازی بن.

نەئێران و نە تورکیا و نە ئینگلیزیش ئامادە نین ئۆتۆنۆمی ئیداری بدەن بە کوردان. هەموویان هەوڵدەدەن خۆیان بە سەر ئەم گەلەدا بسەپێنن. دەوڵەتی ئێران دانی بەوە دانا کە ئەو ناوچانەی ژێر کۆنترۆلی هێزەکانی ئینگلیزن یا دەسەلاتی ئێرانیان تێدانییە کوردەکان بە ئاشکرا دژی دەوڵەتی ئێران راپەریون. هەندێ نیشانە بە دەستەوەیە کە کوردەکان بۆ بەهاری داهاتوو قەبارەی ئەم راپەرینە گەورەتر دەکەن و مەترسیدارتر دەبێ. کەواتە پێویستە ئێمە هەڵویستی خۆمان لەم بارەوە دیاری بکەین.

من ئێستا لە وتووێژەکانمدا لەگەڵ ئێران و تورك و ئینگلیزەکان وانیشاندەدەم کە یەکێتی سۆڤیەت هەوڵدەدا کوردەکانی ئێران تێك بەر نەبن. هەردوو لا بە وتووێژ لەسەر کێشەکان پێك بێن و نەگەڕێنەوە سەر شەڕ و کوشتار. دەڵێم سیاسەتی ئێمە ئەوەیە دەست لە کاروباری ناوخۆی ئێران

وەرنادەین و هیچ پشتیوانییەکی خەباتی کوردەکان ناکەین بۆ ئۆتۆنۆمی و چەکداریان ناکەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئامۆژگاریان دەکەین چەکەکانیان تەسلیمی کاربەدەستانی ئێران بکەنەوە. ئێران و تورك و ئینگلیزەکان باوەڕ بە وتەکانی من و هەڵویست و سیاسەتی ئێمە بەرامبەر بە کوردەکان ناکەن. ڕۆیشتنی سەرۆك هۆزەکانی کورد بۆ (باکۆ) ووتوویژیان لەگەڵ باقیروف تاردایەك ئەم بێ باوەڕیەی ئەوانی بەرامبەر بە ئێمە بەهێز تر کردووە.

ئاڵۆزی کێشەی کورد بۆ ئێمە لەوەدایە کە ئێمە ساڵانێکی دوورودرێژە لەناو ئەم گەلەدا هیچ کارێکمان نەکردووە، پەیوەندی ئێمە بەم کێشەوە بە گوێرەی پێویست روون و ئاشکرا نەبووە، جگە لەوە لەم ساڵانەی دواییدا ئینگلیزەکان پڕوپاگەندەیەکی زۆریان دژی سۆڤیەت لەناو کوردەکاندا کردووە.شوێنەوارەکەشی ئەوە بوو دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر پەیوەندی بازرگانی عەشایری کورد لەگەڵ ناوچەکانی پشت قەفقازی یەکێتی سۆڤیەت پچڕا.

وەك ئاشکرایە تا جەنگی جیهانی یەکەم بازرگانەکانی پشت قەفقازی ئێمە پێداویستییەکانی عەشایری کوردیان وەك شەکر و چای و نەوت و کاڵای ئاسنی و شوشەیان دابین دەکرد و خوری و بەرهەمەکانی تری ئاژەڵیان لێدەکڕین. پساندنی ئەم پەیوەندییە بازرگانییە بوو بەهۆی ئەوەی ئینگلیزەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان کەڵکیان لێ وەربگرن. کێشەی کورد لەم سەردەمەدا گرینگە هەموو داوا لە ئێمە دەکەن بایەخی پێبدەین. سەرەڕای ئەوە بەشێکی زۆر لە کوردەکانی ئێران کەوتوونەتە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی ئینگلیز. ئێمە دەتوانین بەهۆی کوردی ئەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی هێزەکانمان (لە رەزاییە و ماکۆ و خوی و...) رۆڵی سیاسیمان بگوازینەوە بۆ ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز.

فاکتەری هەرە کاریگەر بۆ دەور گێڕانمان لەناو کوردەکان، بێگومان بازرگانییە، ئێمە دەبێ ئەو کەلوپەل و کاڵایانە دابین بکەین کە کوردەکان پێویستیانە تا بزانن ئەم کەلوپەل و کاڵایانە سۆڤیەتین. بەتایبەتی شەکر، چای، قاپ، قاچاخ و شتی وردە، هاوکات لەگەڵ پەیوەندی بازرگانی دەبێ چالاکی کەلتوری هەبێ، دەبێ بۆ چالاکی و کارەکانمان لە ئەزموونی کوردەکانی پشت قەفقازی خۆمان کەڵك وەربگرین. بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندنەواری کوردەکان، لە چاپدانی رۆژنامە، بوونی بەرنامەیی رادیۆ بەزمانی کوردی و نیشاندانی فیلمی سینەمایی کە زۆربەیان سەبارەت بەژیانی گەلانی رۆژهەڵاتی یەکێتی سۆڤیەت بن. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ

کـەڵك لـە کـوردە رووناکبیرەکـانی سـۆڤیەت وەربگـرین، ئەوانـەی لای ئێمـە خوێنـدەواریان تەواوکردووە. ناوەندی کار و چالاکیمان دەبێ لە شاری رەزاییە بێت لەوێ ژمارەیەك خێڵی کورد دەژین کە پەیوەندییەکی نزیك و گەرموگوڕیان لەگەڵ کوردەکانی (وان)ی تورکیا هەیـە. جگـە لەوە لەم ناوچەیە هەندێ توێژی لایەنگری سۆڤیەت لەناو کوردەکاندا هەیە. ئەمە بـوو کورتـە تێبنییەکانی ئێمە سەبارەت بەکێشەی کورد.

بالوێزی یەکێتی سۆڤیەت لە تاران[1]

سیمیرنۆڤ. ئا

نێردراوە بۆ:

مۆلەتۆڤ. ڤ.م

میکویان. ئا. ی

بیریا. ئا. ب

(1) رفیر نیتور لەسەر ئێران. ABHP op. op.

Onuce 6 268 geno i nan. 333 dp 1-3.

## بۆ: هاوڕێ تسوکیرمان

## سەرۆکی بەشی رۆژهەڵاتی کومیسارياری گەل بۆ کاروباری دەرەوە
## (وەزارەتی دەرەوە)

**نهێنی، بەپەلە، ٣ی نەدابری ١٩٣٧**

بەڕێوەبەرایەتی کۆمیسارياى گـەل کاروبـاری نـاوخۆ. (وەزارەتـی نـاوخۆ- کـەی گـی بـێ)ی ئازەربایجان ئاگاداری کردووینەتەوە کە ئەم ئیدارەیە دەسـتیکردووە بـە دەرکردنـی بەکۆمـەڵی ئێرانیەکانی دانیشتووی باکوور،کە تاوانبارو قاچاخچی و پیاوخراپی هەمەلایەنەن.

ئەو ئێرانیانە ژمارەیان دەگاتە دوو هەزار کەس و لانی کەم رۆژانە دەبێ دە تا دوانزە نەفـەریان وەدەر نێن. من پێم وایە کە هەنگاوی ئەوتۆی بەڕێوەبەرایەتی وەزارەتـی نـاوخۆی ئازەربایجـان (کەی گی بی) بێگومان لەلایەن کونسولی ئێرانەوە زوو وەڵام دەدرێتـەوە و نـاوبراو دەسـبەجێ سەفارەتی ئێران لە مۆسکۆ ئاگادار دەکاتەوە و سەفیریش لەم بارەوە ئێـوە ئاگـادار دەکاتـەوە. لەبەر ئەوە دەمەوێ لەکاتی خۆیدا ئێوە لەم هەنگاوەی (کەی جی بی) ئاگادار بکەمـەوە، لـەم بارەوە دەستووری پێویستتان لێوەربگرم[1].

**ئیوانۆڤ**

**فەرمانبەری دیپلۆماسی وەزارەتی ناوخۆ**

---

1- هەمان سەرچاوە onu 6 21

geno 26 17a17 320 d´p. 190

# بۆ سەفیری سۆڤیەت لە ئێران

**١٢ ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٧**

بۆ ئاگاداریتان رادەگەینم: ١٩٣٧/١٠/١٥ ژینراڵ و کونسولێکی تورکیا لە تەورێز هاتنە لام، فەرمانبەرێکی کونسولخانەکەیان بە ناوی سەعید بەگ وەك کونسولی تورکیا بەمن ناساند.
سەعید بەگ پێشان لە وەزارەتی دەرەوەی تورکیاکاری کردووە و سەرۆکی بەشی (ئەرشیڤی) ئەم وەزارەتخانە بوو. هەشت ساڵ لەمەوبەر لە باتووم کونسولی تورکیا بووە. بەژن و منداڵەوە هاتۆتە تەورێز و بەباشی رووسی نازانێ.وتوێژەکانی گەیاندە کێشەی کوردان. ژەنراڵ کونسوڵ بەشانازییەوە رایگەیاند کە ((ئێمە ئەم کێشەیەمان لە تورکیا بۆ هەمیشە بن بڕ کردووە)).

**لیخۆڤ**[٢]

**بەڕێوەبەری ژەنراڵ کونسولی سۆڤیەت لە تەورێز**

زۆر بەڵگە و سەرچاوەی تر باسی گرتن، تەسلیم کردنەوە، دەرکردن، راونان، کوشتن و دوورخستنەوەی هەزاران ئێرانی لە ئازەربایجانی سۆڤیەت و تورکمەنیستان و ئۆزبەکیستان و کۆمارەکانی تری سۆڤیەت بگرە لە رووسیاش دەکات، بەتایبەت کوردێکی زۆر کە پاش تێشکانی بزووتنەوەکانی کوردی خوراسان و گیلان، پەروازەی سۆڤیەت ببوون لەوانە هاوبیرانی خوداوێردی، زلفو، زولفەقار و خالو قوربان و...

ئەو تاوانە گەورەیە ساڵی ١٩٣٧ دەستیپێکرد،تاوانی رژێمەکەی ستالین بوو کە تائێستا هەزاران کتێب و وتاریان لەسەر نووسیوە. بەکۆمەڵ گواستنەوەی گەلانی سۆڤیەت و کوشتن و گرتنی ملیونەها رووناکبیر و خەڵکی بێتاوان جگە لە کوردەکانی ئێران کە قۆناغی یەکەمی بەکۆمەڵ گواستنەوە بوو، ئینجا گواستنەوەی کوردەکانی سۆڤیەت کە قۆناغی دووەم بوو پاش هەڵوەشاندنەوەی کوردستانی سور کە تا ساڵی ١٩٤٤ بەردەوام بوو. لێرەدا ئەم تاوانە گەورەیە بۆ تێبینییەك نییە لەسەر ئەم بەڵگەنامەیە، دەبێ بگوترێت: تەسلیم کردنەوەی ئەو شۆڕشگێڕو

رووناکبیره ئێرانییانه بەفارس و ئازەری و کوردەوە... بەرژێمی رەزا شا کە ژمارەیەکیان گوللە باران و هەندێك زیندانی و هەندێك دوور دەخرێنەوە و هەندێکیان دەخرێنە ژێر چاودێری و خۆناساندنی رۆژانە بەدەزگاکانی پۆلیس تراژیدیایەکی گەورە بوو کە بزووتنەوەی دیموکرات و ئازادیخوازی ئێرانی بۆ ماوەیەکی دور و درێژ تووشی بوو، جگە لەوە تراژیدیای بنەماڵەکانیشیان بوو. ئەو مرۆڤانە لەدەست رژێمە خوێن مژەکەی رەزا شا هەڵهاتبوون و پەنایان هێنابۆ بەر وڵاتی سۆڤیەت کەلای پشتیوانی و یارمەتی گەلان و مرۆڤی ئازادیخوازی لێ دەدا،ئەوانە بەپێ یاسای بنچینەیی سۆڤیەت پەنابەری سیاسی بوون.

ئەگەر لەم راپۆرتەدا تاوانی بێشەرمانەی دزو پیاو کوژ و خراپکاریان..... داونەتە پاڵ، لەبەڵگەکانی تردا تاوانی گومان لێکراو، سەرئەنجام لەسەردەمی جەنگ تاوانی خراپتر لەمەیان داوەتە پاڵ گەلانی تر، وەك کوردەکانی کوردستانی سوور بەبیانووی لایەنگری کردنی ئەڵمانیای فاشیستی و ئاری بوون و هاو هەستییان لەگەڵ ئەڵمانییەکان، تاوانبار دەکرێن و دەکەونە بەر لافاوی ئەنفالیبەلشەفیکی ستالینی و ژمارەیەکی زۆریان بەخۆکوژی و بەربەرەکانێی پۆلیسی پاراستنی سۆڤیەت گیانیان لەدەستدەدەن و ژمارەیەکی زۆریش هەر بێ سەر و شوێن دەکرێن، دوای چەند نەوەیەك هێشتا نەیانتوانیوە شوێنەواری کەسوکاریان بدۆزنەوە. ئەم تاوانەی رژێمی ستالین بەناردنەوەی شۆڕشگێڕان بۆ ئێران دەبێ چ پارێزگارییەکی لەوانە کردبێ و چ یارمەتییەکی گەڕانەوە و لێبوردنی دابن. ئەوەی تەسلیم دەکرێتەوە و بەدەست بەستراوی لەسەر سنووردەدرێتە دەست جەلادەکانی رژێمی شا، تاوانبارە دژی شاو وڵات،خیانەتی کردووە، کۆمۆنیستە، پیاوی سۆڤیەت و بێ دینە..... چونکە لە سۆڤیەت ژیاوە، دەبێ چ سوکایەتییەکیان پێکرابێت.

# سەبارەت بە عەشایری کورد و نیشتەجێکردنیان

**١٩٣٧/٨/٨**

ڕووداوەکانی ئەم دوایەی کوردستان (ڕاپەڕینی کوردەکان) و کۆبوونەوەی مانگی حوزەیران هاوڕێ چورنیخ لە سەفارەت خانەی خۆمان ئێمە و کۆنسولّەکانی هاندا کە جیدی تر لە نیشتەجێکردنی عەشایرە کۆچەرەکان بکۆڵینەوە.

بۆ ئەم مەبەستەش ئێمەی چالاکتر کرد. «گەرچی کەومۆکوڕیمان لە ڕێکخستن و کۆکردنەوەی هەواڵ هەبوو» واتە نەناردنی فەرمانبەرانی کۆنسوڵخانەکان بۆ کوردستان لە نێوان «١١-٦ ئاب» بۆ دڵنیا بوون لەو زانیاری و هەواڵانەی پێشتر بە دەستمان گەیشتبوو. بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لە بارووددۆخی عەشایرەکان ئاگادارین، سەردانی کوردستانیان کرد.

فاکتی ڕوودانی ڕاپەڕینەکە کە لە لایەن فەرماندارى ئازەربایجانی ڕۆژئاوا «٢٦٦» ناڕاستەوخۆ و ساکارانە دانی پێدانا، باسی کوژران و بریندار بوونی پتر لە (٤٥٠) چوار سەدو پەنجا کەس لە هێزەکانی ئێرانی کرد، دەیەویست نیشانی بدا ئەمە ڕاپەڕین نەبووە.

بریندارەکانی سوپای ئێران کە لە نەخۆشخانەی ڕەزائییەدان و بە نهێنی ڕاگیراون، ڕاستی ئەم ڕاپەڕینە دەردەخەن، کوژراو و برینداری هێزەکانی کورد هێشتا نەزانراوە دیارە زیانەکانیان کەم نەبوون.

ڕاپەڕینەکە بە گشتی سەرکوتکراوە بەڵام هەموو هێزەکانی ئێران و توپخانەکەیان هێشتا نەگەڕاونەتەوە ڕەزائییە، چونکە هەندێ گرووپی چەکداری کورد تەسلیم نەبوون و لە چیاکانن. فەرمانبەرانی ڕێگاوبان خەریکی چاککردنەوەی ڕێگای ورمێ کوردستانن.

هۆی ئەم ڕاپەڕینە کە پێشتر بۆمان نوسیبوون زۆربەیان ڕاستن، تەنیا لە چەند ڕوو هەندێ جیاوازی بچووکیان هەیە. بەڵام بەگشتی ناوەڕۆکی هۆکان هەریەك شتە واتە:

ڕاپەڕینەکە لە دوو شوێن لە ناوچەی سەردەشت، واتە لە ناوچەی عەشیرەتی پشدەر کە ئەم عەشیرەتە ئامادە نەبوون لە سوپای ئێراندا خزمەتی سەربازی بکەن، خۆیان بەدەستەوە بدەن و واز لە هاوینە کۆچی سەر سنووری ئێران بێنن.

ئەم کۆچەرانە لە مێژە لە دیوی کوردستانی عێراقەوە بۆ ئەم دیوی کوردستانی ئێران و یان بە پێچەوانەوە وەرزاو وەرز ساڵانە کۆچ دەکەن. سەرئەنجام لە کۆتایی مانگی «ئازار» و سەرەتای حوزەیران سوپای ئێران ڕێگای هاتووچۆی ئەو کۆچەرانە دەبەستێ، ئەمە دەبێتە هۆیەکی سەرەکی ڕاپەڕینەکە.

پارەکە، دەوڵەتی ئێران بەم شێوەی خوارەوە ماڵیاتی لە خەڵك وەردەگرت.

« ٥٥ » شاهی بۆ هەر سەر مەڕ یا بزنێك.

« ٣,٥ » ریاڵ بۆ هەر مانگایەك.

« ٣,٥ » ریال بۆ هەر ئەسپ و گامێشێك.

ئەگەر چی ئەم ماڵیاتە بەرێکوپێکی و لە هەمووان وەرنەدەگیرا و کۆچەرەکان ئەم ماڵیاتەیان نەدەدا.

بەڵام ئەمساڵ دەوڵەتی ئێران بە زۆر لەهەر مەڕ یا بزنێك «٣ ریال»، ئاژەڵی گەورەش وەك گا و گامێش و ئەسپ «٨ ریال»ی وەردەگرت. کۆچەرەکان ئامادە نەبوون ماڵیات بدەن، کاربەدەستانی دەوڵەتیش دەستیان کرد بە تەنگاو کردن وگرتنیان، بەڵام ڕووبەڕووی بەرگری و وەڵامدانەوەی کۆچەرەکان بوونەوە.

دەسەڵاتدارانی ئێرانیش بۆ نیشتەجێکردنی ئەو چەکدارانە دەستیاندایە هەنگاوی توند و تووڵ و کۆچکردنی ئەو عەشایرانەیان بۆ کوێستانەکانیان قەدەغە کرد و ڕێگای هاتووچۆی ئەم دیوو ئەو دیوی سنووریان لێگرتن و..... .

هەرەشەیان لە عەشایرەکان دەکرد کە ئاژەڵەکانیان لەناو دەبەن، ئەوانیش لەوە دەترسان وەك ئەوانەیان لێبێ کە بە زۆر نیشتەجێ کراون و « ٣/١ » سێیەکی مەڕ و ماڵاتی خۆیان لە دەستداوە. ئەوە بوو عەشایرە کۆچەرەکان دەستیان دایە چەك و کەوتنەوە بەرگری لە خۆکردن .

زۆربەی بەرهەڵستی چەکدارانەی ئەم کۆچەرانە سەرکوت کراوە. بەڵام هێمنایەتی بە تایبەت لە کوێستانەکان هێشتا سەقامیگیر نەبووە. هاوکات لەگەڵ ئەم رووداوانە بردنی مەڕ و مالاّت بەرەو عێراق بەردەوام بوو. بە گوێرەی هەندێ سەرچاوەی تاقینەکراوە دوای راپەڕینەکە زیاتر لە سی هەزار «٣٠٠٠٠» سەریان بۆ عێراق بردووە. قاچاخچییەتی و بردنی بەرهەمی ئاژەڵداری و کەرستەی خاو بۆ دەرەوە پەرەی سەندوە، ئێمە زانیارێکی تەواومان لەسەر ئەم سەرژمێریانە نییە و دەسەڵاتدارانی ئێرانیش ئەم شتانەیان بەنهێنی هێشتۆتەوە.

لەبەر ئەوەی هاتووچۆی ئێمەش بۆ ئەو ناوچانە سنووردارە ناتوانین لەو بارەوە بەرێك و پێکی ئامارێکتان پێشکەش بکەین.

لە خوارەوە هەندێ زانیاریتان سەبارەت بە هۆز و عەشایرەکانی کوردستان بۆ دەنووسین:

### ١- عەشیرەتی هەرکی:

یەکێك لە عەشیرەتە گەورەکانە و لە سێ هۆز پێکهاتووە.

١- هەرکی سەیدان.

٢- هەرکی میندان.

٣- هەرکی سەرحەد.

### هۆزی هەرکی سەیدان

کە ئائێستا «٤٥٠» چوار سەد و پەنجا ماڵ یا رەشماڵ دەبن کە دوو سەد و پەنجایان نیشتەجێن و خەریکی وەرزێڕی وئاژەڵدارین. دوو سەد ماڵەکەی تریان زستانان لە دەشتی مەرگەوەر بەسەر دەبەن و هاوینانیش دەچنە کوێستانەکانی چیای زاگرۆس. دەکرێ بڵێین دوو سەد و پەنجا مالیان نیوە کۆچەرن، کە ئەگەر ئاوا نەکەن مەڕ و مالاّتەکەیان لە دەست دەردەچێت کە بە تێکرا «١٠» هەزار سەر ئاژەڵی ورد و شەش سەد سەر گاوگۆل و دوو سەد و پەنجا ئەسپ و باربەریان هەیە.

لە کاتێکدا دوو سەد ماڵەکەی تریان «١٥» هەزار سەرمەڕومالاّت ،هەشسەت سەر گاوگۆل و حەوت سەد ئەسپیان هەیە.پێش پەرشو بلاّو بوون و دابەش بوونی ئەم هۆزە بەسەر ولاّتاندا، نزیکەی پەنجا هەزار مەڕ و بزن و و دوو هەزار سەر گاوگۆل و سی هەزار ئەسپ و بارگینیان

هەبوو. لە سەردەمی شەڕی ئیمپریالیستی، ژمارەی ئەم هۆزە دەگەیشتە هەزار بنەماڵە و ئاژەڵدارێکی دەوڵەمەند بوون.شەر نەك هەر ئەم هۆزەی ماڵ وێران کرد بەڵکو لەسەدا چلی خەڵکەکەشی لەناوبرد.

## هۆزی هەرکی میندان

دووهەم هۆزی عەشیرەتی هەرکییە کە ئێستا ژمارەیان دەگاتە چوار سەد و پەنجا ماڵ کە دوو سەد ماڵ لەوانە نیشتەجێن و لە دەشتی تەرگەوەرن، بەشێکی تریان واتە دوو سەد و پەنجا ماڵەکەی تر هاوینان کۆچدەکەن بۆ چیاکانی زاگرۆس و زستانان دەگەڕێنەوە بۆ عێراق.

## هۆزی هەرکی سەرحەدی

ئەم هۆزە تا جەنگی جیهانی یەکەم دوو هەزار و پێنج سەد ماڵ بووە و شەست هەزار سەر مەڕومالاَت و سی هەزار ئەسپ و بارگێن و دوو هەزار و پێنج سەد سەر گاوگۆلیان هەبووە. ئێستا ئەم هۆزە بەهۆی کێشەی ناوخۆی نێوان شێخەکانی هۆزی سەیدان و میندان لەسەر پاوان کردنی لەوەڕگاکان، زۆر هەژار و لێکەوتوون . ئەم هۆزە ئێستا پێنج سەد رەشماڵی ماوە و ژیانی کۆچەری دەبەنەسەر.

## عەشایری بچووك وە پەرش و بلاَوی ناوچەی دەشتی، مەرگەوەر

لەگەڵ ئەوەشدا عەشیرەتی هەرە گەورە و بە هێزی هەرکی لەناوچەی دەشت و مەرگەوەڕە، هەندێك عەشیرەت و هۆزی بچووك هەن کە نیوە کۆچەر و نیشتەجێن، ژمارەیان سێ سەد و پەنجا تا چوار سەد بنەماڵەیە.

ئەم عەشیرەتە بچووکانە کە هەرکی لاوازبوون و نەیانتوانیوە ببنە خاوەن لەوەڕگا لە ریزی ئەو عەشیرانە بوون کە بۆ یەکەم جار نیشتەجێ کران و دەستیان دایە کشتوکاڵ.

ئەم عەشیرەتە بچووکانە تێکەڵی دانشتوانی تورکی ناوچەکە بوون و بە هۆی ژن و ژنخوازییەوە پێکهاتەی گوندەکانیان تێکەڵ و پێکەڵ بووە، زۆرجاریش عەشایرە کۆچەرەکانی هەرکی زوڵم و زۆریان لێکردوون. گاوگۆلی ئەوانە پتر لە مەڕ و بزنیان زاوزێ دەکەن. بە گشتی ئەم «٤٠٠-

«٣٥٠» ماڵە کوردە نیشتەجێ کراوە، هەشت هەزار سەر مەڕ و بزن و سەد و پەنجا گاوگۆل و هەزار و دوو سەد ئەسپ و بار بەریان هەیە.

## ٢- عەشیرەتی شەمزینان یا بەگزادەکانی دەشت:

ئەم عەشیرەتە دوو سەد و پەنجا بنەماڵەن دەکرێ بڵێین هەموویان نیشتەجێ کراون و خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین، چوار هەزار سەر مەڕ وبزن و هەزار سەر گاوگۆل و دوسەد سەر ئەسپ و باربەریان هەیە. لە کاتی جەنگی ئیمپریالیستی ئەم عەشیرەیە دەگەیشتە حەوت سەد بنەماڵە و و «٣٥٠» هەزار سەر مەڕوبزن و چوارهەزار سەر گاوگۆل و دوو هەزار ئەسپ و بار بەریان هەبووە.

بەهۆی سیاسەتی نیشەجێ کردنی زۆرەملێ، کەم بوونەوەی ئاژەڵ بەرچاو دەکەوێت. رەشماڵ و ماڵەکان لەسێ بەش بەشێکی، مەڕ ومالآتیان لە «٦» بەش بەشێکی،گاوگۆل لە «٤»بەش بەشێکی و ئەسپ و بار بەر لە «١٠» بەش بەشێکی ماوە .

## ٣- عەشیرەتی شوکاك:

بە چەند هۆز دابەشدەکرێت «عەبدۆیی، کۆرکی، کەردال، مامەدی، چنارە، عەبدوئی» و هتد ژمارەی هەمووان دەگاتە دوو هەزار و پێنج سەد ماڵ. تا شەست هەزار مەڕ و دە هەزار بزن و مالآتی شاخداری تر و سێ هەزار و پێنج سەد ئەسپ و بار بەریان هەیە زۆربەیان واتە دووبەشبان کۆچەر و بەشێکیان نیشتەجێ و نیوە کۆچەرن.

باشترین سوارەی کوردستان لەم عەشیرەتەدا هەڵکەوتوون و گەلێکی نا ئارام و چالاکن ، سەرکردەی وەك «سمکۆ، جەعفر ئاغا» ی لێهەڵکەوتووە کە سەرکردایەتی راپەڕینەکانیان کردووە. پیاوە هەرە جەنگاوەرەکانیان لە هۆزی «عەبدوئین».

لەم راپەڕینەی دوایی مانگی حوزەیران شوکاکەکان چ کۆچەر چ نیشتەجێیان چالاکانە بەشداری راپەرینی دژی دەسەڵاتدارانی ئێرانیان کرد.

### ٤- عەشیرەتی سورچی:

ئەم عەشیرەتە جەنگاوەرترین و نائارامترین عەشیرەکانی کوردستانن. هەزار و پێنج سەد بنەماڵەن و شەست هەزار سەر مەروبزن و پێنج هەزار سەر گاوگۆل و «٢» هەزار ئەسپ و بار بەریان هەیە.

ئەم عەشیرەتە کۆچەر و هەرە کولنەدەرە، خۆیان بە خەڵکی هیچ دەولەتێك دانانێن و هیچ سنوورێك ناناسن. هاوینان لە چیاکانی نێوان دالانپەر و زینوێ شێخی دەژین و زستانان بۆ عێراق کۆچ دەکەن.

ئەم عەشیرەتە دوای ئەم راپەڕینەی دوایی لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ عێراق، سوپای ئێران ویستی چەکیان بکا، ئەوانیش بۆ بەرگری لە خۆیان لێیان هاتنە دەست و تا توانیان شەریان کرد دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان لێکوژرا، بەشێکیان چوونە چیا و چەکەکانیان دانەنا تا ئێستاش هەر چەکدارن. بە گوێرەی هەندێ هەواڵ ئێستا خەریکی راو و رووت و چەتەیین.

### ٥- عەشیرەتی زەرزا:

ژمارەیان دەگاتە هەزار بنەماڵە بوار بۆ ژیانی کۆچەری و ئاژەڵداری بۆ ئەم عەشیرەتە کەم رەخساوە بۆیە ناچار بوون لە ناوچەی شنۆ نیشتەجێ بن.

بە گوێرەی ئەو هەواڵانەی کە تاقی نەکراونەتەوە زیاتر لە نیوەیان واتە هۆزەکانی «     » خەریکی کشتوکاڵی گەنم و توتن و ئاژەڵدارین، سی هەزار سەر مەڕ و بزن ، چوار هەزار سەر گاوگۆل و دوو هەزار سەر ئەسپ و باربەریان هەیە. ئەوانی تر زۆربەیان لەبەر بەهێزبوونی عەشیرەکانی تر ناوێرن کۆچ بکەن.

### ٦- عەشیرەتی کرمانجەکان:

**زۆر** هۆزی بچووك بچووك دەگرێتە خۆی، نزیکەی هەزار و حەوسەت بنەماڵەن. زۆربەیان نیشتەجێن و لە ناوچەی رەزائیە دەژین و خەریکی کشتوکاڵی گەنم و توتن و ئاژەڵدارین. نزیکەی دە هەزار حەیوانی شاخدار و سی هەزار مەڕ و هەشت سەد ئەسپ و باربەریان هەیە. زۆربەیان نیشتەجێ و زەحمەتێکشن.

لەم ساڵانەی دوایی دا بە هۆی بارودۆخی هەژاری و نارەزایی لە دەسەڵاتی ئێران، زۆربەی لاوەکانیان بەشداری راپەرینیان کرد و بە خواردن و بارگین و ئەسپ یارمەتی راپەرینەکەیان دا هەندێکیان ژن و منالی خۆیان بەجێهێشت و چوونە رێزی بەرهەڵستکاران.

ئێمە لەم راپۆرتەدا توانیمان باسی شەش عەشیرەتتان بۆ بکەین کە ژمارەی هەموویان دەگاتە هەشت هەزار ماڵ.

گەرچی ئەم زانیاریانەمان نیهێنین، بەلام هەرچۆنێك بێت دیمەنێك لە ژیانی عەشایری کوردمان بۆ کێشان و گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- لە کاتی جەنگی جیهانی ئیمپریالیستی ژمارەی دانیشتوانی کورد زۆر کەم بۆتەوە، ئاژەڵداریشیان لە کەمی داوەو هەژار بوون.

٢- پرۆسەی نیشتەجێ کردنی عەشیرەتەکانی کوردستان چەند ساڵ لەمەو بەر دەستی پێکردووە، هەڵە نییە ئەگەر بڵێن سێ یەکیان نیشتەجێ کراون .

٣- عەشیرەتە نیشتەجێ کراوەکان «٣/١» سێ یەکی ئاژەڵەکانی خۆیان لە دەستداوە و لە کۆچەرەکان خراپتر دەژین.

٤- زوڵمی زۆرتر لە نیشتەجێ کراوەکان دەکرێت تا کۆچەرەکان، ئەوانە بۆخۆشی خۆیان نییە چەکیان بە دەستەوەیە ، بەڵکو بۆ بەرەنگاری و پاراستنی خۆیانە.

٥- زوڵم و زۆرداری رژێم بەرامبەریان لە داهاتوودا دەبێتە هۆی راپەرینێ تر، نیشتەجێ کراوەکان زیاتر لە کۆچەرەکان ئامادەی راپەرین دەبن.

٦- لەبەر ئەوە دەوڵەتی ئێران تا چەند ساڵی داهاتوو لەسەر چەك کردنی ئەو عەشایرانە بەردەوام دەبێ و بە زۆر نیشتەجێ یان دەکات، بۆ ئەوەی سەرباز وماڵیاتیان لێ وەربگرێ و وەك «شاهسوەندیە» کانیان لێبکات.

٧- بە هۆی هەژاری و ئەو زوڵم و زۆرەی لە عەشایری کورد دەکرێ چ نیشتەجێ کراو چ کۆچەر، پێشبینی راپەرینی بەربلاوتر دەکرێ و کۆمەلانی خەڵکی کوردیش بە هانایەوە دەچن.

٨- ئەگەر سیاسەتی دەوڵەتی ناوەندی بەرامبەر بەو عەشایرە نیشتەجێ کراوانە و ئابووریان باش بێت، کۆچەرەکانیش نشتەجێ دەبن.

هەروەك وتمان زانیارییەکانی ئێمە تەواونین و تەنیا باسی «(٨/١ یان ١٠/١)» عەشیرەتەکانی کوردستانمان بۆ نووسین لەسەر زۆر ناوچە و هۆزی ناوچەی سابلاّخ و سەردەشت و ناوچەکانی ترمان هێشتا لێکۆڵینەوە و زانیاریمان نییە. جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە ئاسان نییە. بۆئەم مەبەستە کاتمان پێویستە(1).

روتیر. ئا

ژێنرالی کۆنسوڵی سۆڤیەت لە تەورێز

کۆپی بۆ بالوێزی سوڤیەت لە ئێران

کۆپی بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوە ...

کۆپی بۆ دەزگاکانی ئاسایش و.....

---

(1) هەوال سەرچاوە ل ١٥٧-١٦٣.

# راپۆرتی کۆنسۆڵی سۆڤیەت لە تەورێز

## رۆتیر. ئا. م

**١٩٣٧/٧/٦**

.... نزیکەی لە سەدا شەستی بەرهەمی ئاژەڵداری لە کوردستانەوە دێت سەرەڕای ئەوە نرخی ئەو بەرهەمانە زۆر هەرزانن «لەچاو بەرهەمی پشەسازی» جگە لە گران بوونی کەلوپەلی پیشەسازی کە ئەمانە دەست کەوتنیشیان زۆر زەحمەتە. بە زۆر نیشتەجێ کردنی ئاژەڵدارانی کوردستان کە ژیانی زۆربەیان بەم پیشەوە بەندە و وەرگرتنی مالیات لە لایەن دەسەلاتدارانی ئێرانەوە، بووە بە هۆی راپەڕینی کوردەکان و بە ئاشکرا دەڵێن «ئێمە مالیات نادەینە دەوڵەتی ئێران تارانی پێ ئاوەدان بکاتەوە، بۆ ئێمە هیچی نەکردووە نە بیرێکی ئاوی بۆ لێداوین نە جۆگەیکی بۆ راکێشاوین».

رژێمی ئێران کە هەستی بە راپەڕینی کوردەکان کردبوو کەوتە کۆکردنەوەی هێز و ناردنی بۆ کوردستان، لە «٥ تا ١٠» حوزەیرانی ١٩٣٧ لە تارانەوە هێزێکی زۆری بە تۆپ و چەکی قورسەوە ناردووە بۆ کوردستان.

رێگایی خۆیی ـ رەزائییەیان بەستوە، بۆ گواستنەوەی هێز و چەك و تەقەمەنی دەستیان بەسەر ماشێنی خەڵکیدا گرتووە، ئەو هێزانەی لە تارانەوە دێن بە رێگای هەمەدان-ورمێ دا نێردراون و چەکە قورسەکانیشیان بە رێگای تەورێز-جولفا- خۆی دا ناردەوە. لە «١٨ی حوزەیران» هەواڵی تێکهەڵچوونی کوردەکانمان لەگەڵ سوپای ئێران لەناوچەی شنۆ و سەردەشت و رەزائییە پێگەیشتووە کە تائێستا بەردەوامە، لەو ناوچەیە کوردەکان کە ویستوویانە ئاودیوی عێراق بن، هێزەکانی ئێران پێشیان پێدەگرن. ژمارەی کوردە چەکدارەکان سێ هەزار کەس بووە، دیارە رژێم پێشتر ئاگاداری راپەڕینی کوردەکان بووە، بۆیە دەسپێشخەری کردووە لەناردنی هێزو چەکی قەرس بۆ ناوچەکە، «شێخ عەلی ئاغای ئەسەدی» کە بەڕێوەبەری ناوچەکانی دەشتەبیل و موکری و سەردەشتە، بۆ وتو وێژ لە تاران بووە و هەر لەوێ دەیگرن. بە هاتنی هێزەکان،

ئێران پەرەی بە چەك داماڵینی کوردەکان دا کە بووە هۆی بەرەنگاربوونەوەی کوردەکان. ڕاپەڕینی کوردەکان پێش وەخت دەستی پێکرد، ئەمەش بوو بە هۆی سەرکوت کردنی ڕاپەڕینەکەیان. ڕژێم توانیویەتی «٥» ناوچە چەك بکات واتە «ماکۆ، سەلماس، برادوست، ....» و حەفتا و پێنج هەزار پارچە چەك کۆکاتەوە. ئێستا «٧» ناوچەی خوارەوە ماوە کە چەك نەکراون «دەشتە بێل، شنۆ، سەردەشت، لاجان، سنە، سەقز، موکریان» ئەم ناوچەیەی دوایی واتە موکریانی و دیبوکری هەندێکی چەك کراون. کە دەبینی هێشتا سەد هەزار تفەنگی لێیە و زۆربەیان ئینگلیزی و هەرکامیان پەنجا تا سەد گولەیان هەیە. زۆربەی ئەم چەکانە لە ڕێگای عێراقەوە بە قاچاخ و هەندێکیشیان لە ڕێگای تارانەوە وەدەست ئەم کوردانە کەوتوون. دەوڵەت هەژدە قاچاخچی چەکی گرتوو و هەڵیواسین[1].

(1) .OP رایفیراندوم لەسەر ئێران 21 omul
you. G nanka. 318 jp. 105-107.

# بەشی چوارەم

ئەوەی گرینگە لەم چەند لاپەڕەیەدا پێشینەیەکی مێژووی کوردە لە هاتنی گەزنەفۆن و عەرەبەکان بۆ کوردستان، کە چۆن کورد بەرەنگاریان بۆتەوە ، پاشان باسی ئیمپراتۆری سەلاحەدینی ئەیوبی، ئینجا هێرشی هۆلاکۆ و تەیموری لەنگ و سەرئەنجام باسی ئیمارەتەکانی کوردان دەکات.

دەوری رووسیاش دیارە کە بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتداری موحەمەد پاشای رەواندز هاوکاری سوپای عوسمانی کردووە. سەرەتا عوسمانییەکان بە یارمەتی لەشکری رووس موحەمەد عەلی خدێوی میسر سەرکوت دەکەن ئینجا هێزەکانی عوسمانی دەرفەتیان دەبێ رووبکەنە کوردستان و کۆتایی بە پاشایەتی یامیرایەتی موحەمەد پاشا بێنن.

هەروەها باسی دەوری میسیۆنێرە ئاینییەکانی ئینلگیز دەکا لە هاندانی مەسیحییەکانی کوردستان دژی بەدرخان پاشا.

شەڕی کریم و هاوکاری کوردەکان و رووسیا و دەوری رووسیا لە سەرکوتکردنی شۆڕشی شێخ عوبێدولا.

چۆنیەتی دروستکردنی دەستەکانی حەمیدیە

پەیوەندی کردنی شێخ مەحموود بە تورکەکانەوە:

شێخ مەحموود بە نامە و شاندەکانی چارەنووسی دەسەڵاتەکەی خۆی دەداتە دەست تورکیا و داوا دەکا پەرلمانی تورکیا حوکمداریەکەیبە فەرمی بناسێ .

ئەوەی گرینگ و جێی سەرنجدانە، گێڕانـەوەی ئەحمـەد تەقییـە نوێنـەری شـێخ مـەحموود بـۆ کۆنسۆلی سۆڤیەت دوبسۆن، کە دەڵێت:

«کوردەکان لەگەڵ تورکیا پێکهاتوون و پەیمانێکی دوانزە خاڵییان مۆرکردووە.......

نووسەر لە کۆتاییدا دەڵێت تورکەکان بەم فروفێڵانە سەرئەنجام توانیان کۆتایی بە مەلیکایـەتی شێخ مەحموود بێنن.

ئەم هەنگاوەی شێخ مەحموود هیچ پاساوێکی نییە ، چونکە بەپێی پەیمانی نێوان کورد و تورك، هێزی کورد لەبەر دەستی تورکەکاندا دەبێت و هەر کاتێك بۆ هەر مەبەستێك بیانەوێ دەتوانن بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەتایبەتی دژی ئینگلیز بەکاری بێنن و هێزی تورکیش هەر کاتێك بیەوی دەتوانێ بێتە کوردستان. جگە لەوە شێخ هەوڵیداوە تورك دەسەڵاتەکەی بە رەسمـی بناسـن کـە هێشتا خودی دەوڵەتی نوێی تورکیا لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە رەسمی نەناسراوە.

ئینگلیزەکان بەتایبەت سمکۆی قارەمان و سەید تەها و مستەفا یا مولکی و شـەریف پاشـا و ... دوای بەستنی ئەم پەیمانە شەرمەزاریە زۆر هەوڵ دەدەن شێخ مـەحموود واز لـە تورکـەکان بێنێ، تەنانەت ئینگلیزەکان بۆ وتوویـێژ بـانگی دەکـەن، کەچـی شـێخ لـە بـاتی وەڵامدانـەوە دەکەوێتە شەڕ و ئینگلیزەکان تاوانبار دەکا، نامە و شاند بۆ ئێران و تورکیـا و سـۆڤیەت.... دەنێرێ و داوای یارمەتی و هاوکاریان لێدەکات، کەچی هیچ کامیان وەڵامـی نادەنـەوە هـەتتا بەیاننامەیەکیش لەم بارەوە دەرناکەن.

قۆناغەکانی مێژووی سیاسی کوردەکان و خەباتیان بۆ سەربەخۆیی بەم چەشنەیە:

تەواوی مێژوونووسەکان لەوە یەکدەنگن کە کوردەکان لەو ناوچانە دەژین کە هـەر لـە کۆنـەوە رێگای کاروانە گەورەکانی ئاسیا و ئەورووپا بـە یەکـەوە دەبەسـتێتەوە، گـەلێك جـار گرفـت و نارەحەتیان بۆکاروانەکان دروستکردووە، ئەمەش بۆتە هۆیدلێری و نەبەزییان.

هەر لە ساڵی «٤٥١» بەر لە دایکبوونی مەسیح، گەزنەفۆن بە خۆی و دە هەزارجەنگاوەر بـە وڵاتی «کاردۆخییەکان»دا تێدەپەڕێ کە لە دەوڵەتی فارسەکان سەربەخۆ بووە.

مێژوونووسی بەناوبانگ کرێمسکی دەنووسێت:

کە فارسەکان «مەبەست دەوڵەتی فارسە» تەسلیمی عەرەبەکان بوون، کوردەکان ئازایانە گوێیان نەدایە دەستووری خەلیفە هەمیشە کێشەو نیگەرانیان بۆدروستدەکرد. لە مێژووی عەرەباندا زۆرجار باسی لەشکەرکێشی بۆ کوردستان بۆ بەچۆکداهێنانی دانیشتوانی سەر کێشی کورد کراوە.

نە تەنیا کاروانەکان لەم وڵاتەدا رێگایان لێ ون بووە بەڵکو داگیرکەرە گەورەکانی کۆنیش بە زەحمەت توانیویان بێنە ناو کوردستان. کوردەکان سەرەڕای جەنگاوەری خۆیان جاری وایە تەسلیمی هێرشکەران بوون، بەڵام زیاتر بە رواڵەت بووە، چونکە چیا سەرکەشەکانی کوردستان کە دەسپێڕاگەیشتنیان زۆر ئەستەمە ،باشترین پەناگای کوردەکان بووە لە دەست داگیرکەران و هێرشکەران .

لە سەدەی دوازدەهەمدا سەلاحەدینی ئەیوبی بنەماڵە «پاشایەتی، ئیمپراتۆریەتی» بە ناوبانگی ئەیوبیەکانی پێکهێنا،مەترسی خستە سەر خاچ پەرستان و لە ئۆرشەلیم کۆتایی بە دەسەڵاتەکەیان هێنا.

لە ساڵی ١٣٥٨ کوردستان دەکەوێتە ژێر دەستی مەغۆلەکان واتە هۆلاکۆخان، لە ١٣٨٨ ئۆردوی تەیمور بەوێدا تێدەپەڕێت، کوردەکان «لە ئالاگادی» چالاکانە هێرشی دەکەنە سەر.

بەپێ تێکڕای نووسراوە مێژوویەکان دەردەکەوێ کوردستان هیچ کاتێک بۆ هیچ کەسێ بە تەواوی سەری دانەنواندووە. هەندێ جار سەربەخۆ بووە و هەندێ جار بۆ ماوەیەکی کاتی خۆی بە بەهێزترین دراوسێوە بەستۆتەوە.

مێژوونووسی بە ناوبانگی کوردی سەدەی شانزە «شەرەف خان» لە شەرەفنامەدا بەم چەشنە ژیانی کوردەکان باس دەکات:

«سوڵتانە گەورە و دەسەڵاتدارەکان هیچ کاتێك بەتەنیا نەیانتوانیوە دەست درێژی بکەنە سەر وڵات و خاکەکەیان، تەنیا بە وەرگرتنی دیاری سنووردار بووە، پێیان خۆش بووە وەفاداری و

گوێ رایەڵی کوردەکان بە دەسبێنن، ئەویش ئەوەندەی کە پێویستیان پێ بووە تا وەك هێزێکی یاریدەر کەڵکیان لێوەربگرن».

لە ئەنجامی شەڕی شای ئێران لەگەڵ سوڵتانی تورکیا سەلیم یاوزی ڕەحیم لە ١٥١٦ ،رۆژئاوای کوردستان کەوتە ژێر دەستی تورکان. سنووری نێوان تورکیا و ئێران لەو کاتەوە تا ئێستا هەروا بەبێ گۆڕان ماوەتەوە.

کوردستانی دابەشکراوی تورکیا و ئێران هەروا سەربەخۆیی خۆی پاراستووە. تەنیا هەندێ جار نەبێ لە ژێر گوشاری سوپای ئەم دوو دەوڵەتە، کوردەکان هێزی چەکداریان پێداون(1).

هەتاکو سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم ئەمارات و شانشینی نیوە سەربەخۆ هەبوون. گەورەترین «بەناوبانگترینیان» ئەمانە بوون: بۆتان کە رۆژئاوای ویلایەتی موسڵ و سەنجاقی هەکاری و ویلایەتی بتلیس و رۆژهەڵاتی ویلایەتی دیاربەکر بە ناوەندی جەزیرەوە واتە ئیبنی عومەر و سگیری، گرتۆتەوە.

حوکمدارەکان لە بنەماڵەی عەزیزی سەر بە قوڕەیشییەکان بوون کە هەم لە باری رۆشەنبیری و هەم لە باری ئایینییەوە دەورێکی باڵایان هەبووە.

ئەم پاشایەتییە سەربەخۆیی خۆی تا ١٨٨٠ پاراستووە.

### راپۆرتی «شازادە شاخۆفسکی» ١٩٢٣/١١/٣

بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم دەوڵەتی تورکیالە تێکۆشان دابووە دژی ئەرستۆکراتە سەرکێشەکانی کورد کە زۆرجار لە ژێر دروشمی نەتەوایەتی دژی دەوڵەتی تورك راپەڕیوون.

کە ئاماژە بۆ هەندێ لەم راپەڕینە گرینگانە دەکەین: لەساڵی ١٨٣٠ کوردەکانی ڕەواندزکەڵکیان لە شەڕی تورکیا دژی موحەمەد عەلی خەدێوی میسر وەرگرت و راپەڕین. لە ساڵی ١٨٣٦ سوڵتانی تورکیا بە یارمەتی لەشکری رووسیا خەدێوی میسری سەرکوت کرد،

(1) p. 0732. on8 nan. 158 gelo. 470 1925 jp. 28-43.

هێزێکی زۆر بە سەرۆکایەتی ڕەشید پاشا کە بە کوردستاندا تێپەڕ دەبێت بێ بەزەیانە کوردەکان سەرکوت دەکا.

پاشای بە ناوبانگی کورد لەسەر دەسەڵات لادەبرێت و لە ١٨٥٨ دوردەخرێتەوە. بە دەسکیسی میسیونرەکانی ئینگلیز کوشتاری ئاشووری و کوردەکان بە سەرۆکایەتی بەدرخان و نوراللە خان لە ناوچەی تخوما دەست پێدەکات، هێندەی پێناچێ شەڕی نێوان بەدرخان و برازای یەزدانشیر ڕوودەدات، تورکەکان کەڵك لەم شەڕە وەردەگرن و ناوەندی بۆتان واتا جەزیرە داگیردەکەن و بەدرخان بۆ(کریت) دووردەخەنەوە و پاشان سوپای تورکیا ناوەندە گەورەکانی کوردستان داگیر دەکات.

لە شەڕی «کریمدا» کاتێك تورکیا ناچار دەبێ ژمارەیەك لە هێزەکانی خۆی لە ناوچە کوردییەکان بباتە بەرەی شەڕی رووسیا، دەسبەجێ راپەڕینی گەورە و مەزنی کوردەکان بە سەرۆکایەتی «یەزدانشیر» لە هەکاری و بۆتان دەست پێدەکات.، لە ١٨٨٥ بەتلیس و بە دوای ئەودا موسڵ و پاشان تەواوی ئەو ناوچە بەرینە لە (وان)ەوە هەتا بەغدا دەگرێتەوە.

لەشکەرەکانی تورك لە سگریت تێکدەشکێن و تەفرو تونادەبن: بەرهەڵستکاران هەوڵ دەدەن پەیوەندی بە رووسیاوە بکەن. بەڵام سیخوڕەکانی ئینگلیز بەناوی نێویژی یەزدانشیر فریو دەدەن و دەیدەنە دەست دەوڵەتی تورك.

لە کاتی شەڕی رووسیا-تورکیا لە ١٨٧٦ ژمارەیەکی زۆر لە شێخە کوردەکان پێنشیار دەنێرێن بۆ کۆنسوڵی رووسیا لە ئەرزەڕۆم.

تایبەتمەندی ریبازی سیاسی کوردەکان ئەوەیە هەمیشە کەڵکی لە لاوازبوون و هەر جموجۆڵێکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وەردەگرت بەتایبەتی لە شەڕەکان. گەورەترین راپەڕینی کوردان راپەڕینی ١٨٨٠ یە کە سێ ساڵ درێژەی کێشا.

لە ١٨٨٠ کۆنگرەیەکی بەرفراوانی سەرکردە کوردەکان لەوان و هاوکات لە شەمزینانیش دەبەسترێت.

کارتسۆڤ. یادداشتەکانی لەسەر کورد لە ١٨٩٦ لە تیفلیس لە چاپداوە.

گەورەترین شوێن بۆ هێرشی لەشکەری کوردەکان ئەم جارە کوردستانی فارس هەڵدەبـژێردرێت. چـۆنیەتی ڕێـڕەوی ئـەم ڕاپەڕینـە «مینورسـکی. ق. ق.» دەنووسـیت: «مەبەسـت دیـسان سەربەخۆیی کوردستان بوو، بەڵام ئەمجارەیان کوردستانی فارس پـێش بینـی کرابـوو. هێزێکـی زۆری کوردەکان هێرش دەکەنە سەر ناوچەکانی دەوورووبەری ورمێ و شاری ورمێ گەمارۆ دەدەن بە دەوری گۆلی ورمێدا دەڕۆن لە لای ڕۆژهەلات بناو دەگـرن و لـەوێوە دەڕۆن بـۆ تەورێز،شـار دەشلەژێ، جادەو شەقامەکان سەنگەر بەند دەکرێن، کۆنسوڵی ئێمـە ئارشـیڤ دەگوێزێتـەوە. چەکدارەکانی ماکۆ بۆ ڕزگاری ورمێ دەنێردرێن، هێزێکی تایبەتی ئێمە لـە «نەخجـەوان» بـە سەرۆکایەتی ژنێراڵ ئالخارۆڤ لەسەر سنوور ئامادە دەکـرێ، فارسـەکان لـە لای مەراغـەوە بـە ڕەنگاری کوردەکان دەبن، کوردەکان دەشکێن و پاشەکشە دەکەن.

« سەرەتای لەشکەرکێشی بۆ سەر فارسەکان لە بەهاری ١٨٨٨،شێخ عوبێـدوڵا تـەنیا هـەزار چەکداری سوارەی دەبێت. بـەڵام هەنـدەی پـێ ناچـێت عەشـیرەتی بـەهێزی بلبـاس و هـۆز و خێڵەکانی تری کوردستانی فارس دێنە ریزی بەرهەڵستکاران وبە ئاسانی دەست بەسەر گـەلێك شاری وەك سابلاخ دا دەگرن.

لە ترۆپکی پەرەگرتنی ڕاپەڕینی شێخ عوبێدڵلا ژمـارەی لەشـکرەکەی دەگەیـشتە چـل هـەزار نەفەر. دوای چەند تێشکانێك نەخۆشی و ئاژاوە دەکەوێتە ناو لەشـکرەکەی، تورکـەکان کـەڵك لەم دەرفەتە وەردەگرن و کوردەکـان سـەرکوت دەکـەن و ڕێبەرەکـەیان واتـە شـێخ عوبێـدوڵا دووردەخەنەوە بۆ مەککە.

دوای هەر سەرکوت کردنێك تورکەکان بێرەحمانە بنەماڵە ئەرستۆکراتەکانی کورد لەناو دەبەن و بەم چەشنە دەگەنە مەبەستی خۆیان. شێخەکان جێی ئەریستۆکراتە کوردەکانیان گرتەوە.بۆیـە سیاسەتی سوڵتانەکان بۆ لەناوبردنی ڕێبەرانی کورد و بە پلەوپایە یا بە پارە کڕین توانیویانـە تائێستا هاوسنگی نیوان خۆیان و کوردەکان ڕابگرن .جگە لەوە متیۆدێکی تریان بە کارهێناوە واتە هاندانی عەشیرەتێك دژی عەشیرەتێکی تر. سەرئەنجام لە سەردەمی دەسەلاتداری سـوڵتان

عەبدولحەمیددا بەتەواوی دەستیان گەیشتە کوردە سەربەخۆبووەکان وپرۆژەی دروستکردنی سوپای حەمیدییە یان بۆ عەشیرەتەکانی کورد هێنایە گۆڕێ. لە ١٨٩٠ دەستوری سوڵتان دەردەچێت کە بە پێی ئەم دەستوورە تەواوی عەشیرەتەکان دەبێ لە دەستەکانی حەمیدییەدا خزمەت بکەن، لە بەرامبەردا کوردەکان لە هەندێ مالیات و خزمەت کردن دەبەخشرێن.

**ناوەڕۆکی ئەم دەستوورە بەم چەشنەیە:**

هەر عەشیرەتێك دەبێ ژمارەیەك چەکداری بە ئەسپی خۆیەوە لە سوپای حمیدییەدا هەبێ. هەندێ دەستەی تایبەتی بۆ ناو نووسین دیاری کراوە.

فەرماندەی ئەم دەستانە ئەفسەرانی تورکن و سەرۆك عەشیرەتەکانیش یاریدەری فەرماندەن. دەستەکان ژمارەیان ٥١٢ سوارە، ساڵانە بۆ مەشقکردن کۆدەبنەوە. هەرکام بۆ خۆی ئاڵایەکی هەیە، تەنیا لە کاتی مەشق کردندا چەکی دەوڵەت و جل وبەرگیان پێدەدرێت. لەساڵی١٨٩١ تێکڕای ئاغا و شێخەکان بۆ وەرگرتنی دەستووری نوێ سەبارەت بە ڕێکخستنی دەستەکانی حەمیدییە کۆبوونەوە. ئەم کارە بەربڵاوە سەرکەوتنی کەمی بە داواوە بوو. ئەم دەستانە هەرگیز نەیانتوانی بە تەواوی کۆببنەوە، کوردێکی زۆریش ئامادە نەبوون بەشداری بکەن. ڕێکخەری ئەم دەستانە جەنراڵی تورك «موشیر زەکی پاشا» بوو لە ١٨٩٢ بە تاقیکردنەوە و تێڕوانین لەم دەستانە لە پرۆژەکەی خۆی سارد بۆوە. هەر چۆنێك بێ نزیکەی پەنجا دەستەی کۆکردەوە کە ژمارەیان دەگەیشتە دوانزە هەزار سوار،بەڵام هیچ شتێکی نوێی لە رواڵەت و دیمەنی ئەم دەستانە بەدی نەکرد، هەر ئەو کوردە بێ دیسپلین و ئازادەی جاران بوون.

لە ١٨٩٣ لە ئەستانبوڵ و بەغدا چەند قوتابخانەی عەشیرەتی دامەزرا کە مەبەستیان فێرکردنی خۆشەویستی و وەفاداری لاوە کوردەکان بوو بۆ تورکیا. ئەم قوتابخانانەش زۆریان نەخایاند، تورکەکان تێگەیشتن کە دەبێ حەمیدییە بگۆڕن و بیکەنە هێزێکی ڕێکوپێکی سوکە سوارە واتە «سوارەی خەفیف». تورکە لاوەکان کە لە ١٩١٣ لەسەر دەسەڵات بوون یاسای نوێیان دەرکرد بۆ راکێشانی عەشیرەتە کوردەکان تا لەو دەستانەدا خزمەتی سەربازی بکەن. خاڵی یەکەمی یاسایەکەی سوڵتان عەبدولحەمید کەخۆی ئیمزای کردووە دەڵێ:

«ئەندامانی هەر عەشیرەتێك کۆچەر یا ناکۆچەر لە ناو خاکی ئیمپراتۆری عوسمانیدا بە پێی پێویست و بڕیاری دەوڵەتی دەستەکانی سوارەی حەمیدییە لە سوارچاکی عەشیرەتەکان پێکبێنن ».

بە دەم چەورکردنی سەرکردەکانی کورد دەوڵەتی تورك بەخشیشی زۆری دەدایە ئەوانە. خاڵی (٤٧)ی ئەم دەستوورەی سوڵتان دەڵێ: (ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی چوار گروپی تەواو پێکبێنن پلەی عەقید (واتە سە ئەفسەر)یان دەدرێتێ. ئەو عەشیرانەش کە ٢ تا ٣ گروپی سوارە پێکبێنن ئەفسەری سێ ئەستێرەیان پێدەدرێ پان پێ دەدرێت و دەبنە سەرۆکی سوارەی حەمیدییەی ئەو عەشیرەتە). ئەم دەستوورە بە پێی ژمارەی سوارەکان پلەکانی تر دیاری دەکات. بۆ وەرگرتنی پلەی بەرزتر بۆ ئەفسەرەکان هیچ مەرج و سنوورێك دانەنراوە، تەنیا ئەوە نەبێ ،ئەو کەسانەی تەمەنیان گەیشتۆتە ١٨ ساڵ لە سەرکاری خراپ دادگایی نەکرابن و مرۆڤێکی باش و بەرێز بن». ئەم یاسایە تائێستاش هەروا ماوەتەوە. شەڕەکانی پێشو وانیشان دەدەن کە کوردەکان زۆر کەم و بەنا بەدڵی بەشداری شەڕەکانی تورکیا و سوپای رووسیایان کردووە.

هەندێ لە سەرکردەکانی عەشایری کورد وەك «سمایل ئاغای سمکۆ لایەنگری رووسیا بوون. جگە لەوە کوردەکان هەمیشە دژی ئەو سیاسەتە بوون تورکەکان سنووریان بۆ دابنێن، بە گشتی کوردەکان هێزێکی جەنگاوەر، خۆڕاگر و بەنرخ بوون بەتایبەتی بۆ شەڕی بچووك، بێ وێنەن . کوردناس «باریس شاخۆڤسکی» بەم چەشنە لە جەنگاوەرە کوردەکان دەدوێ:

(زۆر ئازا، نەترس، تفەنگچی و گورج و گۆلن، بە چەشنێك هیچ کەس تایان ناکات. لەوانە، واتە کوردەکانی دەرسیم، دەتوانرێ هێزێکی پیادەی ئەوتۆ دروست بکرێ لە گورج و گۆڵی و پیادەرۆیی لە هێزی سوارە کەمتر نەبن).

سەرەڕای ئەو مانۆڕە سیاسیانەی سوڵتان کە ئاواتی راکێشانی کوردەکان بوو،سەرکەوتوو نەبوو، راپەڕین دژی رژێمی تورکیا هەر بەردەوام بوو.

لە ١٩١٠-١٩١١ راپەڕینی کوردەکانی دیاربەکر بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم پاشا عەبدوڵا قادر و ئەو کەسانەی سوڵتان کردبوونیە سیناتۆر، واتە «حوسێن پاشا، حەسەن بەگ و کامیل بەگ»

پەرەی سەند و کوردەکانی بۆتان و ناوچەکانی ناوەڕاسی رووباری دیجلەیان هەژاندبوو. ئەم راپەڕینەش بە هۆی ژەهرخواردکردنی سەرکردەی راپەڕینەکە حوسێن پاشا لە لایەن دوکتۆرێکی تورکەوە کۆتایی هات.

لە ١٩١٦ بە بەشداری سیخوڕەکانی رووسیا راپەڕینێکی گەورەی کوردەکان ئامادەکرا، کە دەبوایە لە «١٨»ی نیسانی ١٩١٤ وەدەست پێبکات، بەڵام تورکەکان پێدەزانن، کامیل بەگی کوڕی بەدرخان سەرۆکی راپەرینەکە ناچار پەلە دەکا و راپەڕینەکە لە «٧»ی مارت لە بەتلیس دەست پێدەکات. لەبەر ئەوەی راپەڕینەکە پێش وەخست دەستی پێکردو لە کاتی دیاریکراو دانەبوو، ناوەندە گەورەکانی رۆژهەڵات ئاگادار نەکرابوونەوە و ئامادە نەکرابوون، دەرفەتی دا بە تورکان راپەڕینەکە لەناو بەرن. سەرکردەی راپەڕینەکە لە لایەن سەربازانی رووسەوە لە ئەستانبۆڵ دەڕفێندرێ و دەنێردرێت بۆ تیفلیس (راپۆرتی شاخۆڤسکی ١٩٢٣/١١/٣ بوونی ئیمپراتۆریە ناوەندییەکە تورکیای تورکە گەنجەکانیش لە لایەن ئانتانتەکانەوە بەسەربەرەوخوار هەڵواسرا. ئەفسەرە ئینگلیزەکان لە (مەدرەس) لەسەر پاپۆڕ مەرجەکانی ئاشتبوونەوەی خۆیان بەسەر تورکاندا سەپاندو تورکیایان کردە کۆلۆنی دەوڵەتە ئیستعمارییەکان. بەم چەشنە کێشەی کورد ئاستێکی نوپی بەخۆوەگرت.

لەسەر لاشەی مرۆڤە نەخۆشەکە(ئیمپراتۆری عوسمانی کە کوردستان چارەکێکی خاکەکەیەتی) دەوڵەتە ئیستعماریەکان دوایین عەمەلیاتی خۆیان ئەنجامدا. ئیتالیا ئەدەنەی وەرگرت، یۆنان سیرنۆو بەشێکی قەرەکلیسی پێبرا، سوریاو کیلکی تادەگاتە سیواس کەوتە ژێر دەستی فەڕەنسا. میزۆپۆتامیا و عەرەبستان درایە دەست کۆمەڵگای نەتەوەکان و ئینگلیزەکانیش ئەرمینیای مەزن دادەمەزرێنن کە لە دەریای رەش و دەریایی ناوەڕاستەوە دەست پێدەکات. لەسەر ئەم زەمینەیە، واتە دابەشکردنی ناوچەکە، دەوڵەتی نوێی وەك عێراق و سوریا و ئەرمینیا و.....یان، دروستکرد. هەستی نەتەوایەتی کوردەکانیش بزوت بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی کە خاکی ئەرمینیای گەورەشی دەگرتەوە.

سەرکردەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد کە ئەم رووداوانە خافڵی کردبوون، کەوتنە سەر دووریانێك، بەشێك لە کوردەکان بە سەرۆکایەتی عەبدولقادر، پەیرەوی ئینگلیز و بەشەکەی تر

پەیڕەوی فارسن و بەشی سێهەم سەربەخۆیی کوردستانی دەویست. ئەندامانی دەستەی نوێنەرایەتی تورکیا لە کۆنفرانسی ڤەرسالْ کەکلیمانسۆ و لوئید جۆرج ئامادەنەبوون لەگەڵ تورکەکان وتووێژ بکەن. شەریف پاشا لە بەرپرسی دەستەی نوێنەرایەتی تورکیا دێتەدەرێ و خۆی بە نوێنەری کوردستان رادەگەێنێ.

هەروەها نوێنەرانی تری کوردستان لە لایەن رێکخراوە کوردییەکانەوە نێردران بو ڤەرسای، بەلاّم هیچ شتێکی ئەو تۆیان دەست نەکەوت. لە پشتەوەی ئەم دیپلوماسیەتە نادیار و نهێنیانە، پسپۆڕەکانی ئینگلیز لە کوردستان کەوتنە چالاکی گورج وگۆڵ.

ئینگلیز کە لە ئەنجامی شەڕەکانی خۆی لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاست دوو ملیۆن کیلۆمەتردووجا خاکی دەست کەوتبوو، بە بەراورد لەگەڵ خاکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبوومشوری پاراستنی بخوات ئەویش بە دروستکردنی دەوڵەتی جیاجیای وەك ئەرمینیا و عێراق و کوردستان.

کوردستان جگە لە بواری ئابووری و سیاسی لە رووی ستراتیجییەوە بۆ ئینگلیز زۆر بایەخدارە. هەر لە کۆنەوە تائێستا رێگای کاروانەکان بە خاکی کوردستاندا تێدەپەریوە کە هیندوستان بە ئەوروپاوە گرێدەدا، داگیرکەران هەر لە ئەسکەندەری مەقدوینەوە بگرە تائەوانی تر، لێرەوە دەستیان گەیشتۆتە هیندوستان.

کوردستان بەهۆی سنووری ئەتنۆگرافییەوە لە ژێر حیمایەی ئینگلیز، فاکتەرێکی سەرەکی بووە بۆ پاراستنی نە تەنیا عێراق و موسڵ بەڵکو بۆ هیندوستانیش. سەختی چیا سەرکەشەکان کە بەناو کوردستاندا کشاون قەلاّتێکی لە گیران نەهاتووی سروشتیین کە پارێزگاری موسڵ و عێراق و باشووری فارس و پاشان بلوچیستان لە باکوورەوە بۆ رۆژئاوا، دەکات. جگە لەوە ئینگلیزەکان بە دەست بەسەر داگرتنی کوردستان دەتوانن گوشاری خۆیان بخەنەسەر سوریای فەرانسا و ئانازۆلی تورکیا و فارس و ئاژاوە بنێنەوە لە قەفقازەوە زەمینەی دەست پێڕاگەیشتنی نەوتی باکوور برەخسێنن.

کوردستان بـۆ ئینگلیزەکـان و سیـستمی ئیمپریالیـستی، لـە رادەبـەدەر بایـەخی سیاسـی و ستراتیجی هەیە. بۆیە لە خەرجکردنی سەخاوەتمەندانە درێغی ناکەن ،بۆ هێنانی کوردەکـان بـۆ ناو گۆڕەپانی سیاسی زۆر چالاکانە کار دەکەن.

بە رووخانی رووسیای قەیسەری کوردستان بۆتە پـاوانی ئینگلیزەکـان. لـە سـاڵی ١٩٣٠یـەوە وەبگرە تا ئەمڕۆ ئەجیندای ئینگلیز راپەڕینەکان رێکـدەخاو ئـاژاوە لـە باشـووری کوردسـتان دەنێتەوە. دەبێ ئەوەش بگوترێ، سەرەڕای ئەو هەوڵانەش هێشتا ئینگلیزەکان نەیانتوانیوە بـە مەبەستەکانی خۆیان بگەن واتە کوردستانێکی سەربەخۆ دروست بکەن.

سەبارەت بە ئیش و کاری ئەجیندای ئینگلیز لەناو کوردەکانـدا لـە کـاتی پـەیمانی مـەدرەس (١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨)ەوە تا بەستنی پەیمانی سیڤەر (١٠ی ئـابی ١٩٢٠)، فـەوزی بەگ کوردی دیاربەکر کە لایەنگری تورکانەو وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتییە لە وتووێژی خۆیدا لە ١٩٢٤/١٢/١٥ رایگەیاند: دوای پەیمانی مەدروس، کۆمەڵەی ناوچەکانی ئانادول پێکهات، کە مەبەستی سەرەکی ئەوەیە کوردەکان بە هاوڵاتی تورکیا بهێڵێتەوە. ئۆرگانی ئەم کۆمەڵەیە رۆژنامەی (حادیس)ە کە «سولیمان نازیم» دەریدەکا.

هەورەها کۆمەڵەی «بۆ پێشکەوتنی کوردان» یا «بیری پێـشکەوتنی کـوردان». دامـەزرا لـە هەواڵنامەی بیروی چاپەمەنی نوێنەرایەتی سۆڤیەت لە تورکیـا ژمـارە ٣ لـە(١٩٢٤/١٢/١٢ وەگیراوە).

لەسەر لێکۆڵینەوەی ئەم وتووێژە لە رۆژنامەی «ڤۆڵێنتـا»ی ١٩٢٤/١٢/١١ هـاتووە: مـاوەی دوانزە ساڵە، دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد، یەکێکە لە مەبەستەکانی ئینگلیز لە رۆژهەڵات. هەموو سەرە داوەکانی ئەم تۆڕی ئاژاوەیە لە دەست (رێیان) باڵوێزی ئینگلیز دایە. دوای بەستنی پەیمانی ئاشتی، (رێیان) بە پەلە کوردەکانی دانیشتوانی ئەستانبۆڵی بانگ کرد و لەوانە قەنبور عیزەتی بە تۆبزی کردە وەزیری ناوخۆی دەوڵەتی ئەستانبۆل تـا بـە بەڵێنـەکانی خۆی زەمینەیەکی لەبار بۆ هەڵسوڕاندنی کێشەی کورد بـۆ ئینگلیزەکـان ئامـادە بکـات. لـە دەست پێشخەری دووهەمدا بە سولیمان برای قەنبور عیزەت دەڵێ کۆمەڵەی کورد لـە پیـاوە

ناسراوەکانی شار پێکبێنێ. ئەم دەستوورەش بە تەواوی جێبەجێ دەکرێ و سولیمان «کۆمەڵی پێشخستنی کوردەکان»ی پێکهیناو بەدرخانییەکانیش چوونە ناوی. سەرکردایەتێکەی درایە سەید عەبدوڵا قادر. بۆ روو بە رووکردنەوەی ئەم کۆمەڵەیەی ئینگلیزەکان، ئەجینداکانی تورکیاش «کۆمەڵەی شەش ولایەت» یان دروستکرد کە هەوڵیاندا لەگەڵ کۆمەڵەی یەکەم پێك بێن، بەڵام سەرنەکەوتن.

هەر ئەو رۆژنامەیە ئاماژە بەوە دەکات، «هاندەری سەربەخۆیی کوردان» واتە ئەجینداکانی ئینگلیز، ئەمین بەدرخان، خالید پاشا و دوکتۆر شوکری مەحموور بوون. لە سایەی پشتیوانی (رێیان) ئەمانە توانیان هەندێ خاڵ بۆ سەربەخۆیی کوردستان، بخەنە ناو ئەم پەیمانەوە، دوای ئەم هەموو فڕ و فیڵە ئینگلیز لە پەیمانی سیڤەردا (١٠ ئابی ١٩٣٠) رێبەرایەتی خۆی بەسەر کوردستاندا دەسەپێنێ و بەپێی ئەم پەیمانە، تورکیا بە فەرمی دان بەئۆتۆنۆمی کوردستان دادەنێ، کە رۆژهەڵاتی لە فورات و باشوری لە ئەرمینیا بێت. پاشان پەیمانەکە ماف دەدا بە کوردستان داوا لە ئەنجومەنی باڵای کۆمەڵەی نەتەوەکان بکات سەربەخۆیی تەواویان بداتێ (بەشێکی پەیمانی سیڤەر). هاوکات لەگەڵ بە رەنگاری ناسیۆنالیستەکانی ئەنادوڵ و جێبەجێ نەکردنی پەیمانی سیڤەر، ئینگلیزەکان راستەوخۆ لە کوردستان دەسبەکار بوون. بۆ ئەوەی هێزەکانی تورکیا لە بەرەی شەڕی یۆنان لاواز بکەن و لە بەرەی پشتەوەی شەڕ کەوتنە ئاژاوە نانەوە و یارمەتی دانی بزووتنەوەی کورد و مەلیکایەتی سەربەخۆیی کوردستان لە سلێمانی.... .

لە ١٩٣١ کوردەکان بە سەرۆکایەتی جەمیل چەتۆی ئازا و ناودار لە رۆژهەڵاتی سگیرتا (بۆتان) راپەڕین،کەچی تورکەکان بێ بەزەییانە سەرکوتیان کرد.

بە رای «پاریس شاخۆڤسکی» ئەم راپەڕینە دەستی بەدرخانییەکانیشی تێدابوو. چونکە ئەجینداکانی قەیسەر لە ١٩١٦ وە پەیوەندی یان بە جەمیل چەتۆوە هەبووە کە یەکێك بووە لە بەگە وەفادارەکانی بنەماڵەی بەدرخان. بەهاری ١٩٢١ راپەڕینێکی زۆرجدی کوردەکان لە زاری سەر بە ویلایەتی سیواس تا دەگاتە دەرسیم پەرەی سەند. بۆ سەرکوت کردنی ئەم راپەڕینە

کەمال پاشا بە دەستە چەکدارە لازەکانی خۆیەوە لافاوی خوێنی لە ناوچەکانی راپەڕین وەگەڕ خست. بۆیە ئێستا کوردەکانی ئەوێ زۆر دژی تورکن.

بەپێ سەرچاوەکانی تر راپەڕینی ١٩٢١ کوردەکانی ناوچەی دەرسیم و زاری بێ بەزەیانە سەرکوت دەکرێ و چەند گوند بۆمباران دەکرێ و باندەکانی ئوسمان تۆپاڵ و تەواوی ناوچەکە تالان دەکەن (سەرچاوەی ١٥ رۆژی ١٩٢٤/١/٢٠). ماوەی نێوان کۆتایی ساڵی ١٩٢١ را تا کۆتایی ١٩٢٢ پڕە لە راپەڕینی کوردەکان بە سەرۆکایەتی سمایل ئاغای سمکۆی کە ناوبانگی دەرکردووە.

سمایل ئاغا سەرۆکی عەشرەتێکی بچووکی رێگری عەبدۆیە کە لە عەشیرەتی شوکاك جیابۆتەوە. بارەگای سەرەکی ئەم عەشیرەتە قوتور بوو لەبەری ئەو بەری سنووری تورکیا. بەڵام پاشان مەحاڵی چارێك قەڵا دەگرێ و لە قەڵای چارێك قەڵا جێگر دەبێت، رێگای پاش قەڵات زۆر لە سنووری تورکیا دوور نییە. (ب. شاخۆڤسکی).

برای سمکۆ جەعفەر ئاغا لە لایەن کاربەدەستانی فارسەوە لە تەورێز کوژرا. لە کاتی شەڕ سمکۆ هاوکاری رووسەکانی کرد، بە لە ناوچوونی بەرەی قەفقاز سمکۆ چەك و تەقەمەنییەکی زۆر کۆ دەکاتەوە.

لە ١٩١٨ و ١٩٣٣ سمکۆ دژی ئەرمەنی و ئاشوورییەکان خەبات دەکات وە لە ١٩١٨ ناوبراو قەشەی ئاشوورییەکان واتە مارشیمعون بینیامین دەکوژێت.

لەم ماوەیەدا سمکۆ لەگەڵ تورکەکان ئاشت دەبێتەوە وپەیوەندی بەکازم قەرەبەکر پاشاوە دەکا کە قاتلی داشناکەکانە لە قەفقاز. لە ١٩٣٠ سمکۆ لەناو ئێران دەست بە چالاکی دەکا. هاوینی ١٩٣١ سمکۆ دەبێتە خاوەنی ورمێ و دەسەڵاتی بەسەر ناوچەکانی رۆژئاوایی گۆڵی ورمێدا دەبێ و شاری (خۆی) گەمارۆ دەدات و لە سابڵاخ هێزەکانی فارس تێکدەشکێنێ.

سمکۆ هاوکات رۆژنامەی «کوردی» لە چوارقەڵا دەردەکا و بیروباوەڕی ناسیۆنالیستی کورد بڵاودەکاتەوە.

لە شەڕەکانی ١١ تا ١٥ی ئابی ١٩٣١ سمکۆ لە لایەن هێزەکانی فارسەوە دەشکێ و رادەکاتە تورکیا. لە ئەیلەلی ١٩٣٣ تورکەکان لە پەیوەندی سمکۆ و ئینگلیز ئاگادار دەبن، پێکەوە لەگەڵ هێزەکانی فارس لە ناوچەی قەرەحیسار سمکۆ دەشکێنن، ژنەکەی و کوڕەکەی خوسرەو بە بارمتە دەگرن.

رۆژنامەی تورکی «جمهوریيەت» لە ١٤ سیپتامبری ١٩٢٤ وتوویژی سمکۆ بڵاودەکاتەوە. ناوبراو دەڵێ: لەم تێکهەڵچوونانەی دوایی لەگەڵ ئەرمەنی و فارسەکان، نەیارەکانی بە فێڵ جل و بەرگی سوپای تورکی لەبەر سەربازەکانی خۆیان دەکەن، کە لەم فڕوفێڵە گەیشتم شەڕم راگرت، لە رێگای وان بۆ باش قەڵا هەندی چەرکەس بە سەرکردایەتی کازم و نەجمەدین هێرشیان کردە سەرم. (تورکەکان بۆ خۆیان ئەم شتەیان لە زمانی سمکۆوە نوسیووە بۆ ئەوەی تاوانەکانی خۆیان داپۆشن).

تورکەکان بەم دوایانە توانیویانە سمکۆ بۆ لای خۆیان راکێشن و ژن و کوڕە دیلەکەی بەردەن. بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ سمکۆ، هەشت گوندی بە سەد و بیست ماڵەوە پێدەدەن، لە رۆژی ٢٠ی تشرینی دووەمی١٩٢٣ ژن و کوڕەکەی دەگەڕێنەوە بۆ گوندی قەرەتوو، نشینگەی سمکۆ.

لە باشووری کوردستان لە سلێمانی لە کۆتایی ١٩٢٢ ئینگلیزەکان شانشینی کوردی یان بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود دروستکرد و ناوی «مەلیکی کوردستان» یان بە شێخ بەخشی.

شێخ مەحموود یەکێك لە بنەماڵە بە رێزو کۆنەکانی کوردە کە رەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ ئیمامی عەلی و حەزرەتی فاتیمە. بنەماڵەی شێخ مەحموود بە سەرۆکایەتی باوکی واتە سەید رەسول لە موسڵ دەکەوێتە داوی تورکەکان و دەیکوژن و پارچەپارچەی دەکەن. مەحموودی دە ساڵەیش لەم لافاوی خوێنە رزگار دەبێت. بە درێژایی ١٩١٧-١٩١٨ شێخ مەحموود چالاکانە لەگەڵ تورکان دەکەوێتە خەبات دژی ئینگلیز، پاشان ئینگلیزەکان دەیگرن و دووری دەخەنەوە بۆ بەسرە و دوو ساڵ لە تارێکخانەکان زیندانی دەکرێت، سەرئەنجام لە ١٩٢٢ ئازاد دەکرێ و دەکرێتە مەلیکی کوردستان. هاوکات لەگەڵ وەرگرتنی ئەم نازناوە، شێخ مەحموود بەنهێنی

لەگەڵ ئۆزدەمیر پاشا فەرماندەی هێزەکانی تورك لەسەر سنووری عێراق و کۆنسوڵەکانی ئێمە و کۆمیتەی کوردی بەردەوام پەیوەندی پەیدا دەکات.

لە نامەیەك کە بۆ کۆنسوڵمان لە تەوریزلە ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣ لە لایەن شێخ مەحموودەوە نێردراوە دەڵێت: (تەواوی گەلی کورد لە کوردستانی باشوور ئامادەیە لە ژێر فەرمانی ئێوە بێت لە پێناوی دەوڵەتی بەرێزی رووسیا یارمەتی و قوربانی بدات و بەکردەوە و بە گیانێکی دۆستانە هەموو دەستوورەکانی، هەر دەستوورێك بێ، جێبەجێ بکات.....گەلی کورد داوای بە رەسمی ناسینی مافی نەتەوەیی خۆی دەکات). لە کۆتاییدا شێخ مەحموود داوای یارمەتی دەکات. (پیرس ڤودکا بیردی بلاوکراوەی ژمارە ٧ ئەیلولی ١٩٢٣). دەمەو پچڕانی بە یەکجاری پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئینگلیزەکان شێخ مەحموود کە لە رێگای دەستەی نوێنەرایەتی خۆیەوە نامەیێك بۆ ئانکارا دەنێرێت، دەڵێ: «بەپێی بڕیاری زۆر بەی سەرۆك عەشیرەتەکان بۆ بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد لە کوردستانی باشوور دەوڵەتەکەی بە کۆی دەنگ بڕیاری داوە، لە کوردستانی باشوور بەڕێوەبەرایەتی گەلی دابمەزرێنێ وەك (ئەوەی پەرلمانی تورکیا) و چارەنووسی کوردستانی باشووریش بداتە دەست پارلمانی تورکیا.

ئەم پەیامەی مەحموود بەم نووسراوەی خوارەوەی ئۆزدەمیر پاشا و ئیمزای وی: «مۆری خەباتگێری مەزن لە پێناوی ئایین تەسدیق دەکرێت». لێرەدا دەردەکەوێ ئۆزدەمیر پاشا لەسەر بنەمای ئایینی و هەستی ئیسلامی کار دەکاتە سەر شێخمەحمود. جگە لەوە ئۆزدەمیر پاشا لە لایەن دەوڵەتی ئەنقەرەوە دەسەلاتی پێدراوە، بەڵێنی دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆی هاوبەند لەگەڵ تورکیا بە کوردەکانی باشوور بدات. بۆیە ئەحمەد تەقی بەگ نوێنەری حکومەتی شێخ مەحموود لە ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣ دوای گەڕانەوەی لە ئانکارا لە سولێمانی بە هاوڕێ دوبسون دەڵێ: کورد و تورکیا لە رەواندز ریککەوتوون و پەیمانێکی دوانزە خاڵیان مۆرکردووە خاڵی یەکەم دەڵێ: دەوڵەتی تورکیا بەڵێنی سەربەخۆیی بە کوردستانی باشوور داوە و گەرانتی دەدا دەست لە کاروباری ناوخۆی وەرنەدا.

**خاڵی دووهەم:** شێخمەحمود بە حوکمداری کوردستان دەناسێت و لە سولێمانی پەرلمانی کوردستان پێکدێنێ.

**خاڵی پێنجەم:** لەکاتی شەڕدا دەوڵەتی توورکیا کەڵك لە هێزە چەکدارەکانی باشووری کوردستان وەردەگرێت. بەم بەڵێنانەی کەمال دەردەکەوێ تورکەکان توانیویانە شێخ مەحموود بۆ لای خۆیان راکێشن. دیارە لە سەختترین ساتەکانی ژیانی خۆیاندا ناچاربوون بهێڵن و تەنانەت بەڵێنی ئۆتۆنۆمی کوردستانیش بدەن.

ئینگلیزەکان کە لە دەوری سیاسی شێخ مەحموود تێگەیشتن لە۲۳ی شوباتی۱۹۲۳ مۆڵەتێکیان دا بە شێخ لە ماوەی پێنج رۆژ سولێمانییان تەسلیم بکا. لە ۲۸ی شوبات بەفرۆکە بانگەوازیان بلاوکردەوە و داوای خۆ بەدەستەوە دانیان لێکردووە. بەیانی ۳ی مارت شێخ مەحموود لەگەڵ پێنج سەد سوار لە سلێمانیەوە رادەکاتە سورداش.

لە مانگی مارت ۱۹۲۳ دا شێخ مەحموود پەیام دەنێرێ بۆ تێکڕای بالوێزانی ولاتانی دەرەوە لە تاران و دەڵێت: لە جەنگی جیهانییەوە ئێمەی دانشتوانی کوردستانی باشوور داوا لە ئینگلیزەکان دەکەین مافی نەتەوایەتیمان بەرەسمی بناسن، کەچی لەبری ئەوە ولاتەکەمان کاول دەکەن و خەڵکەکەمان دەکوژن و دەرفەتی ئەوەشمان پێ نادەن دەنگ و پرۆتێستۆی خۆمان بەرز کەینەوە. لە ۱۹۲۳ دەسەلاتدارانی ئینگلیز کوردستان دەخەنە ژێر گوشاری بۆمبارانی فرۆکە و هێزی سەربازی، نزیکەی دوو سەد بنەماڵە لە سلێمانی ئاوارە بوون. ماڵ و سامانیان تالان و ولات کاول کراوە، داواکاری دادگای قانونی و عەدالەت و مرۆڤ دۆستی ئێوە دەکەین بەرامبەر بەو داپڵۆسینە.(بیلۆتیی پۆڵ پریۆنی یەکێتی سۆڤیەت لە فارس ژمارە ۷ی ئەیلولی ۱۹۲۳)

لەبەر ئەم فاکتەرانە بەشێك لە کوردەکانی کوردستانی باشوور بە سەرۆکایەتی مەحموود هەڵوێستێکی دوژمنانەیان بەرامبەر ئینگلیزەکان گرتۆتەبەر. ئێستا شێخ لە باشووری کوردستانە.

بەم چەشنە ئینگلیزەکان کۆتایان بە یەکەم «مەلیکیەتی» کوردستان هێنا جێگری ناوبراویان داناوە واتە سەید تەها، کە پێشان خزمەتی رووسیای تزاری کردووە. بۆ پشگیری خەیانەتی سەید تەها وەك ئەو خیانەتەی شێخ مەحموود بە ئینگلیزەکان، ئەم جارە پەنایان بردە بەر سوێند دانی

سەید تەها کە دەبوو بەڕێ و رەسم لە مزگەوتی بەغداد سوێند بخوا کە بە ئینگلیزەکان وەفـادارە. جگە لەوە ئینگلیزەکان بۆ گەرنتی، بنەماڵەی سەید تەهایان وەك بارمتە لە بەغدا هێشتۆتەوە.

لەمەولا سەید تەها یەکێك لە ئەجیندا گەورەکانی ئینگلیزە و هەڵوێستی کـوردان بەرامبـەری نێگەتیڤە. ئینگلیزەکان بۆ ئەم خزمەتەی مانگانە هەزار روپیەی دەدەنێ و دەسەڵاتیان پێـداوە مالیات وەرگرتن، پاوان بکات.پیرس ڤودکا راگەیاندنی ژمارە ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٣

ئەم راپەڕینانەی کوردان کە لە لایەن سـەرکردەکانیانەوە بـەڕێوە دەچێت توانیویانـە دەزگـای هەرەوەزی بۆ بەڕێوەبردنی ئیش و کار دابمەزرێنن.

لە دەست پێکردنی شۆڕشـی تورکـە لاوەکانـەوە رووناکبیرانی کـورد توانیویانـە رێبەرایـەتی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بگرنە دەست. بە هاوکاری عبدالقادر بـە مەبەستی خـەبات بـۆ پێش خستنی هەستی نەتەوایەتی گەلی کورد دەس بەدرووستکردنی کۆمیتەی کوردە لاوەکان و لە سویسرا دەسـت بـە چـاپ و بلاوکردنـەوەی رۆژنامـەی کوردسـتان....دەکرێـت. هێنـدەی پێناچێت تورکە گەنجەکان لەگەڵ داشناکەکان پەیمان دەبەستن و لە دواییدا دەبێتـە کارەسـات و پەرێشانی بۆ کوردان.

بەسەرهەڵدانی ئەم بزووتنەوەیە کۆمیتەی کوردی لە ئەسـتانبۆڵ و ئـەرزەڕۆم دروسـت دەبێـت. کۆمیتەی ئەستانبۆڵ بە سەرۆکایەتی عەبدوالقادر لایەنگری قورسی ئینگلیزەکان بـوو، پاشـان ئەم کۆمیتەیە لە ئینگلیزەکان نائومێـد و دەبـێ و بـەرەو کۆمیتـەی ئـەرزەڕۆم دەڕوا کـە زۆر بەهێزە و دەورێکی گەورەی هەیە. سەرکردایەتی ئەم کۆمیتەیە لە ئەستۆی خالید بەگ دابـوو. کوردێکی رووناکبیر، چاوی بینینی ئینگلیزەکانی نییە، بۆیە کەمالیستەکان لەناو سـوپادا بـە زۆر هێشتبوویانەوە و دەترسان لە ناو کوردەکان چالاکی بنوێنێ.

مستەفا کەمال پاشا بۆ خۆی پێش گەشتەکەی لە بەهاری ١٩٣٤ بۆ ویلایەتەکانی رۆژهـەلات چاوی بە خالید بەگ دەکەوێت و داوای لێدەکات لەناو سوپادا بمێنێتەوە.

ئەندامانی کۆمیتەی کوردی ئەمانەن:

حوسێن پاشا، حەسەن پاشا، سەلیم بەگ ،ئیسماعیل حەقی بەگ، عەلی ئاویر بەگ.

بەپێی گەلاڵەی کۆمیتەی ئەرزەڕۆم لـە کـانوونی یەکـەمی ١٩٢٣ ،کوردسـتانی داهـاتوو ئـەم ناوچانە دەگرێتە خۆ: ئەرزەڕۆم، وان، موسڵ، بەتلیس، دیاربەکر، خارپوت و بەشی ڕۆژهـەڵاتی ویلایەتی سیواس. کوردستانی فارس: کرماشان، سنە، سەقز، سابلاخ، تورچین، سەلماس، ......

کۆمیتەی ئەرزەڕۆم هەمیشە خەریکی ئەوە بووە ئاڕاستەی ئێستای بەرەو کوێ بێت. وەلێ پتر ڕووی لە یەکێتی سۆڤیەتە. هاوکات سمکۆیش بە دەستووری ئەم کۆمیتەیـە کـار دەکـات. کـە کەمالییەکان ئەستانبۆڵیان گرت بەشێك لە ڕێبەرە کوردەکان لە ئەستانبۆلەوە هاتنە ئەرزەڕۆم. لە ئەنجامدا کۆمتیەی ئەرزەڕۆمی کورد ناوی خۆی گۆڕی بە کۆمیتەی ناوەندی کوردستان.

هاوکات کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردیبە ڕێنوێنی خالید بەگ بە هەمـوو توانایەوە کار دەکـات وهەڵوێستی دژایەتی ئینگلیز دەگرێتەبەر. لە ١٩١٣ کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کـوردی تێکـستی مەرجـەکانی خـۆی بـۆ کوردسـتانی ژێـر حیمایـەی رووسـیای سـۆڤیەتی ئامـادە کـرد بـوو. دیکۆمێنتەکە درابۆ دەست کۆنسۆڵی ئێمە لە ئەرزەڕۆم. دوای ئەوەی ئەجینداکانی ئێمە بەپێی ئەو بڕیارە بە ناوبانگەی وەزارەتی دەرەوەی رووسیای سۆڤیەتی لە وەلامدانەوە خۆی دەپارێزێت، ئەو هەستەی پێشووی کۆمیتەی کوردی بەرامبەرمان سـاردبووە. لـە سـاڵانی ١٩٢٣-١٩٣٣ زۆربەی کوردەکان لە ڕێگای کۆمیتەی ئەرزەڕۆمی کوردیەوە نامەیەك بۆ هاوڕێ «دوبسۆن» لە تشرینی دووەمی ١٩٢٣ دەنووسن : «ئێمە بایەخێکی زۆر بۆ مەزنایـەتی دەوڵـەتی سـۆڤیەت دادەنێین کە بۆ رزگـاری مرۆڤایـەتی خزمـەتێکی زۆر گـەورەی کـردووە، یـەکێك لـە ئامانجـە ڕاگەیاندراوەکانی ئەوەیە گەلانی چەوساوە رزگار بن. ئێمە و کوردستان باوەڕمـان وایـە تـەنیا دەوڵەتی مەزنی سۆڤیەت دەستی یارمەتی ڕاسـتەقینە و هاوکاریـان بـۆ درێـژ دەکـات و لـە باوەشمان دەگرێت و دەمانپارێزێ. (پیرس بیرو ١ی کانوونی دووەم ١٩٢٤)

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لەم بارودۆخەدا ناتوانین هەڵوێستی کوردە جوێخوازەکان پەسند بکەین و پشتیوانیان بین، کەچی زۆربەی کوردەکان خەباتی سیاسی خۆیان بۆ سەربەخۆیی بە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بەستۆتەوەو ئومێدیان پێیەتی.

ئەمانە کورتەی قۆناخە سەرەکییەکانی مێژووی کوردە لەسەر ئاستی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتیان. ناوەڕۆکی کێشەی کورد لەم دە ساڵەی دواییدا بەم چەشنەیە:

**ئەنجامەکان:**

١- کوردەکان لەبەر ئەو هەموو فاکتەرە تایبەت و نەتەوایەتییەی هەیانە وەك (زمان، ئایین، مێژوویی گشتی و بارودۆخێکی ئابووری) ........ بێ شك مافی ئەوەیان هەیە وەك نەتەوەیەکی جیاواز و یەکگرتوو لە رووی ئەتنیکییەوە سەربەخۆ بژین.

٢- جگە لەو فاکتەرە ناسروشتیانە وەك ئاژاوە پڕوپاگەندەی ناسیۆنالیستانەی بێگانەکان. هۆی سروشتی زۆرهەن کە هەستی نەتەوایەتی کوردەکان دەبزوێنێ.

٣- کوردەکان چاوی بینیی رژێمی تورکیایان نییە، لەبەر ئەوە تورکەکان ئامادەنین کوردەکان وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ بناسن کاربەدەستانی تورك بە رێگای ژاندارمەکانیانەوە بە زۆر باج و بەرتیل وەردەگرن و سەربازییان پێدەکەن.

٤- مێژووی خەباتی کورد بۆ سەربەخۆییان نیشان دەدات کە چینی سەرەوەی کۆمەڵگای کوردەواری لە بیروباوەڕی نەتەوەیی گەیشتوون زانیویەتی بۆچی راپەڕیوە و خەباتی کردووە.

٥- کوردستان لە رووی جوگرافییەوە وەك شوێنێکی ستراتیژی بایەخێکی یەکجار زۆری بۆئەو دەوڵەتانە هەیە کە هاوسنووری کوردستانن. بۆ ئینگلیز وەك دەڤەرێکی سەربەخۆ لە ژێر حیمایەی دا دەبێتە دووهەم هامیلتۆنی ئینگلیز کە لە باکورەوە دەست بەسەر کانەکان و سەروەت و سامانەکەیدا دەگرێت دەبێتە مەترسی بۆ دراوسێکان واتە قەفقاز، تورکیا، سوریا و فارس.

٦- زۆرجار راپەڕینەکان بە سەرکردایەتی هەندێ رابەر لە ناوچە جیاجیاکاندا بێ بەرنامەیەکی باش سەرکەوتوانە کۆتاییان پێهاتووە. زۆرجار سەرکردەکان هەڵوێستی خۆیان گۆڕیوەو لەسەر جێبەجێ کردنی بڕیارەکانیان سوور نەبوون. ئەم راپەڕینانە لە لایەن هەندێك شێخەوە رێکخرابوون بۆیە و بۆ دروستکردنی دۆزێکی سیاسی ئەوەندە لەکوڵ نەبوون و زەمینەش فەراهەم نەبووە. دەوڵەتانی دەرەوەش توانیویانە هەندێ لەو رێبەرانە بکڕن و بێ ئەوەی رای کۆمەڵانی خەڵك لەبەرچاو بگرن، لەگەڵیان پێکبێن .

٧- بەم دوایانە هەندێ سەرکردە کە خەڵکێکی زۆرکەمیان بەدواوە بوو بێ مەبەست و بێ عەقلانە رادەپەڕین. ئێستا لە جێی ئەوان هەندێ رێکخراو و کۆمیتەی رێکوپێکتر سەریان هەڵداوە و هەوڵ دەدەن تێکڕای ئەو بزوتنەوە پەرت و بڵاوانە یەك بخەن و لەسەر رێبازێکی گشتی لە ژێر دروشمی ناسیۆنالیستیدا رابەرایەتییان بکەن.

٨- پرستیژی یەکێتی سۆڤیەت لەناو کوردەکاندا باڵایە کە پێویستە هاوسۆزی هەستی نەتەوایەتی ئەم خەڵکە بین، چونکە ئەم گەلە، چەوساوەی سیاسەتی فریوکارانەی گەلی دەسەڵاتدارە، دژی زلهێزە ئیمپریالیستەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خەبات دەکات.

## داواکاری ئاشوورییەکانی کۆماری سۆسیالیستی رووسیای فیدراتیفی بۆ ئاشوورییەکانی میزۆپۆتامیا و تورکیا و فارس

بیستومانه ئینگلیز دەیەوێ لە کۆبوونەوەی ئەیلولی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە جنێف، خۆی بە پارێزەر و پشتیوانی گەلی ئاشوور لە کێشەی موسڵدا بناسێنێ. ئێمە دژی ئەم دیپلۆماسیەتەی ئینگلیزین، چونکە بۆ بەرژەوەندی خۆی دەیەوێ لە کێشە موسڵ و رووبەڕوو بوونەوەی تورکەکان، کەڵك لە ئاشوورییەکان وەربگرێت. بۆ ئەم کارەش جگە لە ئاشوورییەکان کەسی تری دەست نەکەوتووە یارمەتی بدا و پشتی پێ ببەستێ. هەر بۆیە لەناو ئاشوورییەکانی موسڵ و هەکاری و ناوچەکانی تری تورکیا خەریکی چالاکین.

ئێمە دژی ئەم دیپلۆماسیەتەی ئینگلیزین بەتایبەتی لە جنێف، رایدەگەیەنین کە پێویستیمان بە پشتوانی ئەوان نییە. داوا لە برایانی ئاشووری خۆمان لە تورکیا و میزوپۆتامیا و فارس دەکەین دژی ئەم پیلانە رابوەستن. داواکاری لایەنگری و پەیوەندی دۆستانەی ئاشوورییەکان و تورك فارسین، ئەم داواکارییە لە لایەن ئاشوورێکی زۆرەوە مۆرکراوە لەوانە.

**دالوڤ موراد خان**[1].

**سەرۆکی کۆمەڵەی ئاشوورییەکانی سۆڤیەتی**

---

(1) op. 0732 onuc 68 nan. 158 geno 470.

## تێزەکانی کێشەی ئاشووری

١- کۆمەڵەی ئاشوورییەکانی دەرەوە رادەگەیێنێت کە هەستی نەتەوەیی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی ئاشووری لە لایەن ئیمپریالیزمی ئینلگیزەوە بۆ مەبەستی سیاسی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست کەلکی لێوەردەگیرێت.

٢- سیاسەتی ئینگلیز لەم سالانەی دواییدا هاندانی گەلانە دژی یەکتر بەتایبەتی ئاشوورییەکان دژی تورکیا و فارس.

٣- ئینگلیزەکان کەلك لە هاندانی ئاشوورییەکان وەردەگرن دژی تورکیا وەك چەکێك بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە نەوتییەکانی خۆیان لە میزوپۆتامیا. گواستنەوەی ئاشوورییەکان بۆ ویلایەتی موسل بە مەبەستی دورستکردنی قەلایەکە دژی تورکیا.

٤- ئەنجامی ئەم سیاسەتەی ئینگلیز کە نانەوەی دووبەرەکییە لە نێوان گەلان بۆتە هۆی کوژران و لە ناوچوونی هەزاران ئاشووری، هەر بۆیە گەلی ئاشووری نایەوێ چیتر ببێتە چەکێکی کوێر لە دەست ئینگلیزەکاندا.

٥- ئێستا دیبلۆماتەکانی ئینگلیز رادەگەیێنن کە پالپشت و پارێزەری ئاشوورییەکانی موسڵ و هەکاری و شوێنەکانی تری تورکیان و داوا دەکەن ئەم ناوچانە بە عێراقەوە بلکێنن، گوایا دەیانەوێ ئاشوورییەکان لە دەست تورکیا رزگار بکەن. دەیانەوێ لە کۆبوونەوەی مانگی ئەیلولی ئەم سالی کۆمەلەی نەتەوەکان بۆ چارەسەری کێشەی موسڵ، ئەم باسە بێننە ئاراوە.

٦- ئاشوریەکان رادەگەیێنن پارێزەری و پشتیوانی ئینگلیزەکانیان ناوێت و پرۆتێستۆی سیاسەتی دووڕووی ئینگلیز دەکەن کە دەیەوێ سیاسەتی تالانکاری دوژمنانەی خۆی بەرامبەر تورکیا لە ژێر هەستی نەتەوەیی گەلی ئاشووریدا بشارێتەوە.

٧- ئاشوورییەکان رادەگەیەنن کە خەباتی ئەوان دژی تورکیا لە رابردوودا ئەنجامی سیاسەتی ئاژاوەگێرانەی ئینگلیز بووە و ئێستا دەست لەو خەباتە دەکێشنەوە و هیوادارن ژیانێکی هێمنانە و دۆستانە لەگەڵ گەلی تورکیا بنیاد بنێن.

٨- ناوچەی موسڵ هەمیشە سەر بە تورکیا بووە و ئێستایش سەر بە تورکیایە لکاندنی ئەم ناوچەیە بە عێراقەوە پێشێلکرنی مافی چارەنووسی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە کە خۆیان بە بەشێکی گەلی تورکیا دادەنێن.

٩- کۆمەڵەی ئاشووری داوا لە برایانی خۆیان لە میزوپۆتامیا و فارس دەکەن دژی ئەم سیاسەتەی ئینگلیز بوەستن کە دەیەوێ بۆ بەرژەوەندی خۆی ئاشوورییەکان دژی تورکیا بەکاربێنێ. لەم کاتەدا کە کێشەی موسڵ هاتۆتە ئاراوە داوا لە گەلی ئاشووری و تورک دەکەین کە پێکەوە دژی ئەم پیلانەی ئینگلیز راوەستن و کێشەکانی خۆیان و ئەو بێباوەڕیەی لە رابردوودا لە نێوانیاندا هەبووە، چارەسەر بکەن[1].

- بۆ ئاگاداری هاوڕێ ڤۆلین (کۆمیتەی دەوڵەتی «شورای وەزیران» یەکێتی سۆڤیەت)

بە دەستووری هاوڕێ ئۆسیترۆڤ ناردوومە و پێویستە لە چاپەمەنییەکانیش بڵاوبکرێتەوە.

**پالیاکۆڤ**

**١ی ئەیلولی ١٩٢٥**

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٧٥.

## بۆ: سەفیری یەکێتی سۆڤیەت لە تورکیا هاوڕێ سۆرتیس

### تێبینی لەسەر نووسراوی ژمارە ٣ و هەروەها راپۆرتی خ.ئا «سەرچاوەی ژمارە ١٥»

دەبێ روونبکرێتەوە: بە راستی سولێمان سورەیا بەگ پەیوەندی بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردەوە هەیە، ئەو کوردانەی لایەنگری ئەمەریکان کە بۆ ئەوێ سەفەر دەکەن بە دەستی پڕ دەگەڕێنەوە بەتایبەتی کوردەکانی دەرسیم.

کوردەکانی دەرسیم واتە قزلّباشەکان کە موسلمان نین دوژمنایەتییان لەگەڵ مەسیحییەکان نییە، بۆیە ئامادەن سەر بە زلهێزێکی مەسیحی واتە ولاتێکی وەکو ئەمەریکا یا دەولەتێکی مەسیحی بن.

پێویستە ئێوە زانیارمان لەسەر نوێنەرانی کوردی پەرلمانی تورکیای بۆ بنێرن واتە زولفی و فەوزی و حەمدی بەگ و بزانین هەلّوێست و بۆچوونەکانیان چین؟ ئایا لەگەڵ هەلّویستەکانی ئێمە دەگونجێن؟ واتە «لە بارودۆخی ئێستای نێو نەتەوەیی و ناوخۆی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە تورکیا، دەبێ هەولّبدات لەگەڵ تورکیا پێك بێن و ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی تورکیا مسۆگەر بکەن».

سەبارەت بە رەزا بەگ دەبێ لێکۆلّینەوەی پێویست بکرێت. ناوبراو کە ئەجیندای کۆمیتەی ئەرەزرۆمە بە سەرۆکایەتی خالید بەگ، ئایا هەر ئەو کەسەیە کە خالید بەگ لە سەری نووسیوە؟

وەك ئاشکرایە کوردەکان هەمیشە دژی هێزی پۆلیس و خزمەتی سەربازی بوون لە تورکیا، لەبەر ئەوە سولّتانی عوسمانی ناچاربوو سوارەی حەمیدییە لەوانە دورست بکات، واتە هێزێکی چەکدار وەك چەکدارە قەزاقەکان، عەبدولحەمید شێوازێکی تایبەتی بەرامبەر بە کوردەکان گرتەبەر و هێزی حەمیدییەی بۆ رێکخستن.

**تێبینی:**

«دروشمی سەربەخۆیی کوردستان» لە بارودۆخی ئەمڕۆی نێونەتەوایەتیدا دروشمێکی دژی شۆڕشە. بەرزکردنەوەی ئەم دروشمە واتە «سەربەخۆیی کوردستان» وەڵامدەرەوەی بەرژەوەندی ئیمپریالیزمی ئینگلیزە، بە جێبەجێکردنی واتە دروستکردنی ئەم دەوڵەتە پێگەی جیهانی دژی شۆڕش خۆی بە هێزدەکا. یەکسەر دژی یەکێتی سۆڤیەت و تورکیا و فارس بە کاری دەهێنرێ.

- کوردەکانی دەرسیم «قزلْباشەکان» پتر کەوتوونەتە بەر قینی تورکان و مالیاتی زۆرتریان لێوەرگیراوە، بۆیە هەمیشە روویان لە وڵاتانی ناموسڵمانە.

- ئەمڕۆ باسەکە ئەوەیە، تورکەکان بۆیە ئامادەن ئۆتۆنۆمی بدەن بە کوردان تا دژی ئەرمەنییەکان بەکاریانبێنن، تەنانەت وابلاوە نوێنەرایەتی کورد بۆ کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس بە رەزامەندی و ئاگاداری تورکانە تا بەرامبەر پلانی دروستکردنی ئەرمەنستانی گەورە کەڵکی لێوەربگیرێ.

## داخوازی ئۆتۆنۆمی کورد لە چوارچێوەی تورکیا

ئەگەر سەرنەگرێت داوای سەربەخۆی بکەن (بۆ بەرەو رووبوونەوەی یا پارسەنگی ئیدعای ئەرمەنییەکانە کە دەکرێ تەنیا بەرژەوەندی تورکیای تێدابێت).

- پرۆژەی «ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان» لەگەڵ هەڵوێستی ئێمە یەك دەگرێتەوە و دەبێتە هۆی ئەوەی یەکێتی سۆڤیەتیش هەبوونی خۆی لە کوردستان مسۆگەر بکات.

بەڵام دانەرانی گەڵاڵەی سەربەخۆیی بۆ کوردستان باسی ئەوە ناکەن کە ئەم دەوڵەتە نوێیە سەربە یا لە ژێر رکێفی یەکییەتی سۆڤییەت بێت، وەك کۆمیتەی ئەرزرومی کوردی.

هاوڕێ لاهوتی کۆمۆنیستی فارس، لەم بارەوە دەنووسێ:

(ئەم دەستەیە لەو کەسایەتیە ناودار و سەرکردە کوردانە پێکهاتووە کە ساردی و گەرمی دونیای دیپلۆماسییان چێشتووە. سەرۆکی ئەم دەستەیە «شەریف پاشایە»، ناوبراو پلەوپایەیێکی گەورەی لە بەڕێوەبەرایەتی ئیمپراتۆری عوسمانی داهەبووە، ئەندامی دەستەی نوێنەرایەتی تورکیابوو لە کۆنفرانسی ڤەرسای، لە کۆنفرانسەکەدا خۆی لە نوێنەری تورکیا کێشایەوە و بەناوی نوێنەری کوردستانەوە خۆی ناساند. هاوکات شەریف پاشا چاوی بە وەزیری دەرەوەی ئێران (موشاوێر الممالك) دەکەوێت و لەمەڕ یەکگرتنی کوردستان لە ژێر حیمایەی ئێران، وتووێژ دەکات).

بەڵام ئینگلیز رخنەی لە دەوڵەتی تاران گرت و دژی ئەم وتووێژانە وەستا [1].

**ك. کرژمینسکی**

---

(1) هەمان سەرچاوە ل ١٣٤-١٣٨.

# نموونەی بەڵگەنامەکان

Письмо № 1 от 23 марта 1923 года № 66/с Генконсула в Карсе тов. ЛУКАНОВА.

Уважаемый товарищ,

Несколько дней моего пребывания в дороге и в гор. КАРСЕ дали мне возможность зафиксировать мои впечатления и наблюдения, которые я постараюсь изложить вместо доклада в этом письме.

15-го марта у меня состоялось свидание с курдским вождем КЯМИЛЬ-БЕЕМ, сыном БЕДИРХАНА, ныне проживающим по улице Гудовича №1 Заглянув к нему и не застав его дома, мне пришлось беседовать с его женой, по происхождению немкой, говорящей довольно сносно по русски. Из разговора выяснилось, что она более меня в курсе дел мужа, что осталось тщательно от меня скрытым. Минут через 10 пришел КЯМИЛЬ-БЕЙ. Познакомившись с ним, я ему передал письмо от тов. ШАХОВСКОГО, которое его бесконечно обрадовало. Прочитав его он был весьма удивлен, что Шаховской в Ангоре и присовокупил, что это первая весточка от него с августа месяца прошлого года. На основании этого письма я весьма осторожно стал нащупывать почву для дальнейшего разговора, ссылаясь при этом на большую дружбу, существующую между мной и Шаховским. Этот аргумент оказал свое благоприятное действие и последний стал разговаривать со мной более откровенно.

Лично не имея от Вас конкретных указаний визит мой свелся исключительно к выяснению его мнения о курдском движении в настоящий период, его действительного авторитета среди курдских племен, а также к завербованию его моим информатором в связи с его бедственным положением. Из беседы выяснилось что автономию Курдистана он мыслит только под протекторатом Сов. России, присовокупляя при этом, что если действительно Сов. Россия намерена обратить серьезное внимание на курдов, то он предложит ей свою программу, которая будет выработана совместно с другими курдскими вождями. В этом отношении я склонен думать, Кямиль-бей согласился бы взять на себя задачу создать автономный Курдистан под протекторатом Турции. Это мое личное мнение, так как этот вопрос я остался при своем свидании не затрагивать. Продолжая разговор, он упомянул о некоторых пунктах будущей программы, но эти пункты были весьма наивны и приводить их не стану.

Восхваляя тов. Шаховского, он не преминул заметить, что любит его как брата, и далее стал указывать на свое нейтральное пове-

В письме присланном в наше тавризское консульство от 20 Января 1923 г. шейх Махмуд писал:" Весь народ южного Курдистана склонен подчиниться, помогать и дать жертвы прелестному Русскому государству, чтобы телом и делом исполнить дружно все распоряжения, какие будут даваться нам". За это народ " требует признания своих национальных прав". В заключение шейх Махмуд просит о помощи.
[Переводка Бюро печати № 7 за Июнь 23г.]

Накануне своего окончательного разрыва с англичанами, шейх Махмуд, через своего делегата послал в Ангору письмо, в котором между прочим говорилось: " согласно желанию, выраженному подавляющим большинством начальников племени, и во имя интересов населения южного Курдистана правительство его приняло всеобщим голосованием организовать в южном Курдистане народное управление, по примеру основных организаций ВНСТ и предоставить последнему судьбы Южного Курдистана"

Это послание Махмуда было снабжено следующей надписью Оздамир паши:" удостоверяется печать великого борца за религию." Из этого видно, что Оздамир паша обрабатывал шейха Махмуда на основе религиозных и исламистских мотивов. Кроме того, Оздамир паша, по уполномочию Ангорского правительства обещал южным курдам создание независимого Курдистана в союзе в Турцией. Так, Ахмед, Таги Бей, уполномоченный шейха Махмуда 18-го Октября 1922г. проезжая из Ангоры в Сулеймание сообщил т.Дубсону, что в Ревандузе курды договорились с турками и подписали договор с 12-ю пунктами. Пункт I-й гласит: турецкое правительство обещает независимость южному Курдистану и гарантирует свое невмешательство во внутренние дела. 2-ой пункт - "Шейх Махмуд признается правителем Курдистана и в Сулеймание организуется меджелис" § 5-й "Военные силы Южного Курдистана в случае войны используются турецким правительством" Очевидно, что благодаря, этим посулам кемалистам удалось переманить на свою сторону шейха Махмуда. Из этого видно, что и турки, в минуту жизни трудную, вынуждены говорить и даже обещать автономию Курдистану.

Наконец, англичане убедившись в двуличной политике шейха Махмуда 22 Февраля 1923г. пред"явили ультиматум о передаче Сулеймание англичанам, в пятидневный срок. 28-го Февраля английский аэроплан разбросал в Сулеймание прокламации о сдаче. Утром 2-го Марта шейх Махмуд с 500 всадника-